اصول الدين الاسلامي

زنجیرەی هزری هاوچەرخی ئیسلامی 55

# بنەماکانی ئاینی ئیسلام

نووسینی

د. رشدی علیان

د. قحطان عبدالرحمن الدوري

بە کوردی کردنی

زنیار عزیز شاه



# بنەماکانی ئایینی ئیسلام

نووسینی:

د.رشدی علیان
مامۆستا لەکۆلیژی شەریعە
زانکۆی بەغداد

د.قحطان عبدالرحمن الدوری
مامۆستا لە کۆلیژی شەریعە
زانکۆی بەغداد

بەکوردیکردنی

زێـــبار عـــزیـــزخـــان



نـــــاوی کتێـــــب : بنەماکانی ئایینی ئیسلام
وەرگێڕانـــــــــی : زێبار عزیزخان
نەخشەســـــازیی : کۆمپیوتەری هیوا
خـــــــــە ت : نەوزاد کۆیی
بـــــــــەرگ : أمین مخلص
نۆرە و سـاڵی چـاپ : یەکەم ١٤٣٤ك – ٢٠١٣ز
تـــــــــیراژ : ١٥٠٠ دانە

لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتییەکان
ژمارەی سپیاردنی ( ٧٦٣ ) ساڵی ٢٠١٢ پێدراوە





نوسینگەی تەفسیر
بۆ بڵاوکردنەوەو ڕاگەیاندن
هەولێر – شەقامی دادگا – ژێر ئوتێلی شیرین پالاص
Mob:00964 750 460 51 22
Tel: 0964 750 25 18 138
www.tafseer-pub.com
tafseeroffice@yahoo.com




بسم الله الرحمن الرحيم

الحمد لله والصلاة والسلام على سيدنا محمد رسول الله وعلى آله وأصحابه ومن والاه وبعد:

**مەعلومە كە ئایینە ئاسمانیەكان گشتیان بۆ ئەوە هاتوون كە سەرفرازی ئادەمیزاد وەدەست بێنن و بۆ سودی بەندەكان هەناردراون بۆ ئەوەی بەخۆشی ژیان بەرنەسەر و لە ڕۆژی دوای دا بە بەهەشتی خودای مەزن شاد ببن.**

**ئەم ئاینە پیرۆزانە لە ڕێگای پێغەمبەرانەوە (درودی خودایان لەسەر بێ) بە ئوممەتەكانیان ڕاگەیەنراون، جا هەندێك لەم مرۆڤانە باوەڕیان هێناوەو ڕێگای ڕاستیان هەڵبژاردووە كە لەگەڵ فیترەتی پاك گونجاوە، و هەندێكیشیان سەركەش و عاصی بوونە و بەرهەڵستی پێغەمبەرانیان كردووە و كێشە و بەربەرەكانیان نواندووە هەر جارێ بەشێوازێك داوای جۆرێك بەڵگەیان كردووە، نەك بۆ ئەوەی بڕوا بێنن بەڵكو بۆ بەرەنگاربوونەوەو بەرپەرچدانەوەی داواكاری ئەم پێغەمبەرە پیرۆزانە بووە، و ئەم پێغەمبەرانە بە پاڵپشت بە سروش و وەحی ئیلاهی چەندین موعجیزاتی جۆراوجۆریان نیشانداوە بۆ سەلماندنی ڕەوای داواكاریەكانیان و بەڵگەی ڕوون و ئاشكرایان بۆ هێناون بەڵام گاورەكان هەر ئامادە نەبوونە كە باوەڕ بەم بەڵگانە بهێنن، و گەورەترین بەربەست لە بەردەمیان چاولێكەری باوو باپیرانیان بووە كە لەسەر بیروڕای هەڵە ژیاون و هەروەها لەخۆبایی بوونیان بووە بە (عەقڵ)، كە وایان زانیوە عەقڵ دەبێ حاكم بێ بەسەر هەموو شتێكا، و هەر شتێك لەگەڵ عەقڵی ئەوان گونجاو نەبێ ئەوا شیاوی باوەڕ پێ هێنان نییە...**

**كاتێك ئاینی پیرۆزی ئیسلام هات و لە دوورگەی عەرەبی سەری هەڵدا، ئەم خەڵكەی ئەو كات ئوممەتێكی نەخوێندەوارو ساكار بوون، هیچیان لە ئاینەكانی پێشوو و فەلسەفە نەدەزانی، هەندێك یاسای خێڵەكی سادە بەڕێوەی دەبردن، و لەڕووی بیروباوەڕدا بتە داتاشراوەكانیان دەپەرستن كە لە بەردو دارو قوڕو خورما**

دروستیان دەكردن، بۆیە كە بانگهێشتی حەق و ڕەوای ئیسلامیان بیست سەرسام بوون و ئۆقرەیان لێ براو زۆریان لا سەیر بوو كە باس لە یەكتاپەرستی خودایان بۆ دەكرێ و باسی ژیانەوەی پاش مردن و بەهەشت و جەهەننەم دەكرێ، جا پرسیاری سەیرو دژایەتی جۆراوجۆریان دەكرد و بەرهەڵستی ئەم دینە ڕاست و ڕەوایەیان دەكرد، پێغەمبەری خودا (درودی خودای لەسەر بێ) وەڵامی پرسیارەكانی دەدانەوەو بەڵگەی حاشا هەڵنەگری بۆ دەهێنانەوە.

و كاتێك موسڵمانان كۆچیان كرد بۆ مەدینەی پیرۆز لەگەڵ جۆرێكی تر لە گاورەكان بەرەنگاربوونەوە كە ئەویشجولەكەكانی مەدینە بوون كە شێوازێكی نوێیان لە پرسیارو بەرهەڵستی نیشان دەدا، وەك پرسیار لە (غەیبیات)ی وەك (ڕۆح) و هەواڵی ئوممەتانی پێشوو... هتد، بەڵام قورئانی پیرۆز وەڵامی ئەم پرسیارانەی دەدانەوە..

جا ئەم كێشەی نێوان ئادەمیزادە باوەڕدارەكان و بێ باوەڕان و ئەم بەڵگانەی كە دەخرانەڕوو بۆ سەلماندنی ڕاستی ئاینەكان سەرەتای بنەمای ئاینیان پێك دەهێنا. وە تاكو پێغەمبەرمان (درودی خودای لەسەر بێ) لە ژیاندا بوو وەڵامەكانی لە ڕێی وەحی دادەبەزین و خوای گەورە بەڵگەكانی دادەبەزاند و گاورەكانی پێ دەبەزاندن، بەڵام پاش كۆچی دوایی پێغەمبەری خودا (درودی خودای لەسەر بێ) وەحی پچڕا، بۆیە شێوازێكی تر لە بەڵگە پێویست بوو بۆ بەرەنگاربوونەوەی ئەم هێرشە فیكریەی دوژمنانی دین بەرپایان دەكرد كە ئەویش بەڵگەی عەقڵی و فەلسەفی بوون وە لەوێ زانستی (كەلام) سەری هەڵدا، ئەمەش لەسەردەمی ئەمەویەكان بوو كاتێك جۆرەها خەڵك هاتنە ناو بازنەی ئیسلام و هەندێكیان بە پیلانی داڕێژراو هاتبوونە ناو ئیسلام بۆ ئەوەی بیروباوەڕی موسڵمانان تێك بدەن، و جەدەل و كێشمەكێش بە تووندی سەری هەڵدا بە تایبەت دەربارەی (خەلقی قورئان) و (قەزاو قەدەر) و (سیفاتی ئیلاهی)... كە موعتەزیلە و خەواریجەكان ئەمەیان وروژاند و خەریك بوو ئوممەتی ئیسلام بەرەو هەڵدێرێكی ترسناك بەرن، و ئەم شەپۆلە فیكرییە ترسناكە ماوەی سەدەیەكی خایاند تاوەكو دەرچوونی پێشەوا (أبو الحسن الأشعري)/ ٢٦٠-٣٢٤كۆچی/ كە بە بەڵگەی (نەقڵی و عەقڵی) بۆچوونەكانی موعتەزیلەی

هەڵوەشاندەوە، هەروەها (أبو منصوری ماتریدی) /٣٣٣ کۆچی/ کە لەسەر بیروباوەڕی ئەهلی سوننە و جەماعە بوون و عەقائیدی ئیسلامیان بەجوانی ڕوون کردەوەو ئوممەتی ئیسلامیان ڕزگارکرد لە فیتنەی ئیعتزال و خەواریج. پاشان چەندین زانایانی پایەبەرز لەم مەیدانەدا هاتنە پێش بۆ چەسپاندنی عەقائیدی ئیسلام و بەرپەرچدانەوەی بۆچوونە هەڵەکان وەك: (ئیمامی غەزالی ٥٠٥ ك) و (ئیمام فخرالدین الرازی ٦٠٦ ك) و (ئیمام الحرمین الجوینی ٤٧٨ ك)کە ئەمانە گشتیان لەسەر بیروڕای ئەهلی سوننە و جەماعە بوون و زانستی (کەلام) لەسەر دەستی ئەوان زۆر گەشەی کرد.

ئەم زانستە پێویستی بە وشیاری تەواو و شارەزایی قووڵ هەیە و خوێندنەوەو کار لەسەر کردنی ئاسان نییە، دەبێ لەسەرچاوە باوەڕپێکراوەکان وەربگیرێ و لەو پەرتوکانە بخوێندرێ کە جێگای متمانەی ئوممەتی ئیسلامن بۆ ئەوەی تووشی هەڵە نەبین و لە ڕێی ئەهلی سوننە و جەماعە لانەدەین.

یەکێك لەم پەرتوکە سەردەمیانەی کە لە زانکۆکانی عێراق دەخوێندرێ پەرتوکی (أصول الدين الإسلامی)یە کە بەشێوازێکی زانستی و ئەکادیمی و بە زمانێکی سەردەمیانە ئەم بابەتەی تێدا ڕوون کراوەتەوە- خودا جەزای نووسەرانی بداتەوە -، و برای عەزیزمان کاکە (زێبار) هەڵساوە بە وەرگێڕانی بۆ زمانی کوردی - خودا جەزای ئەویش بداتەوەو تەوفیقی بدا بۆ زیاتر خزمەت کردن بە ئیسلام و موسڵمانان.

بێ گومان ئەم کارە پیرۆزە سودی بەرچاوی دەبێ بۆ قوتابیان و خوێندەواران بەگشتی کە ئارەزووی شارەزابوونیان هەبێ بۆ تێگەیشتن لە عەقائیدی ئیسلامی پیرۆز.

وصلى الله على سيدنا محمد وعلى آله وصحبه وسلم

**د. مادح ملا محمد بەرزێوەیی**

ڕەمەزان/ ١٤٣٣

# پێش نووس

ڕاستیەك هەیە دەمەوێت بیخەمەڕوو ئەویش ئەوەیە هەر كاتێك باس و خواس هاتە سەر ئەو پەرتوكانەی كە لە زمانێكەوە بۆ زمانێكی دیكە وەرگێردراون خوێنەر ڕاستەوخۆ لە پەرتوكە وەرگێڕدراوەكە دوور دەكەوێتەوە بەهۆی خراپی هەندێك لە برا وەرگێڕەكانمان كە بەداخەوە دەڵێم بەبێ ئەوەی شارەزایی و پسپۆریان لە بواری وەرگێڕاندا هەبێت خۆ دەبەر ئەو كارە سەختە ڕادەكەن و سەرو گوێی لێ دەقرتێنن و خوێنەر لەخۆیان دەتۆرێنن. من خۆم یەكێك بووم لەو خوێنەرانەی كە لەگەڵ پەرتوكە وەرگێڕدراوەكاندا تەنیا بەڕوانین و تەماشاكردنیانەوە شەكەت و ماندوو ببووم، بۆیە دەخوازم ڕایبگەیەنم و بڵێم بەتۆی خوێنەری ئازیز كە وەرگێڕی ئەم پەرتووكە (بنەماكانی ئایینی ئیسلام) برای هێژام (زێبار عزیزخان) وێڕای دەست خۆشی كردنم بۆ ئەو كارە دەگمەن و ناوازەیەی خوازیارم كارەكانی بە برشتر بن و شایەنی باسە كە ناوبراو هونەرێكی تایبەت بە خۆی گرتۆتەبەر بۆ وەرگێڕان، بەدڵنیاییەوە خوێنەر هەست بە شەكەتی و بێ زاری ناكات لە كاتی خوێندنەوەیاندا نەك هەر هەست بە شەكەتی و بێ زاری ناكات بەڵكو تام و چێژێكی لە ڕادە بەدەر لە وەرگێڕاوەكە وەردەگرێت خودا پاداشتی بەخێر بداتەوە.

ئەوەندە بە وردی و دانایی و سەلیقەوە كاری وەرگێردراوەكەی كردووەو بۆ دانیشتوە ئەگەرچی وەرگێڕان هونەرێكی گەلێك سەختە نەخاسمە نوسراوەكە لە مەڕ بیروباوەڕو ئەو گرێ كوێرە دەرونیانە بدوێت كە ساڵەهای ساڵە هەر دوو تەوژمی ئیمان و عەقیدە و كوفرو بێ باوەڕی دەبەریەك ڕاچوون و هەر یەكەیان بنیاتنانی بینای خۆیان لە دژی یەكتر فراوان و گەورە دەكەن تەنانەت كێشەی ئیمان و عەقیدە و كوفرو بێ باوەڕی هەموو جیهانی تەنیوەو تەواوی تەكنەلۆژیاو وزەی خەڵكیان لە پێناویدا خستۆتەگەڕ، بۆ یەك لاكردنەوەی گومان و دوودڵی لەلایەك و ڕەش كردنەوەی یەكتریان لەلایەكی دیكەوە لەگەڵ هەموو ئەمانەی ڕابرا وەرگێڕ توانیویەتی بەپێنووسی خۆی بیری خوێنەر بشلەژێنێت و پەرش و بڵاو ئاڵۆزی بكات لە میانەی خوێندنەوەو تێكەڵبوونی لە نێو فیكرو ویست و خواست خەیاڵی

نوسەردا، خوێنەر لە یادو بیروەریدا نامێنێت ئاخۆ ئەم پەرتوكەی لە بەردەمیدایە وەرگێڕ لە زمانێكەوە بۆ زمانێكی دیكە وەرگێڕاوە كە بەوشێوە دانسقەیە لەگەڵ هەست و نەستیدا تێكەڵ بووە یان خۆی ئەم پەرتووكەی نووسیوەو كاری وەرگێڕانی نەكردووە، ئەمە وێڕای بەكارهێنانی زمانێكی پاراوو سوك و ئاسان و ڕوون و ڕەوان و ئاشكرا كە دەبێتە جێگەی ڕەزامەندی خوێنەرانی.

دیارە كاری وەرگێڕانیش پێویستی بە زمانێكی ڕوون و ڕەوانە كە گوزارشت لە بۆچوونەكانی نووسەری پەرتوكە وەرگێراوەكە بكات بەبێ شێواندن و تێكدان و تێك گیران و گۆڕینی ئەسڵی مەبەست كە وەرگێڕ خۆشبەختانە بە ئەمانەتی عیلمیەوە تەواوی ئەو بنەمایانەی ڕەچاوكردوون دوابەدوای بەسەرداچوونەوە (المراجعة) و خوێندنەوەی وەرگێڕدراوەكە بە فەخرەوە بە برای وەرگێڕم ڕاگەیاند بە ئەندازەیەك هەوڵ و ماندوبوون و شەونخونیت كردووە و مافی تەواوت بە وەرگێڕاوەكە داوە دەتوانم بڵێم ئەگەر لەمەودوا بە گریمانە (بشمريت) هیوادارم خوا دەست بە تەمەنیەوە بگریت بۆ زیاتر خزمەتكردن بە فەرهەنگ و كلتوورو كەلەپوری ئیسلامی، ویژدانت ئاسودە بێت و پەرۆش مەبە هیچ نەبێت ئەم شاكارە وەرگێڕدراوەت لە دوای فەوتی خۆی جێ هێشتووە، بە حوكمی نزیكیم لە وەرگێڕەوە لە ڕێگەی خوێندنەوەو موتاڵاكردنی سەرجەم وەرگێردراوەكانی (بانگخوازەو پێغەمبەر نییە، تەوژمی فیكری سیاسی وەهابی، بنەماكانی ئایینی ئیسلام، بیروباوەڕی ئیسلامی و مەزهەبەكانی، گەشەسەندنی فیكری سیاسی شیعە لە ڕاوێژەوە بۆ ویلایەت فەقیە) هەستی ئەوەم بۆ دروست بووە كە بە قەناعەتەوە دەڵێم: هەروەك بڵێی خوای گەورە ناوبراوی تەنیا بۆ كاری وەرگێڕان خوڵقاندووە، بە هیوای تەمەن درێژی و لەش ساغی و كۆڵنەدان، ئیتر هەر سەكەوتوو بیت لە كارەكانتدا.

**ڕەقیب ڕەسول ڕوستایی**

**پێش نوێژو وتارخوێن – سۆران**

٢٠١٢/٧/٨

# پێشەكی وەرگێڕ

**سوپاس و ستایش بۆ ئەو خوایەی كە زانایە، دەسەڵاتداری زاڵی دانایە، هەربووی بێ سەرەتایە، نەبوون بۆ ئەو ئەستەمە، بێ كۆتای خاوەن توانایە، كات بەسەریدا نایە، درودو سڵاو وەك ڕێژنەی بارانی بەهار بڕژێ بەسەر گیانی ئەو پێغەمبەرەی كە فەوتێنەری ناحەقە، ڕۆشنكەرەوەی ڕاستیە بە بەڵگەی ئاشكراو ڕوون.**

پاشان!

كاتێك مرۆڤ لە دایك دەبێت و یەكەم هەنگاو دەنێت بۆ ناو بازنەی ژیانی دونیا، ئەوا لەسەرەتای چاو هەڵێنانی بە ڕووخسارو دیاردەكان چەندین پرسیار لەگەڵ ئەمەدا لە دایك دەبن، ئەم پرسیارانە شتێكی سروشتین كە بەخوارسكی لە دەروون و فیترەتی مرۆڤدا جێگیر كراون، مرۆڤ هەر لە بچوكترین شت تا گەورەترینیان نیشانەی پرسیاری لەسەر دادەنێت، گرنگترین پرسیاریش لەناو ئەو كۆمەڵە پرسیارەدا ئەوەیە لە كوێ هاتووم؟ بۆچی هاتووم؟ بۆ كوێ دەچم؟ كێ منی بەدیهێناوە؟ ...تاد، بەڵێ ئەم پرسیارانە گرنگ و گەورەن بە ئەندازەی ئەو شتانەی پرسیاریان لەبارەوەكراوە، پرسیار لەبارەی مرۆڤ خۆی كراوە، پرسیارێكی گرنگە، چونكە مرۆڤ خۆی مەتەڵێكە و جیهانێكی بچوك كراوەیە، پرسیار لەبارەی بەدیهێنەر كراوە؟.

هەر پرسیارێك وەڵامێكی دەست دەكەوێت چ ڕاست یان هەڵە، جاری واش هەبوە پرسیارەكە بەبێ وەڵام ماوەتەوە. وەڵامەكانیش دەگۆڕێن بە هۆی جیاوازی عەقڵ و ژینگە و توانای مرۆڤەكان، بۆیە هەر یەكەو بە ئاوازێك لەبارەی ئەو شتانە دەیخوێند! تا وای لێهات زۆرێك لە مرۆڤ هەر لە گێژاوی گومڕاییدا خول دەخۆنەوەو بوونەتە دەنگێكی جیاوازو نامۆ لە ناو سەدای بوون و شانۆی ژیان!

بەهۆی كاریگەر بوونی عەقڵی مرۆڤ بە دەورووبەرو هەست و ئارەزووەكان و

سنوردارییەکەی، عەقڵ نەیتوانی ئەو ڕۆڵەی خۆی بگێڕێت کە بۆی دیاریکرابوو، بۆیە خوای گەورە پەیام و پەیامبەرانی (سەلامیان لێ بێت) نارد بۆ ئەوەی مرۆڤایەتی پێناسەی خۆی بزانێت، پێگەکەی دیاری بکرێت، لە هاوکێشەی ژیان و ئەرك و مافەکانی ڕوون بکرێنەوە.

پێغەمبەران (سەلامیان لێ بێت) بە ئارەقە و خوێن و ڕۆح و جەستەیان تێکۆشان لە پێناو گەیاندنی پەیامی ئاسمانی کە ڕاسپاردەی خوایی بوون بۆ مرۆڤەکان و ڕاستە ڕێکردنیانە بۆ سەرفرازی دین و دونیاو دوارۆژ.

خوای گەورە بەفەزڵ و بەخششی خۆی دوایین پێغەمبەر هاوڕێ لەگەڵ دوایین پەیامی ڕەوانەکرد بۆ مرۆڤایەتی، تا ئەو کۆتا پەیامە ببێتە دەستوری هەمیشەیی بۆ گوزەران و کلیلی نهێنیەکانی ژیان و تاکە ڕێگەی بەختەوەری و خۆشگوزەرانی، بەهاتنی ئەو پێغەمبەرە (ﷺ) جیهان هەنگاوی نا بەرەو قۆناغێکی نوێوەو مرۆڤایەتی دووبارە شادبووەوە بە نووری پێغەمبەرایەتی.

بەڵێ ئەم پێغەمبەرە (ﷺ) پایەبەرزو موبارەکە خاوەنی پەیامێکی کورت ماوەو دیاریکراو بۆ کات و شوێن و گەلێکی پێ نەبوو، بەڵکو هەڵگری مەشخەڵێك بوو کە جیهانی ڕووناك کردەوە، لەژێر چەتری پەیامەکەی هەموو چین وتوێژو نەتەوەو هۆزێك لە هەر سەردەمێك لەسەردەمەکان کۆدەبنەوەو جێگایان دەبێتەوە، هەر کەسێك چەندە برینی گومانەکانی قوڵ بن و نەخۆشی بێ باوەڕی سەخت بێت ئەوا دەتوانێت چارەسەری تەواوی دەست بکەوێت لە تیمارگەی ئەو پێغەمبەرە نازدارە (ﷺ).

ئەم پەیامەی پێغەمبەر (ﷺ) کانیاوێکە بەڵام جیاواز لە کانیاوەکانی تر، کە خەڵکی نەك بە خواردنەوە لێی تێر دەبن، تەنانەت لەکەناریشدا ئارام و دڵ دامەزراو دەبن، هیچ کەس لێ پاشگەز نەبۆتەوە، کە تامی ئاوی ئەو کانیاوەی نۆشی بێت، هیچ کەس تامی ئەو کانیاوەی نەکردووە، کە لێی پاشگەز بووبێتەوە.

ئەم پەیامە گرنگی زۆری داوە بە هەموو بوارەکانی ژیان بەتایبەت لایەنی بیروباوەڕو عەقیدە، چونکە ئەم لایەنە بناغە و ڕەگ و ڕیشەی کەسایەتی تاك و

كۆمەڵگەیـە، زانایـانی قوتابخانـەی قورئـان گرنگیـەكی زۆریـان داوە بـەم لایەنـە وەك ئـەركێكی ئـایینی سەرشـانیان، ئـەم كتێبـەش هەوڵێكـە لـەو هەوڵانـەی كـە هەمیشـە و نەبڕاوەیە بۆ ڕوون كردنەوەی ڕاستیەكانی بیروباوەڕ. لەبەر ئەوە بەندەی هـەژارو بـێ هێـزو لاواز هەڵسـا بـە بـەكوردی كردنـی تـا بتوانێـت بـەم كـارەی خزمـەتێك بـە ئارەزوومەنـدانی پێشـكەش بكـات و ببێتـە مایـەی دەوڵەمەنـد كردنـی كتێبخانـەی كوردی بە كتێبی نـاوازەو دەگمـەنی لـەو جۆرە خـوا پاداشـتی (دانـەران) بداتـەوەو بـە بەهەشتی پان و بەرینیان شاد بكات.

لـە كۆتاییشـدا بەپێویسـتی دەزانم كـە سوپاسـی ئـەم بەڕێزانـە بكـەم كـە بەهـەر شێوەیەك لە شێوەكان یارمەتیاندام: (د.ملا مـادح بـەرزێوەیی، م. انعـام محمـد طاهـر، م. نیعمەت بازید، م. ملا رقیب رەسول ڕۆستایی، ملا محمود) خوای گـەورە پاداشـتیان بداتەوە[1]، خوای گەورە ئەو كارەم بكاتە توێشوی دواڕۆژم.

**زێیار عزیزخان**

**سـوران**

---

(١) بۆ ڕاڤەی ئایەتەكانی قورئانی پیرۆز سوودم بینیوە لە: خوڵاصەی تەفسیری نامی، دانراوی مەلا عبدالكریمی مدرس. تەفسیری ئاسان بۆ تێگەیشتنی قورئان، نووسینی بورهان محمد أمین. شایەنی باسیشە كە لە وەرگێڕانی دەقێكدا، سوودم لە سەرچاوەیەك وەرگرتبێت بە هەر ناونیشانێكی بوو بێت ئاماژەم بۆ سەرچاوەو ژێدەرەكە كردووە.

لە كاتی نووسینی سەرچاوەكانی پەڕاوێزدا ڕاستەوخۆ ژمارەی بەرگ و لاپەڕەكەم نووسیوە. (وەرگێڕ).

# دابەش کردنی کارەکان لە نێوان هەردوو نووسەرەکە

<u>( د.رشدی علیان ) ئەمانەی خوارەوەی نوسیوە:</u>

١- بەشی یەکەم: چەند توێژینەوەیەکی ڕێخۆشکەر.

٢- لە بەشی سێیەم ئەمانەی نووسیوە:

دەروازەی یەکەم: عەقلی مرۆڤ و پێویستی بە ڕێنماییپێغەمبەرایەتی.

دەروازەی دووەم: مشتومڕ لەگەڵ ئەوانەی نکۆڵی لە پێغەمبەرایەتی دەکەن.

<u>( د. قحطان عبدالرحمن الدوری ) ئەمانەی خوارەوەی نوسیوە:</u>

١- بەشی دووەم: خواناسی ( ئیلاهیات ).

٢- لە بەشی سێیەم ئەمانەی نووسیوە:

دەروازەی سێیەم: پێغەمبەرایەتی بەشێوەیەکی گشتی ( النبوة العامة ).

دەروازەی چوارەم: پێغەمبەرایەتی بە شێوەیەکی تایبەتی ( النبوة الخاصة ).

٣- بەشی چوارەم: ڕۆژی دوایی ( الیوم الآخرة ).

# بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان

## پێشەكی چاپی چوارەم

چاپی سێیەمی ئەم كتێبە وەك پەیڕەو (منهج) پەسەند كراوە، كە لە بابەتی بیروباوەڕو عەقائیدی ئیسلامی دا دەخوێنرێت لە زانكۆكانی عێراقدا ئەوا لە بەردەستدا نەما.

بۆ دابین كردنی پێداویستی قوتابیەكانمان، ئەم چاپە كە هەڵەكانی ڕاست كراونەتەوەو بژاركراوە دەیخەینە بەردەست، بە پێی پلانی وەزارەتی خوێندنی باڵاو توێژینەوەی زانستی لە پێشخستنی كتێبە پەیڕەوی (منهجی)یەكان.

ئەمەش دوای كۆچی دوایی هاوەڵم (مامۆستا د. رشدی علیان) كە لە ئێوارەی یەك شەممە (٣)ی مانگی ڕەمەزانی (١٤٠٩) بەرامبەر (٩)ی نیسانی (١٩٨٩) چووە بەر ڕەحمەت و بەزەیی خوای گەورە، كە بەڕاستی باشترین برا و دراوسێ و هاوەڵم بوو، خوای گەورە بە ڕەحمەت و بەزەییەكی زۆر دایگرێت و نیشتەجێی بكات لە بەهەشتە پان و بەرینەكەی، بەڕاستی هەر ئەو بیسەر و وەڵامگۆی دوعایە.

د. قحطان عبدالرحمن الدوري

مامۆستا لە كۆلیژی شەریعە - زانكۆی بەغداد

١٤١١ك - ١٩٩٠ز

# بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان

## پێشەکی چاپی سێیەم

پاش ئەوەی لیژنەکانی زانستی لە زانکۆکانی وڵات ئەو کتابەی ناساند وەك پەیڕەو (منهج)ی خوێندن لە بابەتی عەقائیدی ئیسلامی و وەزارەتی خوێندنی باڵا، توێژینەوەی زانستی کردیە مولْکی خۆی ئەوا چاپی یەکەم و دووەمی ئەم کتێبە نەما و بەردەست نەکەوت.

بە پشت بەستن بە پلانی وەزارەت لە دانانی کتێبی پەیڕەو (منهج)ی و پێشخستنی، ئەوا ئەو کتێبەی خۆمان دەخەینە بەردەست بە بژارکراوی و زیادکراوی بەشێوەیەك ئەو چەمکانە لەخۆ بگرێت کە دانی پێدانراوە بۆ ئەوەی بخوێنرێت لەو بابەتە.

داوا لە خوای پایەبەرز دەکەین کە ئەو کارەمان بکاتە جێگای ڕەزامەندی خۆی، قوتابیانی خۆشەویست و خوێنەرانی بەڕێز سودی لێ ببینن، بەڕاستی پەروەردگار بیسەری نزاو دوعایە.

سوپاس و ستایش بۆ پەروەردگاری جیهانیان.

**نووسەران**

**١٤٠٦ك - ١٩٨٦ز**

## بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان

### پێشەکی چاپی دووەم

پاش ئەوەی لیژنەکانی زانستی تایبەت بە بابەتی عەقائیدی ئیسلامی لە زانکۆکانی وڵات، کاتێك لیژنەی پەیڕەوەکان (منهاج)ی فێرکردن لە وەزارەتی خوێندنی باڵاو توێژینەوەی زانستی وەك کتێبی پەیڕەو (منهج)ی ناساند و کردیە موڵکی خۆی،ئەوا پاش چەند مانگێکی کەم چاپی یەکەمی ئەم کتێبە نەما و بەردەست نەکەوت.

ئێمەش ئەو کتێبە دەخەینەڕوو بۆ چاپی دووەم بە بژارکراوی و زیادکراوی.

داوامان وایە لە خوای بەخشندە و باڵادەست و خاوەن شکۆ کە خوێنەری بەڕێزی لێ سوودمەند بکات، بەڕاستی خوای گەورە بیسەرو نزا وەرگرە، لەسەرەتاوە تاکۆتایی سوپاس بۆ پەروەردگاری جیهانیان.

**نووسەران**

**١٤٠١ك - ١٩٨١ز**

# بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان

## پێشەکی چاپی یەکەم

ماوەیەکی دوورو درێژە جیهان شەپۆڵ ئەدات بە چەند بیروباوەڕی فرەو جیاجیا، قیژەو هاواریەتی بە چەند هزرێکی ململانێکەری شڵەژاو، هەر یەك گومانی ئەوە دەبات کە ئەو ڕێنمایی کراوەو لەسەرچاوەی حەقیقەت تێرئاو بووە.

ئێمەی موسڵمانان بەم مرۆڤایەتیە وێڵەبەزییمان دێتەوە، کە هەواو ئارەزوو پاڵنەریەتی، ململانێکان دەوریان داوەو لە کاتێکەوە بۆ کاتێکی تر بەرەو فەوتان کێشی ئەکەن، بەڵام ئێمە دەمانەوێ ئیسلام مرۆڤایەتی بنیات بنێتەوە، چونکە هەر ئیسلامە کە دەیگەیەنێتە سەربەرزی داواکراو (منشود) و ژیانی بەختەوەر، و پاکی دەکاتەوە لە پیسی ڕق و کینە و خۆویستی و خۆپەسەندی (أنانى) و گومڕایی، خوای پایەبەرز فەرموویەتی:﴿ وَمَآ أَرۡسَلۡنَٰكَ إِلَّا رَحۡمَةٗ لِّلۡعَٰلَمِينَ ١٠٧ ﴾ الأنبياء: ١٠٧. واتە: ("ئەی محمد (ﷺ)" ئێمە تۆمان ڕەوانە نەکردووە تەنها بۆ ئەوە نەبێت کە ببیتە ڕەحمەت و بەرەکەت بۆ هەموو جیهانییەکان). ئەو بەزەیی و ڕەحمەتە لەوە دەدرەوشێتەوە کە: باوەڕبوون بەخوای گەورە لەسەر گشت تاکێکی پێویست کردووە، تا باوەڕ بێنێت کە هەر خوای گەورە خاوەن سامان و موڵکە، ئەوەی مرۆڤ هەیەتی ئەوا لە دەستی دەچێت. خوای پایەبەرز فەرموویەتی: ﴿ قُلِ ٱللَّهُمَّ مَٰلِكَ ٱلۡمُلۡكِ تُؤۡتِي ٱلۡمُلۡكَ مَن تَشَآءُ وَتَنزِعُ ٱلۡمُلۡكَ مِمَّن تَشَآءُ وَتُعِزُّ مَن تَشَآءُ وَتُذِلُّ مَن تَشَآءُۖ بِيَدِكَ ٱلۡخَيۡرُۖ إِنَّكَ عَلَىٰ كُلِّ شَيۡءٖ قَدِيرٞ ٢٦ ﴾ آل عمران: ٢٦. واتە: ("ئەی پێغەمبەر (ﷺ)" بڵێ: خوایە تۆ خاوەنی هەموو شتێکیت، دەسەڵات دەبەخشیت بەهەر کەسێك کە بتەوێت و دەسەڵات وەردەگریتەوە لە هەر کەسێك بتەوێت هەر کەسێك بتەوێت باڵادەستی دەکەیت، هەر کەسێکیش بتەوێت زەلیل و بێ دەسەڵات و ژێر دەستی دەکەیت، هەرچی خێر هەیە هەر بەدەستی تۆیە، بێ گومان تۆ دەسەڵاتداری بەسەر هەموو

**شتێكدا).**

**تـا بـاوەڕ بێنێـت كـە دواڕۆژ لـەناو ناچێت و هـەر دەمێنێـت، خـوای پـاك و بـەرز فەرموویــەتی:** ﴿ وَٱلْأَخِرَةُ خَيْرٌ وَأَبْقَىٰٓ ﴿١٧﴾ ﴾ **الأعلـى: ١٧. واتـــە: (لــە كاتێكــدا قیامــەت و بەدەســت هێنــانی بەهەشــت چــاكترە و بەردەوامیشــە). كــە خانــەی ســزاو پاداشــت و لێپرسینەوەیە، جا بۆیە پێویستە مـرۆڤ لێپێچینەوە بكات لەگـەڵ خـۆی بـەر لـەوەی خـوای گـەورە لێپێچـینەوەی لەگـەڵ بكـات لەسـەر كـارو كـردەوەی پێشـووی. خـوای پایەبــــەرز فەرموویـــــەتی:** ﴿ أَفَحَسِبْتُمْ أَنَّمَا خَلَقْنَٰكُمْ عَبَثًا وَأَنَّكُمْ إِلَيْنَا لَا تُرْجَعُونَ ﴿١١٥﴾ فَتَعَٰلَى ٱللَّهُ ٱلْمَلِكُ ٱلْحَقُّ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ رَبُّ ٱلْعَرْشِ ٱلْكَرِيمِ ﴿١١٦﴾ ﴾ **المؤمنـون: ١١٥، ١١٦. واتە: (ئایا گومانتان وادەبرد كـە بەڕاسـتی ئێمـە ئێوەمـان بـەبێ مەبەسـت دروسـت كـردووە و ئێـوە بـۆ لای ئێمـە ناهێنرێنـەوە؟!، بـەرزو بڵنـدی بـۆ خـوا، پاشـای ڕەوای حەق، هیچ خوایەك نیە جگەلەو زاتە، خاوەنی عەرشی شكۆدارو بەرزە).**

**ئەمەش بۆ ئەوەیـە تـا كۆمـەڵگای پـێ بنیـات بنێـت و مرۆڤایـەتی بـەو سیستەمە كامــەران بێــت كــە قورئــانی پــیرۆز هێناویــەتی و پێغەمبــەری خــوا (ﷺ) ڕوونــی كــردەوە. خــوای پایەبــەرز فەرموویــەتی:** ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ أَطِيعُواْ ٱللَّهَ وَأَطِيعُواْ ٱلرَّسُولَ ﴾ **النسـاء: ٥٩. واتـە: (ئـەی ئەوانـەی باوەڕتـان هێنـاوە، فەرمانبـەردارو گوێڕایـەڵی خـواو پێغەمبــەر بكــەن). و خــوای گــەورە فەرموویــەتی:** ﴿ وَمَآ ءَاتَىٰكُمُ ٱلرَّسُولُ فَخُذُوهُ وَمَا نَهَىٰكُمْ عَنْهُ فَٱنتَهُواْ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ إِنَّ ٱللَّهَ شَدِيدُ ٱلْعِقَابِ ﴾ **الحشـر: ٧. واتـە: (ئـەوەی پێغەمبـەر (ﷺ) پێـی بەخشـیوون وەری بگـرن، هــەر فــەرمانێكی پێــدان بــە گــوێی بكــەن، قەدەغـەی هـەر شـتێكی لـێ كـردن مەیكـەن، لـەخوا بترسـن؛ چـونكە بەڕاسـتی خـوا بەتووندی تۆڵە دەسێنێت). ئا لەو كاتەدا كەسایەتی ئیسلامی دروست دەبێـت كـە بـە هزرو بیروباوەڕەكەیەوە سەربەخۆیە، نەزانی ئاوێتە (الجهل المركب)ی جولەكـە و قـین لە دڵان ئەوانەی دوژمنی عەرەب و ئیسلامن كاریگەری خۆی نابێت.**

**ئێمـە كـە ئـەو كتێبـە پێشـكەش بـە خوێنـەری بـەڕێز دەكـەین، مەبەسـتمانە كـە**

شوێنێك بگرێ لەو دەریا گەورەیەی بیروباوەڕ، تاكو بەشدار بێت لەگەڵ ئەو كتێبانەی لەو گۆڕەپانەدا دانراون كە بیروباوەڕی ئیسلامیان خستۆتەڕوو، بەشێوەیەكی سادە و نزیك لە هۆش(ذهن)، ئەمەش بە لەبەرچاوگرتنی شێوازی پوخت و ڕوون و ئاشكرا و خۆبەدوور گرتن لە ڕاجیایی و چوونە ناو لق و پۆپەكان كە پێویستیمان پێی نیە و تەنها یەك مەزهەبیشمان نەخستۆتەڕوو، بەڵكو ڕای مەزهەبە جیا جیاكانی ئیسلامیمان خستۆتەڕوو، تا لێكۆڵەر پەیی ببات بە حەقیقەتی ڕاجیاییەكە و تا بشزانێت كە ئەو ڕاجیاییە تەنها لە بابەتە لاوەكیەكان بووە، كە زۆر گرنگ نین، مادام هەموویان كۆكن لەسەر سێ بنچینەكانی ئیسلام كە باوەڕبوونە بەخواو پێغەمبەر و ڕۆژی دوایی.

لەبەر ئەمە كتێبەكەمان دابەش كرد بۆ چوار بەش:-

**بەشی یەكەم**: بەشێكی ڕێخۆشكەرە. لە میانەی پەیدابوونی زانست و گەشەسەندنی بنەماكان لەلایەن مەزهەبەكانمان خستۆتەڕوو.

**بەشی دووەم**:خواناسی (الاهیات).

**بەشی سێیەم**:پێغەمبەرایەتی.

**بەشی چوارەم**: ڕۆژی دوایی.

ئومێدەوارین كە ئەو كتێبە بۆشاییەك لە پەرتوكخانەی عەرەبی و ئیسلامی پڕ بكاتەوە، داواكارین لە خوا، بمانپارێزێت لە هەڵخلیسكان و دوورمان بگرێت زیادەڕەوی، ڕێنماییمان بكات بۆ ڕێگای ڕاست ... بەڕاستی هەر خۆی وەڵامدەرەوەی دوعاكانمانە.

**نووسەران**

**١٣٩٧ك - ١٩٧٧ز**

# بەشی یەکەم

# لێکۆڵینەوەیە بەراییەکان

**دەروازەی یەکەم: ناساندنی زانستی بنەماکانی ئایین**

**دەروازەی دووەم : مێــــژووی زانستی بنەماکانی ئایین**

**دەروازەی سێیەم : بــــــنەماکانی ئاییــــنی ئیسلام**

## دەروازەی یەكەم
# ناساندنی زانستی بنەماكانی ئایین

**سەرەتا ( تمهید ):**

ئیسلام كۆتا پەیامی خواییە، هەر بۆیە بانگەوازێكی جیهانییە و ئایینێكە بۆ گشت خەڵك، بۆ ئەم مەبەستە ڕوون كردنەوەی بنەماكانی بیروباوەڕو عەقیدە و بنەماكانی ڕەوشت و یاسادانان بۆ لایەنی كرداری لە ئەستۆی خۆی گرتووە، كە ئەمانەش دەبنە هۆی ڕێكخستنی ژیانی خودی مرۆڤ و پەیوەندی لەگەڵ پەروەردگار و پەیوەندی لەگەڵ خانەوادە و ئەرك و مافەكانی بەرامبەر ئەو كۆمەڵگایەی كە تیایدا دەژی... تا هەست بكات بە حەسانەوەو ئارامی لە ژیانیدا و دڵنیاش بێت لە ئاكام و سەرەنجامەكەی لە دوای مردنی.

ئەوەی پەیامی ئایینی ئیسلام بپشكنێت دەبینێت سێ بەشی سەرەكی لەخۆ گرتووە:

**١- بنەما ڕەوشتییەكان (المبادیء الخلقية).**

**٢- حوكمە كرداریيەكان (الأحكام العملية).**

**٣- بنەما بیروباوەڕییەكان (الأصول الاعتقادية).**

**<u>بنەما ڕەوشتییەكان</u>:** ئەو ڕەوشتانە لە خۆ دەگرێت كە پێویستە مرۆڤ لەخۆیدا بێنێتەدێ و خۆی پێ بڕازێنێتەوە كە دەبنە هۆی ئەوەی كاری چاكە و خێری لێبكەوێتەوە، وەك: دەستپاكی و دادپەروەری و چاكەكاری و خۆبەكەم زانین و یارمەتی پێشكەش كردن، و لێخۆش بوون و چاوپۆشین، و خۆشویستن و تێكەڵاوبوون... .

ئامانجی ئەم بنەمایانەش بریتیەلە بڵاوكردنەوەی چاكەكاری و ڕێز و دووركەوتنەوە لە خراپەكاری و پەستی و كاركردن لە پێناو هێنانە كایەی

كۆمەلگایەكی مرۆیی نمونەیی واقیعی.

ئەو زانستەی كە ڕوونكردنەوەی ئەو بنەما ڕەوشتیانە لە خۆ دەگرێت بریتیە لە زانستی ڕەوشت (الاخلاق) و تەصەوف.

**<u>حوكمە كردارییەكان:</u>** بابەتی ئەم لایەنەش هەموو ئەو كردارانە لەخۆ دەگرێت كە مرۆڤ دەیانكات چ پەرستش بێت وەك: نوێژ و جیهاد .. هتد یان مامەڵە وەك: كڕین و فرۆشتن و ئەوەی پەیوەستە بە تاوانەكان.

ئامانجی ئەمەش بریتیەلە:- ڕێكخستنی كاروبارەكانی كۆمەلگای مرۆیی لە هەر شتێ كە ژیانی مرۆڤ پێویستی پێیەتی لە گشت كات و شوێنێكدا.

ئەو زانستەی كە ئەركی ڕوونكردنەوەی ئەو یاسا (أحكامانە) لە خۆ دەگرێت بریتیەلە:- زانستی شەریعەت و ئەحكام یان زانستی فیقه.

**<u>بنەما بیروباوەڕییەكان</u>**: بابەتی ئەم لایەنەش زانراوە چەسپاندنی بیروباوەڕی ئایینیەكە پەیوەستە بە خواو سیفات و كردارەكانی و ئەوەی لەوەوە سەرچاوە دەگرێت هەروەها دەروازەكانی پێغەمبەرایەتی و دوارۆژیش ... لەخۆی دەگرێت.

ئامانجی بریتیەلە: چەسپاندنی بیروباوەڕەی ئایینی بە بەلگە دلنیاكەرەوەو یەقینی و گومان هەلێنەگرەكانی و ڕێنمایی كردنی دینداران بە ڕوونكردنەوەی بەلگە بۆیان و پابەندكردنی بێ باوەڕان بە بەرپاكردنی بەلگە لەسەریان و پاراستنی بنچینەكانی ئایین نەوەك گومانەكانی بێ باوەڕان جێ پێ لەق بكەن.

ئەو زانستەی كە لە بنەما بیروباوەڕییەكاندەكۆلێتەوە بریتیەلە- زانستی بنەماكانی ئایین (أصول الدین).

### ١- ناوەكانی ئەم زانستە و هۆیەكانی:-

ئەو زانستەی كە لە بیروباوەڕە ئایینیەكان دەكۆلێتەوە بەچەند ناوێك ناونراوە:-

أ- **الفقه الأكبر**:ئیمامی ئەبوحەنیفە ئەو ناوەی لێناوەو بۆدانـاوە لە كتێبەكەی خۆید (الفقه الاكبر)[1] باسی كردووە كە: ( تێگەیشتن لە ئایین چاكترە لە تێگەیشتن

(١) كتێبێكی بچوكە، چەند شرۆڤەیەكی بۆ كراوەو چەند جارێك چاپ كراوە.

له زانست، چونكه تێگەیشتن لـه ئـایین بنچـینه (اصل)ە، و تێگەیشـتن لـه زانسـت لـق (فرع)ە، و پلەوپایەی بنچینه بەسەر لق و پۆپدا شتێكی زانراوە).

ب- زانستی تێڕامان و بەڵگـه هێنانـەوه (علـم النظـر و الاسـتدلال): بۆیـه ئـەو نـاوەی لێنراوه، چونكه پشت دەبەستێت به پـەیڕەوی تێڕوانینـی هـزری، وبەڵگـه هێنانـەوەی عەقڵی وەك هۆیـەك بـۆ سـەلماندنی ئـەو بنەمایانـەی بیروبـاوەڕ بـه دەقـه ئایینیـەكان دەسەلمێنرێن بەكارهێناوە.

پ- زانستنی خوابەیـەكزانین (التوحید) و سـیفات (الصفات):بۆیـه بـەو نـاوه ناوبـانگی دەركـــردووه، چـــونكه ئەمانـــه نـــاودارترین بەشـــەكانیەتی، تەنانـــەت بابـــەتی خوابەیەكزانین و سیفاتی خوایی گرنگترین و ترسناكترین دەروازەو بابەتن.

ت- زانســتی بیروبــاوەڕ: بۆیــه بــەوناوه نــاونراوه، چـونكه هەڵدەسـتێت بــه لێكۆڵینـەوه لـه عەقیـدەو بیروبـاوەڕی ئـایینی، و سـەلماندنی بـه بەڵگـەی یـەقینی و گومان هەڵنەگر، و بەرگری كردن له بەرامبەر عەقیده و هزره دژەكانی.

چ- زانسـتی كـەلام: بـەهۆی چـەند هۆیەكـەوه بـەو نـاوه ناوبـانگی دەركـردووه گرنگترینیان ئەمانەن[(١)]:

١- گرنگترین بابـەت كـه ڕاجیـایی لێكەوتـەوه و مشـتومڕی زۆری لەسـەری بـوو لـه چـەرخی یەكـەم بـریتی بـوو لـه بابـەتی (كـەلامی خـوا) ئایـا هـەربوو (ئەزەلی)یـه و پەیوەسـته بـەزاتی خـوای گـەورەوه یـاخود بـەدیهێنراو و دروسـتكراوه؟ بۆیـه ئـەو زانسته ناونرا به گرنگترین بابەت لەناو بابەتەكانی.

٢- یاخود بەهۆی لێكۆڵینەوەو گفتوگۆ له نێوان هـەر دوولای وتوێـژكار دەسـتەبەر دەبێت، بەڵام جگەلەمه لەوانەیه به ڕامان و خوێندنەوەی كتێب بەدەست بێت.

٣- لەوانەیـه ڕاسـترین هۆكـار ئـەوەبێت كـه زانایـانی كـەلام دواون لـەو شـتەی كـه

---

(١) سەیری ئەم سەرچاوانه بكە: التفتازانی/ شرح العقائد النسفیة، ١٤، ١٥. و المواقف وشرحه. للسید شریف ١٦. و مصطفی عبدالرزاق/ تمهید لتأریخ الفلسفة الاسلامیة ٢٦٧. و عبدالرحمن البدوی/ مذاهب الاسلامیین ١/ ٢٨.

پێشینان لە هاوەڵان (صحابة) و شوێنكەوتووان (تابعين) لە ئاستیدا بێ دەنـگ بوونـە. دواون دژی بێ دەنگییە، و موتەكەلیمەكان لە بابەتانێك دەدوان كە پێویست بـوو لێـی بێ دەنگ بن وەك لاسایی كردنـەوەی پێشـینانی ئـایین كـە بـە ئەندازەیـەكی زۆر كـەم نەبێت ئەوا نەچوونەتە قوڵایی بابەتە بیرباوەڕییەكان.

و- بنــەماكانی ئــایین (أصـول الــدين): بۆیــە بــەوناوە نــاونراوە، چــونكە بنچــینەی زانیارییەكانی ئایینە و ئەو زانیاریانە لەسـەری بنیـاد دەنـرێن، و لەبەرئـەوەی ئـەركی ڕوونكردنــەوەی ئــەو شــتانە لــە ئەســتۆ دەگرێــت كــە لــە بنــەماكانی ئــایین و بنچینەكانیەتی كە بەنـەبوونی بـاوەڕ دانامـەزرێت. لـە بەرامبـەر زانسـتی (فیقـه) كـە هەڵدەستێت بـە ڕوونكردنـەوەی لایەنـە ناسـەرەكی (فروع)یـە كرداریيـەكانی ئـایین، و لەبەرامبەر زانستی ڕەوشت و تەصەوف كـە گرنگـی دەدات بـە لایـەنی ڕەوشـت لەسـەر بنچینەی چێژی ڕۆحی و ویژدانی دەروونی و دڵ.

بۆیە ئەو ناوەمان هەڵبژارد و كردمانە ناونیشانی ئـەم كتێبـە، ئامانجمـان جـەخت كردنەوەیــە لــە لێكۆڵینــەوەی بنــەماكانی ئــایین، نــەك لێكۆڵینــەوە لــە بنــەما مەزهەبیەكان، و بابەتە لاوەكیەكان چ تیۆری بن یان كرداری.

## ٢- پێناسەی زانستی بنەماكانی ئایین:-

بـەو پێیـەی كـە وشـەیەكی لێكـدراوی پـاڵ یەكـە، كـە وشـەی بنـەماكان (أصـول) خـراوە پاڵـە (مضـاف)، و وشـەی ئـایین (الـدين) پـاڵی دراوەتـە پـاڵی (مضـاف اليـه)، ئەمەش بەوە دەبێت هەر وشەیەك بەتەنیا پێناسـە بكـرێن (لـە ڕووی زمـان) و دووەم جار پێناسەی بكەین بەوەی ناوێكـە بـەكاردێت بـۆ زانسـتێكی تایبـەت لـە زانسـتەكانی ئایین (لەڕووی زاراوە).

**بنەماكان ( أصول ):-**

كۆیە، تاكەكەی بریتیەلە بنـەما (أصـل) مانـا زمانەوانییەكـەی بریتیـە لـەوەی كـە جگەلەخۆی شتێكی دیكەی لەسەری بنیاد دەنرێت. جا ئـەو بنیادنانـە چ بەرجەسـتە بێت، وەك: ئەو بناغەیەی خانوی لەسەر دروست دەكرێت یـاخود بنیاتنانەكـە عـەقڵی بێت، وەك: بنیاتنانی حوكمە لاوەكی و بەشییەكان (فرعيات و جزئيـات) لەسـەر ڕێسا

(قواعد)ە گشتیەكان. زانایان دەستكاری وشەی بنەما (أصل)یان كردووە و لە مانا زمانەوانییەكەی كە ئاماژەكانی حەقیقین بەكاریان هێناوە بۆ چەند مانایەكی خوازراو (مجازی) مەجازی بەكاریان هێنانەوە. گرنگترینیان[1]:

وەك: ئەوەی بەرامبەر لق (فرع)، ڕێسا (القاعدة)، بەڵگە (الدلیل)، پەسندترین ڕاو بۆچوون (الراجح من الأمور) بەكار هاتووە.

وشەی بنەما (أصل) لەو زانستەدا بە مانا زمانەوانییەكەی بەكاردێت، واتە: ئەوەی كە جگەلەخۆی لەسەری بنیاتدەنرێ، ئەمەش لەبەر ئەوەیە كە بەشەكانی تری ئایینی لەسەر بنیاتدەنرێ.

دروستیشە بە مانا خوازراو (مجازی)یەكەی یەكەم بەكاربێت، واتە: ئەوەی بەرامبەری لق (فرع)ە. چونكە بنەما (أصل) لەبەرامبەر زانستەكانی تری شەریعەتە. بە مانای خوازراو (مجازی) دووەمیش بەكاردێت، واتە: ئەو بنچینەیەی كە جگەلەخۆی لەسەری بنیاتدەنرێ، لەبەرئەوەی جگەلە بنەماكانی ئایینی لەسەر بنیاتدەنرێت.

## ئایین (الدین):-

ناوێكی گشتییە لە زمانەوانیدا بۆ هەموو ئەو شتانەی كە خوای پێ دەپەرسترێت، هەروەك بۆ چەند مانایەكی جیا جیاش بەكاردێت، وەك: گوێڕایەڵی و ملكەچی و تەسلیم بوون، و بەمانای باڵادەستی و سامان و دەسەڵاتداری، و سزاو پاداشت، و نەریت و عادەت و دادوەری (القضاء) و مەزهەب و میللەت و بەرنامە (شەریعەت)یش بەكاردێت[2].

دەكرێ ئەو مانا جیایانەی وشەی ئایین بگەڕێنرێنەوە بۆ سەر سێ واتا كە نزیك و

---

(١) سەیری ئەم سەرچاوانە بكە: (قاموس المحیط مادة (أصل) و ارشاد الفحول ٣ و مباحث الحكم عند الأصولیین ٨ لمحمد سلام مدكور و الأصول العامة ٣٩ لسید محمد تقی الحكیم.

(٢) سەیری: قاموس المحیط و لسان العرب و دائرة المعارف القرن العشرین ١٠٦/٤. بكە.

پەیوەست بن بەیەكەوە، جیاوازی نێوان ئەو واتایانە بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە كە وشەی ئایین (الدین) لە ڕاستیدا یەك وشە نیە، بەڵكو سێ وشەیە، بە دەربڕینێكی ڕوونتر سێ فرمان (فعل) لەخۆی دەگرێت بە نۆرە.

ڕوونكردنەوەی ئەمەش بەوەیە كە وشەی ئایین (الدین) جار وایە لە فرمانێكی تێپەڕی لە خودی خۆی (متعدی بنفسە) (دانە یدینە)وەردەگیرێت: دەستی خست و بەڕێوەی برد، جارێكیش بە فرمانێكی تێپەڕ بە لام (دان لە): بۆی ملكەچ بوو، جارێكیش بە فرمانی تێپەڕ بە (ب) (دان بە): خۆی پێ ڕازاندەوە.

١- ئەگەر وتمان (دانە دیناً): مەبەستمان لەوە ئەوەیە كە كردی بە موڵكی خۆی و حوكمی كرد و بەڕێوەی برد و مشوری خوارد و زاڵبوو بەسەری و لێی پرسییەوە و بڕیاری لەبارەوە دا و پاداشتی دایەوەو بەخششی پێدا. جا وشەی (الدین) لەو شێوازە بەكارهێنانەدا دەخولێتەوە لە دەوری مانای سامان و موڵك و دەستكاری تێداكردنی هەروەك ئەوەی پاشاكان دەیكەن: لە سیاسەت و مشورگێڕی و حوكم و زاڵ بوون و لێپرسینەوەو پاداشت.وەك: ﴿ مَـٰلِكِ يَوۡمِ ٱلدِّينِ ﴿٤﴾ ﴾ الفاتحة: ٤. وشەی (الدین) لەم ئایەتەدا بە واتای: ڕۆژی لێپرسینەوە و پاداشت و سزایە، لە فەرموودەشدا هاتووە: (الكيس من دان نفسه، و عمل لما بعد الموت، والعاجز من أَتْبعَ نفسه هواها، و تمنى على الله الأمانيّ)(١) واتە: زیرەك ئەوەیە كە نەفسی خۆی بگرێتەوەو كار بكات بۆ دوای مردنی، دۆڕاو و دەستەوەسانیش ئەوەیە كە جڵەوی دابێتە نەفسی خۆی ئەویش بەدوای هەواو ئارەزووەكانی كەوتبێت و كاری بریتیبێت لە هیواو ئاوات خواستن. (دان) واتە: جڵەوكەی گرتە دەست و ڕێكی خست. و (الدیّان) واتە: ناوبژیوانی دادوەر (الحكَم القاضي).

٢- ئەگەر وتمان (دان لە) مەبەستمان ئەوەیە كە گوێڕایەڵ و ملكەچی بوو. ئایین

---

(١) أحمد و ترمذی و ابن ماجە و الحاكم لە (المستدرك) دا لە (شداد)ی كوڕی (أوس)یان گێڕاوەتەوە، و ئەم فەرموودەیە ڕاست (صحیح)ە / الجامع الصغیر ٢/٩٨.

لێرەدا بریتیە لە ملكەچی و گوێڕایەڵی و پەرستش و لەخواترسان.

٣- ئەگەر وتمان (دان بالشيء) ئەوا ماناكەی ئەوەیە كە ئەو شتەی كردووەتە ئایین و مەزهەبی خۆی. واتە باوەڕی پێیەتی یان خووی پێوەگرتووە یان خۆی پێ ڕازاندۆتەوە.

جا لەسەر ئەمە ئایین بریتیە لە مەزهەب و ڕێباز كە مرۆڤ بە تیۆری و بە كرداری گوزەری بەسەردا دەكات. مەزهەبی كرداری لەلایەن هەموو تاكێك نەریت و ڕێڕەو (سیرة)ەكەیتی، وەكدەوترێت: (هذا دینی و دَیْدَنی) واتە: ئەمە ئایین و نەریت و خووی منە. مەزهەبی تیۆریش لای ئەو بریتیە لەو بیروباوەڕو بۆچوونەی كە هەیەتی. وەك ئەو وتەیە: (دَیَّـتُ الرّجـلَ) واتە: ئەوم سپارد و دامە دەست ئایینەكەی. و شتێكی لێ بەناپەسەند نەزانی كە بە ڕەوای بزانێت بە بیروباوەڕی خۆی.

شاراوە نییە كە ئەو بەكارهێنانە پەیوەستە بە دوو جۆر بەكارهێنانەكانی پێشوو، چونكە ئەو نەریت (عادەت)ە یان ئەو بیروباوەڕەی كە مرۆڤ هەیەتی ئەوا دەسەڵاتی هەیە بەسەریدا تا وای لێدەكات ملكەچی باوەڕەكانی بێت و پەیوەست بێت بە شوێنكەوتنی.

پوختەی قسان لەسەر ئەو مانا زمانەوانیانە، ئەوەیە كە وشەی ئایین (الدین) لەلایەن عەرەب ئاماژە دەكات بۆ پەیوەندی نێوان دوو لایەن، كە یەكێكیان ئەویتر بەگەورە دەگرێت و بۆی ملكەچ دەبێت. جا ئەگەر لایەنی یەكەم بەوە وەسف كرا ئەوا دەبێتە ملكەچ و تەسلیم بوون. ئەگەر لایەنەكەی تر پێی وەسف كرا ئەوا واتای دەبێتە فەرمان و دەسەڵات و حوكم و پابەندكەر. ئەگەر لە میانەی ئەو وشەیە سەیری بەستەری كۆكەرەوەی نێوان هەر دوولایەنە بكەین ئەوا دەبێتە ئەو دەستورەی كە پەیوەندی نێوان هەردوولا ڕێك دەخات و ئەو ڕوخسارە دەخاتەڕوو.

ئێستا دەتوانین بڵێین: پێكهاتەی وشەكە هەر هەمووی لەدەوری ئەوە دەخولێتەوە كە پێویست بوونی ملكەچ بوونە، چونكە لە بەكارهێنانی یەكەمدا ئایین واتە پابەندكردنی بەوەی ملكەچ بێت، لە بەكارهێنانی دووەمدا بریتیە لە

ملکەچ بوون، لە حاڵەتی سێیەمدا ئەو بنەمایە دەگەیەنێت کە پێویستە ملکەچی بۆی بنوێنرێت.

ئەوەی مەبەستمانە لەو هەموو مانا بەکارهێنراوانە ئەوا دوو ماناکەی کۆتاییە، بەتایبەتیش بەکارهێنانی سێیەم. جا وشەی ئایین واتە ئەو ڕاستی و حەقیقەتە دەرەکییەی کە هەر ئومەتێك لە ئومەتەکان دەکرێت بۆی بگەڕێتەوە لەو بنەمایانەی کە ئاییندارى پێوەدەکات چ بیروباوەڕ بێت یان کردارو ڕەفتار[1].

ئەوەی خستمانەڕوو بریتیبوو لە مانای وشەی ئایین (الدین) و بنچینەکەی لە زمانەوانیدا.

بەڵام لە نەریتی خەڵك و زاراوەیاندا، ئەوا ئیسلامییەکان پێناسەیان کردووە بەچەند پێناسەیەکی لەیەك نیزك لەڕووی دەربڕینەوە و هەر یەك مانا دەدەن بەدەستەوە، کە بریتین لەمانە:-

١- ئایین: پەیامێکی دانراوی خواییە کە ڕێنمایی دەکات بۆ ڕاستی و حەق لە بیروباوەڕ، بۆ چاك هەڵسوکەوت و ڕەفتارو سەوداکردن.

٢- ئایین: پەیامێکی دانراوی خواییە، کە خاوەن و عەقڵەکان ئاراستە دەکات، ئەمەش دوای ڕازی بوونی عەقڵمەندەکان بەوەی ئایینیان وەك پێشڕەو دەستنیشان کردووە بۆ ئەوەی بیان بات بەرەو حاڵێکی چاك و دەرەنجامێکی سەرکەوتوو.

تێبینی دەکرێت کە پێناسەی ئیسلامییەکان بۆ ووشەی ئایین کورت هەڵاتووە لە ئایینی ئاسمانی، لەبەر ئەوەی وشەی (پەیامی خوایی)یان بەکارهێناوە وەك قەیدو بەندێك لەگشت پێناسەکاندا. وەك ئەوە وایە کە ئەوان ئایینە داهێنراوو (دەستکردەکان) بە ئایین ناونەبەن، کە مرۆڤ بەخۆی دای ڕشتووە لە ڕێگەی هۆکاری مرۆیی وەك: ئایینی بتپەرستی و بوزی، لەگەڵ ئەوەی قورئانی پیرۆز بە ئایین ناوی بردوون، وەك دەفەرموێت:﴿ وَمَن يَبۡتَغِ غَيۡرَ ٱلۡإِسۡلَٰمِ دِينٗا فَلَن يُقۡبَلَ مِنۡهُ وَهُوَ فِي

---

(١) سەیری: د. محمد عبالله دراز/ الدين ٢٥. بکە.

ٱلۡأٓخِرَةِ مِنَ ٱلۡخَٰسِرِينَ ﴿٨٥﴾ ﴾ آل عمـران: ٨٥. واتــه: (ئــەوەی جگەلــە ئــایینی ئیســلام پەیڕەوی هەر ئایینێكی تر بكات لێی وەرناگیرێت، لە قیامەتیشدا لە خەسارەتمەندو زەرەرمەندانــە). هــەروەها دەفــەرموویت: ﴿ لَكُمۡ دِينُكُمۡ وَلِيَ دِينِ ﴿٦﴾ ﴾ الكـافرون: ٦. واته: (دینی خۆتان بۆ خۆتان و دینی خـۆم بـۆ خۆم).لەگـەڵ ئەوەشـدا ئیسلامییەكان پێناسـەی ئایینیـان كـورت كردۆتـەوە لـە ئـایینی ڕاسـت و دروسـت[1]، كـە ئـایینی دابەزێنراوە،بەڵام ئایینە دەستكردەكان بە تێڕوانینی ئیسلامیەكان پوچ و بـێ بنـەمان بەبێ لەبەرچاو گرتنی ناوەڕۆك و پێكهاتەكەی.

زۆرێك لە ئیسلامیەكان چـەمكەكانی: ئـایین و ئیسلام و ئوممـەت و شـەریعەت و مەزهـەبیان بـە هاومانـا (مـترادف) دانـاوە، دەیـانبینی كـە دەڵـێن: ئـایینی ئیسـلام،

---

(١) زانایانی ئیسلامی ئایینیان بۆ دوو جۆر دابەش كردووە:-

أ- ئایینە ڕاست و دروستەكان: كە بریتین لەو ئایینانەی كە لەلایەن خواوە هاتوون، كە داوا لە شوێنكەوتووانی دەكەن تەنها خوای گەورە بپەرستن كە هەر ئەو خوایە، و فەرمانیان پێدەكات بە خۆڕازاندنەوە بە ڕەوشتی چاك و بەرز، و پابەندیان دەكات بە چەند جۆرێكی پەرستش و نەریت و دروشم، و كاری سەوداگەری و پەیوەندییەكانیان ڕێكوپێك دەكات...

ب- ئایینە پوچ و بێ بنەماكان: كە پێك دێن لە ئایینە سروشتی و داهێنراو دەستكردەكان، كە مرۆڤ - چ تاك یان كۆمەڵ - دایناوە بۆ بەڕێوەبردنی خەڵكی و ڕێكخستنی كاروباریان. مێژوونوسە ئایینەكان لە موسڵمانان ئەوانەی دەچنە ناو چوارچێوەی ئایینی ڕاست ناویان ناوە: (أهل الملل) واته: شوێنكەوتووی ئایینی ڕاست. (ملل: كۆی: "ملة"ە واته: ئایین - وەرگێڕ -). شوێنكەوتووانی ئایینی پوچ و بێ بنەماشیان ناوناوە (أهل النحل) واته: شوێنكەوتووی بانگەشەو ڕێبازی دەستكردی خۆی. (نحل: كۆی: "نحلة"یە: واته: ڕێبازو باوەڕ. -وەرگێڕ-). شهرستانی لە كتێبەكەیدا (الملل و النحل) و ئیبن حزم لە كتێبەكەی دا (الفصل في الملل و الاهواء و النحل) ئەو دوو چەمكەی بەكارهێناوە. شهرستانی ئەهلی كیتاب و موسڵمانەكانی بە ئەهلی (ملل) داناوە، بەڵام صابیئەكان و بتپەرست و ئەستێرە پەرست و بەراهیمەكانی بە ئەهلی (نحل) داناون. سەیری: شهرستانی - الملل و النحل ١/ ٤٤، و ئیبن حزم - الفصل في الملل و الاهواء و النحل ٩٥/١. بكە.

**ئوممەتی ئیسلام، شەریعەتی ئیسلام، مەزهەبی ئیسلام[1].**

**لە ڕاستیدا چەمكی ئایین فراوانترە لەهەموو ئەو چەمكانەی باسكران و لە ئیسلامیش فراوانترە، چونكە ئیسلام ئایینە، و هەموو ئاینێكیش ئیسلام نیە. و فراوانتریشە لە ئوممەت و شەریعەت، چونكە ئەمانە دوو ناون بۆ پەرستش و ڕەفتارو سەوداكردن كە بیروباوەڕو عەقیدە لەخۆ ناگرێت. وە فراوانتریشە لە مەزهەب، چونكە واتای مەزهەب بریتیەلە كۆی ڕاو بۆچوونە ئیجتهادییەكان كە هەندێ لە زانایانی موسڵمانان هەڵیانهێنجاوە و زۆربەی كاری پێدەكەن وەك مەزهەبە ناسراوەكان.**

**ئەوەی باسمان كرد پێناسەی ئایین بوو بەشێوەیەكی گشتی. بەڵام ئایین بەشێوەیەكی تایبەتی بریتیە لە ئیسلام، كە ئەمەیە مەبەستمان لەو لێكۆڵینەوەیەدا، خوای پاك و بەرز فەرموویەتی: ﴿ وَرَضِيتُ لَكُمُ ٱلۡإِسۡلَٰمَ دِينٗا ﴾ المائدە: ٣. واتە:(ڕازیم بەوەی كە تەنها ئیسلام ببێتە بەرنامەو دین و ئاینتان). هەروەها خوای پاك و تاك فەرموویەتی:﴿ إِنَّ ٱلدِّينَ عِندَ ٱللَّهِ ٱلۡإِسۡلَٰمُ ﴾ آل عمران: ١٩. واتە: (بەڕاستی دین و ئاینی پەسەند لای خوا تەنها ئایینی ئیسلامە). و دەفەرمووێت: ﴿ هُوَ ٱلَّذِيٓ أَرۡسَلَ رَسُولَهُۥ بِٱلۡهُدَىٰ وَدِينِ ٱلۡحَقِّ لِيُظۡهِرَهُۥ عَلَى ٱلدِّينِ كُلِّهِۦ ﴾ الفتح: ٢٨. واتە: (خوا ئەو زاتەیە كە پێغەمبەری خۆی ڕەوانە كردووە، هاوڕێ لەگەڵ ڕێنمووی و پەیامی ڕاست و دروستدا، بۆ ئەوەی زاڵی بكات بەسەر هەموو پەیام و بەرنامەیەكی تردا).**

**مانای وشەی ئیسلام لە زمانەوانیدا بریتیە لە گوێڕایەڵی و تەسلیم بوون و ملكەچی و دەستەوەسانی نواندن، هەروەك بەمانای سەلامەتی و ئارامی دێت.**

**بەڵام مانای ئیسلام لە نەریتی خەڵك و زاراوەكانی بریتیە لەو ئاینەی كە خوای گەورە داینـاوەو ناردوویەتی بۆ بەندەكانی لەسەرزمانی كۆتا پێغەمبەر محمد (ﷺ)یان ئەو ئاینەیە كە خوای گەورە لە ڕێگای سروش (وحی) ناردوویەتی بۆ**

(١) سەیری: التعریفات ٩٤ دانراوی: جرجانی. بكە.

**محمد** (ﷺ).

**موسڵمانیش ئەو کەسەیە کە تەسلیم بووەو ملکەچە - لە ڕووکەشدا - بۆ ئەو پەیامەی پێغەمبەری بەڕێز هێناویەتی.**

**ئەو کەسەش کە بە ئەندامەکانی دیارو ڕووکەشی ملکەچ دەبێت و بە دڵیش ئەو پەیامە بەڕاست دادەنێت کە پێغەمبەر هێناویەتی ئەوا (باوەڕداره).**

**کەواتە: باوەڕ بریتیە لە: (دانپێدانان بە زمان و بەڕاست زانینی دڵ و دەروون)، زۆربەی موسڵمانان ئەوەشیان خستەپاڵ (کارکردن بە ئەندامەکان)، هەندێکیان بۆ ئەوەچوون کە کردار پێویستیەکە لە پێویستیەکانی باوەڕ نەوەك بەشێك بێت لێی.**

**لەبەر ئەوە ئەو ئاینە ناونراوە بە ئیسلام، چونکە خوای پاك و بەرز فەرموویەتی:** ﴿ وَرَضِيتُ لَكُمُ ٱلۡإِسۡلَٰمَ دِينًا ﴾ المائدة: ٣. **واتە: (ڕازیم بەوەی کە تەنها ئیسلام ببێتە بەرنامەو ئاینتان). هەروەها دەفەرمووێت:** ﴿ إِنَّ ٱلدِّينَ عِندَ ٱللَّهِ ٱلۡإِسۡلَٰمُ ﴾ آل عمران: ١٩. **واتە: (بەڕاستی ئایینی پەسەند لای خوا تەنها ئایینی ئیسلامە).**

**دوای ئەوەی تەواوبووین لە پێناسەی چەمکی: بنەماکانی ئاین (أصول الدين) وەك چەمکێکی لێکدراوی خراوەپاڵ، دەچینە سەر پێناسەی ئەو چەمکە وەك ناوێك بۆ زانستێکی تایبەت لە زانستەکانی ئایین.**

**زانایان ئەو زانستەیان بە شێوەی جیا جیا پێناسە کردووە، کە بەڵگەیە لەسەر جیاوازی تێڕوانینیان:-**

**١- عضدالدين الايجي (لە ٧٥٦ککۆچی دوایی کردووە) بەو شێوەیە پێناسەی کردووە:-**

**(زانستێکە بەهۆیەوە دەتوانرێت بیروباوەڕو عەقیدەی ئایینی بچەسپێنرێت بە خستنەڕووی بەڵگە و لادانی گومانەکان.**

**مەبەست لە بیروباوەڕ خودی بیروباوەڕە نەك کردەوە. و مەبەست لە ئایینی ئەوەیە کە دراوەتە پاڵ پێغەمبەر محمد (ﷺ).جا ئەوەی دژەڕامانە ئەگەر بە**

هەڵەشی دابنێین، ئەوا نایخەینە دەرەوەی چوارچێوەی زانایانی کەلام)[1].

٢- تهانوی (لە ١١٥٨ك کۆچی دوایی کردووە) بەوە پێناسەی کردوووە:-

(بێگومان زانستێکە بەهۆیەوە دەتوانرێت سەلماندنی بیروباوەڕە ئایینەکانئەنجام بدرێت لە بەرامبەر کەسی تر بەهێنانەوەی بەڵگەی جیا جیا و پوچەڵ کردنەوەی گومانەکان، هەروەها لە هەڵبژاردنی سەلماندنی بیروباوەڕەکان بۆ بەدەست هێنانی، ئەمەش ئاماژەیەکە بەوەی کە بەرهەمی زانستی کەلام سەلماندنیەتی لەسەر کەسی تر، بەوەش کە بیروباوەڕ دەبێت سەرچاوە بگرێت لە شەریعەت بۆ ئەوەی سەنگی شەرعی هەبێت، ئەگەرچی لە خودی خۆیدا لەو شتانەیە کە لە تایبەتمەندی عەقڵە)[2].

٣- شێخ محمد عبده (لە ١٩٠٥زکۆچی دوایی کردووە) بەوە پێناسەی کردووە:-

(خوابەیەکزانین: زانستێکە لە بوونی خوا و ئەوەی پێویستە بدرێتە پاڵی و ئەو شتەی دروستە پێی وەسف بکرێت، و ئەوەش کە پێویستە بۆی بەکار نەهێنرێت دەکۆڵێتەوەلە پێغەمبەران بۆ سەلماندنی ڕاستی پەیامەکان و تایبەتمەندییەکانیان و ئەوەی دروستە بدرێتە پاڵیان و ئەو شتانەی کە پێویستە نەدرێتە پاڵیان)[3].

٤- محمد فرید وجدی (لە ١٩٥٢زکۆچی دوایی کردووە) پێناسەی کردووە:-

(زانستی (أصول الدین): زانستێکە لەو بۆچوون و تێڕوانین و بیروباوەڕانە پێکهاتووە کە پێغەمبەر (ﷺ) بەڕاشکاوی دەری بڕین و بە بەڵگەی گومان هەڵنەگر و یەقینیچەسپاندی سەریشی خست، هەموو ئەو شتانەشی کە پێچەوانەی بوون پوچەڵی کردەوە)[4].

لە پێناسە و دەربڕینە جیاوازەکانی زانایان بۆ بابەت و باس و ئەرکی زانستی

---

(١) المواقف ١/ ٣٤.

(٢) كشاف اصطلاحات الفنون ١/ ٢٠.

(٣) رسالة التوحيد ٧.

(٤) دائرة المعارف القرن ١٤ك ٢٠ز ٦/٦٢٠.

**بنـەماکانی ئـایین (أصـول الـدین) کـە ناسـراوە بـە (زانسـتی کـەلام) ئـەوا چـەند شـتێ بەدەست دێت، گرنگترینیان:-**

**١- زانستی بنەماکانی ئایین (أصول الدین) پشت دەبەستێت بـە پـەیڕەو مەنهـەجی تێـڕوانین و بەڵگەهێنانـەوەی عـەقڵی وەك هۆیـەك بـۆ چەسـپاندنی بیروبـاوەڕو عەقائیدی ئایینی کە لەڕێی سروش (وحی) دەچەسپێت.**

**٢- ئـەرکی سـەرەکی زانسـتی بنـەماکانی ئـایین (أصـول الـدین) بریتیـە لـە بەڵگـە هێنانەوەی عەقڵی لەسەر دروستی بیروباوەڕی ئیمانی، و لادانی گومانی دوژمنانە.**

**٣- ڕاجیـایی هەیـە لەسـەر ئـەوەی کـە ئایـا ئـەو زانسـتە بیروبـاوەڕی ئـایینی دەچەسپێنێت هـەروەك چۆن بەرگریشی لێ دەکات یـان ئـەرکی بریتیـە لـەوەی دان بنێت بەوەی سروش هێناویەتی و گومان و شـوبهە لابـدات لەسـەر ئـەوەی بـە سـروش (وحی) چەسپاوە.**

**خاڵی ڕاجیایی لەوەدایە: کە بیروبـاوەڕ و عەقائیـدی ئیمـانی بـە شـەرع یـان بـە عـەقڵ چەسـپاون؟ پێشـینان (سـلف)[1] و ئـەهلی سـوننە[1] بۆچـوونیان وایـە کـە بەشـەرع**

---

(١) پێشینان (سلف): بریتیە لە هاوەڵانی پێغەمبەر (ﷺ) و شوێنکەوتووانیان، و سەلەفیەکانیش: سەلەفیەکانیش: کۆمەڵێکی ئیسلامین ویستیان وابوو کە لێکۆڵینەوە لە بابەتی عەقائید بگەڕێتەوە بۆ ئەو حاڵەت و بارودۆخەی کە هاوەڵان و شوێنکەوتووان لەسەری بوون. و لەبەر ئەمەش ئەو دروشمەیان دووپات دەکردەوە کە هیچ ڕێگەیەك نیە بۆ زانینی عەقائیدی ئیمانی و گشت ئەحکام و یاساکانی تری شەرعی تەنها ڕێگەی قورئان و سوننەت نەبێت، و دەسەڵاتی عەقڵیش کورت دەکەنەوە لەوەی ملکەچ و دانپێدانەر بێت و ئەو دەقانەی گێڕدراونەتەوە شیان کاتەوە. تێکگیران نییە لە نێوان عەقڵ و دەق. عەقڵ دەبێتە گەواهیدەر نەوەك دادوەرو دەبێتە دانپێدانەر نەوەك هەڵوەشێنەرەوە، ئەو کۆمەڵەیە لە سەدەی چوارەمی کۆچی لەناو حەنبەلیەکان دەرکەوتن، دواتر لە سەدەی حەوتەمی کۆچی ئەو ڕێبازەیان زیندوو کرایەوە لەسەر دەستی شێخ ئیسلام "ئیبن تیمیە" کە زۆر بەتووندی بانگەشەی بۆ ڕاو بۆچوونەکانی ئەوانی دەکرد، پاشان ئەو بۆچوون و تێڕوانیانە دەرکەوتن لە دوورگەی عەرەبی لە سەدەی

چەسپاوەو ئەركی عەقڵ بریتیە لە تێگەیشتن لە شەرع و بەڵگە هێنانەوە لەسەری و لادانی گومانەكان.

ئەوانەی دەڵێن بە عەقڵ چەسپاوە، بریتیت لە: عەقڵانیەكان و لە سەروشیانەوە موعتەزیلەكان[2] و شیعە[3] ئەركی دەقە شەرعیەكانیان لەوە كورت كردەوە كە

---

دوازدەهەمی كۆچی لەسەر دەستی شێخ ((محمدی كوڕی عبدالوهاب))، و ئێستاش وەهابیەكان لەسەری بەجۆش و خرۆشن و بانگەشەی بۆ دەكەن.

(١) ئەهلی سوننە و جەماعە: زۆربەی موسڵمانان پێك دێنن و ڕێبازەكەیان لە چەسپاندنی عەقائید و دانپێدانانی وەك سەلەفیەت بوو، تا أبو حسن الأشعری هات (٢٦٠ك - ٣٢٤ك) و دەستی كرد بە سەرخستن و پشتگرتنی ڕاو بۆچوونەكانی ئەهلی سوننە بە بەڵگەی عەقڵی و دەمەتەقێی دەكرد لەگەڵ دژەڕاكانی ئەهلی سوننە كە موعتەزیلەكان بوون بە پشت بەستن بە بەڵگەی عەقڵی و نەقلی (كە قورئان و سوننەتە - وەرگێڕ -)، جا مەزهەبی ئەشعەری بڵاوبووەو پەرەی سەند، وای لێهات كە لەناو ئەهلی سوننەدا ئەو ڕایە ڕای زۆرینە و زاڵبوو بێت هەتا ئەمرۆش. و لە دیارترین كەسەكانی الغزالي و الباقلاني و الفخر الرازي و امام الحرمین.

(٢) موعتەزیلە: دەستەو تاقمێكی ئیسلامیە، ڕێبازیان لە زانینی عەقائید و چەسپاندنی و بەرگری لێكردنی عەقڵی بوو، متمانەیان ئەوەندە بە عەقڵ هەبوو هیچ شتێك سنوری بۆ دیارنەدەكرد تەنها ئەو ڕێزە نەبێت كە بۆ فەرمانەكانی شەرع هەیانبوو، جا هەر مەسەلەیەك لە مەسەلەكان ئەوا دەخەنە بەردەم عەقڵ جا هەر شتێ عەقڵ قبوڵی كرد ئەوانیش دانی پێدا دەنێن، و هەر شتێكیش عەقڵ قبوڵ نەكات تەئویلی بۆ دەكەن. ئەمەش ناچاری كردن كە هەندێ دەقی ئایینی تەئویل بكەن كە وا بەدەردەكەوێت لە ڕووكەشدا پێچەوانەی مەسەلەكانی عەقڵن، و دەركەوتنی ئەو تاقمە لەسەرەتای سەدەی دووەمی كۆچی بوو، كەسە سەرەتاكانی بریتی بوون لە: واصلی كوڕی عطاء (٨٠ - ١٣١ك) و عمروی كوڕی عبید لە ١٤٢ك كۆچی دوایی كردووە.

(٣) شیعة الرجل: شوێنكەوتوو و پشتیوانەكانی، هەر هۆزێك لەسەر شتێك كۆببنەوە ئەوا پێیان ئەوترێت شیعە، بەڵام ناوی شیعە زیاتر بۆ ئەوانە بەكاردێت كە پشتی عەلی و خانەوادەكەی ئەویان گرتووە - خوا لێیان ڕازی بێت - تا وای لێهات بووە ناوێكی تایبەت بەوان.

داندەنێن بە بیروباوەڕو عەقائیدە ئایینیەكان بە بەڵگە عەقڵیەكان.

---

ئیبن حزم واتای شیعایەتی (تشیع)ی دیاریكردووە، هەروەك دەڵێت: ((هەر كەسێ بۆچوونی یەكبگرێ لەگەڵ شیعە لەوەی عەلی - ڕەزای خوای لێبێت - چاكترین كەسە لە دوای پێغەمبەری خوا (ﷺ) و خۆی و منداڵەكانی شیاوترینن بۆ ئیمامەت ئەوا ئەو كەسە شیعەیە، ئەگەرچی لە شتەكانی تردا وەك گشت موسڵمانانی تر لە شیعە جیاواز بێت، بەڵام ئەگەر لەوەی باسمان كرد لەگەڵ شیعە ڕای جیاواز بو ئەوا شیعە نییە)) الفصل: ٢/١١٣. و شهرستانی لە كتێبی (الملل و النحل: ١/١٩٥) پێناسەی كردوون: ((ئەوانەن كە پشتی عەلیان گرت بە تایبەتی -سەلامی لێ بێت - و بۆچوونیان وابوو كە دەق "نص" هاتووەو وەسیەت كراوە بەوەی ئەو ئیمامە جا چ بە ئاشكرا چ بە نهێنی، بڕوایان وابوو كە ئیمامەت تەنها لە ناو نەوەكانی ئەودا ئەبێت، جا ئەگەر ئیمامەتی بەدەر لەوان بوو یان بە ستەمەكارییە یاخود بە بەكارهێنانی توقیەیە لەلایەن ئەو نەوەیەی كە مافیەتی)).

مێژوونوسان لە كۆن و نوێیەوە ڕاجیان لەسەر دیاریكردنی كاتی سەرهەڵدانی شیعەگەری لە ئیسلامدا هەیە، كۆمەڵێك بۆ ئەوە چوون كە شیعەگەری لە سەردەمی پێغەمبەر (ﷺ) سەریهەڵداوە، (النوبختی) و (العاملی) ئەو بۆچوونەیان هەیە.

كۆمەڵێكی تر بۆ ئەوەچوون كە شیعەگەری دوای كۆچی دوایی پێغەمبەر (ﷺ) سەری هەڵداوە، لە دەرئەنجامی ئەوە كە كێ دەبێتە جێنشینی، ئەوانەی ئەو بۆچوونەیان هەیە: ابن خلدون و أحمد أمین، و هەندێ ڕۆژهەڵاتناسان بۆ ئەوەچوون كە شیعەگەری لەسەردەمی عوسمان - خوا لێی ڕازی بێت - سەری هەڵداوە هاوشان لەگەڵ جوڵانەوەی فیتنەكە، (ولهوزن) ئەو بۆچوونەی هەیە. و بۆچوونم وایە كە شیعەگەری وەك تاقمێكی ئایینی كەسایەتی سەربەخۆ و بیروباوەڕی تایبەتی هەیە و وەك بزوتنەوەیەكی سیاسی ئامانج و فەلسەفەی تایبەتی هەیە، كە لە ساڵی ٦٢ك لە دەست پێكدا لە بزوتنەوە تۆبەكاران (التوابین) پاش شەهید بوونی ئیمامی حسین - ڕەزای خوای لێبێت - سەری هەڵدا.

## دەروازەی دووەم

# میــژووی زانستی بنەماكانی ئایین

### سەرەتا:

بۆمـان دەركـەوت كـە (زانسـتی بنـەماكانی ئـایین)[1] لـەو زانسـتە ئایینیانەیـە كـە ڕەنـگ كـراوە بـە ڕەنگـی عـەقڵی. بابەتەكـەی زانـراوە كە پەیوەسـتە بـە چەسـپاندنی بیروبـاوەڕو عەقائیـدی ئـاینی. وە ئامانجیشـی بریتیـە لـە دان پێـدانان بـە عەقائیـدی ئیمانی و بەرگری لێ كردنی، زانستەكانی تری ئاینیش لەسـەری بنیاتـدەنرێن و لـق و پۆپ وەردەگرن، تەنانەت بنەمایە بۆ هەموو زانستەكانی ئایین.

ئـەوەی گومـان هەڵنـەگرە ئەوەیـە كـە (ئـەو جـۆرە زانسـتە ناسـراو بـووە لەلایـەن ئوممەتەكانی تـری بەر لە ئیسلام، تەنانـەت لـەناو هـەر ئوممـەتێك ئەوانـەی كاروبـاری ئایینیـان بـەڕێوەدەبرد ئـەوا تێدەكۆشـان لـە پێنـاو پاراسـتن و بـەرگری لـێ كردنـی، و یەكەم ڕێگەش كە دەیانگرتەبەر بۆ ئەم مەبەستە بریتی بـوو لـە ڕوونكردنـەوە، بـەڵام لەگەڵ ئەوەشدا كەم وابوو لـەم ڕوون كردنەوەیانـدا پەنابەرنـە بـەر بەڵگـەی عـەقڵی و كەم وابوو ڕاو بۆچوونیان بنیاتنابا لەسەر ئەو شتانەی كە لەناو سروشـت دا هـەن یـان ئەوەی سیستەمی بونەوەر لەخۆی دەگرێت، بەڵكو عەقڵەكان ململانێیان بـوو لـە شـتە زانستیەكان و ئاینیش تێدەكۆشا بۆ پابەندبوون بـە بیروبـاوەڕو عەقائیـدەكان و نزیـك خسـتنەوەیان لـە هەسـت و سـوزی دڵ ئەمـەش وای كـرد كـە پێچـەوانەی یـەك بـن) و پەیڕەویان لە دانەنان بە بابەتەكانی ئەو زانستە دەوەستایە سـەر تەفسیرو لێكدانـەوەی

---

(١) مەبەست لەو وشە و چەمكە ئەو زانستەیە كە لەو كتێبەدا هاتووە بەمانا زاراوەییەكەی كە لە دەقە كۆنەكاندا هاتووە كە بریتیە لە ((مەعریفە بەشێوەیەكی گشتی)) نەوەك مانا دیاریكراوەكە.

دەقەكان و تەئویل[(١)]كردنیان و قەناعەت هێنانی خەڵكی بە شتی دەراسا یان دروست كردنی خەیاڵات بۆیان[(٢)].

جا قورئانی پیرۆز هات و پەیڕەوێكی گرتە بەر لە ڕوونكردنەوەی ئایین بەشێوەیەكی گشتی و لە بواری عەقائیدیش پەیڕەوێكی تایبەت كە پێشتر كتێبە پیرۆزەكان لەسەر ئەم پەیڕەوە نەڕۆیشتوون، جا قورئانی پیرۆز تەنها باسی عەقائیدی ئیمانی نەكرد، و داوای لە خەڵكی نەكرد كە ملكەچ و تەسلیمی ببن لەبەر ئەوەی كە شت دەگێڕێتەوە، بەڵكو بەڵگەی خستەڕوو وەك پشتگیری، و لەهەمان كاتیشدا بیروباوەڕی دژەكانی خستەڕوو و بەڵگەشی هێنایەوە لەسەر پوچەڵیەكەی، و لەگەڵ عەقڵدا گفتوگۆی كرد و دوا، و فیكری بە ئاگا هێنایەوە، و سیستەمی بونەوەرو ئەو ڕێكوپێكی و جوانییەی تێدایە خستیە بەردەم تێڕوانینی عەقڵ، و

(١) واتای وشەی تەئویل: (وشەی تەئویل لە ئەصلی زمانی عەرەبی دا لە :(آل، یؤل، مآلاً، و تأولا) هاتوه، واتە: (رجع، یرجع، مَرْجعا) وشەی (مَرْجع) واتە: ئەو شوێنەی كە ئینسان بۆی دەگەڕێتەوە (مآل)یش هەر بەو مانایە دێت. وشەی تەئویل لەزمانی عەرەبی دا سێ واتا دەگەیەنێت: یەكەم: ئاكام و سەرەنجام (العقبة و المآل)، پەروەردگار بەم واتایەی بەكارهێناوە ﴿هَلْ يَنْظُرُونَ إِلَّا تَأْوِيلَهُ﴾ الأعراف:٥٢.واتە: ئایا كافرەكان چاوەڕێی چی دەكەن هەر چاوەڕێی ئەوە ناكەن كە ئاكام و سەرەنجامی ئەوەی قورئان دە فەرمووێ بێ!. دووەم: بەمانای لێكدانەوەو تەفسیر كردن دێت وەك خوای تاك و پاك فەرموویەتی:﴿وَمَايَعْلَمُتَ أْوِيلَهُ إِلَّااللَّهُ﴾ آل عمران : ٧. واتە: تەفسیرو لێكدانەوەی ئەو جۆرە ئایەتانە تەنیا خوا دەیزانێ. سێیەم: واتای تەئویل بریتیەلە: لادانی وشەیەك لەمانای ڕواڵەتی یان حەقیقی خۆی بۆ مانایەكی پەنهان یاخود مەجازی لەبەر بەڵگەیەك كە ڕێگەمان نادات ئەو وشەیە بە مانای حەقیقی یەكەی یاخود بەمانای ڕواڵەتیەكەی بەكاربێنین، وەك خوای كاربەجێ دەفەرمووێ: ﴿وَمَايَعْلَمُتَ أْوِيلَهُ إِلَّااللَّهُ وَالرَّاسِخُونَ فِي الْعِلْمِ﴾ آل عمران : ٧. دەگونجێ وشەی تەئویل لێرەدا بەو مانایەی سێیەمیشیان بێت). سەیری: (ئیمان و عەقیدەی ئیسلامی لەبەر ڕۆشنایی قورئان و سوننەت دا: م. عەلی باپیر، بەرگی سێیەم: خوا بەیەكگرتن لەناوو سیفەت و پەرستراوێتی دا، ١٥٥-١٦١) بكە. (وەرگێڕ).

(٢) سەیری: محمد عبده/ رساله التوحید ٨.

داواشی لێكرد كە لێی وورد بێتەوە تا بەوهۆیە بگاتە یەقین كە پەیامی قورئان ڕاستە و ئەو شتەی بانگەوازیشی بۆ دەكات دروستە.

مامۆستا (عقاد) لە كتێبەكەیدا (التفكير فريضة اسلامية) دەڵێت[1]:

(لە تایبەتمەندیە زۆرەكانی قورئانی پیرۆز، تایبەتمەندییەك هەیە كە ڕاجیایی لەسەر كەمتر دەبێتەوە لە نێوان موسڵمانان و غەیرە موسڵمانەكان، چونكە لە كاتی خوێندنەوەی ئایەتەكان قورئانی پیرۆز بەشێوەیەك ئایەتەكان دەچەسپێن كە ژمارەكانی ژمێریاری و ئاماژەو ماناكان پوخت و ساكارەكان پشتی ئایەتەكان دەگرن، بەر لە گەڕانەوە بۆ پشتگرتنی ئایەتەكان بۆ دەمەتەقێ و مەزهەبەكان كە ڕایەكان جیاوازن لەم بارەوە...

جا ئەو تایبەتمەندیەش بریتیە لە هۆشداری دان سەبارەت بە پلەی بەرزی عەقڵ و گرنگی دان پێی لە بابەتی بیروباوەڕ و عەقیدە و شوێنكەوتن و ڕاسپاردن، جا لە كتێبە ئایینیە گەورەكانی تردا ئاماژەی دیارو نادیار هەن بۆ عەقڵ یان هێز جیاكەرەوە، بەڵام بابەتەكە وەك پێویست باسی لێوە نەكراوە، تەنانەت خوێنەر لەهەندێك كاتدا ئەوەی تێدا بەدی دەكات كە گاڵتە و بێ ڕێزی بەعەقڵ دەكەن و هۆشداری دەدەن لەبارەیەوە، چونكە مەیدانی عەقڵ خلیسگە (مزلة)ی بیروباوەڕو عەقیدەیە و دەرگایەكە لەو دەرگایانەی كە بانگەشەی تری لێوە دەكرێ و خەڵكی بەهۆیەوە نكۆڵی دەكات...

بەڵام قورئانی پیرۆز كە باس لە عەقڵ دەكات بەوپەڕی ڕێزەوە لەبارەی دەدوێت و گەورەیی پلەوپایەكەی بەدەردەخات و تەنانەت ئاگاداریش دەدات كە پێویستە كار بە عەقڵ بكرێت و بۆی بگەڕێنەوە، و ئاماژە نەكراوە بە عەقڵ بەشێوەیەكی لاوەكی لە میانەی ئایەتەكەدا، بەڵكو لە زۆربەی ئەو جێگایانەی كە باسی عەقڵ دەكرێت بە جەخت لەسەر كراوەیی چ بە دەق چ بە مانا ئاماژەی بۆ كراوە، ئەم حاڵەتەش لە هەموو ئەو حاڵەتانە دووپات دەبێتەوە كە فەرمان و ڕێگری دەكرێت لە باوەڕدا لەو

(١) ٧ ، ٨.

شـتانەی کـه داوای لێکـراوه عـەقڵی خـۆی بكاتـه دادوەر یـان سەرزەنشـتی نكـۆڵی کـار دەكات بەهۆی ئەوەی عەقڵی فەرامۆش كردووە و دەرگاكانی داخستووه).

تێفكره لەو ئایەتانەی كه تیایدا خوای گەوره تێڕوانینی مرۆڤ ئاراسته دەكات بۆ ئەو شتانەی لەناو بونەوەر دان، هەر له بوون، و تەنانەت ڕێنمایشی دەكات بۆ ئەو ڕێگەیەی كه دەبێته هۆی ئەوەی باوەڕ بەخوای پاك و بەرز بێنێت، وەك:﴿ إِنَّ فِي خَلْقِ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ وَٱخْتِلَٰفِ ٱلَّيْلِ وَٱلنَّهَارِ وَٱلْفُلْكِ ٱلَّتِي تَجْرِي فِي ٱلْبَحْرِ بِمَا يَنفَعُ ٱلنَّاسَ وَمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ مِنَ ٱلسَّمَآءِ مِن مَّآءٍ فَأَحْيَا بِهِ ٱلْأَرْضَ بَعْدَ مَوْتِهَا وَبَثَّ فِيهَا مِن كُلِّ دَآبَّةٍ وَتَصْرِيفِ ٱلرِّيَٰحِ وَٱلسَّحَابِ ٱلْمُسَخَّرِ بَيْنَ ٱلسَّمَآءِ وَٱلْأَرْضِ لَأَيَٰتٍ لِّقَوْمٍ يَعْقِلُونَ ﴿١٦٤﴾ ﴾ البقرة: ١٦٤. واته: (بەڕاستی له دروست كردنی ئاسمان و زەوی و ئاڵوگۆڕی شەوو ڕۆژدا و لەو كەشتیانەی كه دەگەڕێن به دەریادا و بەهۆیەوه سوود به خەڵكی دەگەیەنن و لەو ئاوەی كه خوا له ئاسمانەوه دەیبارێنێت و ئینجا بەهۆیەوه زەوی پێ زیندوو دەكاتەوه دوای ووشك بوون و مردنی، هەروەها جۆرەها زیندەوەر و گیانلەبەر و مارو مێرووی لەسەر ڕووكاری زەویدا بڵاو كردۆتەوه و گۆڕاندن و هاتووچۆ پێكردنی باوو شەماڵ و ڕاگیر كردنی هەورەكان له نێوان ئاسمان و زەویدا، ئەمانه هەموو بەڵگەو نیشانەی بەهێزن بۆ ئەوانەی كه عەقڵ و بیروهۆشیان دەخەنەكارو بیر له دەسەڵاتی بێ سنووری خوا دەكەنەوه).

زیاتر له هەشـتا ئایـەت لـەو چەشـنه هـەن، کـه هەرهـەموویان سـەرنج ڕادەكێشـن بـەرەو دیاردەكـانی بـوون و بـەدیهێنراوان و شـته نـامۆو سـەر سـوڕهێنەكانی ژیـان و سیستەمی جیهان و ئەو ڕێكوپێكی و پەیوەندیه تۆكمەیەی هەیه له نێـوان بەشـەكانی دا. بەتایبـەتی بـۆ ئـەو پەیوەنـدیـه تۆكمەیـەی هەیـه لـه نێـوان جیهـانی هەسارەكان و جیهانی سەرزەوی، و ئەو هەڵبەزو دابەزەی مرۆڤ له ناو بووندا، پاشان داوا دەكـات كـه لەگشت ئەو دیاردانه تێفكیرن و ڕامان بێتـه كایـه کـه بەڵگـەن و دەكرێـت بەهۆیانـەوه بەرەو خوا مرۆڤ ڕێنمایی بكات و باوەڕ به پێغەمبەرانی بكات.

نمونەی ئەو ئایەتانه ئەو فەرمایشتەی خوایه، كه دەفەرمووێت:

﴿ إِنَّ ٱللَّهَ فَالِقُ ٱلْحَبِّ وَٱلنَّوَىٰ ۖ يُخْرِجُ ٱلْحَىَّ مِنَ ٱلْمَيِّتِ وَمُخْرِجُ ٱلْمَيِّتِ مِنَ ٱلْحَىِّ ۚ ذَٰلِكُمُ ٱللَّهُ ۖ فَأَنَّىٰ تُؤْفَكُونَ ﴿٩٥﴾ فَالِقُ ٱلْإِصْبَاحِ وَجَعَلَ ٱلَّيْلَ سَكَنًا وَٱلشَّمْسَ وَٱلْقَمَرَ حُسْبَانًا ۚ ذَٰلِكَ تَقْدِيرُ ٱلْعَزِيزِ ٱلْعَلِيمِ ﴿٩٦﴾ وَهُوَ ٱلَّذِى جَعَلَ لَكُمُ ٱلنُّجُومَ لِتَهْتَدُوا۟ بِهَا فِى ظُلُمَٰتِ ٱلْبَرِّ وَٱلْبَحْرِ ۗ قَدْ فَصَّلْنَا ٱلْءَايَٰتِ لِقَوْمٍ يَعْلَمُونَ ﴿٩٧﴾ وَهُوَ ٱلَّذِىٓ أَنشَأَكُم مِّن نَّفْسٍ وَٰحِدَةٍ فَمُسْتَقَرٌّ وَمُسْتَوْدَعٌ ۗ قَدْ فَصَّلْنَا ٱلْءَايَٰتِ لِقَوْمٍ يَفْقَهُونَ ﴿٩٨﴾ وَهُوَ ٱلَّذِىٓ أَنزَلَ مِنَ ٱلسَّمَآءِ مَآءً فَأَخْرَجْنَا بِهِۦ نَبَاتَ كُلِّ شَىْءٍ فَأَخْرَجْنَا مِنْهُ خَضِرًا نُّخْرِجُ مِنْهُ حَبًّا مُّتَرَاكِبًا وَمِنَ ٱلنَّخْلِ مِن طَلْعِهَا قِنْوَانٌ دَانِيَةٌ وَجَنَّٰتٍ مِّنْ أَعْنَابٍ وَٱلزَّيْتُونَ وَٱلرُّمَّانَ مُشْتَبِهًا وَغَيْرَ مُتَشَٰبِهٍ ۗ ٱنظُرُوٓا۟ إِلَىٰ ثَمَرِهِۦٓ إِذَآ أَثْمَرَ وَيَنْعِهِۦٓ ۚ إِنَّ فِى ذَٰلِكُمْ لَءَايَٰتٍ لِّقَوْمٍ يُؤْمِنُونَ ﴿٩٩﴾ ﴾ الأنعام: ٩٥ - ٩٩. واتە: (بەڕاستی خوا لەتكەری دەنك و دانەوێڵەیە بۆ ئەوەی بیپشكوێنێت و بڕوێت، زیندووش لە مردوو دەردەهێنێت، دەرهێنەری مردووشە لە زیندوو، ئا ئەوەیە خوای پەروەردگارتان، جا ئیتر بۆ كوێ لادەدرێن و بۆ كوێ وێڵ دەكرێن. (هەر ئەو زاتەیە) بەیانیان فەراهەم دەهێنێت و ئاسۆ ڕوناك دەكاتەوە و شەوی كردووە بەهۆی ئارامی و خامۆشی، ڕۆژو مانگیشی كردووە بەهۆی ڕاگرتنی حیساب، ئەو شتانە هەمووی بەنەخشەی خوای باڵادەست و زانا كێشراوە. هەر ئەو زاتە، ئەستێرەی بۆ فەراهەم هێناون تا ببێتە هۆی ڕێنموونیتان لەناو تاریكیەكانی سەر ڕووكاری وشكانی و دەریاكاندا، بەڕاستی ئێمە نیشانە و بەڵگەی زۆرمان (لەسەر دەسەڵاتی خۆمان و ڕێكوپێكی كارمان) ڕوون كردۆتەوە بۆ كەسانێك كە پێی بزانن و لێی تێبگەن. هەر ئەو زاتە ئێوەی بەدیهێناوە لە تاكە كەسێك، سەردەمێك (بەشێكتانی لە پشتی باوكتاندا) نیشتەجێ كردبوو (كە گوێزرانەوە بۆ ناو سكی دایكتان) ئەو شوێنە ئێوەی گرتە خۆ (تا تیایدا نەش و نما بكەن، یاخود بۆ ماوەیەك ئێوەی لەسەر ڕووكاری زەوی دانا، دوایی لە توێیدا شاردنیەوە تا ڕۆژی قیامەت) بەڕاستی ئێمە نیشانە و بەڵگەی زۆرمان (لەسەر دروستكردنی ئێوەو دروستكاری خۆمان هێناوەتەوە) بۆ كەسانێك كە تێفكرن و ووردبین بن. ئەو خوایە زاتێكە كە لە ئاسمانەوە باران دەبارێنێت (دەفەرموویێت):

جا بەهۆیەوە چرۆو چەکەرەی هەموو شتێکی پێ دەردەهێنین و شینی دەکەین، ئینجا لاسکی سەوزی لێ پەیدا دەکەین، زنجیرە دانەی سەفتەکراوی لێ دروست دەکەین (وەك گوڵەگەنم و چەڵتوك و گەنمەشامی ...هتد) لە دارخورماش لە هەندێ لق و چڵەپۆپی هێشووی خورما شۆڕ دەبێتەوە، هەروەها باخی هەمەجۆری ڕەزو ترێ، زەیتون و هەناریش، هەیانە لە ڕواڵەتدا لەیەك دەچێت، هەشیانە لەیەك ناچێت، جا تەماشای بەرەکەی بکەن کاتێك بەر دەگرێت، پێ دەگات، (سەرەتا هەندێکی گوڵە و دوایی خۆی هەڵدەپێچێت، ڕەنگ و قەبارەیەك دەگرێتە خۆی، دوای چەند مانگێك قەبارەشی گەورەتر دەبێت، ڕەنگیشی دەگۆڕێت، ئەوسا پێدەگات و تام و بۆنی سروشتی خۆی بۆ دروست دەبێت) بەڕاستی ئا لەو شتانەدا (کە ئاماژەی تێداکرا بۆتان) چەندەها بەڵگەو نیشانەی تەواون بۆ کەسانێك کە ئیمان و باوەڕیان دەهێنن (بەو بەدی هێنەرەی کە ئاسەواری دەستی قودرەت و بە دەسەڵاتی لە هەموو شتێکدا بەدی دەکرێت).

هەروەها خوای گەورە دەفەموویێت:

﴿ ٱللَّهُ ٱلَّذِى رَفَعَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ بِغَيْرِ عَمَدٍ تَرَوْنَهَا ۖ ثُمَّ ٱسْتَوَىٰ عَلَى ٱلْعَرْشِ ۖ وَسَخَّرَ ٱلشَّمْسَ وَٱلْقَمَرَ ۖ كُلٌّ يَجْرِى لِأَجَلٍ مُّسَمًّى ۚ يُدَبِّرُ ٱلْأَمْرَ يُفَصِّلُ ٱلْـَٔايَٰتِ لَعَلَّكُم بِلِقَآءِ رَبِّكُمْ تُوقِنُونَ ﴿٢﴾ وَهُوَ ٱلَّذِى مَدَّ ٱلْأَرْضَ وَجَعَلَ فِيهَا رَوَٰسِىَ وَأَنْهَٰرًا ۖ وَمِن كُلِّ ٱلثَّمَرَٰتِ جَعَلَ فِيهَا زَوْجَيْنِ ٱثْنَيْنِ ۖ يُغْشِى ٱلَّيْلَ ٱلنَّهَارَ ۚ إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَـَٔايَٰتٍ لِّقَوْمٍ يَتَفَكَّرُونَ ﴿٣﴾ وَفِى ٱلْأَرْضِ قِطَعٌ مُّتَجَٰوِرَٰتٌ وَجَنَّٰتٌ مِّنْ أَعْنَٰبٍ وَزَرْعٌ وَنَخِيلٌ صِنْوَانٌ وَغَيْرُ صِنْوَانٍ يُسْقَىٰ بِمَآءٍ وَٰحِدٍ وَنُفَضِّلُ بَعْضَهَا عَلَىٰ بَعْضٍ فِى ٱلْأُكُلِ ۚ إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَـَٔايَٰتٍ لِّقَوْمٍ يَعْقِلُونَ ﴿٤﴾ ﴾ الرعد: ٢- ٤. واتە: (خوا ئەو زاتەیە کە بەچاوی خۆتان دەبینن چۆن ئاسمانەکانی بەبێ کۆڵەکە و ستوون بەرز کردۆتەوەو ڕاگرتووە، لەوەودوا لەسەر تەختی فەرمانڕەوایی وەستاوە، خۆرو مانگیشی ڕام هێناوە، هەر یەکەیان لە چەرخ و خولی خۆیدا بیۆچان تا ماوەیەکی دیاریکراو دەسوڕێنەوە، هەر ئەو زاتە کاروباری جیهان هەر هەمووی بەڕێ دەکات و ڕێکی

**دەخات، هەروەها ئایەتەکانی قورئان بەووردی و دوورو درێژی دەخاتە بەرچاو بۆ ئەوەی دڵنیابن لە بەخزمەت گەیشتن و ئامادەبوونی بەردەم دادگای پەروەردگارتان (بۆ لێپرسینەوە).**

**لەکاتێکدا کە خوای گەورە بە تێروتەسەلی بنەماکانی بیروباوەڕو عەقیدەی ئیسلامی لە کتێبەکەی دا (کە قورئانی پیرۆزە) خستوەتەڕوو بە بەلگە بەهادارەکانیەوە، ئەوا لەهەمان کاتیشدا بیروباوەڕی دژەکانیشی گێڕاوەتەوەو و بەلگەی هێناوەتەوە لەسەر پوچییەکەی.**

**بەرپەرچی ئەوانەی داوەتەوە کە نکوڵی لە ڕاستێتی پێغەمبەران دەکەن، هەروەك خوای گەورە دەفەرموویێت:**

﴿ وَمَا مَنَعَ ٱلنَّاسَ أَن يُؤْمِنُوٓاْ إِذْ جَآءَهُمُ ٱلْهُدَىٰٓ إِلَّآ أَن قَالُوٓاْ أَبَعَثَ ٱللَّهُ بَشَرًا رَّسُولًا ﴿٩٤﴾ قُل لَّوْ كَانَ فِى ٱلْأَرْضِ مَلَٰٓئِكَةٌ يَمْشُونَ مُطْمَئِنِّينَ لَنَزَّلْنَا عَلَيْهِم مِّنَ ٱلسَّمَآءِ مَلَكًا رَّسُولًا ﴿٩٥﴾ ﴾ الإسراء: ٩٤- ٩٥. **واتە: هیچ شتێك نەبووەتە کۆسپ لە ڕێگەی ئەوەدا خەڵکی باوەڕبهێنن- کاتێك هیدایەتیان بۆ هات - تەنها ئەوە نەبێت کە وتیان: ئایا خوا مرۆڤێکی بە فرستادە ناردووە؟!. پێیان بڵێ: ئەگەر لەسەر زەویدا فریشتە هەبوونایە بەدڵنیاییەوە هاتوچۆیان بکردایە و ژیانیان ببردایەتە سەر، ئەوا ئێمە هەر لە ئاسمانەوە فریشتەیەکمان دادەبەزاندە سەریان کە پێغەمبەرو فرستادە بێت بۆیان (چونکە دەبێت لە جۆری خۆیان بێت).**

**کاتێ بەرپەرچی ئەوانە دەداتەوە کە نکوڵی دەکەن لە زیندوو بوونەوە، بەو فەرمایشتە:**

﴿ وَضَرَبَ لَنَا مَثَلًا وَنَسِىَ خَلْقَهُۥ ۖ قَالَ مَن يُحْىِ ٱلْعِظَٰمَ وَهِىَ رَمِيمٌ ﴿٧٨﴾ قُلْ يُحْيِيهَا ٱلَّذِىٓ أَنشَأَهَآ أَوَّلَ مَرَّةٍ ۖ وَهُوَ بِكُلِّ خَلْقٍ عَلِيمٌ ﴿٧٩﴾ ﴾ یس: ٧٨ - ٧٩. **واتە: (نمونەی لاوازی و بێ دەسەڵاتی بۆ ئێمە هێناوەتەوە و بەدیهاتنی خۆی لە بیر کردووە، دەیوت: کێ ئەم ئێسکانە زیندوو دەکاتەوە لە کاتێکدا کە ڕزیوو پرتوکاون؟!. پێیان بڵێ: ئەو زاتەی**

كە یەكەمجار دروستی كرد، هەر ئەویش زیندووی دەكاتەوە، ئەو بەهەموو دروستكراوێك زانا و ئاگایە).

كاتێ بەرپەرچی ئەوانە دەداتەوە كە هەسارە پەرستن، بەو فەرمایشتە:

﴿ فَلَمَّا جَنَّ عَلَيْهِ ٱلَّيْلُ رَءَا كَوْكَبًا ۖ قَالَ هَٰذَا رَبِّى ۖ فَلَمَّآ أَفَلَ قَالَ لَآ أُحِبُّ ٱلْـَٔافِلِينَ ﴿٧٦﴾ فَلَمَّا رَءَا ٱلْقَمَرَ بَازِغًا قَالَ هَٰذَا رَبِّى ۖ فَلَمَّآ أَفَلَ قَالَ لَئِن لَّمْ يَهْدِنِى رَبِّى لَأَكُونَنَّ مِنَ ٱلْقَوْمِ ٱلضَّآلِّينَ ﴿٧٧﴾ فَلَمَّا رَءَا ٱلشَّمْسَ بَازِغَةً قَالَ هَٰذَا رَبِّى هَٰذَآ أَكْبَرُ ۖ فَلَمَّآ أَفَلَتْ قَالَ يَٰقَوْمِ إِنِّى بَرِىٓءٌ مِّمَّا تُشْرِكُونَ ﴿٧٨﴾ إِنِّى وَجَّهْتُ وَجْهِىَ لِلَّذِى فَطَرَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ حَنِيفًا ۖ وَمَآ أَنَا۠ مِنَ ٱلْمُشْرِكِينَ ﴿٧٩﴾ ﴾ الأنعام: ٧٦-٧٩. واتە: (ئینجا كاتێك شەو باڵی كێشا بەسەر ئیبراهیمدا ئەستێرەیەكی (گەشی گەورەی) بینی، بۆیە وتی: ئاگاداربن، وادابنێین ئەمە پەروەرگارمە، كاتێك ئەستێرەكەی لێ ئاوابوو وتی: من شتی لەبەرچاو ون بووم خۆش ناوێت و نایپەرستم. ئینجا كاتێك مانگی بینی هەڵهات، وتی: ئاگاداربن، وا دابنێین ئەمەیان پەروەردگارمە، كاتێك ئەویش ئاوابوو وتی: سوێند بێت بەخوا ئەگەر پەروەرگارم هیدایەتی نەدامایە، ئەوە بێگومان لە ڕیزی دەستەی گومڕاكاندا دەبووم. ئینجا كاتێك خۆری بینی هەڵهات، وتی: ئاگاداربن، وا دابنێین ئەمەیان پەروەردگارمە، ئەمەت گەورەتریشە كاتێك ئەویش ئاوابوو و وتی: ئەی خەڵكینە، ئەی خزمینە، بەڕاستی من بەریم لەو شتانەی ئێوە كردووتانە بەهاوەڵ (شەریك) بۆ پەروەردگار. بەڕاستی من ڕووی خۆم و دڵم لە پەرستندا كردۆتە ئەو زاتەی ئاسمانەكان و زەوی فەراهەم هێناوە، لە كاتێكدا ڕووم لە هیچ شتێكی تر ناكەم، بە دڵ ئارامی تەواویشتەوە (دەڵێم): هەرگیز من لە ڕیزی موشریك و هاوەڵگەڕاندا نیم).

كاتێ بەرپەرچی ئەوانە دەداتەوە كە فریشتە پەرستن، و بانگەشەی ئەوە دەكەن كە فریشتە كچی خوان (پاك و بێگەردی بۆ خوا)، بەو فەرمایشتە:

﴿ وَقَالُوا۟ ٱتَّخَذَ ٱلرَّحْمَٰنُ وَلَدًا ۗ سُبْحَٰنَهُۥ ۚ بَلْ عِبَادٌ مُّكْرَمُونَ ﴿٢٦﴾ لَا يَسْبِقُونَهُۥ بِٱلْقَوْلِ

وَهُم بِأَمۡرِهِۦ يَعۡمَلُونَ ﴿٢٧﴾ يَعۡلَمُ مَا بَيۡنَ أَيۡدِيهِمۡ وَمَا خَلۡفَهُمۡ وَلَا يَشۡفَعُونَ إِلَّا لِمَنِ
ٱرۡتَضَىٰ وَهُم مِّنۡ خَشۡيَتِهِۦ مُشۡفِقُونَ ﴿٢٨﴾ وَمَن يَقُلۡ مِنۡهُمۡ إِنِّيٓ إِلَٰهٞ مِّن دُونِهِۦ فَذَٰلِكَ نَجۡزِيهِ
جَهَنَّمَۚ كَذَٰلِكَ نَجۡزِي ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿٢٩﴾ ﴾ الأنبياء: ٢٦ - ٢٩. **واتە: (خوانەناسان دەیانوت: خوای میهرەبان کوڕی بۆ خۆی بڕیارداوە (فریشتەکان ڕۆڵەی ئەون)، پاکی و بێگەردی بۆ ئەو زاتەیە، بەڵکو ئەوانە بەندەی ڕێزداری ئەون. (ئەو فریشتانە ئەوەندە ڕەوشت بەرزن) هەرگیز (نافەرمانی ناکەن و) قسە لە قسەیدا ناکەن و لە گوفتاردا پێشی ناکەون، ئەوانە بە فەرمانی ئەو دەجولێنەوە و فەرمانی ئەو جێبەجێ دەکەن. هەر خوا دەزانێت ئەو خەڵکە لە ڕابردوودا چیان ئەنجامداوە و لە داهاتووشدا چی ئەنجام دەدەن (دنیا و قیامەت، ڕابردو و داهاتوو، بۆ ئەو زاتە چوونیەکە)، فریشتەکانیش تکاکار نابن تەنها بۆ ئەو کەسانە نەبێت خوا پێی ڕازییە و ئەو فریشتانە لە ترسی ئەو زاتە ناوێرن هیچ سەرپێچیەك ئەنجام بدەن. خۆ ئەگەر یەکێك لە فریشتەکان (لە خۆی غەڕڕا بێت) بڵێت: بەڕاستی منیش خوام بێجگە لەو، ئەوە پاداشتی دەدەینەوە بە دۆزەخ، هەر بەو شێوەیە پاداشتی ستەمکاران و یاخیەکان دەدەینەوە).**

**کاتێ بەرپەرچی جولەکەکان دەداتەوە، بەو فەرمایشتە:**

﴿ قُلۡ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ هَادُوٓاْ إِن زَعَمۡتُمۡ أَنَّكُمۡ أَوۡلِيَآءُ لِلَّهِ مِن دُونِ ٱلنَّاسِ فَتَمَنَّوُاْ ٱلۡمَوۡتَ إِن كُنتُمۡ
صَٰدِقِينَ ﴿٦﴾ وَلَا يَتَمَنَّوۡنَهُۥٓ أَبَدَۢا بِمَا قَدَّمَتۡ أَيۡدِيهِمۡۚ وَٱللَّهُ عَلِيمُۢ بِٱلظَّٰلِمِينَ ﴿٧﴾ ﴾ الجمعة: ٦ - ٧. **واتە: (ئەی پێغەمبەر (ﷺ) پێیان بڵێ: ئەی ئەوانەی لەسەر دینی جولەکەن، ئەگەر ئێوە بڕواتان وایە کە بەڕاستی ئێوە دۆست و لایەنگری خوان، جگەلە خەڵکی تر، کەواتە داوای مەرگ بکەن و ئاواتی مەرگ بخوازن. کەچی ئەوانە هەرگیزاو هەرگیز ئاواتی وا ناخوازن و مردن داوا ناکەن، چونکە خۆیان دەزانن چیان دەست پێشخەری کردووە، خوایش زانایە بەکارو کردەوەی ستەمکاران).**

**کاتێ بەرپەرچی نەصرانیەکان دەداتەوە، بەو فەرمایشتە:**

﴿ إِنَّ مَثَلَ عِيسَىٰ عِندَ ٱللَّهِ كَمَثَلِ ءَادَمَۖ خَلَقَهُۥ مِن تُرَابٍ ثُمَّ قَالَ لَهُۥ كُن فَيَكُونُ ﴿٥٩﴾ ٱلْحَقُّ مِن رَّبِّكَ فَلَا تَكُن مِّنَ ٱلْمُمْتَرِينَ ﴿٦٠﴾ فَمَنْ حَآجَّكَ فِيهِ مِنۢ بَعْدِ مَا جَآءَكَ مِنَ ٱلْعِلْمِ فَقُلْ تَعَالَوْا۟ نَدْعُ أَبْنَآءَنَا وَأَبْنَآءَكُمْ وَنِسَآءَنَا وَنِسَآءَكُمْ وَأَنفُسَنَا وَأَنفُسَكُمْ ثُمَّ نَبْتَهِلْ فَنَجْعَل لَّعْنَتَ ٱللَّهِ عَلَى ٱلْكَٰذِبِينَ ﴿٦١﴾ إِنَّ هَٰذَا لَهُوَ ٱلْقَصَصُ ٱلْحَقُّۚ وَمَا مِنْ إِلَٰهٍ إِلَّا ٱللَّهُۚ وَإِنَّ ٱللَّهَ لَهُوَ ٱلْعَزِيزُ ٱلْحَكِيمُ ﴿٦٢﴾ فَإِن تَوَلَّوْا۟ فَإِنَّ ٱللَّهَ عَلِيمٌۢ بِٱلْمُفْسِدِينَ ﴿٦٣﴾ ﴾ آل عمران: ٥٩ - ٦٣. واتە: (بەڕاستی نمونەی دروست بوونی عیسا لەلایەن خواوە؛ وەك نمونەی ئادەم وایە کە لە خاك دروستی کردو لەوەودوا فەرمانی داو پێی وت: ببە (بە ئینسان) ئەویش بوو. حەقیقەت و ڕاستی هەر ئەوەیە لەلایەن پەروەردگارتەوەیە، کەواتە نەکەیت بچیتە ڕیزی ئەوانەی کە گومان کارکردی هەیە لەسەریان. (دوای ئەوەی کە هەموو ئەو ڕاستیانەت پێگەیشت دەربارەی عیسا)، جا ئەگەر کەسانێك هەر موجادەلەیان کردوو لەسەری ڕۆیشتن و شتی ناڕەوایان دەربارەی عیسا وت: تۆش پێیان بڵێ: وەرن با کوڕانی ئێمە و کوڕانی ئێوە، ئافرەتانی ئێمە و ئافرەتانی ئێوە، خۆمان و خۆشتان بانگ بکەین و ئامادەبین (لە شوێنێکی تایبەتدا)، پاشان لە خوا بپاڕێینەوەو ئینجا داوا بکەین نەفرین و لەعنەتی خوا دابباریێتە سەر درۆزنەکان. بەڕاستی هەر ئەمەیە بەسەرهاتی ڕاست و دروست (دەربارەی عیسا و دایکی)، هیچ خوایەك نیە جگە لە (الله)،بێگومان ئەو (الله)یە هەر خۆی باڵادەست و دانایە. (لەگەڵ ئەو هەموو بەڵگەو ڕاستیانەدا) ئەگەر ڕوویان وەرگێڕاو پشتیان تێکرد (ئەوە بزانە ڕاستی خواز نین)، خوایش زانا و ئاگایە بەوانەی کە تۆوی تاوان و خراپە دەچێنن).

سەرباری ئەوەی کە قورئانی پیرۆز بەڵگەی دەخستەڕوو لەسەر بیروباوەڕی ڕاست و بیروباوەڕی دژەکانی دەگێڕایەوەو بەڵگەشی لەسەر پوچەڵیەکەی دەهێنایەوە، و لەگەڵ عەقڵ دەدوا و فیکری بە ئاگا دەهێنایەوە، ئەوا مەیدانی دەمەتەقێ و جەدەلی فراوان نەدەکرد و لەو پێناوەشدا هاندانی نەبووە، بەڵکو بەپێچەوانەوە زۆر بەکەمی دەپرژایە سەر ئەو لایە، چونکە دەکرێت ببێتە هۆی ڕق

و کینەو دوژمنایەتی، هەر لەبەر ئەوەشە کە خوای گەورە فەرمانی بە پێغەمبەری بەڕێز کردووە کە نەرم و نیان بێت لەو کاتەی دژەڕاکانی بانگ دەکات بۆ سەر ڕێگەی ڕاست و لەو کاتەی گفتوگۆیان لەگەڵ دەکات، ئەمەش لە پێناو ئەوەی کە خۆشەویستی و تێکەڵاوی هەر بەردەوام بێت، و تا لە ڕێی بیرکردنەوەی ڕاست و ئامۆژگاری چاکەوە قەناعەتیان بێنێت، خوای باڵادەست و خاوەن شکۆ دەفەرمووێ: ﴿ ٱدۡعُ إِلَىٰ سَبِيلِ رَبِّكَ بِٱلۡحِكۡمَةِ وَٱلۡمَوۡعِظَةِ ٱلۡحَسَنَةِۖ وَجَٰدِلۡهُم بِٱلَّتِي هِيَ أَحۡسَنُۚ إِنَّ رَبَّكَ هُوَ أَعۡلَمُ بِمَن ضَلَّ عَن سَبِيلِهِۦۖ وَهُوَ أَعۡلَمُ بِٱلۡمُهۡتَدِينَ ﴾ النحل: ١٢٥. واتە: (ئەی پێغەمبەر (ﷺ)، ئەی ئیماندار) بانگەواز بکە بۆ لای بەرنامە و ڕێبازی پەروەردگارت بە حیکمەت و دانایی و ئامۆژگاری جوان و بەجێ و گفتوگۆ و موجادەلە بە جوانترین شێوە، چونکە بەڕاستی پەروەردگارت هەر خۆی زانایە، کە کێ گومڕایە، هەروەها هەر خۆیشی زانایە بە هیدایەت وەرگران). خوای گەورە جەختی دەکردەوە بۆ پێغەمبەر (ﷺ) لەوەی بیروباوەڕەکەی ڕاستە و ڕێگاکەی دروستە، و دەمەتەقێیەی دوورو درێژ ئەنجام نەدات لەگەڵ دژەڕاکانی[1]، نمونەی ئەمەش ئەو فەرمایشتەی خوای گەورەیە:﴿ لِّكُلِّ أُمَّةٖ جَعَلۡنَا مَنسَكًا هُمۡ نَاسِكُوهُۖ فَلَا يُنَٰزِعُنَّكَ فِي ٱلۡأَمۡرِۚ وَٱدۡعُ إِلَىٰ رَبِّكَۖ إِنَّكَ لَعَلَىٰ هُدٗى مُّسۡتَقِيمٖ ﴿٦٧﴾ وَإِن جَٰدَلُوكَ فَقُلِ ٱللَّهُ أَعۡلَمُ بِمَا تَعۡمَلُونَ ﴿٦٨﴾ ٱللَّهُ يَحۡكُمُ بَيۡنَكُمۡ يَوۡمَ ٱلۡقِيَٰمَةِ فِيمَا كُنتُمۡ فِيهِ تَخۡتَلِفُونَ ﴿٦٩﴾ ﴾ الحج: ٦٧ - ٦٩. واتە: (بۆ هەر میللەتێك بەرنامەو پرۆگرامێکمان دیاری کردووە پەیڕەوی دەکەن و لەسەری دەڕۆن (بە گوێرەی کات و شوێن و بارودۆخیان، ئەم بەرنامەیەشمان ناردووە بۆ هەتا هەتایی) کەواتە با خاوەن ئایینەکانی تر نەیکەنە کێشە و ئاژاوە لەگەڵتاندا لەبارەی ئەم ئایینەوە، ئەی محمد (ﷺ) بەردەوام بانگەوازی خەڵکی بکە بۆ لای پەروەردگارت چونکە بەڕاستی تۆ لەسەر ڕێگە و ڕێباز و هیدایەتێکی ڕاست و

---

(١) بڕوانە: سید قطب، في ظلال القرآن ٦٢٦/٥.

دروستیت. خۆ ئەگەر موجادەلەت لەگەڵدا بکەن (ئەوە تۆ موجادەلە مەکە بەڵکو بڵێ: خوا خۆی چاك زانایە بەو کارو کردەوانەی ئەنجامی دەدەن. هەرخوا خۆی لە ڕۆژی قیامەتدا داوەری دەکات لە نێوانتاندا لەسەر ئەو شتانەی کە ئێوە کێشە و جیاوازیتان لەسەر دەکرد (لەوێ ڕاستیەکان بەتەواوی دەردەکەوێت).

پاش ئەوەی پەیڕەو ڕێبازی قورئانی پیرۆزمان زانی لەوەی چۆن عەقائیدی ئیمانی ڕوون دەکاتەوە و جێگیری دەکات و بەرگری لێ دەکات، ئەوا دەست دەکەین بە باس کردنی پوختەیەکی مێژووی لەسەر بارودۆخی عەقائیدی ئایینی لە سەردەمی پێغەمبەر (ﷺ) و خەلیفەکانی ڕاشدین و لەسەردەمی ئەمەوی و دواتر سەردەمی عەبباسیەکان، لەگەڵ ئاماژەدان بۆ ئەو قۆناغانەی کە چاخی تازە پێیدا تێپەڕی.

## ١- بارودۆخی عەقیدە و بیروباوەڕی ئیسلامی لەسەردەمی پێغەمبەرو خەلیفەکانی ڕاشدین:

### أ- لە سەردەمی پێغەمبەر:

ئیسلام هات و بڕیاری دا کە ئایینی ڕاست هەر یەك ئایینە، کە ئەویش بریتیە لە سروش و پەیامی ڕەوانەکراوی خوایی بۆ سەرجەم پێغەمبەرانی، و بنەماکانی ئەو ئایینە ڕاستە چەسپاو و نەگۆڕن و پەیامبەرانیش لە بنچینە و بنەماکاندا کۆکن و ڕاجیا نین. بە پێچەوانەی یاسا کردارییەکان کە لە پەیامی پەیامبەرێکەوە بۆ پەیامی پەیامبەرێکی تر جیاوازە، و ڕاست و دروست و حەقن مادام هەڵنەوەشێنرابنەوەو (نسخ) نەکرابن.

زەمەخشەری لە بارەی تەفسیری ئەو فەرمایشتەی خوای گەورە: ﴿ أُوْلَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ هَدَى ٱللَّهُۖ فَبِهُدَىٰهُمُ ٱقۡتَدِهۡۗ ﴾ الأنعام: ٩٠. واتە: (ئەو (ناوبراوانە)، ئەو کەسانەن کە خوا (بەتایبەت) هیدایەت و ڕێنموونی کردوون، تۆش (ئەی محمد (ﷺ)، ئەی ئیماندار) شوێنی هیدایەت و ڕێنمووی ئەوانە بکەوە. دەفەرموویێت: (مەبەست لە

هیدایەتی پێغەمبەران ڕێبازەکەیانە لە باوەڕ بوون بە خوای گەورە و بەیەکزانینی و باوەڕ بوون بە بنەماکانی ئایین، بەدەر لە شەریعەتەکان کە جیاواز و هیدایەتن ئەگەر هەڵنەوەشێنرابنەوە، چونکە ئەگەر هەڵوەشێنرانەوە ئەوا بە هیدایەت نامێننەوە، بەپێچەوانەی بنەماکانی ئایین کە هەتا هەتا هەر هیدایەتە)(١).

لە واقیعدا ئایینی ئیسلامی لە دوو ڕەگەزی جیاواز و تایبەتمەند پێك هاتووە: بنەما (أصول)، و لق و پۆپ (فروع) و بەدەربڕینێکی تر: عەقیدە و شەریعەت.

جا عەقیدە: خوای گەورە لە کتێبە پیرۆزەکەی دا کە قورئانی پیرۆزە هەموو بنەماکانی باس کردووە و پێغەمبەری ڕێزداریش بەو پەڕی جوانییەوە لە ڕێگەی گوفتارو کردارییەوە ڕوونی کردۆتەوە. پێغەمبەر (ﷺ) گفتوگۆی لەگەڵ ئەهلی کیتاب دەکرد، و گفتوگۆ و موجادەلەشی لەگەڵ هاوبەش دانەران دەکرد، و وەڵامی پرسیارەکانی ئەوانی ئەدایەوە، بەو مەرجەی ئەو پرسیارانە تایبەتمەندی و خاسیەتی جەدەل و سەرکەشی و عینادی پێوەدیار نەبوایە، جا ئەو پرسیارانەش بە ووردی بابەتەکانی عەقیدەیان لە خۆ دەگرت: لە بارەی ناسینی خوا، و قەدەر و ڕۆح، و زیندوو بونەوە و بەهەشت و دۆزەخ و پێغەمبەرێتی و حەقیقەتی باوەڕ، و پەیوەندی ئیسلام لەگەڵ ئایینەکانی تر(٢).

هەروەها (ابن هشام) گێڕاویەتیەوە کە تاقمێك لە جولەکە هاتنە لای پێغەمبەری خوا و لێیان پرسی: ئەوە زانیمان خوا ئەو شتانەی بەدیهێناوە، ئەی کێ؟ خوای بەدیهێناوە؟ پێغەمبەری خوا تورەبوو تا ڕەنگی تێکچوو، پاشان ئەو سورەتە دابەزی: ﴿ قُلْ هُوَ ٱللَّهُ أَحَدٌ ١ ٱللَّهُ ٱلصَّمَدُ ٢ لَمْ يَلِدْ وَلَمْ يُولَدْ ٣ وَلَمْ يَكُن لَّهُۥ كُفُوًا أَحَدٌۢ ٤ ﴾(٣) واتە: (ئەی محمد (ﷺ)، ئەی ئیماندار) بڵێ: ئەو

(١) الزمخشری، الكشاف ٢/٣٤.

(٢) يحيى هاشم حسن فرغل، نشأة الآراء و المذاهب و الفرق الكلامية ٢٦٧.

(٣) بڕوانە: ابن هشام، السيرة النبوية ٢/٢٢٠.

خوایەی کە ناوی - الله -یە خوایەکی تاك و تەنهایە (بێ هاوەڵ و هاوتایە). خوا زاتێکی پایەدارو دەسەڵاتدارە، نیازی بەکەس نییە و هەمووان ئاتاجی ئەون، هەر ئەو دەتوانێت بەڵاو ناخۆشی لابەرێت و پێویستی و داخوازییەکانمان جێبەجێ بکات. هیچ کەسی لێ نەبووەو خۆیشی لە هیچ کەس نەبووە. هەرگیز هاوتاو هاوشێوەو دەسەڵاتدارێکی نییە کە لە بەرامبەریەوە بوەستێت و هاوشانی بێت).

کاتێ پێغەمبەری خوا ﷺ ئەو فەرمایشتەی خوای گەورەی خوێندەوە: ﴿ إِنَّكُمْ وَمَا تَعْبُدُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ حَصَبُ جَهَنَّمَ أَنتُمْ لَهَا وَٰرِدُونَ ﴿٩٨﴾ ﴾ الأنبياء: ٩٨. واتە: (بێگومان ئێوەو ئەو شتانەی لە جیاتی خوا دەتانپەرست سووتەمەنی دۆزەخن و سەڵکە بزوتی ئاگرن، دەبێت هەر بچنە ناوی و هەمیشە تێیدا بن). لەو کاتە تاقمێك لە هاوبەش دانەران لێیان پرسی: ئا هەموو ئەو شتانەی کە دەپەرسترێن و ئەوانەش بەندایەتیان بۆ دەکرد دەچنە دۆزەخەوە؟ ئەمە چۆن دەگونجێ لە کاتێکدا ئێمە فریشتە دەپەرستین، و جولەکەش عوزەیرو نەصرانیەکانیش عیسای کوڕی مەریەم دەپەرستن... جا پێغەمبەر (ﷺ) وەڵامی دایەوە: (هەر کەسێ پێی خۆش بێت بپەرسترێت جگەلە خوا ئەوا لەگەڵ ئەوانەی بەندایەتی بۆ دەکەن دەچنە ئاگری دۆزەخەوە)، جا ئەو ئایەتانە دابەزین: ﴿ وَمَن يَقُلْ مِنْهُمْ إِنِّىٓ إِلَٰهٌ مِّن دُونِهِۦ فَذَٰلِكَ نَجْزِيهِ جَهَنَّمَ ﴾ الأنبياء: ٢٩. واتە: (هەر کەسێ بڵێت: بەڕاستی منیش خوام بێجگە لە - الله -، ئەوە پاداشتی دەدەینەوە بە دۆزەخ). تا ئەو فەرمایشتە: ﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ سَبَقَتْ لَهُم مِّنَّا ٱلْحُسْنَىٰٓ أُو۟لَٰٓئِكَ عَنْهَا مُبْعَدُونَ ﴿١٠١﴾ ﴾ الأنبياء:١٠١. واتە: (بەڕاستی ئەوانەی هەر زوو بڕیارمان داوە چاکە بهێنینە ڕێیان (بەهۆی ئیمان و ئیمان و باوەڕو کردەوەی چاکەیان) ئەوانە دوورە پەرێزکراون لە دۆزەخەوە)(١).

(ابن مسعود) وتی: من لەگەڵ پێغەمبەری خوادا بووم (ﷺ) لە ناو کێڵگەیەکی

(١) بڕوانە: تفسیر ابن الکثیر ٣/ ١٩٨ و ١٣١/٤. و الواحدی: أسباب النزول القرآن ٣١٤.

مەدينە، پاڵی دابووەوە لەسەر ڕايەخێك، لەو كاتە هەندێ جولەكە بەلامان تێپەڕين، وتيان: لەبارەی ڕۆح پرسياری لێ بكەن. هەندێكيان وتيان: پرسياری لێ مەكەن چونكە بەشتێك ڕووبەڕوتان دەبێتەوە كە لەلاتان ناخۆشە، جا هەندێ لەو جولەكانە هاتنە لای وتيان: ئەی باوكی قاسم، چی دەڵێی لەبارەی ڕۆح؟ ئەڵێ پێغەمبەر (ﷺ) بێدەنگ بوو و دەستی خستە سەر نێوچەوانی، زانيم كە سروش دادەبەزێت بەسەريا، جائەو ئايەتە بۆ سەر پێغەمبەر (ﷺ) دابەزی: ﴿ وَيَسْـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلرُّوحِۖ قُلِ ٱلرُّوحُ مِنۡ أَمۡرِ رَبِّي وَمَآ أُوتِيتُم مِّنَ ٱلۡعِلۡمِ إِلَّا قَلِيلٗا ﴾ الإسراء: ٨٥. واتە: (پرسيارت لێ دەكەن دەربارەی ڕۆح (كە چيە و چۆنە؟) بڵێ: ڕۆح بەشێكە لە فەرمانی پەروەردگارم و بەدەست ئەوە (من نازانم چيە و چۆنە) و هيچتان پێ نەبەخشراوە لە عيلم و زانست تەنها شتێكی كەم نەبێت).[1]

پێغەمبەری خوا (ﷺ) تەنها لە كاتی بانگ كردنی دژەڕاكانی بۆ سەر ئايينی نوێ و لادانيان لەسەر باوەڕە پوچەڵەكانيان پەنای دەبردەبەر گفتوگۆو موجادەلە و دەمەتەقێ، ئەمەش بەوەی كە بيزانيايە ئەو خوانەناسانە ئامادەباشيان تێدايە، سەرباری ئەمەش پێغەمبەر (ﷺ) ڕێگری دەكرد لە موسڵمانان لەوەی موجادەلە بكەن بە مەبەستی دەست خستنی هەندێ لە بنەماكانی باوەڕ، و لەبەرامبەردا فەرمانی دەكرد بەوەی دەست بگرن بەوەی كە بۆيان تەنيا لە ڕێگەی پەيام ڕوونكراوەتەوە.

شەريعەت: قورئانی پيرۆز بنەما و بنچينە گشتيەكان و زۆربەی ئەحكامە لاوەكيەكانی لە خۆ گرتووە، و پێغەمبەری ڕێزدار ئەو بنەمايانەی ڕوونكردۆتەوەو گەشەی پێداوە بەو بنەما گشتی و ئەحكامە لاوەكيانەی كە زيادی كرد، هەروەك دەرگاكەشی واڵاكرد بۆ نەشونما پێ كردنی، ئەمەش لە ڕێگەی دانپێدانان بە بنەمای

(١) بڕوانە: الواحدی، أسباب نزول القرآن ٢٩٩.

ئیجتهاد و تێڕامان[1].

هاوەڵانی پێغەمبەر تێگەیشتن لەو مانایانە، و بەناپەسەندیان دەزانی کە لێکۆڵینەوەو موجادەلە و دەمەتەقێ بکرێ لە بنەماکانی عەقیدە، و بۆچونیان وابوو کە ئەو شتانە تەنها بە سروش دانی پێدادەنرێ. کەچی پێیان ئاسایی بوو کە ئیجتهاد و کۆشش بکرێت لە یاسا و شەرعی کرداری[2].

بەشێوەیەکی کورت و پوخت؛ سەردەمی پێغەمبەر بەسەرچوو، موسڵمانان هەر لەسەر ئەو بیروباوەڕو عەقیدەیە بوون کە لە قورئانی پیرۆزدا هاتبوو، چونکە ئەوان (گەیشتبوون بەسەردەمی سروش و گەورەیی و شەرەفی هاوەڵێتی پێغەمبەر، و ڕووناکایی و نوری هاوەڵێتی هەموو تاریکیەکی گومان خەیاڵی لابردبوو لەسەر عەقڵ و دڵ و دەروونیان)[3].

---

(١) بڕوانە: مصطفى عبدالرزاق، تمهيد لتأريخ الفلسفة الاسلامية ٢٧٠. و د. عرفان عبدالحميد، دراسات في الفرق و العقائد ١٢٤.

(٢) هاوەڵانی هاوچەرخی پێغەمبەر کۆشش و ئیجتهادیان دەکرد تەنها لەکاتێك کە دووربوان لە پێغەمبەر، و ئیجتهادەکەیان سێ جۆر بوو:

١- ئیجتهاد و کۆشش بۆ تێگەیشتن لە مەبەستی پێغەمبەر (ﷺ).

٢- ئیجتهاد و کۆشش بۆ زانینی حوکمی شەرعی واقیع و بارودۆخێك کە دەقێکی ئایینیان لەسەر پێنەگەیشتووە.

٣- ئیجتهاد و کۆشش بۆ یەکلاکردنەوەی کێشەکانی نێوان خەڵك.

سەیری: پەرتوکەکەمان بکە: العقل عند الشيعه ٢٠.

(٣) طاش كبرى زاده، مفتاح السعادة ٢/ ٣٢.

## ب- لە سەردەمی خەلیفەكانی ڕاشدین (١١ - ٤٠ك):

**بارودۆخی عەقائید لەو سەردەمەدا هەروەك سەردەمی پێغەمبەر (ﷺ) مایەوە و ڕاجیاییەكی وا نەهاتەكایەوە لە بابەتەكانی عەقیدەدا. بەڵكو ڕاجیایی بەشێوەیەكی گشتی ڕوویدا لە چەند بابەت و مەسەلەیەكی كرداری كە مەبەست لێی - وەك شهرستانی دەڵێت: (إقامة مراسم الشرع، و إدامة مناهج الدين)[١]. واتە: (جێبەجێ كردنی دروشم و بۆنەكانی شەرع، و بەردەوامی دان بە بەرنامەو پەیڕەوی ئایین). هەندێ لەو ڕاجیاییە كرداریانە گەورەبوون و مەترسیان مەزن بوو تا وای لێهات پەیوەست بوون بە مەسەلەكانی عەقیدەوە، تەنانەت دواتر بووە بناغە بۆ دروست بوونی دەستە و تاقمە ئیسلامیەكان. جا مەترسیدارترین ڕاجیایی كە ڕاستەوخۆ ڕوویدا لە دوای كۆچی دوایی پێغەمبەر (ﷺ) بریتی بوو لە ڕاجیاییان لەسەر خیلافەت. و بابەتەكەشی بریتی بوو: لەوەی كێ شیاوترین كەسە كە ببێتە جێنشینی پێغەمبەر و حوكمڕانی ئوممەتەكەی بكات...؟ ئایا پیاوێك لە پشتیوانان (أنصار) كە پشتگیر و پەناگە بوون بۆ كۆچكەران... یاخود پیاوێك لە كۆچكەران، ئەوانەی پێشەنگ بوونە لە موسڵمان بوون و ئازاریان چەشت و ئارامیان گرت... یان پیاوێك كە لە ڕەچەڵەك وئالوبەیتی پێغەمبەر (ﷺ) بێت... دواتر هەموو ڕاو بۆچوونەكان وەستان و كۆك بون لەوەی أبوبكر (ڕەزای خوای لێبێت) بكرێتە جێنشین و خەلیفە، و بەمەش ڕاجیایی دامركایەوە، تا دواتر سەرهەڵبداتەوەو ببێتە هۆیەك بۆ پەرت بوونی ڕیزی موسڵمانان لەمەودوا[٢].**

**موسڵمانان ڕاجیاییان تێكەوت لە سەردەمی أبوبكر لەوەی ئایا بجەنگن لەگەڵ ئەوانەی زەكات نادەن، كۆمەڵێك وتیان: لەگەڵیان ناجەنگین، و ئیمامی (عمر) (ڕەزای**

---

(١) الشهرستانی، الملل و النحل ٢٠/١. و سەیری.: الاسفرایینی، التبصیر في الدین ٢٦. بكە.

(٢) بڕوانە: شیخ محمد أبو زهرة، تأریخ مذاهب الاسلامیة ١٢/١. و أبو حسن الأشعری، مقالات الاسلامیة و اختلاف المصلین ٢/١. و الاسفرایینی، التبصیر في الدین ٢٦.

خۆی لێبێت) وتی: چۆن بجەنگین لەگەڵیان دا كەچی پێغەمبەر (ﷺ) وتویەتی: (أمرت أن أقاتل الناس حتى يقولوا لا اله الا الله، فاذا قالوها عصموا مني دماءهم و أموالهم[1]) واتە: (فەرمانم پێكراوە كە بجەنگەم لەگەڵ خەڵكیدا تا شایەتمان دێنن، جا ئەگەر شایەتمانیان هێنا ئەوا خوێن و ماڵیان پارێزراوە لەلای من). و كۆمەڵێكی تر ووتی: لەگەڵیان دەجەنگین، تا أبوبكر (ڕەزای خوای لێبێت) وتی: ئایا پێغەمبەر نەیوتووە: تەنها بە مافی ئەو نەبێت، مافی ئەویش بریتیەلە بەرپاكردنی نوێژ و بەخشینی زەكات، ئەگەر یەك بەچكە وشتر كە هی زەكاتە پێم نەدەن كە پێشتر دەیاندا بە پێغەمبەر ئەوا لەسەر ئەمە لەگەڵیان دەجەنگم. بەخۆی چوو بۆ جەنگ كردن لەگەڵیان، و هاوەڵانیش هاتنە سەر ڕای ئەو[2]. لە ڕاستیشدا ئەم ڕاجیاییە بنچینە بوو بۆ ئەو ڕاجیاییانەی - پاشتر - ڕوویدا لە بابەتی ئیمان دا، لەوەی كردەوە بەشێكە یان بەشێك نییە لە ئیمان[3].

---

(١) زانایان ڕاجیاییان هەیە لەسەر ئەوەی كە جەنگان لەگەڵ ناموسڵمانان لەبەر خودی بێ باوەڕی و كوفرەكەیانە یان لەبەر ئەوەیە كە ئەوان نیەتی دەستدرێژی و جەنگ (حرابة)یان هەیە، لێرەدا مەبەستمان لە جیهادی كوشتار و جەنگە، جا زۆربەی زانایان بۆچوونیان وایە كە هۆی ئەنجامدانی جیهادی كوشتاری و جەنگ بریتیە لەوەی بێ باوەڕان نیەتی دەستدرێژی و جەنگ (حرابة)یان هەیە و ئەو جیهادەش بۆ نەهێشتی ئەو مەترسیەیە، و شافیعی و ئیبن حزمش لە دیارترین دوو بۆچوونەكانیان بۆ ئەوەچووە كە هۆیەكەی بێ باوەڕییە. سەیری: (الجهاد في الاسلام كيف نفهمه؟ و كيف نمارسه؟ د. محمد سعيد رمضان البوطي، دار الفكر، دمشق، چ ٢، ٩٤ بكە. (وەرگێڕ).

(٢) سەیری: الشهرستانی، الملل و النحل ٢٣/١. و مصطفى عبدالرزاق، تمهيد لتأريخ الفلسفة الاسلامية ٢٨٣. بكە.

(٣) موسڵمانان ڕا جیا بوون لەوەی كردەوە بە بەشێك لە ئیمان دابنێن یان نا، جا زۆربەی موسڵمانان بە بەشێك لە ئیمانی هەژمار كرد، و ئەم مانایەشە كە لە ڕیوایەتەكاندا هاتووە: ((باوەڕ: زانینە بە دڵ، دان پێدانانە بە زمان، كردەوەیە بە بنەماكان)) و بنەماكان بریتین لە

موسـڵمانان ڕاجیایـان تێکـەوت لـەوەی ئایـا أبـوبکر عومـەری دیـاریکرد وەك خەلیفە[1]، حا زۆربەی هاوەڵان پێی ڕازی بوون، کۆمەڵێکیشیان پێـی ڕازی نـەبوون، تـا یەکێکیان وتی: بەڕاستی کەسێکی گـرژو تووندـت کـردە حـوکمڕان بەسـەرماندا، بـەڵام دواتر لە ڕاکەیان پەشیمان بوونەوە بەو وتـەی أبـوبکر، کـە وتـی: ئەگـەر پـەروەردگارم پرسـیارم لـێ بکـات لــە قیامەتــدا ئــەوە دەڵــێم: چــاکترین کەســیانم کردۆتــە حوکمڕانیان[2].

هـەروەها موسـڵمانان لـە سـەردەمی عومـەر (خـوا لێـی ڕازی بێـت) لـەبارەی زەوی

---

ئەو شتانەی کە ئیسلامی لەسەر بنیادنراوە وەك: نوێژ ڕۆژوو و هەموو واجبەکان، و هەندێکی تر کردەوەیان بە پێویستیەك (لازم) لە پێویستیەکانی باوەڕ داناوە نەوەك بە بەشێك لێی.

و وتیان: باوەڕ: بڕواهێنانە بە دڵ و دان پێدانانەبە زمان. و لەسەر ئەمە هەر کەسێك کردەوەی چاك ئەنجام نەدات ئەوا لەلای زۆربەی زانایان لاسار (فاسق)ە، و لەلایەن تاقمی ئەزارقە لە خەواریجەکان بێ باوەڕە و دەرچووە لە بازنەی باوەڕ و بێ باوەڕ بووە لەلایەن زۆربەی موعتەزیلە و زۆرێك لە خەواریج و زەیدیەکان کە بڕوایان بە پلەیەك هەیە لە نێوان دوو پلەکە (واتە لە نێوان باوەڕ و بێباوەڕیدا - وەرگێڕ - ).

(١) د. حاکم المطیری، لە کتێبەکەیدا (ئازادی یان تۆفان) و. فاتح محمد سەنگاوی، لەو بارەوە دەڵێت: (بەهەمان شێوە عومەر تەنها بە پاڵاوتنی ئەبوبەکر لە کاتێ کە لە سەرەمەرگدابوو وەپاش ئەوەی ڕاوێژی بە هاوەڵان کرد و ئەوانیش ڕازی بوون یەکسەر نەبوو بە خەلیفە، بەڵکو کاتێ بوو بە خەلیفە کە موسڵمانان بەیعەتیان پێدا لە پاش کۆچی دوایی ئەبوبەکر بەڕەزامەندی هاوەڵان - خوایان لێ ڕازی بێت - ... شێخی ئیسلام ئیبنو تەیمیە فەرموویەتی:(هەروەها عومەر کاتێ ئەبوبەکر ئەو کارەی پێسپارد ئەو وەختە بووە ئیمام کە بەیعەتیان پێداو گوێڕایەڵیان بۆی دەربڕی، ئەگەر وا ڕێبکەوتایە ئەوان پێ سپاردنەکەی ئەبوبەکریان جێبەجێ نەکردایە و بەیعەتیان پێنەدایە ئەوا نەدەبویە ئیمام). ئەمەش تەئکید دەکاتەوە کە پێ سپاردن (عهد) تەنها پاڵاوتن (ترشیح)ە، ئوممەت بۆی هەیە پەسەندی کاو دانی پێدابنێ یان بەرهەڵستی بێ و پەسەندی نەکا). (سەرچاوەی ناوبراو ٤٨). (وەرگێڕ).

(٢) بڕوانە: الشهرستانی، الملل و النحل ٢٤/١.

ڕەشهەڵگەڕاو (سواد)ی عێراق و فارس ڕاجیاییان تێکەوت، هەندێ وتیان: دابەشی کە، و عومەر وتی: دابەشی ناکەم بەڵکو وەك موڵکی گشتی موسڵمانان بەجێی دەهێڵم، چونکە دەترسا لەوەی ئەو زەویانە هەر هەمووی ئەگەر دابەش بکات ئەوا لەوانەیە نەوەکان بێن و هیچ زەویەکیان دەست نەکەوێت، و لەبەر ئەوەی پێویستی بەو زەویانە هەیە بۆ پڕ کردنەوەی کەلێنەکان و پاراستنی وڵات، بەم هۆیە هاتنە سەر بۆچوونەکەی ئەو کۆك بوون لەسەری[1].

موسڵمانان ڕاجیاییان کەوتە نێوان لەمەڕ ئەو سیستەمەی عومەڕی کوڕی خەتاب دایهێنا سەبارەت بە کاروباری خیلافەت بەوەی کردیە ڕاوێژ لە نێوان شەش لە هاوەڵان... تا کۆك بوون لەسەر بەیعەتدان بە عوسمان - ڕەزای خوای لێبێت -.

دواتر ڕاجیاییان تێکەوت لەمەڕ هەندێ کاری عوسمان، بەشێوەیەك کە کۆمەڵێك چەندین کاری ئەویان بە ناپەسەند دانا. لەوانە: گێڕانەوەی (حکم)ی کوڕی (أمیە) بۆ مەدینە، کەچی پێشتر پێغەمبەری خوا شاربەدەری کردبوو و تەنانەت ناونرابوو: (شاربەدەرکراو بەفەرمانی پێغەمبەری خوا). و لەوانە: پەنادانی (عبدالله)ی کوڕی (سعد)ی کوڕی (سرح) دوای ئەوەی کە پێغەمبەر (ﷺ)خوێنەکەی ئەوی بەفیڕۆ دابوو، نەوەك هەر ئەمە بەڵکو عوسمان ئەوی کرد بە بریکاری خۆی لە میسر.

هەروەك چۆن ڕاجیابوون لە ڕاپەڕین دژی عوسمان و کوشتنی، کۆمەڵێك وتی: بە ستەم و دەستدرێژی کوژرا. و ئەوانی تر: ڕای تریان پێچەوانەی ئەمە هەبوو[2].

هەروەها دوای ئەوەی بەیعەتدرا بە عەلی کوڕی أبی طالیب، ئەوا خەڵکی ڕاجیا بوون لە هەمبەر ڕووداوی یاخی بوونی (طلحة) و (زبیر) و جەنگ لەگەڵ کردنیان لەلایەن ئیمامی عەلی، و سەبارەت بە معاویە کە نکوڵی دەکرد لە ئیمامەتیەکەی و جەنگی لەگەڵ دەکرد، و لەبارەی ڕووداوی داوەری (تحکیم)، و ڕاجیایی خەواریج لەگەڵی و

(١) بڕوانە: شیخ محمد أبو زهرة، تأریخ مذاهب الاسلامیة ١٤/٢.

(٢) الشهرستانی، الملل و النحل ١/ ٢٤-٢٥.

یــاخی بوونیــان لــە گوێڕایــەڵی و فــەرمانی و تەنانــەت دوژمنایــەتی کردنــی[(١)]...
لەسەردەمی ئەودا ڕاجیایی دروست بـوو لەسـەر زیادەڕۆچـووەکانی شیعەکان ئەوانـەی
کە سنوریان بەزاندبوو لە پاك و پیرۆز ڕاگرتنی بەوەی بڕوایان وابوو کـە عـەلی خـوای
بەدیهێنـراوەکانــە... کــە ئەمــەش وای کــرد بیانکوژێــت و هەنــدێکیان بــە ئــاگر
بسوتێنێت...[(٢)].

(١) خەواریج: کۆی دەرچوو (خارجة)یە، ئەوانە ئەو کۆمەڵ و تاقمەن کە یاخی بوون و دەرچوون لە گوێڕایەڵی حوکمڕان و دەسەڵاتداری شەرعی. بەڵام هەر کە ناوی خەواریج بهێنرێت ئەوا = =بیرو هۆش دەچێتە لای ئەوانەی یاخی بوون و دەرچوون دژی ئیمامی عەلی (ڕەزای خوای لێبێت) دوای ئەوەی کە داوەری (تحکیم)ی قبوڵ کرد. وە ئەوەی سەرسام و نامۆیە ئەوەیە کە هەر ئەو خەواریجانە بوون کە ئیمامی عەلیان ناچارکرد بۆ قبوڵ کردنی داوەری (تحکیم)ەی کە معاویە و سەربازەکانی بانگەشەیان بۆ کرد دوای جەنگی صفین کە نزیك بوو معاویە و سەربازەکانی ڕاکەن لە دەسەڵاتەکەی ئیمامی عەلی، بەڵام دوای مایەپوچی داوەری (تحکیم) ئەوا بە تاوانێکی گەورەیان دانا، و داوایان لە ئیمامی عەلی کرد تەوبە بکات لەو تاوانەی کە کردوویەتی، چونکە بێ باوەڕی و کوفری کردووە بەوەی داوەری قبوڵ کردووە هەروەك چۆن ئەوانیش کوفریان کردو پاشان تۆبەیان کرد. و لەو گومانەیاندا هەندێ عەرەبی دەشتەکی کە زۆربەیان لە هۆزی (تەمیم) بوون پشتی ئەوانیان گرت و ئەم دروشمەیان بەرزکردەوە (لا حکم الا لله) واتە: حوکم و فەرمان تەنها بۆ خوایە. دوای ئەوەی کە دەمەتەقێ و موجادەلەیان لەگەڵ عەلی کرد و قسەیان پێ دەبڕی ئەوا ئەم حاڵەتە گۆڕا بۆ جەنگ کردن لەگەڵی. دواتر دابەش بوون بۆ چەند تاقمێك: گرنگترینیان: (أزارقە) کە شوێنکەوتووی نافعی کوڕی أزرقی، کە لە هۆزی حنیفەیە، (الصفریە)، کە شوێنکەوتووی زیادی کوڕی أصفرە، (عجاردە)، شوێنکەوتووی عبدالکریمی کوڕی عجردە، و (اباضیة)، کە شوێنکەوتەی (عبدالله)ی کوڕی (اباض)ە، ئەمانە لە عوممان لە کەنداوی عەرەبی و لە بیابانەکانی جەزائیر بوونیان هەیە.

(٢) زیادەڕۆچوون (الغلو) لە زمانەوانیدا: بریتیە لە سنور بەزاندن و تێپەڕاندن و دەرچوون لە مەبەست، خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿يَاأَهْلَ الْكِتَابِ لَا تَغْلُوا فِي دِينِكُمْ﴾النساء: ١٧١. واتە: (ئەی خاوەنانی کتێب زیادەڕەوی مەکەن لە ئاینەکەتاندا). خوای گەورە ڕێگری و قەدەغەی کرد لەوەی

**ئەمانـه دیـارترین ئـەو ڕاجیاییانـه بـوون كـه ڕوویانـدا لـه نێـوان موسـڵمانادا لـەو سەردەمەدا. هەروەك دەشـبینی كـه ئـەو ڕاجیاییـه لەسـەر بابەتـه كردارییـەكان بـووە، تەنها هەندێكیان نەبێت وەك خیلافەت... بـووە بنچینەیەك بـۆ ڕاجیـایی عەقائیـدی، و دواتر بووە هۆی سەرهەڵدانی زۆرێك له تاقمه ئاینیەكان.**

**سـەبارەت بـه عەقیـده ئـەوا مێـژوو هـیچ شـتێكی بـۆ ئێمـه نەگێڕاوەتـەوە لەسـەر دروست بوونی ڕاجیایی لەمەڕ ئەو بابەته. پەیڕەویشیان لـه دان پێـدانانی عەقائیـد و بیروبـاوەڕی ئـاینی ئـەوا لـه زۆربـەی حاڵەتـدا دامـەزرابوو لەسـەر گێڕانـەوە (نقـل)، پـەنایان نـەدەبرده بـەر لێكۆڵینـەوەو تێڕامـان و ئەنجامـدانی گفتوگـۆو جـەدەل و دەمەتـەقێ تـەنها لـەو كاتانـەدا نـەبێت كـه بـانگی دژەكانیـان دەكـرد بـۆ وازهێنـان لـه**

---

سنور ببەزێنرێ له پیرۆز ڕاگرتنی مەسیح (سەلامی لەسەر بێت)، و هۆشداریشی داوه لەوەی قسه له مەبەست لانەدرێ، و ئەو بانگەشەیەی نەصرانیەكانیشی به زیادەڕەوی دانا لەبەرئەوەی سنوری بەزاندووە، و ئەو زیادەڕەوانەی كه به ڕووكار خۆیان به موسڵمان دەردەخست، هەر ئەوان بوون كه هەڵدەستان بەوەی سیفەتی خوایەتی یان پێغەمبەرێتیان دەدایه لای ئەمیری= =بڕواداران و پێشەواكانان (سەلامیان لەسەر بێت)، و تەنانەت پلەوپایەی ئاینی و دونیایی وایان بۆ بڕیاردا كه هەموو سنورێكی شكاندبوو، و له مەبەست دەرچوو بوو، كه بەڕاستی گومڕابووی بێ باوەڕن، و ئەمیری بڕواداران حوكمی كوشتن و سوتاندنی بەسەردا سەپاندن و ئیمام و پێشەواكانیان - سەلامیان لەسەر بێت - حوكمی كافرێتی و دەرچوون له بازنەی ئیسلامیان بەسەردا دان. / شرح عقائد الصدوق، دانراوی: شیخ صدوق ٢٥٧. و سەیری: فرق الشیعه، دانراوی: نوبختی ٤٠-٦٠. تاقمه زیادەڕۆچووەكان زنجیرەیەك هزرو تیۆری كۆنیان له خۆگرتبوو كه ئیسلام لەگەڵ ئەو هزرانه تێكگیرا و ڕووبەڕوو بوویەوە له كاتی ڕزگار كردنی وڵاتان، جا ئەو هزرانه ئامانجی ئەوەبوو كه ڕووبەڕووی ئیسلام ببێتەوەو له ناوەوەیدا بیڕوخێنێت، جا بۆ ئەم مەبەسته هەڵگرانی ئەو هزره پوچانه بەڕووكەش خۆیان به موسڵمان پیشان دا، و دروشمی پشتیوانی ئالوبەیتیان هەڵگرت، كه پاڵی نا به ئیمامەكان - سەلامیان لەسەر بێت - كه خۆیان لەوان و هزرەكەیان بەری بكەن. سەیری: الغلو و الفرق الغالیه ٨٥ لدكتور عبدالله سلوم. و المقالات و الفرق ٥٥ لأبي خلف الاشعری، و أصل الشیعه و أصولها ٩٩، لآل كاشف الغطاء. بكه.

بیروباوەڕە پوچەکانیان و هاتنە سەر ڕێگەی ڕاست.

نموونەی ئەمەش وتەی أبوبکر لە دانان بەوەی کە خوای گەورە پێچەوانەی ڕووداوەکانە و خوای گەورە شێوەی نییە:

(العجز عن درك الادراك ادراك) واتە: (دەستەوەسانی و کوڵبوون لە پەیی پێبردن، ئەوا خۆی لەخۆیدا پەیی پێبردنە). جا (أسفرایینی) ئەو وتەیەی شیکردۆتەوە بەوەی: (ئەگەر بەڕاستی و دروستی بۆت دەرکەوت کە بەدیهێنەر ناناسرێت لە ڕێگەی وێنەکردن و ئاوێتەکردن و پێوانە و قیاس کردنی بە بەدیهێنراوان، ئەوا ئەوکاتەلەلات شتێکی ڕاست دەبێت کە بەدیهێنراو تەواو پێچەوانەی بەدیهێنراوانە)[1].

عومەر کاتێ ڕاوەستابوو وتاری دەدا بۆ خەڵك لە (جابیە) لەبارەی قەدەر، جا لە وتارەکەیدا وتی: (خوا کەسێ گومڕا دەکات کە بیەوێت و ڕێنمویی کەسێکیش دەکات کە ویستی لەسەر بێت) جا قەشەیەك وتی: ئەوە ئەمیرەکەتان چی دەڵێت؟ وتیان: خوا کەسێ گومڕا دەکات کە بیەوێت و ڕێنمویی کەسێکیش دەکات کە ویستی لەسەر بێت. جا قەشەکە وتی: هەڵەی کردووە، خوای گەورە لەوە دادگەرترە کە کەسێك گومڕا بکات، جا ئەم هەواڵە گەیشتە عومەر، ئەویش ناردی بەدوای قەشەکەدا و پێی وت: بەڵکو خوا گومرات بکات، ئەگەر ئەو پەیمانەت نەبووایە ئەوا ملەکەتم دەپەڕاند[2].

گێڕدراوەتەوە کە (أبو موسى الأشعری) دەمەتەقێ و گفتوگۆی لەگەڵ ئەوانە کردووە کە وتویانە: چۆن شتێك خوا ئەندازەگیری بکات و لەسەرم بنووسێت دواتریش سزام دەدات لەسەری؟ جا وەڵامی ئەوانەی داوە بەوەی وتی: ئەندازەگیری

---

(١) الاسفراینی، التبصیر في الدین ٩٧.

(٢) بڕوانە: الخطیب البغدادی، تأریخ بغداد، ١١/٢٩٠. و ئایەتی: ﴿ أَفَمَن زُيِّنَ لَهُۥ سُوٓءُ عَمَلِهِۦ فَرَءَاهُ حَسَنًاۖ فَإِنَّ ٱللَّهَ يُضِلُّ مَن يَشَآءُ وَيَهۡدِي مَن يَشَآءُۖ فَلَا تَذۡهَبۡ نَفۡسُكَ عَلَيۡهِمۡ حَسَرَٰتٍۚ إِنَّ ٱللَّهَ عَلِيمُۢ بِمَا يَصۡنَعُونَ ﴾ فاطر: ٨.

كـردووەو لەسـەر ئێـوەی نوسـیوە كـە زانیویـەتی و لێـی شـاراوە نـەبووە، سزاشـی داوە بەشێوەیەك كە ستەم و زۆرداری نەكردووە.

ئیمـامی عـەلی لـەناو هاوەڵانـدا لەهـەر هـەموویان زیـاتر پـەنای دەبـردە بـەر موجادەلـە و گفتوگـۆ، ئەمـەش بـۆ ئـەوەی دەگەڕێتـەوە كـە لـە هـەموو هاوەڵان زیـاتر بەشدار بوو لە چارەسـەر كردنـی ڕووداوەكـان و لێكۆڵینـەوە لێـی، و لـە دیـارترین ئـەو كەسانەش بوو كە تەمەنیان درێژ بوو و گەیشتنە ئەو كاتەی كە كۆمەڵگەی ئیسلامی چـووە قۆنـاغێكی نـوێی ترسـناكەوە، سـەرباری ئـەوەی كـە ئیمـامی عـەلی گـەورەترین كەسایەتی بوو كە ڕووداوەكانی ئاشوب و فیتنەی ئیسلامی وەك خولگەیەكیان دانا.

لەبەر ئەو هۆیانەی باسمان كـردن زۆرێـك لـە ڕاو بۆچـوونی لـەپاش خـۆی بـەجێ هێشت كە دەدوێن لـەبارەی مەسـەلە هـەرە ووردەكـانی بیروبـاوەڕو عەقیـدە دەدوێـین: لەبارەی زاتی خوای گەورە و سیفاتەكانی، و لەبارەی قەدەر، و بابـەتی دروسـت بـوونی قورئان (خلق القرآن)[1].

بەشـێوەكی گشـتگیر و پوخـت كـراو: موسـڵمانان لـەو سـەردەمەدا دەسـتیان هەڵنـەگرت لـە تێڕامـان لـە بابەتـەكانی بیروبـاوەڕ بـە مەبەسـتی ڕێنمـاییكردن و وەك ئامرازێكی ڕێنموونی، بەڵكو خۆیان بەدوور گرت لـە خـۆ هەڵقورتانـدن و پـەنا بردنـە بەر تێڕامان و گفتوگۆی بێ بەندوبار. تەنها لەو كاتەدا پـەنایان دەبـردە بـەر تێڕامـان و گفتوگۆ كـە خزمـەتی كردبایـە بـە چەسـپاندنی بیروبـاوەڕی ئـایین و بەرپەرچـدانی گومانی دژەكان.

---

(١) فرغل، نشأة الآراء و المذاهب و الفرق الكلامية ٥٠.

## ٢- بارودۆخی عەقیدەو بیروباوەڕی ئیسلامی لە سەردەمی ئەمەوییەكان (٤١ - ١٣٢ك)[(١)]:

بارودۆخی عەقائید و بیروباوەڕی ئیسلامی بەرەو پێشچوونێكی بەرچاو و گەورەی بەخۆیەوە بینی لەو سەردەمەدا، جا چەندین كێشەی عەقیدەیی دەركەوتن كە بوونە هۆی پەرتەوازەیی و ڕاجیایی موسڵمانان، لە ئاكامدا مشتومڕو دەمەتەقێ لە نێوانیاندا پەرەی سەند، و پشت بەستنی تاقم و كۆمەڵێك لە چەسپاندنی عەقائید و بیروباوەڕ بەشێوەی گشتی و بنەماكانی ئایین بەشێوەیەكی تایبەتی بە پەیڕەو بەرنامەی تێڕوانینی هزری و بەڵگەهێنانەوەی عەقڵی وەك هۆكار بۆ ئەم مەبەستە. دیارترینی ئەو كێشانە، كە زۆرترین قسەو باسیهەڵگرتبوو باسی (قەزاو قەدەر) بوو، كە (معبد الجهنی)[(٢)] وروژاندی و دوای ئەو (غیلان الدمشقی)[(٣)] پەرەی پێدا، و هەردوو مەسەلەی بەدیهێنراوی قورئان (خلق القرآن) و سیفاتەكانی خوا (الصفات الالهیة) بازاریان گەرم بوو و (جعد)ی كوڕی (درهم)[(٤)] ئەم بابەتانەی وروژاند و

---

(١) سەردەمی ئەمەوییەكان، سەردەمی هاوەڵە تەمەندرێژەكانیش لەخۆ دەگرێت كە كۆتایی هات لە لە نێوان ساڵانی ٩٠ و ١٠٠ك و سەردەمی شوێنكەوتووان (تابعین).

(٢) معبد الجهنی، لە شوێنكەوتووان (تابعین)ەكان بوو یەكەم كەس بوو لەبارەی مەسەلەی قەدەر دوا، عبدالملك لە ساڵی ٨٠ك كوشتی. و حسنی بصری ڕێگری دەكرد لەوەی خەڵكی لە مەجلیسەكەی دابنیشن و دەیوت: كەسێكی گومڕابوو و گومڕاكەرە.

(٣) غیلانی كوڕی مسلمی تبطی دمشقی: باوكی خزمەتكاری عوسمانی كوڕی عفان بوو، لە ڕای زۆربەی لێكۆڵەڕان بە بانگەشەكەر و مژدەدەری حەقیقی دادەنرێت بۆ مەزهەبی (قەدەر)، هیشامی كوڕی عبدالملك لە دەروازەی دیمەشق هەڵیواسی و لەسێدارەی دا.

(٤) جعدی كوڕی درهم، لە خزمەتكارەكانی هۆزی (حكم) بوو، لەڕووی بنەچەوە فارسی بووە، پەروەردەكراوی مەڕوانی كوڕی محمد بوو كۆتا خەلیفەكانی ئەمەوی، (جعد) ئەو بیرۆكەی خۆی لە سەردەمی هیشامی كوڕی عبدالملك ئاشكرا كرد (١٠٥ - ١٢٥ك) و هیشام بەندی كردو ڕەوانەی كردە لای والی عێڕاق (خالد)ی كوڕی (عبالله)ی (قسری) و ئەویش لە ساڵی ١٢٠ك كوشتی.

دوای ئەویش (جهم)ی کوڕی (صفوان)[1] پەرەی پێدا، و مەسەلەی(گوناهە گەورەکان و حوکمی بکەرەکەی) کە خەواریجەکان وروژاندیان.

له کتێبی (التبصر فی الدین)[2] دا هاتووە:

(لەسەردەمی هاوەڵە دواییەکان بیرۆکەی نامۆی قەدەریەت دەرکەوت، لێکۆڵینەوەیان دەکرد لە بابەتی قەدەر و تواناکەی، نمونەی ئەو کەسانەش (معبدی جهنی) و (غیلانی دمشقی) و (جعدی کوڕی درهم)، جا ئەو هاوەڵانەی کە مابوون سەرزەنشتی ئەوانەی ناوبراویان دەکرد بەهۆی ئەو کارەیانەوە، وەك: (عبدالله)ی کوڕی عومەر (٧٣ك مردووە) و (عبالله)ی کوری عەبباس (٦٨ك مردووە) و (عبدالله)ی کوڕی (أبی أوفا) (٨٧ك مردووە) و جابر (٥٠ك مردووە) و (أنس) کە (٩٣ك مردووە) و أبی هریره (٥٨ك مردووە) و عقبەی کوری عامر (٥٨ك مردووە) و هاوتەمەنەکانیان، و ئامۆژگاری ئەوانەی دوای خۆیان دەکرد کە سەلامیان لێ نەکەن و نەچنە لایان کە نەخۆش کەوتن، و کە مردیشن نوێژیان لەسەر نەکەن).

له کتێبی (مفتاح السعادة) دا هاتووە[3]:

پیاوێك بە ئیبن عومەری (کۆچی دوایی کردووە لە ٧٣ك) ووت: لەم سەردەمەی خۆماندا کەسانێ دەرکەوتوون زینا دەکەن و مەیی دەخۆنەوە و ئەو نەفسە دەکوژن کە خوای گەورە حەڕامی کردووە، دواتر بەڵگەمان بەسەردا دەهێننەوەو دەڵێن: ئەو کارانەی ئێمە لە زانستی خوادا پێشتر هەبووە. ئیبن عومەر توڕەبوو و وتی: (پاك و بێگەردی بۆخوا؛ بەڵێ ئەو شتانە پێشتر لە زانستی خوادا هەبوون، بەڵام زانستی

---

(١) جهمی کوڕی صفوانی راسبی، نازناوەکەی: (أبو محرر) بوو، و قوتابی (جعدی کوڕی درهم) بوو، و نوسەری حارسی سریج بوو، کە لە کۆتاییەکانی ژیانی دا دەرچوو لە دژی دەوڵەتی ئەمەویەکان و سلمی کوڕی أحوزی مازنی لەساڵی ١٢٨ك کوشتی بە فەرمانی والی خوراسان نصری کوڕی سیار. و (جهم) بە سەرۆکی تاقمەکە دادەنرێت کە کاریگەرییەکی گەورەی هەبوو لە هزری ئیسلامیدا.

(٢) الإسفرایینی، التبصیر فی الدین ٢٧-٢٩.

(٣) طائش کبرا زاده، مفتاح السعادة ٣٢/٢.

خوای گەورە ئەو تاوانانەی پێ ئەنجام نەداون).

له كتێبی (الرسالة الحموية) دا هاتووه[1]:

(یەكەم جار ئەو بیرۆكەو قسەی (نەفی كردنی سیفاتەكانی خوا) لە جعدی كوڕی درهەمەوە هات و جهمی كوڕی صفوانیش لەویەوە وەریگرت و دەریخست و هەر لەبەر ئەمەش بوو كە جەهەمیەتی درایە پاڵ).

پوختەی قسان: ئەوەیە كە لەو سەردەمەدا مشتومڕو ڕاجیایی هاتە كایە لەنێوان ئەو تاقمانەی كە ئاماژەمان بۆ سەرچاوەی سەرهەڵدانیان كرد لە سەردەمی سەلەف و قوڵبوونەوەی ململانێ لە نێوانیاندا. و ئەو ململانێیەش پشتی بەست بەهەموو هۆكارەكانی بەرگری كردن كە پشتیان بەستبوو بە بەڵگەی عەقلی و گێڕانەوە (نەقلی)، پاشان چەند مەسەلەیەكی ئیعتقادی لەدایك بوو كە جێگەی ڕاجیایی و مشتومڕ بوو. و موسڵمانان لە دەرەنجامدا دابەش بوون بۆ چەند تاقمێك، ئالەوكاتەدا (تاقمی كەلام) دەركەوت لەسەر دەستی ئەو تاقمانە وەك دژێكی موعتەزیلە[2].

له كتێبی (مفتاح السعادة) دا هاتووه[3]:

(بنچینەی بڵاوبوونەوەی مەسەلەی كەلام بەدەستی موعتەزیلە و قەدەریەت[4] بوو لە دەوروبەریساڵانی سەدی كۆچی. چونكە دەركەوتنی فیكرەی موعتەزیلە لەلایەن واصلی كوڕی عطاء بوو، واصل كۆچی دوایی كرد لە ساڵی ١٣١ك و

(١) ابن تيمية، رسالة الفتوى الحموية الكبرى ٢٣.

(٢) مصطفى عبدالرزاق، تمهيد لتأريخ الفلسفة الاسلامية ٢٨٧.

(٣) طائش كبرا زاده، مفتاح السعادة ٢/٣٣.

(٤) قەدەریەت: هەموو ئەوانە لە خۆ دەگرێت كە قەدەر نەفی دەكەن و دەڵێن خوا هیچ شتێكی ئەندازەو تەقدیر نەكردووە و دەیدەنە پاڵ مرۆڤ. واتە بڕوایان وایە كە مرۆڤ بە ڕەهایی و بێ سنور ئازادە و خۆیشی قەدەری خۆ دیاری دەكات. و لە ناودارترین كەسەكانی: معبدی جهنی و غیلانی دمشقی. و موعتەزیلەكان دواتر ڕای ئەوانی وەك بنچینەی مەزهەبی خۆ دانا و لە كەسە یەكەمەكانی واصلی كوڕی عطاء و عمروی كوڕی عبید (١٤٢ك مردووە).

له ساڵی ٨٠ك له دایك بووه، جا بەم پێیە ئەو قۆناغەی كە تیایدا قوتابی زانست بووەو توانای ئیجتهادی هەبووەو ئەوا نزیكە لە دەورووبەری ساڵی سەدی كۆچی بووبێت) و واصلی كوڕی عطاء یەكەم كەس بوو كە فیكرەی موعتەزیلەی دەرخست و بڵاوی كردەوە[1].

لەوەی خستمانەڕوو، ئەوا دەكرێ ئەو دەرەنجامانەی خوارەوەی وەربگرین:

أ- تێڕوانینی عەقلی لە عەقائید و بیروباوەڕەكانی ئایینی سەری هەڵدا لەسەر دەستی (جهنیه) و (جهمیه) و (قدریه) و (معتزله)ەكان، و ئەمە لە كۆتایی سەدەی یەكەم و سەرەتای سەدەی دووەمی كۆچی بوو.

ب- گرنگترین مەسەلە كە هۆی مشتومڕو ڕاجیاییین بریتین لە: مەسەلەی (سیفاتەكانی خوا)، و مەسەلەی (قەزاو قەدەر).

پ- ئەوانەی ئەو مەسەلانەیان وروژاند خزمەتكار (موالی) بوون، كە تازە موسڵمان ببوون و وازیان لە بیروباوەڕە كۆنەكەیان هێنابوو هاتبوونە ناو ئیسلام، و بەرفراوان بوونی جیهانی ئیسلامی بەهۆی پرۆسەی ئازادكردنی زەوییە نوێیەكان كاریگەری هەبوو.

ت- مەزهەبە سیاسیی و تاقمە ئاینیەكان كە لە سەردەمی پێشتر پەیدابوون، ئەوا گەشەیان كرد و كەسایەتیە هزر (فیكر)ی و بیروباوەڕو عەقیدەییەكەی جیاواز و تایبەتمەند بوو لەو سەردەمەدا.

---

(١) وتراوە واصلی كوڕی عطاء فیكرەی موعتەزیلایەتی لە (أبی هاشم)ی كوڕی (عبدالله)ی كوڕی (محمد)ی (حنفیه)ی (٩٨ك مردووە) وەرگرتووە، و (أبو هاشم) لە باوكیەوە (محمد)ی كوڕی حنفیه (٨١ مردووە) وەرگرتووە، و (محمد) لە باوكیەوە (علی) كوڕی (أبی طالب) (٤٠ك مردووە) وەرگرتووە.

## گرنگترینیان:

شیعه و خەواریج و چەند تاقمێکی تری نوێی ئاینی دەرکەوتن لەو سەردەمەدا گرنگترینیان: قەدەریه و جبریه[1] و المرجئه[2] و موعتەزیله.

ج- نووسین و کتێب دانان لەو سەردەمەدا دەستی پێکرد لەسەر مەسەلەکانی کەلام، بەڵام هیچی نەگەیشتۆتە دەستی ئێمە.

## ٣- بارودۆخی عەقیدەو بیروباوەڕی ئیسلامی لە سەردەمی عەبباسیەکان (١٣٢ك) تا سەردەمی ڕابوونی هاوچەرخ:

سەردەمی عەبباسی بە سەردەم و چاخی زێڕین دادەنرێت لە نووسینەوەی زانست و زانیارییە ئیسلامیەکان، جا لەو سەردەمەدا نووسینەوەو دانانی پەیام و کتێب لە زانستی کەلامدا دەرکەوت. ئەندامانی تاقمەکان لەو سەردەمەدا شتیان نووسی لەوانە: واصلی کوڕی عطاء کە ئەم کتێبانەی هەن: (أصناف المرجئة) و (المنزلة بين المنزلتين) و (الخطب في التوحيد و العدل)، عمروی کوڕی عبيد (١٤٢ك مردووە) باسی کتێبێکی ئەویان کردووە کە بەرپەرچی قەدەریەکانی داوەتەوە. و

---

(١) جبریه: ئەوانەن کە بانگەشەی ئەوەیان کرد مرۆڤ هیچ تواناو ویستێکی نییە و سەرپشك نییە، بەڵکو لە هەموو کردەوەکانی دا ناچارکراوە، خوای گەورە کردەوە لە مرۆڤدا دروست دەکات هەروەك لە گیانلەبەرو شتی بێ هەست (جماد) دا دروست دەکات، کە کردەوەکان دەدرێنە پاڵ مرۆڤیش ئەوا لە ڕووی مەجازەوەیە، تەنانەت پاداشت و سزا و پێسپاردن (تکلیف)یش هەر ناچارییە و مرۆڤ هیچ شتێکی بەدەست و یستی خۆی نییە. لە یەکەم کەسەکان کە لەوبارەوە دوان: جهدی کوڕی درهم و جهمی کوڕی صفوان بوون.

(٢) مرجیئە: ئەوانەن کە حوکمدانیان دواخست لەسەر کەسێك تاوانی گەورە بکات، و حوکمەکەیان سپارد، لەبەرامبەر خەواریجەکان کە بکەری تاوانی گەورەیان بە کافر و بێ باوەڕ دادەنا، و موعتەزیلەکان کە دەیانوت: نە باوەڕدار و نە بێ باوەڕە، بەڵکو لە پلەیکدایە لە نێوان ئەو دوو پلەیەدا.

(هیشام)ی كوڕی (حكم) (١٩٩ك مردووە) - زانایەكی كەلامی شیعیی - چەند كتێبێكی هەن: (الامامة) و (الرد على الزنادقة) و (الرد على أصحاب الأثنين) و (التوحيد) و (الرد على من قال بامامة المفضول) و جگەلەمانەش، و ئیبن ندیم لە (الفهرست)[1] باسی كردووەو هەروەك چۆن باسی زانایانی كەلامی (جبری) و ئەو كتێبانەی دایانابوو كردووەو باسی زانا كەلامیەكانی خەواریج و كتێبەكانیانشی كردووە. و ئەوەی ئەهلی سوننە لە بارەی عەقائید نووسیویانە لەوانە (الفقة الأكبر) و (العالم و المتعلم) كە دراونەتە پاڵ أبی حنيفە (١٥٠ك مردووە) و كتێبی (الفقة الأكبر) كە دراوەتە پاڵ ئیمامی شافیعی (٢٠٤ك مردووە).

پەیڕەو (منهج)ی تێڕوانینی عەقلی پەرەی بەخۆوە بینی لە چەسپاندنی عەقائیدی ئاینی و بەرگری كردن لێی، و موعتەزیلە ئاڵای ئەو پەیڕەو و شێوازەی هەڵگرت و شیعەش لەم بوارەدا وەڵامیان دایەوەو شوێنیان كەوتن، هەر لەبەر ئەمەش تێڕوانینی هەردوولا لە زۆرێك لە مەسەلەكانی ئەو زانستەدا وەك یەك و كۆك بوون، وەك: نەفی كردن و بڕیاردانی ئەوەی كە خوای گەورە نابینرێت، و دروستكراوی قورئان، و دانان بەوەی كە خوای گەورە هیچ جۆرە دەسەڵاتێكی نیە بەسەر كردەوەی بەندەكانی بەڵكو بەندەكات تەواو ئازادن، و بنچینەی میهرو بەزەیی (اللطف)، و پێویست بوونی چاكترین (وجوب الأصلح)، و مەسەلەی چاك و خراپی كە دوو شتی عەقڵین، و دادگەری (العدل)، جا شتێكی سروشتی بوو كە هەردوو تاقم كۆكبن لە زۆرێك لە مەسەلە فیكری و عەقیدەییەكان، لەگەڵ ئەوەشدا موعتەزیلە زیاتر خۆیان داماڵی بوو لە بەندوبارو قەیدەكان و ڕێزی زیاتری یاسا و ئەحكامە عەقڵیەكانیان دەگرت، تەنانەت هەوڵی گونجاندی عەقڵ و (نەقڵ)یان نەدەدا لەكاتی تێكگیران و دژیەك بووندا، بەڵكو حوكمی عەقڵیان وەردەگرت و نەقڵەكەشیان تەئویل دەكرد بە پێچەوانەی شیعە كە هەوڵی گونجاندنی دەدەن ئەگەر كرا و ئەگەر نەكرا ئینجا نەقڵەكە تەئویل دەكەن، لەبەر ئەمە ئەم دوو تاقمە

(١) ٢٥٢، بڕوانە: مصطفى عبدالرزاق، تمهيد لتأريخ الفلسة الاسلامية ٢٨٨.

لە زۆرێك لە مەسەلە هزری و عەقیدەییەکان ڕاجیابوون و بەتایبەتی ئەوەی کە پەیوەستە بە ئیمامەتەوە وەك: پارێزراوی (العصمة) و دیارنەبوون (الغيبة).

بەم شێوەیە مەزهەبی موعتەزیلە بووە مەزهەبی باوو زاڵ لە نێوان مەزهەبە کەلامییەکان، ئەمەش لەبەر ئەوەیە کە پابەندی پەیڕەوی عەقڵییەو پشتیش دەبەستێت بە (مەنتیق) و موجادەلە و دەمەتەقێ، لەگەڵ ئەوەشدا دەسەڵاتی سیاسی پشتی گرت و سەری خست، ئەمەش بووە هۆی لاوازبوونی مەزهەبەکانی تر بەتایبەتی شیعەکان و سەلەفییەکان لەبەرئەوەی دەسەڵات بەخەستی دەیچەوساندنەوە، چونکە پشتیان بەپەیڕەوی نەقڵی بەستبوو.

سەرکردایەتی و ڕابەرایەتی زیاتر لە یەك سەدە بەدەستی موعتەزیلە بوو، بەڵام دواتر پاشەکشەی کرد و لاوازبوو، ئەمەش بۆ چەند هۆکارێك دەگەڕێتەوە، گرنگترینیان:

١- زیادەڕۆچوونی موعتەزیلە و تێپەڕاندنیان لە بەڵگە هێنانەوەی عەقڵی (الاستدلال العقلی).

٢- بەکارهێنانی دەسەڵات وەك ئامرازێك بۆ سەپاندنی ڕاوبۆچوونە ئاینی و تێڕوانینە هزریەکانیان.

٣- پەنا بردنەبەر چەوساندنەوەی دژەکانیان لە بیروباوەڕدا، بەتایبەتی ئەهلی سوننە.

ئەم هۆیانە و هەندێکی تریش ئۆپۆزیسیۆنی توونددوتۆڵ کردو وای لێکرد هەنگاو بنێت بۆ زاڵبوون بەسەریاندا... هەر وای لێهات. هێشتان جێنشینایەتی متوکل (٢٣٢ - ٢٤٧) تەواو نەبوو بوو، ئەوا فەرمانی دەرکرد (بەوەی وازبهێنرێت لە تێڕوانین و لێکۆڵینەوە لە ئاین، و وازبهێنرێ لەوەی خەڵکی پێیوە سەرقاڵ بوون لە سەردەمی (مأمون) و (معتصم) و (واثق)، و فەرمانی کرد کە خەڵکی ملکەچ بن و لاسایی و تەقلید بکەن، و فەرمانیشی کرد بە شێخە فەرمووده ناسەکان - هەڵگرانی

پەیڕەوی دەق و ڕێبازی نەقڵی - بە فەرمووده گێڕانەوەو دەرخستنی سوننەت)[1].

شەپۆڵی دژایەتی هزری موعتەزیلە دوای متوكل بەردەوام بوو، جا ئەو كودەتا سیاسیە كۆتایی هات بە كۆدەتایەكی تری هزری، ئەمەش بە چوونەدەرەوەی (أبی حسن الأشعری) (٢٦٠ - ٣٢٤) لە ڕیزەكانیاندا و زۆری بەرپەرچ دانەوەی ئەو بۆ موعتەزیلەكان دوای ئەوەی كە ماوەیەكی زۆر لەناویان مابوویەوە[2].

ئەشعەری سەردەمێكی نوێی دەست پێكرد، كە تیایدا دەسڵاتی موعتەزیلەكان كەوتە لەرزە، ئەویشبە كتێبەكانی دەستی كرد بە بەرپەرچ دانەوەی دژەكانی ئەهلی سوننە بەتایبەتی موعتەزیلە، و بەڕێبازی خۆی پشتی عەقائیدی ئاینی گرت لەسەر پەیڕەوی پێشینان (سلف) بە بەڵگەی عەقڵی. و لەوبارەوە خاوەنی كتێبی (مفتاح السعادة) دەڵێت: (پاڵی نا بەو كتێبانەی كە دانرابوون لەسەر مەزهەبەكانی ئەهلی سوننە، و موعتەزیلەكان بەر لەو كاتە سەریان بەرز كردبۆوە بەڵام ئەشعەری سەركوتی كردن و تا چوونە ناوچاڵەكانی سمسم)[3].

پوختەی قسە ئەوەیە كە سەركردایەتی پەیڕەو و ڕێبازی عەقڵ هەر لەدەستی موعتەزیلەدا مایەوە لە سەرەتای سەدەی دووەم تا كۆتایی سەدەی سێیەمی كۆچی، ئەگەرچی دەسەڵاتی سیاسی هەندێك لە زیادەڕەویی و لادانەكەی كەم كردەوە، بەڵام لەگەڵئەوەشدا (أبی حسن)ی (أشعری) كە ڕێبازێكی میانڕەو و مامناوەندی گرتەبەر لەنێوان پێشینان (سلف) و زیادەڕەوی موعتەزیلە، و ئەشعەری هەڵسا بەچەسپاندنی عەقائیدی ئیمانی بە بەڵگەی عەقڵی... ئەوا گەورەترین كاریگەری هەبوو لە هەژاندنی قەوارەی موعتەزیلەو سەركوت كردنی. و دوای ئەشعەری كۆمەڵە زانایایەكی گەورەو پایەدار پشتیوانی مەزهەبی ئەویان كرد و سەریانخست، لەوانە:

---

(١) المسعودي، مروج الذهب ٢٦٩/٢.

(٢) بڕوانە: الدكتور عرفان عبدالحميد، دراسات في العقائد و الفرق لا ١٣٢.

(٣) طائش كبرا زاده، مفتاح السعادة ٢٣/٢. و بڕوانە: مصطفى عبدالرزاق، تمهيد لتأريخ الفلسفة الاسلامية ٢٨٩.

(القاضي باقلانی) (٤٠٣ك مردووه) و (الاسفرايينی) (٤١٨ك مردووه) و (أبو منصور البغدادی) (٤٢٩ك مردووه) و (امام الحرمين الجوينی) (٤٧٨ك مردووه) و (الغزالی) (٥٠٥ك مردووه) و (الشهرستانی) (٥٤٨ك مردووه) و (فخرالدين الرازی) (٦٠٦ك مردووه) و ناوی (أهل السنه والجماعة)یان نا لە مەزهەبەکە، و ئەوانە هەڵسان بە فراوان کردنی بۆچوون و ڕایەکانی تا بەهۆی کۆششەکانیان قوتابخانەی کەلامی دروست بوو کە هەڵگری ناوی (الاشاعرة و الأشعرية) و ئەو قوتابخانەیە توانی لەگەڵ قوتابخانە هاوشێوەکەی (الماتريدية)[1] دەسەڵات و چوارچێوەکەیان فراوان بکەن بەسەر جیهانی ئیسلامیدا لەسەرەتای سەدەی چوارەمی کۆچییەوە. و لە نێوان هەر دوو قوتابخانەکە (الأشعرية) و (الماتريدية) ململانێ و ڕاجیایی هەبوو لە هەندێ مەسەلەی عەقیدەیی بەڵام بە تێپەڕبوونی کات چارە کراو گەیشتە خاڵی یەکگر.

بەڵام موعتەزیلە وەك قوتابخانەیەکی هزری ئەوا لەناوچوو، بەڵام بۆچوون و تێڕوانینەکانیان هەر ژیان لەناو ئەو تاقمە کەلامیانەی کە هزری ئیسلامی لەدوای خۆی بەجێهێشت بەتایبەتی شیعە کە ڕێبازی عەقڵی پەیڕەو دەکەن وەك موعتەزیلەکان، سەرباری ئەمە ئەو ڕاجیایی و مشتومڕەی لە نێوان هەردوو قوتابخانەی شیعە و موعتەزیلەدا هەیبووە زۆرتر پەیوەست بووە بە بابەتی ئیمامەت.

(کولد زیهر) دەڵێت: (هزری موعتەزیلایەتی تا ئەمرۆش هەر ماوەو جێگیر بووە لە کتێبەکانی شیعەدا، و هەر بەم هۆیەشەوە هەڵەیەکی گەورەیە - چ لەلایەنی مێژووی ئایینی یان مێژووی ویژەیی - کە واگومان ببەین بەوەی موعتەزیلایەتی

---

(١) بەناوی دانەرەکەیە کە (أبی منصور محمد)ی کوڕی (محمد)ی کوڕی (محمود)ی (ماتريدی)ە (٣٣٣ك مردووه)، ئەوانە کۆمەڵەی شەرعناسە حەنەفیەکانن کە موقەلیدەکانی ئیمام (أبی حنيفه) (١٥٠ك مردووه) و دوو هاوەڵەکەی: (أبی يوسف يعقوب)ی کوڕی (ابراهيم الحضرمی)، و (محمد)ی کوڕی (الحسن الشيبانی).

شوێنەوارێکی بەرهەستی نیە پاش ئەو سەرکەوتنە گەورەو یەکلاکەرەوەی کە عەقیدەی ئەشعەری بەدەستی هێنا. دانراوی عەقیدەیی زۆر هەن لەلای شیعە، کە لەسەری دەڕۆن و تەنانەت بەڵگەیەکی بەردەستیشن کە ئەو گومانە پوچەڵ دەکاتەوە، تەنانەت دەتوانرێ کتێبە عەقیدەییەکانی شیعی هەر بە کتێب و دانراوی موعتەزیلی دابنرێن)[1].

لەگەڵ ئەو پلەوپایەی قوتابخانەی ئەشعەری هەیەتی لە ناو جیهانی ئیسلامی دا، ئەوا ئاراستە و شەپۆلی دژایەتی کردنی تێڕوانینی عەقڵی بۆ عەقائید هەر بەردەوام بوو لە ڕیزی ئەهلی (حدیث) و بەتایبەتی حەنبەلیەکان، تەنانەت لەوان هەبوون زۆر بەتوندی دەستیان دەگرت بە دەقەوە بۆیە هەندێ جار ناودەنران دەقییەکان (النصیّون) یان پیتگەڕاكان (الحرفیون) و نەقڵیەکان (النقلیون).

ئەو جەنگ و دژایەتی و هەڵمەتە بۆ سەر زانستی کەلامی سوننی لە پۆشتەی ئەشعەری دا دەستی پێ کرد لە شێخی ئیسلام (أبو اسماعیل الانصاری الهروی) (٤٨١ك مردووە) کە کتێبێکی دانا بەناونیشانی (ذم الكلام وأهله)، دواتر هەڵمەتی حەنبەلیەکان بۆ سەر زانستی کەلام بەردەوام بوو لەدوای (هروی) کە خۆی دەبینیەوە لە کتێبەکانی (ابن قدامه المقدسی) (٦٢٠ك مردووە) و (ابن صلاح الشهرزوری) (٦٤٣ك مردووە) و (ابن تیمیه الحرانی)[2] (٧٢٨ك مردووە) و

---

(١) العقیدة و الشریعة ٩٩، و. د. محمد یوسف موسا و ئەوانی تر.

(٢) ابن تیمیه هەڵسا بە پشتگرتنی مەزهەبی پێشینان (سلف)، و زۆر زیاد بەرپەرچی مەزهەبی ئەشعەریەکانی دایەوە، و زۆر ڕەخنەی توندی لەوان و لە شیعە و لە صۆفیەکان گرت. جا خەڵکی لە ئاست ابن تیمیەدا بوون بە دوو بەشەوە: بەشێك لاسایی دەکاتەوەو هەمان بۆچوونی هەیە و کار بە ڕایەکانیشی دەکات و پێی وایە کە شێخی ئیسلام و لە دیارترین و گەورەترین لەبەرکەر (حافظ)ەکانی ئوممەتی ئیسلامیە. و بەشەکەی تر بە بیدعەچی و گومڕای دادەنێت و ئەوەی بەتاوان لەسەری دادەنێت کە سیفاتەکان دەچەسپێنێت و ڕەخنەی لێ دەگرێت لە چەند مەسەلەیەکدا کە هەندێك لەو مەسەلانە پێشینەی هەیە و واگومان دەبەن کە لە هەندێکی تردا لە یەکدەنگی (اجماع) دەرچووە. شێخ محمدی کوڕی عبدالوهاب دامەزرێنەری بزوتنەوەی

قوتابیەکەی (ابن القیم الجوزیە)[1] (٧٥١ك مردووە).

ئەوانە کاریان کرد لەسەر زیندوو کردنەوەی مەزهەبی پێشینان (سلف) لەسەر ڕێبازی حەنبەلیەکان کە دامەزرابوو لەسەر وەرگرتنی عەقائید لە قورئانی پیرۆزو سوننەتی بەپێز بەتەنها. جا بە توندی بەرگریان کرد لە بەرامبەر ئەو ڕێبازە عەقلیەی کە موعتەزیلە بانگەشەی بۆ دەکرد و لە قوتابخانەی شیعەدا ژیا.

هەروەك بەرگریان کرد لە بەرامبەر ڕێبازی ئەشعەریەکان کە دامەزرابوو لەسەر چەسپاندنی عەقائیدی ئیمانی بە بەڵگەی عەقلی و زۆر بەتووندی ڕووبەڕووی ڕێبازی ئەشعەرییەکانی دوایین بوونەوە ئەوانەی ئالودەی لێکۆڵینەوەی کتێبەکانی فەلسەفەبوون تا وای لێهات هەردوو زانستی (کەلام و فەلسەفە)یان لێ تێکەڵ بوو، و مەسەلەکانی کەلام ئاوێتەی هەندێ مەسەلەی فەلسەفی بوو بەشێوەیەك وای لێهات هیچ یەکێك لەو دوو زانست و هونەرە لەیەك جیا نەدەکرایەوە هەروەك (بیضاوی) (٦٦١ك مردووە) لە کتێبەکەی (الطوالع) و (عضدالدین الایجي) (٧٠٥ك مردووە) لە کتێبەکەی (المواقف)[2] کردوویەتی.

دواتر هیمەتەکان لاواز بوون لە لێکۆڵینەوەی بەهێز بۆ زانستی کەلام تا وای

---

وەهابی لە سەدەی دوازدەی کۆچی هزرو تێڕوانینەکانی ابن تیمیەی جێگیر کردەوەو پشتی پێ بەست و بانگەشەی بۆ کرد و بە جۆش و خرۆش بوو بۆی. ئەو وەهابیانە لە شانشینی عەرەبی سعودی دا زاڵن و شوێنکەوتوویان هەن لە وڵاتە جیا جیاکانی ئیسلامی دا.

(١) بڕوانە: الدكتور عرفان عبدالحميد، دراسات في العقائد و الفرق ١٣٩.

(٢) بڕوانە: الدكتور عرفان عبدالحميد، دراسات في العقائد و الفرق، ٢٩٤. دانراوی: شيخ مصطفى عبدالرزاق. و علم الكلام و بعض مشكلاته، دانراوی: تفتازانی: لە پێشەکیەکەی (لاپەڕە: ب)دا دەڵێت: ((لە ڕاستی دا موتەکەلیمەکانی ئیسلامی بەتایبەتی ئەوانەی دوایین نەوەستان لەلای سنوری چەسپاندنی عەقائید، بەڵکو سنوریان شکان و ڕۆچوون لە چەند مەسەلەیەکدا کە نزیکترە لەوەی بابەتێکی فەلسەفی تەواو بێت، و چەند مەسەلەیەکی سروشتیان وەك پێشەکی بۆ زانست داناوە وەك لێکۆڵینەوە لە جەوهەر(جوهر) و ڕووکەش (عرض) و ئەو بەشەی کە دابەش نابێت و گەردیلە (ذرة) و سروشتی بوونەوەر بەشێوەیەکی گشتی)).

لێهـات دەتـوانین بڵـێین موسـڵمانان شـتێكی نوێیـان نـەهێناوە لـەدوای ئـەوكات و لـە جیهـانی (هـزری ڕەسـەن) شـتێكیان دانـەهێنا، و لـە نـاو لێكۆڵـەرانی كتـێبی پێشـینان تەنها دربڕین گۆڕینەوەو شێواز گۆڕین ماوە، ئەمەش لە چەند كتێبێكی كەمـدا بـەدی دەكرێت كە بە لاوازی و كەموكوریەوە دیاریكردووە[١].

بەڵام ڕابوونی هاوچەرخی زانسـتی كـەلام ئـەوا وەسـتاوەتە سـەر ململانێـی نێـوان دوو قوتابخانە كە یەكەمیان قوتابخانە ئیجتهادی (توفیقیـە[٢]) میانڕەوەكـان لـە ئەشـعەری و ماتریدیەكان و دووەمیان شوێنكەوتووانی مەزهەبی دەق (نـص)، كـە شـوێنكەوتووی ئیمام (تقي الدين ابن تيمية الحراني) و قوتابیەكەی (ابـن قـيم الجوزيـة) كـە نازنـاوی سەلەفیەتیان لەخۆ نا، و سێیەم شوێنكەوتووانی مەزهەبی عـەقڵی كـە شـیعەی دوازدە ئیمامی ئەمڕۆ نوێنەرایەتی دەكات [٣].

---

(١) محمد عبده، رسالة التوحيد ٢٢.

(٢) بۆیە بەئیجتهادم لێكداوەتەوە، چونكە (توفیقی) واتە: شتێكی یەكلایی و جێگیر بوو نییە كە ڕاوبۆچوون هەڵنەرگرێت. و (توقیفی) ئەوەیە كە بواری ڕاو بۆچوون و ئیجتهادی تێدا نەبێت، پشت بە سروش ببەستێت. (وەرگێڕ).

(٣) الدكتور عرفان عبدالحميد، دراسات في العقائد و الفرق ١٤٩.

## دەروازەی سێیەم

# بنەماكانی ئایینی ئیسلام

مەبەستمان لە بنـەماكانی ئـایین ئـەو بناغـەو بنچینانەن كە ئـایین جـەختی لـێ دەكاتەوەو لەسەری دادەمەزرێت و ئەو بنچینانەن كە بـاوەڕی لەسـەر بنیاتـدەنرێت، و بە نەمانی هەریەك لەم بنەمایانە باوەڕ نامێنێت.

موسـڵمانان ڕاجیاییـان هـەبووە سـەبارەت بـەو شـتەی كـە لـە بنـەماكانی ئـایین دادەنرێت و ئەو شتەش كە لێی ئەژمار ناكرێت، هـەر لەبەرئەمـەش بنـەماكانی ئـایین لەلایـەن گـرنگترین تاقمـەكان دەخەمـەڕوو، پاشـان ئـەوەی بـاس دەكـەین كـە هـەموو تاقمـەكان لەسـەری كـۆك بوونـە و ئـەوەش كـە هـەر تاقمێـك بەتـەنیا و تایبـەت وەك بنەما دایناوە.

### ١- ئەهلی سوننە

زۆربـەی ئـەهلی سـوننە یەكـدەگن لەسـەر ئـەوەی بنـەماكانی ئـایین (بنـەماكانی باوەڕ) شەشن كە بریتین لە:

١- باوەڕ بە خوا.

٢- باوەڕ بە فریشتەكان.

٣- باوەڕ بە كتێبە ئاسمانیەكان.

٤- باوەڕ بە پێغەمبەران.

٥- باوەڕ بە ڕۆژی دوایی.

٦- باوەڕ بوون بە قەدەر چ خێرو چاكە یان شەڕو خراپە بێت.

### بنەمای یەكەم: باوەڕ بە خوا

بریتیـە لـەوەی مـرۆڤ بـاوەڕی بـەبوونی خـوا و تـاك و تەنهاییەكـەی هـەبێت، و باوەڕی بەوە هەبێت كە هەرگیز هاوشێوەو هاوێنەی نیە، و تـەنها زاتـی ئـەوە خـاوەنی

هەموو سیفاتی تەواو و کامڵ هەر لە دادگەری و حیکمەت و دانایی و زانست .... و پاك و بێ گەردە لە هەموو سیفاتە کەم و کورتەکان لە ستەم و بەدخویی ...

## بنەمای دووەم: باوەڕ بە فریشتەکان

فریشتەکان جەستەیان نوورانیە، هێزێکی دەرئاسایان هەیە کە زۆر لە توانای هێزی مرۆڤ بەرزترە، چەند ئەرکێکیان هەن بە ڕاستگۆیی و دڵسۆزی ئەنجامی دەدەن، و پارێزراون لەوەی هەڵەبکەن چ بە ئەنقەست چ بە لە بیرچوونەوە:﴿ لَّا يَعۡصُونَ ٱللَّهَ مَآ أَمَرَهُمۡ وَيَفۡعَلُونَ مَا يُؤۡمَرُونَ ﴾ التحريم: ٦.واته: (نا فەرمانی خوا ناکەن لە هیچ شتێکدا کە فەرمانیان پێ بدات و هەرچی فەرمانێکیان پێ بدرێت ئەنجامی دەدەن). بوونی فریشتەکان بە بەڵگەی بڕەڕ (قطعي)ی قورئان و سوننەت چەسپاوە:﴿ ءَامَنَ ٱلرَّسُولُ بِمَآ أُنزِلَ إِلَيۡهِ مِن رَّبِّهِۦ وَٱلۡمُؤۡمِنُونَۚ كُلٌّ ءَامَنَ بِٱللَّهِ وَمَلَٰٓئِكَتِهِۦ وَكُتُبِهِۦ وَرُسُلِهِۦ لَا نُفَرِّقُ بَيۡنَ أَحَدٖ مِّن رُّسُلِهِۦۚ وَقَالُواْ سَمِعۡنَا وَأَطَعۡنَاۖ غُفۡرَانَكَ رَبَّنَا وَإِلَيۡكَ ٱلۡمَصِيرُ ﴿٢٨٥﴾ ﴾ البقرة: ٢٨٥. واته: (پێغەمبەرو ئیمانداران باوەڕیان هەیە بەوەی لەلایەن پەروەردگاریان هاتۆتە خوارەوە، هەموویان باوەڕیان هەیە بە خواو فریشتەکانی و کتێبەکانی و پێغەمبەرەکانی "دەڵێن" هیچ جۆرە جیاوازییەك ناکەین لە نێوان هیچ پێغەمبەرێك لە پێغەمبەرەکانی خوادا "لەباوەڕدا"، هەروەها وتیان: گوێڕایەڵ و ملکەچین (بۆ بەدیهێنەرمان) پەروەردگارا لێخۆشبوونی تۆمان دەوێت و سەرەنجام هەر بۆ لای تۆیە گەڕانەوە). و باوەڕ بوون بە فریشتەکان لەلایەن عەقڵ ناچێتە خانەی ئەو شتانەی ئەستەمن، بەڵکو دەچێتە خانەی ئەو شتانەی کە بوونیان دروست (جائز)ە لەلایەن عەقڵەوە: (ئالێرەدا نکۆڵی کردن و باوەڕ نەبوون بە بوونی فریشتەکان کوفرە بە یەکدەنگی موسڵمانان، بەڵکو بەدەقی فەرمایشتی خوای گەورە: ﴿ وَمَن يَكۡفُرۡ بِٱللَّهِ وَمَلَٰٓئِكَتِهِۦ وَكُتُبِهِۦ وَرُسُلِهِۦ وَٱلۡيَوۡمِ ٱلۡأٓخِرِ فَقَدۡ ضَلَّ ضَلَٰلَۢا بَعِيدًا ﴾ النساء: ١٣٦. واته: (ئەوەی باوەڕی نەبێت بە خواو بە

فریشتەکانی و بەکتێبەکانی و بە پێغەمبەرانی و بە ڕۆژی دوایی، ئەوا بەڕاستی گومڕابووەو بەوپەڕی گومڕایی). باوەڕ بوون بە پێغەمبەرێتی محمد (ﷺ) و دابزینی قورئان بۆی باوەڕ بە فریشتەکان پێویست دەکات، چونکە نکۆڵی کردنی بوونی فریشتەکان نکۆڵی کردنە لە پێغەمبەرێتی محمد (ﷺ) و قورئانی پیرۆز بەیەکەوە)[1].

## بنەمای سێیەم: باوەڕ بە کتێبە ئاسمانیەکان

شتێکی گومان هەڵنەگرە کە هەر پێغەمبەرێك کە بۆ گەلەکەی نێردراوە ڕاسپاردەی ئاسمانی پێ بوو کە ئامانجی بووە پەیوەندی تاکەکانی ئەو ئوممەتە ڕێکبخات لەگەڵ بەدیهێنەر. و دواتر ڕێکخستنی ژیانی تاکەکان و پەیوەندییان لەگەڵ یەکتری و لەگەڵ ئوممەت و گەلانی تردا، قورئانی پیرۆز ناوی چەند کتێبێکی لەوانە بۆ ئێمە باس کردووە کە ڕاسپارەی خوایی لەخۆی گرتووە لەوانە (صحف)ی (ابراهیم) و (توراة)ی (موسا) و (انجیل)ی عیسا.

ئیسلام داوای لە ئێمە کردووە کە باوەڕمان بە سەرجەم ئەو کتێبانە هەبێت کە ڕەوانە کراون بەشێوەیەکی گشتی بەڵام - خوای گەورە - لە قورئانی پیرۆزدا ئێمەی پابەند کردووە بە کارکردن بە قورئانی پیرۆز، چونکە هەموو ڕاسپاردە خواییەکان لەخۆ دەگرێت، و ناوەڕۆکی کتێبەکانی پێشخۆی لەخۆیدا هەڵگرتووە: ﴿ وَأَنزَلۡنَآ إِلَيۡكَ ٱلۡكِتَٰبَ بِٱلۡحَقِّ مُصَدِّقٗا لِّمَا بَيۡنَ يَدَيۡهِ مِنَ ٱلۡكِتَٰبِ وَمُهَيۡمِنًا عَلَيۡهِۖ فَٱحۡكُم بَيۡنَهُم بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُۖ وَلَا تَتَّبِعۡ أَهۡوَآءَهُمۡ عَمَّا جَآءَكَ مِنَ ٱلۡحَقِّۚ لِكُلّٖ جَعَلۡنَا مِنكُمۡ شِرۡعَةٗ وَمِنۡهَاجٗا ﴾ المائدة: ٤٨. واتە: (ئێمە قورئانمان هاوڕێ لەگەڵ هەموو حەقیقەت و ڕاستیەکدا بۆ تۆ دابەزاندووە، ڕاستی و دروستی کتێبەکانی پێش خۆیشی دیاری دەکات و چاودێرە بەسەر هەموویاندا "کاتێك خاوەنانی کتێب لە گاوڕو جوو گیروگرفتیان دەهێنن بۆ

(١) كبرى اليقينيات الكونية ٢٩٢، للدكتور محمد سعيد رمضان البوطي.

لای تۆ" بەوبەرنامەیەی خوا ناردوویەتی داوەری بکە لە نێوانیاندا و شوێن ئارەزووەکانی ئەوان مەکەوەو لەو حەقە لامەدە کە بۆت ڕەوانەکراوە، بۆ هەر لایەکتان "موسڵمانان و خاوەنانی کتێب" بەرنامەو پرۆگرامی تایبەتمان بڕیارداوە).

## بنەمای چوارەم: باوەڕ بە پێغەمبەران

حیکمەت و دانایی خوای گەورە وابوو کە بۆ هەموو نەتەوەو گەلێك پێغەمبەر ڕەوانە بکات، تا ئاشنابن بە پەیامی خواو فێری حیکمەت و بانگیان بکات بۆ پەرستی خوای بالادەست بەتەنها: ﴿ وَلَقَدۡ بَعَثۡنَا فِي كُلِّ أُمَّةٖ رَّسُولًا أَنِ ٱعۡبُدُواْ ٱللَّهَ وَٱجۡتَنِبُواْ ٱلطَّٰغُوتَ ﴾ النحل: ٣٦. واتە: (سوێند بەخوا بێ گومان ئێمە لەناو هەر گەل و نەتەوەیەکدا پێغەمبەرێکمان ڕەوانە کردووەو پێمان ڕاگەیاندووە، کە پێیان بڵێت: تەنها خوا بپەرستن و خۆتان دوورە پەرێز بگرن لە هەموو پەرستراوێکی تر). لە پێناو یەکێتی و یەکگرتوویی ئەو بانگەوازەی پێغەمبەران، ئەوا ئیسلام داوای لە شوێنکەوتووانی کردووە کە باوەڕ بە ڕاستێتی هەموو پێغەمبەرانی خوا بکەن - بەشێوەیەکی گشتی - و نکوڵی نەکەن لە پێغەمبەرێتی هیچ یەکێکیان ﴿ لَا نُفَرِّقُ بَيۡنَ أَحَدٖ مِّن رُّسُلِهِۦ ﴾ البقرة: ٢٨٥. واتە: ("دەڵێن" هیچ جۆرە جیاوازییەك ناکەین لە نێوان هیچ پێغەمبەرێك لە پێغەمبەرەکانی خوادا "لە باوەڕدا"). هەروەك ئیسلام فەرمانی بە شوێنکەوتووانی کردوە کە بڕوا بێنن بەوەی ئەو پێغەمبەرانە خاوەنی باشترین و چاکترین سیفاتی مرۆیی بوونە لە دەستپاکی و ڕاستگۆیی و زیرەکی و پاك و دووریش بوونە لە ڕەوشتە نزم و پەست و کەموکورتەکان لە خیانەت و درۆ و گێلی.﴿ وَجَعَلۡنَٰهُمۡ أَئِمَّةٗ يَهۡدُونَ بِأَمۡرِنَا وَأَوۡحَيۡنَآ إِلَيۡهِمۡ فِعۡلَ ٱلۡخَيۡرَٰتِ وَإِقَامَ ٱلصَّلَوٰةِ وَإِيتَآءَ ٱلزَّكَوٰةِۖ وَكَانُواْ لَنَا عَٰبِدِينَ ٧٣ ﴾ الأنبياء: ٧٣. واتە: (هەموو ئەوانیشمان کردە پێشەواو بە فەرمانی ئێمە ڕێنمووییی خەڵکیان دەکردو نیگامان بۆ کردن بە ئەنجامدانی کارو کردەوە چاکەکان و ڕاگرتنی نوێژ و زەکات دان، (بەڕاستی) ئەوان هەر ئێمەیان دەپەرست و هەر بەندایەتی ئێمەیان دەکرد).

## بنەمای پێنجەم: باوەڕ بە ڕۆژی دوایی

بریتیە لەوەی مرۆڤ باوەڕی هەبێت بە بوونی ژیانێکی تر جگەلە ژیانی ئەم دونیایە، ئەمەش بەوەی خوای گەورە بوونەوەر زیندوو بکاتەوە پاش مردنیان بۆ لێ پێچینەوەو سزاو پاداشت:﴿ لِيَجْزِيَ ٱلَّذِينَ أَسَٰٓـُٔواْ بِمَا عَمِلُواْ وَيَجْزِيَ ٱلَّذِينَ أَحْسَنُواْ بِٱلْحُسْنَى ﴾ النجم: ٣١. واتە: (بۆ ئەوەی تۆڵە بسێنێت لەوانەی کە خراپەیان کردووە بەگوێرەی کردەوەکانیان، پاداشتی ئەوەش کە چاکەیان کردووە بە چاکترین شێوە بداتەوە).

﴿ زَعَمَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوٓاْ أَن لَّن يُبْعَثُواْۚ قُلْ بَلَىٰ وَرَبِّي لَتُبْعَثُنَّ ثُمَّ لَتُنَبَّؤُنَّ بِمَا عَمِلْتُمْۚ وَذَٰلِكَ عَلَى ٱللَّهِ يَسِيرٌ ﴿٧﴾ ﴾ التغابن: ٧. واتە: (ئەوانەی بێ باوەڕ بوون بە بۆچوونی خۆیان وتیان: هەرگیز زیندوو ناکرێنەوە، پێیان بڵێ: وا نییە، سوێند بە پەروەردگارم، بەڕاستی هەر زیندوو دەکرێنەوە، پاشان ئاگادار دەکرێن لە هەموو ئەو کارو کردەوانەی کە ئەنجامتان دەدا ئەوەش بۆ خوا زۆر ئاسان و سادەیە).

﴿ قَدْ خَسِرَ ٱلَّذِينَ كَذَّبُواْ بِلِقَآءِ ٱللَّهِۖ حَتَّىٰٓ إِذَا جَآءَتْهُمُ ٱلسَّاعَةُ بَغْتَةً قَالُواْ يَٰحَسْرَتَنَا عَلَىٰ مَا فَرَّطْنَا فِيهَا ﴾ الأنعام: ٣١. واتە: (بەڕاستی ئەوانەی کە بڕوایان بە ئامادەبوونی بەردەم (دادگای) خوایی نەبوو زەرەریان کرد و خۆیان دۆڕاند، کاتێکیش قیامەت کتوپڕ یەخەیان پێدەگرێت، دەڵێن: ئاخ و داخ و پەشیمانی بۆ ئەو ڕۆژگارەی کە بە کەمتەرخەمی و (بەڕەڵایی و سەرکەشی و تاوان) بردمانە سەر). ﴿ قَٰتِلُواْ ٱلَّذِينَ لَا يُؤْمِنُونَ بِٱللَّهِ وَلَا بِٱلْيَوْمِ ٱلْأَخِرِ ﴾ التوبة: ٢٩. واتە: ("ئەی ئیمانداران" دژی ئەوانەی کە باوەڕی "ڕاست و دروستیان" بەخواو بەڕۆژی قیامەت نییە بجەنگن).

## بنەمای شەشەم: باوەڕ بە قەزاو قەدەر چ خێرو چاکە یان خراپە بێت

دوای ئەوەی حیکمەت و کارلەجێی خوای گەورە وای خواست بەندەکان بەدیبهێنێت، ئەوا وازی لێ نەهێنان بە سەرگەردانی بەڵکو پێغەمبەرانی بۆ ڕەوانە کردوون: ﴿ رُّسُلًا مُّبَشِّرِينَ وَمُنذِرِينَ لِئَلَّا يَكُونَ لِلنَّاسِ عَلَى ٱللَّهِ حُجَّةُۢ بَعْدَ ٱلرُّسُلِ ﴾

النساء: ١٦٥. واتە: (پێغەمبەرانمان "ڕەوانە كردووە" كە مژدەدەرن "بە ئیمانداران" و ترسێنەرن بۆ "یاخیەكان"، تا خەڵكی هیچ بەڵگەیەكیان بەدەستەوە نەمێنێت "لەسەر بێ دینی و یاخی بوونیان" دوای ئەوەی خوا پێغەمبەرانی بۆ ڕەوانە كردوون).

كتێبەكانی خۆی بۆ ڕەوانە كردووەو ئاكامی ڕێنمایی و هیدایەت و سەركەشی و یاخی بوونی بۆ ڕوون كردۆتەوە ﴿وَهَدَيْنَاهُ النَّجْدَيْنِ﴾ البلد: ١٠. واتە: (ئایا سەرپشكمان نەكردوون لە شوێنكەتنی ڕێبازی ڕاست یان چەوت). و پاش ڕوونكردنەوەی ئەوە بۆیان... ئەوا ویستێكی سەربەخۆی پێبەخشیون تا بە ئازادیەكی تەواو لە ژیاندا هەڵسوكەوت بكەن، هەر شتێ یان هەر كارێ ویستی لەسەر بێت دەیكات و هەرچی ویستیشی لێ نەبێت نایكات ﴿وَقُلِ ٱلۡحَقُّ مِن رَّبِّكُمۡۖ فَمَن شَآءَ فَلۡيُؤۡمِن وَمَن شَآءَ فَلۡيَكۡفُرۡ﴾ الكهف: ٢٩. واتە: (پێیان بڵێ: حەق هەر ئەوەیە كە لەلایەن پەروەردگارتانەوە بۆتان ڕەوانەكراوە، جا ئەوەی دەیەوێت با باوەڕ بێنێت و ئەوەی دەیەوێت با كافرو بێ باوەڕ بێت). بەڵام خوای گەورە ئاگاداری هەموو كردەوەی بەندەكانیەتی و ئەوەی زانیوە بە زانستە فراوانەی كە هیچ شتێك دەوری نادات، كە بەندەكانی چاكە یان خراپە ئەنجام دەدەن، و هیدایەت یاخود گومڕایی قبوڵ دەكەن، گشت ئەم شتانە لە كتێبێكدا تۆماری كردوون﴿لَا يُغَادِرُ صَغِيرَةً وَلَا كَبِيرَةً إِلَّآ أَحۡصَىٰهَا﴾ الكهف: ٤٩. واتە: (هیچ گوناهێكی وردو درشت بەجێ ناهێڵێت بەڵكو هەمووی تۆمار كردووە). ﴿إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَخۡفَىٰ عَلَيۡهِ شَيۡءٞ فِي ٱلۡأَرۡضِ وَلَا فِي ٱلسَّمَآءِ ۝٥﴾ آل عمران: ٥. واتە: (بێگومان هیچ شتێك لە خوا وون نابێت نە لە زەوی و نە لە ئاسماندا).

قەزا، بریتیە : (لەو زانستەی خوا كە فراوانەو دەوری هەموو شتێكی داوە لەوەی كە بووەو دەبێت، و هەرچیش ڕوودەدات تا ڕۆژی سزاو پاداشت).

قەدەر: بریتیە لە: (ڕوودانی ڕووداوەكانە لە كات و كەسەكاندا بەپێی ئەوەی كە

له زانستی خوای دانا و كارلەجێ دا هەبووه).

واتای باوەڕ پێبوونیان: ئەوەیه بڕوات وابێت كه هەر شتێك تووشی مرۆڤ دێت له چاكه و خراپه ئەوا به پێی ئەندازەگیری و زانستی خوای باڵادەست و خاوەن شكۆ ڕوودەدات.

ئەوەی جێگای هۆشداری دانه لەسەری ئەوەیه كه خوای گەوره زانستی تەواوی هەیه لەبارەی بەندەكانی چی دەكەن و چیان لێ دەپشكوێتەوه بەپێی ئەو زانست و ئەندازەیه، ئەوه مانای وانیه كه بەندەكان ناچارن لەو كردەوانەیاندا، و پابەندن به ئەنجامدانی ئەو كارانه، چونكه ئەگەر ئەوه ڕوویدا ئەوا پرۆسەی سزاو پاداشت و مژده و ترساندن و فەرمان و هەڕەشه پوچەڵ دەبێتەوه، بەڵكو مرۆڤ خۆی هێڵی كارەكانی دیاری دەكات و ڕێگای خۆی هەڵدەبژێرێت:﴿ فَمَن يَعْمَلْ مِثْقَالَ ذَرَّةٍ خَيْرًا يَرَهُ ﴿٧﴾ وَمَن يَعْمَلْ مِثْقَالَ ذَرَّةٍ شَرًّا يَرَهُ ﴿٨﴾ ﴾ الزلزلة: ٧ - ٨. واته: (جا ئەوەی بەقەدەر سەنگی گەردیلەیەك خێرو چاكەی ئەنجام دابێت دەیبینێتەوه. ئەوەش كه بەقەدەر سەنگی گەردیلەیەك شەڕو خراپەی هەبێت دەیبینێتەوه).

بنەماكانی ئیسلام لەلایەن ئەهلی سوننه بریتین لەو بنەمایانەی كه له فەرمایشتی پیرۆزی پێغەمبەردا هاتوون: (ئیسلام لەسەر سێ بنەما و كۆڵەگه دامەزراوه:

١- شایەتی دان كه هیچ پەرستراوێك نییه جگەله - الله - و محمد نێردراوی خوایه.

٢- نوێژ بەرپاكردن.

٣- زەكات دان.

٤- گرتنی ڕۆژووی مانگی ڕەمەزان.

٥- حەج كردن و چوون بۆ ماڵی خوا [(١)]، بۆ ئەو كەسەی كه توانای هەیه).

---

(١) متفق علیه، (بخاری) و (مسلم) له كتێبی (ایمان) دا هێناویانه./ اللؤلؤ و المرجان في ما اتفق علیه الشیخان ٣-٤.

## ٢- شیعەی ئیمامی

زۆربەی شیعەی دوازدە ئیمامی كۆكن لەسەر ئەوەی بنـەماكانی ئـایین پێـنجن، كـە بریتین لەمانە:

١- خوابەیەكزانین.

٢- دادگەری.

٣- پێغەمبەرێتی.

٤- ئیمامەت.

٥- ڕۆژی دوایی.

## بنەمای یەكەم: خوابەیەكزانین

بریتیە لە باوەڕ بوون بەوەی خوا تاكە و بێ هـاوەڵ و هاوتایـە، و خوابەیـەكزانین (توحید) دابەش دەبێت بۆ چوار بەش:

١- خـوا بەیـەكزانین لـە زاتـی پیرۆزیـدا (توحیـده في الـذات): بریتیـە لـە بـاوەڕ بـوون بەوەی خوای پاك و بێگەرد هـیچ هـاوەڵێكی نیـە كـە بـەخودی خـۆی بـوونی پێویسـت بێت.

٢- خوا بەیەكزانین لە سیفاتدا: بریتیە لە باوەڕ بـوون بـەوەی كـە سـیفاتەكانی خـوای گەورە هاوێنەی نیە، و سیفاتەكانی خودی زاتی خوای گەورەن.

٣- خوا بەیەكزانین لە پەروەردگارێتی و كردەوەدا: باوەڕ بوون بـەوەی هـیچ كارتێكـەر و كاریگەرێكی حەقیقی لـە بوونـدا نیـە جگەلـە خـوای گـەورە، هـەر خـوا بەدیهێنـەرو ڕۆزیدەرو ژیێنەرو مرێنەرە..... تاد.

٤- خوا بەیەكزانین لە پەرستراوێتی و پەرستشـدا: بریتیـە لـەوەی تـەنها خـوای گـەورە بپەرسترێت و هـیچ كەسـێك لەمـەدا نەكرێتـە هاوبەشـی:﴿ وَٱعۡبُدُواْ ٱللَّهَ وَلَا تُشۡرِكُواْ بِهِۦ شَيۡـٔٗاۖ ﴾ النساء: ٣٦. واتە: ("ئەی خەڵكینە" تەنها خوا بپەرستن و هـیچ جـۆرە شـەریك و هاوەڵێكی بۆ بڕیـار مـەدەن). ﴿ أَنِ ٱعۡبُدُواْ ٱللَّهَ مَا لَكُم مِّنۡ إِلَٰهٍ غَيۡرُهُۥٓۚ أَفَلَا تَتَّقُونَ ﴾ المؤمنـون: ٣٢. واتە: (تەنها خوا بپەرستن، جگەلەو زاتە خوایەكی ترتان نیە).

## بنەمای دووەی: دادگەری

دادگەری لە زمانەوانیدا پێچەوانەی ستەمە، و وشەی ڕاستی (حق) و ئینصاف هاومانای دادگەرین، و ستەم لە زمانەوانیدا بەچەند واتایەك لێكدراوەتەوە، لەو واتایانە: دانانی شت لە غەیری جێگای خۆی، و ماف خواردن، هەروەك لەو فەرمایشتەی خوای گەورەدا هاتووە:﴿ وَلَمۡ تَظۡلِم مِّنۡهُ شَيۡـًٔا ﴾ الكهف: ٣٣. واتە: (هیچی لێ خەسار نەبووە)(١).

بەڵام ستەم لە زاراوەی شەرعیدا، لە كاتی توێژینەوەو تەفسیری ئەو ئایەتەدا ﴿ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَظۡلِمُ مِثۡقَالَ ذَرَّةٖۖ وَإِن تَكُ حَسَنَةٗ يُضَٰعِفۡهَا وَيُؤۡتِ مِن لَّدُنۡهُ أَجۡرًا عَظِيمٗا ﴾ النساء:٤٠. واتە: (بەڕاستی خوا بە قەدەر تۆزقاڵێك ستەم (لە ئادەمیزاد) ناكات، خۆ ئەگەر چاكەیك هەبێت "بەرەكەتی بەسەردا دەڕێژێت و" چەند بەرابەری دەكات و لەلایەن خۆیەوە پاداشتی گەورەو بێ سنور دەبەخشێت "بەچاكە خوازان"). ئەوا شێخ (طبرسی) ستەمی بەوە لێكداوەتەوە:( ستەم ئەو ئازارایە كە سودی نیە و لەسەری دەمرێت، و لادانی هیچ زیانێك لەو گەورەتر نیە چ لە ئێستا چ لە داهاتوودا، و شیاو نییە، وەك خۆی نایەتەجێ، بنچینەكەی بریتیە لە دانانی شت لە غەیری شوێنی خۆی، و وتراوە بنچینەكەی لە خەسار بوون و بەفیڕۆدان (انتقاص) هاتووە لەو فەرمایشتەی خوای گەورە ﴿ وَلَمۡ تَظۡلِم مِّنۡهُ شَيۡـًٔا ﴾، جا بەم پێیە ستەم بریتیە لە فەوتاندن و بەفیڕۆدانی ماف) تا دەڵێت:(خوای گەورە ستەم هەڵنابژێرێ و ستەم كردن بۆ خوای گەورە نەشیاوە، چونكە خوا زانایە كە ستەم ناشرینە و تەنانەت پێویستیشی پێ نیە، و زاناشە كە خۆی دەوڵمەندە و پێویستی بە ستەم نیە، چونكە كەسێك شتی ناشرین و خراپ هەڵدەبژێرێت كە خۆی نەزان بێت بە ناشرینی و

(١) دانەر مەبەستی لە خستنەڕووی ئایەتەكە ڕوونكردنەوەی ستەم و زۆرداریيە، بەڵام من كە لە تەفسیری ئاسان: بورهان محمد أمین، نەقڵم كردووە وەك خۆیم داناوەتەوە بۆ ئەوەی ناوكۆ (سیاق)ی ئایەتەكە تێك نەچێت. (وەرگێڕ).

خراپی ئەو شتە یان بۆ ئەوە پەنا بۆ ئەو شتە خراپە دەبات تا زیانێك لەسەر خۆی لابدات یان سودێك دەستبخات یاخود نەزانە بەوەی پێویستی پێی نیە، و خوای گەورە پاكە لە هەموو ئەو شتانە و پاكە لە هەموو ئەو سیفاتانەی كەموكورتن و پاكیشە لەدەستەوەسانی)[1].

## بنەمای سێیەم: پێغەمبەرایەتی

پێغەمبەرایەتی ئەركێكی خواییە، خوای گەورە تایبەت دەیبەخشێت بەو بەندەیەی كە خۆی ویستی لەسەرە، ئەمەش میهرو بەخششی (لطف) خواییە كە بەسەر بەندەكانی دا دەڕێژێت، و مەبەست لە میهرو بەزەیی (لطف) ئەوەیە كە مرۆڤ لەگەڵیدا نزیكتر دەبێت لە گوێڕایەڵی و دوورتر دەكەوێتەوە لە تاوان، و پێغەمبەر ئەو سوودە بەرپا دەكات، و ئەو فەرمایشتەی خوای گەورە ئاماژە بۆ ئەوە دەكات: ﴿ وَلَوۡ أَنَّآ أَهۡلَكۡنَٰهُم بِعَذَابٖ مِّن قَبۡلِهِۦ لَقَالُواْ رَبَّنَا لَوۡلَآ أَرۡسَلۡتَ إِلَيۡنَا رَسُولٗا ﴾ طه: ١٣٤. واتە: (خۆ ئەگەر بەڕاستی ئێمەیش پێش ناردنی قورئان بۆ پێغەمبەر لەناومان ببردنایە، ئەوە دەیانوت: پەروەردگارا، بۆچی پێغەمبەرێكت بۆ ڕەوانە نەكردین). جا مادام وایە حاڵەتەكە وادەخوازێت كە خوای گەورە پێغەمبەر ڕەوانە بكات بۆ ڕوونەكردنەوەی ئەحكام و یاساكان، و حەڵاڵ و حەرامیان پیشان بدات، و سزای تاوانەكان جێبەجێ بكات و مافی ستەملێكراو لە ستەمكار وەربگرێت و داوەری بكات لە نێوان خەڵكدا بە دادپەروەرانە: ﴿ لِئَلَّا يَكُونَ لِلنَّاسِ عَلَى ٱللَّهِ حُجَّةُۢ بَعۡدَ ٱلرُّسُلِ ﴾ النساء: ١٦٥. واتە: (تا خەڵكی هیچ بەڵگەیەكیان بەدەستەوە نەمێنێت).

پێویستە لەسەر موسڵمان باوەڕی هەبێت بە گشت پێغەمبەرانی خوا - بەگشتی - و باوەڕی هەبێت بە پێغەمبەرێتی محمد (ﷺ) بەشێوەیەكی تایبەت، چونكە باوەڕ بوون پێی بنەمایەكە لە بنەماكانی ئایینی ئیسلام.

---

(١) مجمع البيان: ٣/٤٨.

## بنەمای چوارەم: ئیمامەت

بریتیـه لـه سـەرۆكایەتی گشـتی لـه كاروبـاری دیـن و دونیـا، ئەمـەش بـۆ كەسـێك دەبێـت وەك بریكـارو جێگـرەوەی پێغەمبـەر، و شـیعەی ئیمـامی بـاوەڕی وایـە كـە ئیمامەت پلەیەكی خواییە، هەروەك چۆن بۆیە خوای گەورە كەسانێك هەڵدەبـژێرێت بۆ پێغەمبەرێتی و پەیامبەری بەو یستی خۆی، ئەوا بەهـەمان شـێوە بـۆ ئیمامـەتیش ئەو كەسە هەڵدەبژێرێت كە ویستی لەسەرە، و فەرمان بـە پێغەمبەرەكەی دەكات كـە بە دەق (نص) دیاری بكات، و بیكاتە ئیمـامی خـەڵكی لـە دوای خـۆی، بـۆ هەڵسان بـە ئەنجامـدانی ئـەو ئـەرك و كاروبارانـەی كـە پێغەمبـەر پێـی هەڵدەسـێت، تـەنها ئـەوە نـەبێت ئیمـام سـروش و نیگـای بـۆ نایـەت وەك پێغەمبـەر، بـەڵكو ئـەحكام لـە پێغەمبـەرەوە وەردەگرێـت خـوای گـەورەش ڕاسـتەڕێ دەكـات، جـا پێغەمبـەر پـەیامی خوا دەگەیەنێت، و ئیمامیش پەیامی پێغەمبەر دەگەیەنێت[1].

## بنەمای پێنجەم: ڕۆژی دوایی

واتە خوای گـەورە بوونـەوەر زینـدوو دەكاتـەوە لـەدوای مـردن بـۆ ژیـانێكی تـر تـا هەر كەسێك پاداشـت و سـزای لەسـەر ئـەوە وەربگرێتـەوە كـە پێشـتر ئـەنجامی داوە، و پێویستە لەسەر تاكی موسڵمان كە باوەڕی هەبێت كە خوای گـەورە بوونـەوەر زینـدوو دەكاتـەوە دوای مـردن بـۆ سـزاو پاداشـت بـە ڕۆح و جەسـتە لەسـەر ئـەو شـێوەی كـە هـەیانبووە لـە دونیـادا:﴿ فَمَن يَعۡمَلۡ مِثۡقَالَ ذَرَّةٍ خَيۡرٗا يَرَهُۥ ﴿٧﴾ وَمَن يَعۡمَلۡ مِثۡقَالَ ذَرَّةٖ شَرّٗا يَرَهُۥ ﴿٨﴾ ﴾ الزلزلـة: ٧ - ٨. واتـە: (جـا ئـەوەی بەقـەدەر سـەنگی گەردیلەیەك خێرو چاكەی ئەنجام دابێت. ئـەوەش كـە بەقـەدەر سـەنگی گەردیلەیـەك شەڕو خراپەی هەبێت دەیبینێتەوە).

---

(١) أصل الشيعة و أصولها ٩٨، دانـراوی: شیخ محمد حسین آل كاشف الغطاء.

## ٣- موعتەزیلە

موعتەزیلە کۆکن لەسەر ئەوەی بنەماکانی ئایین پێنجن، کە بریتین لە:

١- خوابەیەکزانین.

٢- دادگەری.

٣- پلەیەك لە نێوان دوو پلەکە.

٤- پەیماندان بە باوەڕداران و هەڕەشە لە یاخی و بێ باوەڕان (الوعد و الوعید).

٥- فەرمان بەچاکە و ڕێگری لە خراپە[١].

## بنەمای یەکەم: خوابەیەکزانین

بریتیە لە نکۆڵی کردن لە بوونی چەند خوایەك و باوەڕبوون بەوەی خوای گەورە تاکە، هیچ شتێ جگەلە زاتی ئەو بەشدار نیە لەو سیفاتانەی کە شیاوی ئەون چ بە بوونی یان بە نەبوون. و پێویستە دان بنرێت بەمەدا، بۆیە جەنگیان دژی بتپەرستانی فارس گەرم بوو کە باوەڕیان بە بنەمای ڕووناکی و تاریکی هەیە، و موعتەزیلە نکۆڵیان کرد لە سیفاتە کۆنەکان کە زیادن لە زاتی پەروەردگار، بۆیە وتیان: خوا بە زاتی خۆی زانایە و بەتوانایە و زیندووە، نەوەك بە زانست و توانا و ژیان[٢].

## بنەمای دووەم: دادگەری

واتای ئەوەیە کە خوای گەورە دادگەرە، مادام دادگەرە - مرۆڤی ئەرکدارو ڕاسپاردووە - ئەوا پێویستە توانا ویستێکی وای پێ ببەخشێت کە مرۆڤ خۆی ببێتە دروستکەری کردەوەکانی کە بەرپرسە لێی و خوای گەورە کاریگەری نەبێت لەمەدا، ئەو بنەمایەش ئاراستەیە دژی (جبریە)کان کە دەیان وت: خوا بە دیهێنەری هەموو شتێکە و تەنانەت بکەرو ئەنجامدەر (فاعل)ی هەموو شتێکە و ئەنجامدەری کارەکانی

(١) بڕوانە: هذه الأصول في شرح الأصول الخمسة للقاضي عبدالجبار بن أحمد.

(٢) بڕوانە: الملل و النحل ١/ ٤٤، للشهرستانی. و مذاهب الاسلامیین ١/ ٥٨، للدكتور عبدالرحمن البدوی.

مرۆڤیشە. بەشێوەیەك كە مرۆڤ ناچار (مجبر) و دەستەمۆ (مسیر) دەبێت لە هەموو شتێكیدا وەك هەر شتێكی ناو سروشت.

## بنەمای سێیەم: پلەیەك لە نێوان دوو پلەكە

واتاكەی ئەوەیە، كە كەسێ گوناهی گەورە بكات باوەڕدار نیە هەروەك (مورجئەكان) بۆی دەچن و بێ باوەڕیش نیە هەروەك خەواریجەكان دەڵێن، بەڵكو لە پلەیەكدایە لە نێوان كوفرو باوەڕدا، كە بریتیە لە پلەی لاسار (فاسق)ی.

## بنەمای چوارەم: پەیماندان بە باوەڕداران و هەڕەشە لە یاخی و بێ باوەڕان (الوعد و الوعید)

واتە: خوای گەورە پەیمانی بە پاداشتی هەر شتێك دابێت و هەڕەشەی لەسەر هەر شتێك كرد بێت ئەوا دەیهێنێتەجێ، جا خوای گەورە پەمانی داوە پاداشتی گوێڕایەڵان بداتەوە بەچاكە، و هەڕەشەی سزای دۆزەخی كردووە لە یاخی و تاوانبارەكان.

## بنەمای پێنجەم: فەرمان بەچاكە و ڕێگری لە خراپە

مەبەست لە فەرمان بەچاكە: بەرپاكردنی چاكەیە. مەبەست لە ڕێگری لە خراپە: لابردن و نەهێشتنی خراپەیە، جا ئەو بنەمایە فەرمان دەكات بە جیهاد كردن و تێكۆشان لەگەڵ هەموو ئەو كەسانەی پێچەوانەی حوكمی خوا یان فەرمان و ڕێگری خوایی كاردەكەن.

## ئەو بنەما ئایینیانەی كە موسڵمانان لەسەری كۆكن

لەوەی ڕابرد بۆمان دەركەوت كە ئەو بنەما ئایینانەی موسڵمانان لەسەر كۆكن سەرباری جیابوونی تاقم و مەزهەبەكانیان، و ئەو بنەمایانەی كە باوەڕ بەبێ ئەوان دانامەزرێت بریتین لە:

١- باوەڕ بوون - بە پوختی - بە بوونی خوا و سەرجەم سیفاتەكانی كە چەسپاون و دەگەڕێنەوە بۆ ئەوەی كە خوای گەورە خاوەنی هەموو سیفاتە تەواو و كامڵەكانە،

و هەموو سیفاتە پێچەوانەكان (سلبی) كە دەگەڕێنەوە بۆ ئەوەی كە خوای گەورە پاكە لە هەموو كەموكورتیەك، و باوەڕ بوون بە تێڕوتەسەلی ئەمە پێویست نیە.

٣- باوەڕ بوون بە پێغەمبەرێتی (محمد) و دان پێدانان بەوەی كە بەپوختی ڕاستگۆیە لەگەیاندنی پەیامی خوا.

٤- باوەڕ بوون بە زیندوو بوونەوەو لێپرسینەوەو سزاو پاداشت.

٥- بەمەرج گیراوە لە باوەڕدا نكوڵی نەكرێت لەو شتەی كە لە ئاییندا بە پێویست دانراوە وەك باوەڕ بە فریشتەكان و كتێبە ئاسمانیەكان و پێغەمبەرانی پێشوو و نوێژو زەكات و حەج .... و هاوێنەیئەمانە لە فەڕزەكانی ئایین كە بە بەڵگەی سەلمێنراو (قطعي) لە كتێبی خواو سوننەتدا چەسپاوە، ئەم شتانە مەرجە كە نكوڵیان لێ نەكرێت لە ئیمان و ئیسلام دا، جا مەبەست باوەڕ بوون نیە بە هەریەك لەو فەڕزانە بەڵكو لەبەر ئەوەی كە ئەو شتانە مەرجن لە ئیمان و ئیسلامدا چەسپاون بە بەڵگەی سەلمێنراو و بڕەڕ (قطعي) و لەبەر ئەوە نكوڵی كردن لەو شتانە پێچەوانەی بەڕاست دانانی پێغەمبەر (ﷺ) و شەریعەتەكەیە كە جێگایی بایەخە لە ئیماندا.

پوختەی قسە: هەر كەسێ دانی نا بەو بنەمایانە ئەوا بە باوەڕدار و موسڵمان دادەنرێت، و باوەڕی هێنا بەشێوەیەكی پوخت بەو پەیامەی پێغەمبەر (ﷺ) هێناویەتی، و نكوڵی نەكرد لە شتێك كە بە پێویست دانراوە لە ئاییندا، و هەر كەسێ باوەڕی بەو بنەمایانە نەبێت ئەوا بە بێ باوەڕ دادەنرێت یان نكوڵی بكات لە شتێ كە بەپێویست دانراوە لە ئاییندا، ئەمەش بەچەند جۆرێك:-

١- نكوڵی بكات لە قبولْ كردنی ئەو شتەی كە بەپێویست دانراوە لە ئاییندا.

٢- نكوڵی بكات كە لەوەی كە بەشێك بێت لە پەیامی پێغەمبەر (ﷺ).

٣- نكوڵی بكات كە كۆكە و بەپێی حیكمەت و دانایی و بەرژەوەندییە.

## ئەو بنەمایانەی ڕاجیاییان لەسەرە

ئەو بنەمایانەی کە موسڵمانان لەسەری کۆك بوون، جا ئەو بنەمایانەی لەوان باسکران ئەوا یان دەگەڕێنەوە بۆ سەر هەمانئەو بنەمایانە، بەڵام هەندێ تاقم ئەو بنەمایانەی وەك بنچینەی سەربەخۆ داناوە بە لەبەر چاوگرتنی چەند شتێکی تایبەت کە پەیوەستە پێیەوە یان بەڵگەیەك لەلایان هەیە کە ئاماژە بۆ سەربەخۆییەکەی دەکات و بە لقێك لە بنەمایەکی دانەناوە.

بۆ نمونە باوەڕ بە فریشتەکان و کتێبەکانی ئاسمانی و پێغەمبەران کە ئەمانە بنەمای سەربەخۆن لەلایەن ئەهلی سوننە، و دەشکرێ ئەوەی باسکرا بخرێتە خانەی باوەڕ بە پێغەمبەر، چونکە باوەڕ بەو شتانە بەشێکە لە پەیامی پێغەمبەر کە هێناویەتی، و ڕای گەیاندووە کە باوەڕ بوون بە فریشتە و کتێبەکانی ئاسمانی مەرجن بۆ دروستی باوەڕو ئیسلام لەلایەن گشت تاقمە ئیسلامیەکان، و هەر کەسێ نکۆڵی لەوانە بکات یان لەهەر شتێکی تر کە لە ئاییندا بە پێویست زانراوە (ضرورة)[1] ئەوا بەبێ باوەڕ دادەنرێت بە یەکدەنگی موسڵمانان، چونکە نکۆڵی کردن لێی ئەوە پێویست دەکات کە نکۆڵی بکات لە پێغەمبەرێتی محمد (ﷺ)و لەو قورئانەی کە بۆی دابەزیوە.

---

(١) پێویستی (ضرورة): لە زمانەوانیدا بە مانای بەڵگە نەویست (بدیهی) دێت، بەڵام لە زاراوەدا ئەوا هەندێکیان پێناسەیان کردووە بەوەی بریتیە لەو شتانەی کە لەلایەن کەسانی دیندار نادیار و لێڵ نین بەڵکو ڕوونن.و هەندێکی تر دەڵێن: بریتیە لەو شتانەی کە شەرعیەت و ڕەوابوونی شاراوە نییە لەلایەن دینداران. و هەندێکی تر دەڵێن: ئەو شتەیە کە پێویست بووە پێغەمبەر (ﷺ) دەربېڕێت و پێویستیش لە تەواتوری بێ گومانی مانا ڕوون بەدەست دێت، دەکرێت ئەمە ڕووبدات بەهۆی زۆر گوێبستن و زۆری بۆری هەروەك هەواڵەکانی بوونی وڵاتان یان بەهۆی ئاماژەو قەرینەیەك کە مانای بڕەڕو بێ پێچ و پەنا هەڵبگرێت، جا شتە پێویستەکانی ئایین وەك یەکە چ بیروباوەڕی یاخود کرداری بێت وەك نوێژ، چونکە هەردوو لایەنەکە وەك یەکن ئەگەر نکۆڵی لە هەر یەکێکیان بکرێت ئەوا بێ باوەڕی کوفرو دەرچوونە لە ئایین.

باوەڕ بە قەدەر چ خێر و چ شەڕ ئەوا بنەمایەكی مەزهەبیە لەلایەن ئەهلی سوننە كە ئاراستە كراوە دژی (جهمیە)كان ڕایان وایە كە مرۆڤ بەڕەهایی ناچاركراوەو هیچی بەهیچ پێ ناكرێت، و دژی موعتەزیلەكان كە ڕایان بە سپاردن (تفویض) (ویستی ئازاد و ڕەهای مرۆڤ) هەیە، و دژی شیعە كە ڕایان وایە لەسەر بە پلەیەك لە نێوان دوو ڕای پێشوو.

دادگەری خوایی كە بنەمایەكی سەربەخۆیە لەلایەن شیعە و موعتەزیلە ئەوا دەچێتە ناو چوارچێوەی بنەمای یەكەم (خوا بەیەكزانین) و زانیمان كە پێویستە لەسەر باوەڕدار باوەڕی هەبێت بە بوونی خوا، و باوەڕی هەبێت بەوەی خوای گەورە خاوەنی هەموو سیفاتێكی تەواوو كامڵە، كە دادگەریش یەكێكە لەو سیفاتانە، و پاك و بێگەردە لە سیفاتە ناشیاو كەموكورتەكان لەوانەش سیفەتی ستەم و زۆرداری.

پەیمان (وعد) و هەڕەشە (وعید) بنەمایەكی سەربەخۆن لەلایەن موعتەزیلەكان كە دەكرێ بگەڕێنرێتەوە بۆ ناو چوارچێوەی سیفەتی دادگەری كە سیفەتی تەواو كامڵی خوای گەورەیە، چونكە پەیمان و هەڕەشە (بریتیە لەوەی كە خوای گەورە ئەگەر پەیمانی پاداشتی دا بە گوێڕایەڵان و هەڕەشەی سزادانی یاخی و تاوانبارانی كرد، ئەوا پێویستە ئەو پەیمان و هەڕەشەیەی بێنێتەجێ، چونكە لە دادگەریەوەیە كە پەیمان شكێنی و درۆ نەكات)[1].

سەبارەت بە فەرمان بە چاكە و ڕێگری لە خراپە كە موعتەزیلە بە بنەمایەكی سەربەخۆیان داناوە لەناو ئەو شتانەی كە بە پێویست زانراون لە ئاییندا، و زانیمان نكۆڵی نەكردن لەوشتانە مەرجە بۆ هاتنەجێی ئیسلام و ئیمان و باوەڕ لەلایەن گشت مەزهەبەكانەوە، جا واجب بوونی فەرمان بەچاكە و ڕێگری لە خراپە چەسپاوە بە قورئانی پیرۆز و سوننەتی بەپێز و یەكدەنگی.

بەڵگە لە قورئانی پیرۆز ئەو فەرمایشتەی خوای گەورەیە: ﴿ كُنتُمْ خَيْرَ أُمَّةٍ

(١) شرح أصول الخمسة، ١٢٣ للقاضي عبدالجبار.

﴿ أُخْرِجَتْ لِلنَّاسِ تَأْمُرُونَ بِالْمَعْرُوفِ وَتَنْهَوْنَ عَنِ الْمُنكَرِ ﴾ آل عمـــران: ١١٠. واتـــه: ("بەڕاستی" ئێـوە چـاكترین ئوممـەتێكن كـە بـۆ (سـوودی) خـەڵكی هێنراونەتـە مەیدانەوە، چونكە فەرمان بەچاكە دەدەن و قەدەغەی خراپە دەكەن).

بەڵگە لە سوننەتی پێغەمبەر (ﷺ)ئەو فەرمایشتەیە: (لیس لعـین تـری الله یعصـی ان تطرف حتی تغیر أو تنتقل) واتە: چاوێك بۆی نیـە خـوا ببینێت، لەكاتێكدا خراپـە بكرێت و ئەویش چاوی لە ئاست بپۆشێت تا ئەو تاوانە دەگۆڕێت یان دەگوازرێتەوە.

یەكدەنگی هیچ كێشەیەكی تێدا نییە، چونكە موسڵمانان كۆكن لەسەری.

سـەبارەت بـە پلـەی نێـوان دوو پلەكـە (واتـە پلـەی لاساری لـە نێـوان هـەر دوو پلـەی بـاوەڕداری و بـێ بـاوەڕی)[1] ئـەوە بنەمایـەكی مەزهەبیـە لەلایـەن موعتەزیلـەوە، ماناكەشـی ئەوەیـە كـە ئەنجامـدەری تـاوانی گـەورە نـاوێكی هەیـە لـە نێـوان هـەردوو ناوەكـە و حـوكمێكی هەیـە لـە نێـوان دوو حوكمەكـە، ئەمـەش ئاراسـتەكراوە دژبـە خەواریجـەكان كـە ئەنجامـدەری تـاوانی گـەورەیان بـە بـێ بـاوەڕ و كـافر دادەنـا و مورجئەكان كە بە باوەڕداریان دادەنا.

ئیمامەت (هـەروەك ڕای لێكۆڵـەرەكانی شیعەشـی لەسـەرە كـە بنەمایـەك نییـە لـە بنـەماكانی ئـایین، واتـە بنچینەیەك نییـە لـە ئیمـان یـان ئیسلام، بـەڵكو بنەمایـەكی مەزهەبیە لە بنەماكانی مەزهەبی شیعە، بەو واتایەی هـەر كەسێك نكـۆڵی بكـات لـەو بنەمایە ئەوا نابێتە تاكێكی شیعە - نەوەك نەبێتە باوەڕدار یاخود موسڵمان)[2].

## بنەمای ئایینی و بنەمای مەزهەبی

بۆمـان دەركـەوت كـە هەنـدێ لـە بنـەماكانی عەقیـدە هـەن بـریتین لـە بنـەمای ئایینی بەو واتایەی كە زانـراوە لەلایـەن گشت ئەوانـەی شوێنی ئـاین دەكـەون، وەك: خوا بەیەكزانین، و پێغەمبەرێتی ...

---

(١) وەرگێڕ.

(٢) أصول الدین الاسلامي ٢٥ للشیخ محمد علی ناصر. والاسلام و الخلافة، لنا ٤٨، ٥٥.

هەندێ لەو بنەمایانـەش هەیـە كـە بنـەمای مەزهـەبین، بـەو وتایـەی كـە زانـراوە لەلایـەن گشـت شـوێنكەوتوانی هـەر مەزهـەبێك لـەو مەزهەبانـە وەك بـاوەڕ بەقـەدەر لەلایـەن زۆربـەی ئـەهلی سـوننە، بـاوەڕ بـە پلەیـەك لـە نێـوان دوو پلەكـە لەلایـەن موعتەزیلە، و ئیمامەت لەلایەن زۆربەی شیعەی ئیمامی.

جیاوازی نێوان بنەمای ئایینی و بنەمای مەزهەبی بریتیە لە:

بنەمای ئاینی: نكۆڵی لێكردنی مرۆڤ دوچاری بـێ بـاوەڕی و دەرچـوون دەكـات لـە ئـاین. و بنـەمای مەزهـەبی: نكـۆڵی لێكردنـی مـرۆڤ دووچـاری دەرچـوون دەكـات لـە مەزهەب، مرۆڤ دوچاری بێ باوەڕی و دەرچوون ناكات لە ئایین، تـەنها ئـەو كاتـە پێـی بێ باوەڕ دەبێت كە بڕوای وابێت ئەو شتە بەڕاسـتی لـە پێغەمبـەرەوە (ﷺ) هـاتووە، چـونكە نكـۆڵی لێكردنـی لـەو كاتـەدا دەبێتـە نكـۆڵی كـردن لـە بنەمایـەكی ئـاینی، و ئەوەش وا لە بكەرەكە دەكات كە دەربچێت لە ئاین و بێ باوەڕ بێت.

ئا بەم شێوەیە دێینە كۆتایی ئەم بەشـە: كـە چـەند توێژینەوەیـەكی ڕێخۆشـكەرن بـۆ لێكۆڵینـەوە لـە بنـەماكانی ئـایینی ئیسـلام، دوای ئـەوە بـۆ هـەر بنەمایـەك لـەو بنەمایانـەی كـە یەكدەنگی لەسـەرە ئـەوا بەشـێكی تایبـەتی بـۆ تـەرخان دەكـەن و بـە كەمێك درێژە پێدانەوە... بەم شێوەیەی خوارەوە:

بەشی دووەم: لەبارەی ئیلاهیاتەوە.

بەشی سێیەم: لەبارەی پێغەمبەرێتیەوە.

بەشی چوارەم: لەبارەی ڕۆژی دوایی.

# بەشی دووەم
# خواناسی (الالهيات)

**لە دوو دەروازە پێك دێت:**

## دەروازەی یەکەم: بوونی خوا و سیفاتەکانی. ئەمەش دوو باس لەخۆ دەگرێت:

باسی یەکەم: بوونی خوای باڵادەست و خاوەن شکۆ.

باسی دووەم: سیفاتەکانی خوا، کە بریتین لە:

١- سیفاتی خودی (نفسی)

٢- سیفاتی پێچەوانە (سلبی)

٣- سیفاتی واتایی (معانی)

## دەروازەی دووەم: دەرەنجام و بەرهەمی باوەڕبوون بە سیفاتەکانی خوا، ئەمەش لە چەند باس پێکدێت:

باسی یەکەم: ئەو شتانەی بۆ خوای گەورە نەبوو و ئەستەمن

باسی دووەم: ئەو شتانەی بۆ خوای گەورەدروستن.... بینین (الرؤية)

باسی سێیەم: قەزاو قەدەر

# خواناسی (الإلهیات)

باوەڕ بە خواو تاك و تەنهاییەكەی، بنەمای یەكەمە لە بنەماكانی ئیسلام و بنچینەی سەرەكی هەموو باس و بابەتەكانی بیروباوەڕییە بە گشتی.

هەر بۆیە ئێمە لێرەدا توێژینەوە دەكەین لە باسی بوونی خوا و سیفاتەكانی، ئەو عەقیدە و بیرو باوەڕەی كە لەسەری بنیاتدەنرێ، لەو توێژینەوەیەماندا تەنها ئەو باسانە دەخەینەڕوو كە پێویستە بۆ لێكۆڵەرو توێژەر ئەو ڕاستییە بزانێت، ئەمەش بە گرتنەبەری دوو ڕێگە كە لە دەرەنجامدا توێژەر دەگەیەننە ئەو حەقیقەتەی كە نكوڵی لێ ناكرێت:

یەكەمیان: وەرگرتن و نەقڵ كردنی ئایەتەكان لە قورئانی پیرۆز، كە لە خوای گەورە بە ئێمە گەیشتووە لە ڕێگەی نیگا و سروش ناردن بۆ پێغەمبەر (ﷺ). بەڵگەی بڕەڕ (قاطع) لەوبارەوە كە چەسپاون لە كاتی گفتوگۆ كردن لەبارەی سروش و ئیعجازی قورئان لەو كتێبەدا.

وەرگرتن و نەقڵ كردن لە سوننەتی پێغەمبەر(ﷺ) كە چەسپاوە ڕاست و صەحیحە و لە پێغەمبەرەوە (ﷺ) هاتووە، و بەخۆ دوورگرتن لەو فەرمایشتانەی كە تانەیان لێدراوە (جرح) كراون یان لاوازن.

دووەمیان: تێڕوانینی عەقڵی سەلامەت و تەندروست، بریتیە لە بناغەی كۆشك و قەڵای بیروباوەڕی ئیسلامی. بەم شێوەیە عەقیدەی ئیسلامی دادەكوتێ و جێگیر دەبێت لە دەروونـدا لەسەر بناغەیەكی توونـدو تۆڵی وەستاو بە بەڵگەی عەقڵی یەقینی و بێ گومان كە مشتومڕ هەڵنەگرێت.

# دەروازەی یەكەم
# بوونی خواو سیفەتەكانی

## باسی یەكەم
## بوونی خوای باڵادەست و خاوەن شكۆ

لە كۆن و نوێدا باس و بابەتی بوونی خوای پاك و بەرز هزرو فیكری مرۆڤی سەرقاڵ كردووە، جا لە ئەنجامی ئەو گێژاوەی كە خەڵكی تێدابووە ئەوا باوەڕ بە بوونی خوای پاك و بەرزیلێكەوتەوە ئەمەش پاش ئەوەی عەقڵی خۆیان كردبووە دادوەرو دووریان خستبووەوە لە ئارەزوو و لادان، ورد ببوونەوە لە ڕێكوپێكی بوونەوەر و نهێنیەكانی.

گومڕابوو و گومڕاكەرەكان نكۆڵیان كرد لە بوونی خوا، بەبانگەشەی ئازادی عەقڵ، لەبەر ئەوەی هەستەكان پەییان نەبردووە بە خوای گەورە، غەیب پشتی پێ نابەسترێت لە چەسپاندنی بوونی خوادا...

بۆیە زانایان ڕووبەڕووی نكۆڵی كاران بوونەوەو بەرپەرچیان دانەوە، زۆر بەڵگەی تەواو و ڕاشكاوی نەقڵی و عەقڵیان خستەڕوو، كە بوونی خوای پاك و بەرز بۆ كەسی خاوەن عەقڵ چەسپان و ئەوەشیان خستەڕوو كە خوای گەورە هۆكاری بوونی بوونەوەیە.

گرنگترین ئەم بەڵگانە ئێستا دەیانخەینەڕوو:

### بەڵگەكانی بوونی خوای پاك و بەرز

زانایان چەندین بەڵگەیان هێناوەتەوە لەسەر بوونی خوا ئەوا گرنگترینیان دەخەینەڕوو:

## بەڵگەی یەکەم: بەڵگەی بەدیهاتن و پەیدابوون (الحدوث)

زانایانی کەلام ئەم بەڵگەیەیان بنیاتناوە لەسەر دوو پێشەکی:

پێشەکی یەکەم: جیهان بەدیهێنراو و پەیدابوو (حادث)ە[1].

پێشەکی دووەم: هەر بەدیهێنراوێك پێویستی بە بەدیهێنەر هەیە.

دەرەنجام: ئەم جیهانە پێویستە بەدیهێنەرێکی هەبێت، واتە: بوونەکەی بەسەر نەبوونەکەی دا زاڵ بێت، ئەویش خوای پاك و بەرزە.

بۆئەوەی دروستی ئەو دەرەنجامەمان بۆ دەرکەوێت، ئەوا پێویستە لەسەرمان بەڵگە بێنینەوە لەسەر دروستی هەردوو پێشەکیەکەی پێشوو.

## بەڵگەی ئەوەی کە جیهان بەدیهێنراو و پەیدابووە

دەکرێت بەڵگەی بەدیهێنراوی جیهان لەم دوو بەڵگانەدا دابڕێژین:

یەکەم: جیهان لە گۆڕاندایە.

هەر گۆڕاوێك بەدیهێنراوە.

کەواتە جیهان بەدیهێنراوە.

دووەم: جیهان پێکهاتووە لە کرۆك (جوهر)[2] و ڕووپۆش (عرض)[3].

هەر یەکێك لە کرۆك و ڕووپۆشەکان لە گۆڕاندان.

---

(١) جیهان: بریتیە لە غەیری خوای پاك و بەرز.

بۆیە ناونراوە بە بەدیهێنراو، چونکە بەدیهاتووەو پەیدابووە پاش ئەوەی کە نەبووە، ئەمەش بەهۆی هۆیەك کە بەدیهێناوەو پەیدای کردووە.

جا بەدیهێنراو بریتیە لە: هەر شتێك کە نەبووە و پاشان بەدیهێنراوە. / المسامرة لابن أبي شريف، شرح مسايرة للكمال بن همام، چاپخانەی (الاستقامة) لە میسر، ١٧.

(٢) کرۆك (جوهر): بریتیە لەوەی کە پشت بەخۆی ئەبەستێت و سەربەخۆیە.

(٣) ڕووپۆش (عرض): بریتیە لەوەی سەربەخۆ نیە و پشت بە جگەلە خۆی دەبەستێت وەك ڕەنگەکان و جوڵە و ڕاوەستان. بۆ نمونە بەرد هەم کرۆك (جوهر)ە و هەم ڕووپۆش (عرض)یشە، چونکە ماددەکی کرۆك (جوهر)ە، و ڕەنگەکانی و جوڵە یان ڕاوەستانی ڕووپۆش (عرض)ن.

کەواتە جیهان لە گۆڕاندایە.

ڕووپۆش (عرض)ەکان بەدیهێنراون بە بەڵگەی:

أ- بینینــی ئــەوەی کــە لــە گۆڕاندایــە لــە بــوون بــۆ نــەبوون بەهــەمان شــێوە لــە نەبوونەوە بۆ بوون و لـە وەسـتانەوە بـۆ جوڵـە و لـە جوڵـەوە بـەرەوە وەسـتان، گۆڕان نیشانەی بەدیهێنراوی و پەیدابوونە.

ب- پێویست بوونی بە زاتێك کە کـاتی بـەدیهاتنی دیـاری بکـات، چ پـێش بـوونی و چ دوای بـوونی، ئـەوا پێویسـتی بـە پەسـەندکەرێك هەیـە کـە وابکـات کـە لـەو کاتـە بـەدیبێت، چـونکە پەسـەند کـردن (تـرجیح) بـەبێ پەسـەندکەر (مـرجح) شـتێکی نەشیاو نەبووە.

پ- پێویست بوونی بە جەستەیەك تا پێی هەڵسێت.

کرۆك (جوهر)یش بەهەمان شێوە بەدیهێنراون، بۆ نمونە:

کرۆك (جوهر)یش پەیوەستی بە ڕووپۆش (أعراض)ەکانەو لێـی جیـا نابێتـەوە، و بـەبێ جوڵـە و ڕاوەسـتان و ڕەنـگ نابێـت، و هـەروەك پێشـتر باسمـان کـرد ڕووپـۆش (أعراض)ەکانیش بەدیهێنراون، ئەوەی پەیوەست بێـت بـە شـتی بـەدیهێنراو بەهـەمان جۆر بەدیهێنراوە.

جا ئەگەر سەلمێنرا کـە کـرۆك (جـوهر) و ڕووپـۆش (أعـراض)ەکـان بـەدیهێنراون ئەوا ئەو جیهانەی کە لەو دووانە پێکهاتووە ئەوا بەهەمان جۆر بەدیهێنراوە.

بەم شێوەیە پێشەکی یەکەممان بۆ دەسەلمێنرێت کە :(جیهان بەدیهێنراوە).

## بەڵگە لەسەر ئەوەی هەر بەدیهێنراوێك پێویستی بە بەدیهێنەر هەیە:

ئەمـەش بریتیـە لـەوەی کـە ئەگـەر شـتێك ڕوویـدا و بـەدیهات ئـەوا پێویسـتی بـە بەدیهێنــەر هەیــە، ئەگــەر وانــەبوو ئــەوا بوونەکــەی پەســەند دەبــوو بەســەر نەبوونەکەیـدا بـەبێ ئـەوەی پەسـەندکەرێك هـەبێت، ئەمـەش بـێ گومـان نەشـیاو و

نەبووە[1].

واتای پەسەند كردن بەبێ پەسەندكەر: بریتیە لەوەی شتێك لە ئاڕاستەیەكی دیاریكراو بڕوات، دواتر لە ئاڕاستەكەیدا بگۆڕێت، لەسەر ئاڕاستەكەی لابچێت بەبێ بوونی هیچ بگۆڕێك.

پوچەڵیەكەی دیارە، چونكە هەموو عەقڵمەندان دەزانن كە بۆ لادان و گۆڕانی شتێك لە بارو حاڵەتی پێشووی ئەوا پێویستی بە بگۆڕو كارتێكەرێك هەیە، تا ئەو بارودۆخ و حاڵەتە نوێیەی بەسەردا بسەپێنێت و حاڵەتی كۆنەكەی لەناو ببات.

ئەگەر هەر دوو لای تەرازو بەیەكسانی ڕاگیر كران كە هیچ لایەك گرانتر نەبێت لەلاكەی تر، ئا لەو كاتەدا واگومان ببەیت لایەك پەسەند و گران بووە بێ ئەوەی قورسایی تێدابێت و بێ ئەوەی كاریگەرییەكی دەرەكی كاری تێبكات وەك: پاڵدانی هەوا یان بەرد... ئەگەر وا بەخەڵكی ڕاگەیاندرا كە ئامێری ڕادیۆ هەواڵی جیهانی پێدای بەبێ ئەوەی دەمەوانە (صمام)ەكەی بەڕێوە ببەیت، ئەوا پێت پێ دەكەنین و تەنانەت بەزەییان پێتدا دەهێتەوە.

بەم پێیە دەڵێین: بەرلەوەی جیهان بێتە خانەی بوونەوە ئەوا نەبوون باڵی كێشابوو بەسەریدا، بۆیە نەبوون (عدم) پەسەندترە لە بوون (وجود)ی لەبەر ئەوەی نەبوون پێش بوون بووە، بەڵام كاتێك ئەو جیهانە دروستكرا ئەوا بوونەكەی بەسەندتر بوو لە نەبوونەكەی، جا بوون و نەبوون دوو شتی یەكسانن، و پەسەند كردنی یەكێك بەسەر یەكێكی تردا بەبێ پەسەندكەر ئەوا بێ گومان شتێكی نەشیاو نەبوو و پوچەڵە.

---

(١) سەیری ئەم بەڵگەیە بكە لەم سەرچاوانە: المواقف للعضد و حاشیة السید شریف جرجانی علیه، علیه، استانبول ١٢٨٦ك، ٤٦٦. و المسامرة علی المسایرة ١٧-٢١ و حاشیة قاسم بن قطلو بغا علی المسایرة ١٨-١٩. و العقائد العضدیة و حاشیة المرجانی و جلالی الدوانی علیه. و الكلنبولی علی الدوانی، استنبول ساڵی ١٣١٦ك، ١، ٢٢٦-٢٢٩. و شرح الدردیر علی خریدة البهیة و حاشیه الصاوی علیه ٤٦-٤٩ و ٥٥. و الرازي مفسرا - د. محسن عبدالحمید ٢٨٢.

وتنـی ئـەوەی کـە نـەبوون گـۆڕاوە بـۆ بـوونی جیهـان بـەبێ ئـەوەی ئـەو بوونـە هۆكارێكی هەبێت، ئەوا شتێكی نەشیاو و نـەبوو و پوچـەڵە وەك بانگەشـەكەی خـاوەن تەرازو ڕادیۆکە[1].

بـەم شـێوە پێشـەكی دووەمیشـمان بـۆ دەسـەلمێنرێت، كە:(بریتیـە لـەوەی هـەموو بەدیهێنـراوێك پێویستی بە بەدیهێنەرە).

* * *

## بەڵگەی دووەم: بەڵگەی پێویست بوون (الوجوب)

بەدیهێنـەری ئـەم بوونـەوەرە یـان حوكمەكـەی پێویسـتە (واجـب) یـان ئەسـتەمە (مستحیل) یـاخود شـیاوە (ممكـن). هـەموو شـتێك دەبێـت یـەكێك لـەو سـێ حوكمـەی پێشـوی بەسـەردا بچەسـپێت و حـوكمی چـوارەمی نییـە، چـونكە ئەمانـە بەشـەكانی حوكمی عەقڵین[2].

---

(١) كبری الیقینیات الكونیة سالی ١٣٩٠ك، ٨١ و٨٣.

(٢) حوكم: بریتیە لە چەسپاندنی شتێك یان نەهێشتنی، ئەمەش بەهۆی: شەرع یان نەریت و عادەت یاخود عەقڵ دەبێت، كەواتە دەبێتە سێ بەش:

١- حوكمی شەرعی: ((هۆی چەسپاندنی شەرعە))، وەك چەسپاندنی واجبێتی نوێژ.

٢- حوكمی ئاسایی و عادەتی (العادی): ((هۆی چەسپاندنی بریتیە لە نەریت و عادەت و ئەزموون)) وەك چەسپاندنی سیفەتی سوتاندن بۆ ئاگر.

٣- حوكمی عەقڵی: ((هۆی چەسپاندنەكەی عەقڵە))، وەك چەسپاندنی سیفەتی جووتی بۆ ژمارە (٢) و (٤) .... و حوكمی عەقڵی كۆڵەگەی سەرەكییە لە لێكۆڵینەوەكەمان لە بواری عەقیدەدا.

حوكمی عەقڵی:

دابەش دەبێت بۆ: ١- پێویست (واجب) ٢- نەبوو و نەشیاو (مستحیل) ٣- شیاو و دروست (ممكن و جائز).

١- پێویست (واجب): بریتیە لەوەی كە چەسپاوەو نەبوون قبوڵ ناكات یاخود بریتیە لەوەی كە عەقڵ ئەندێشە و تەصەوری نەبوونیەكەی ناكات. وەك پێویست بونی توانا بۆ خوای گەورە، و وەك پێویست بوونی سیفەتی جووتی بۆ (٤).

١- ناکرێت بەدیهێنەری جیهان شتێك بێت کە شیاوی نەبوون (مستحیل) بێت، چونکە شتی نەشیاو و نەبوو، هەرگیز ناتوانرێت بوونی ئەندێشە بکرێت، چونکە نەبووی ڕووتە (عدم محض)، ناتوانێت جگە لەخۆی بەدیبهێنێت، کەواتە بەدڵنیاییەوە (فاقد الشئ لا یعطیه) کەسێ شتێکی نەبێت پێی نابەخشرێت، جا چۆن شاوی نەبوون (مستحیل) دەبێتە سەرچاوەیەك بۆ بوون؟

٢- ناکرێت و دروست نیە بەدیهێنەری جیهان شیاوی بوون (ممکن) بێت، چونکە تەنها کاتێك شیاوی بوون (ممکن) دێتە بوون کە هۆی بوونی هەبێت، جا ئەگەر هاتوو ئەو هۆیەش چووە خانەی شیاوی بوون ئەوا لەوکاتەدا پێویستی بە هۆیەکی تر هەیە ... تاد بەم شێوەیە. ئەمەش خول (دور) و زنجیرەیی (التسلسل) پێویست دەکات، کە هەردووکیان پوچەڵن - هەروەك ڕوونیان دەکەینەوە پاش کەمێکی تر -، جا هەر شتێکیش سەر بۆ هەر دووکیان بکێشێت ئەوا پوچەڵە، بەم پێیە پێویست بوو کە بەدیهێنەری ئەم جیهانە شیاوی بوون نەبێت.

٣- ئینجا کە سەلمێنرا و چەسپا کە بەدیهێنەری ئەم جیهانە نە ئەستەم (مستحیل)ە و نە شیاوی بوون (ممکن)ە، ئەوا پێویست دەکات کە بەدیهێنەری ئەم

---

٢- ئەستەم (مستحیل): بریتیە لەو شتە نەبوەی کە لە شیاوی بوون و چەسپانی نییە، چونکە ناکرێت هەرگیز ببێت، هەرگیز ناتوانرێت ئەندێشە بکرێت کە ببێت یاخود بریتیە لەوەی کە عەقڵ ئەندێشە و تەصەوڕی بوون وپەیدابوونی ناکات. وەك چەسپاندنی هاوبەش بۆ خوا، و پێشکەوتنی کوڕ بەپێش باوکی لە بووند.

٣- شیاو و دروست (ممکن و جائز): ئەوەیە کە جارێك بوون و جارێکی تر نەبوون قبوڵ دەکات بەڵام لە دواییەك. وە بریتیە لەوەی کە لە عەقڵدا بوون و نەبوونی وەك یەکە، ناهێتە خانەی بوونیش مەگەر بەهێزێکی پەسەندکەر نەبێت. وەك بوونی بەهەشت ئێستا. و بوونی تۆ ئێستا لەم ژوورەدا))/ الباجوری علی السنوسیة ١٠-١٤ و المعتقد المنتقد ١٣-١٥.

جیهانە پێویستە بوون (واجب الوجود)[١] بێت. كە بوونی نەوەستێتە سەر هۆیەك، بەڵكو هۆی هەموو هۆكارەكانە و هۆی بوونی جیهانە[٢].

## مانای خول (دور) و بەڵگەی پوچەڵیەكەی

خول (الدور): بریتیە لەوەی دوو شت هەر یەكەیان هۆكاری بوونی ئەوی تر بێت[٣].

وەك ئەو وتەیەی كە دەڵێت: زەید عەمروی بەدیهێناوە، عەمرو زەیدی بەدیهێناوە.

بوونی هەریەك لە زەید و عەمرو دەوەستێتە سەر ئەوەی تر. كە ئەمەش خولی پوچەڵە[٤]، بەڵكو هەر دووكیان هەر بە نەبوو دەمێننەوە تا هێزێكی كاریگەری دەرەكی كاری تێدەكات.

---

(١) واتای چەمكی پێویستە بوون (واجب الوجود): بریتیە لەوەی كە هەرگیز نەبوون باڵی بەسەردا ناكێشێت، هەرگیز نەبوون قبوڵ ناكات بە هەربوو و هەتا هەتایی. سەیری: شرح الخريدة للدردير ٥٥، الباجوري في شرح الجوهرة ٤٧/١. بكە.

(٢) بڕوانە: المواقف و شرحه: سيد شريف ٤٦٦ و حاشية الدواني و الكلنبولي عليه ٢٢٧/١ و الرازي مفسرا ٢٨٢ و الباجوري على الجوهرة ٤٧/١-٤٨.

(٣)المواقف ١٧٧.

(٤) خولی پوچەڵ (الدور الباطل) وەك یەكە چ: لەیەك پلەدا بێت، كە پێی دەوترێت خولی ڕاشكاو، وەك (أ) دەوەستێتە سەر (ب) و بەپێچەوانەوە.

یان لە چەند پلەیەكی جیاواز دابن:((كە ناو دەبرێت بە خولی نادیار)) وەك (أ) دەوەستێتە سەر (ب) و (ب) لەسەر (ج) و (ج) لەسەر (أ).

بڕوانە: التعريفات - سيد شريف الجرجاني، میسر بەچاپی گەیاندووە لەساڵی ١٩٣٨ لا ٩٤ وشەی (دور). بەم واتایە هاتووە لە: مقاصد الطالبين و شرحه لسعد الدين التفتازاني، چاپی استنبول ساڵی ١٣٠٥ك، ١٦٤/١.

## هۆی پوچەڵی خول (دور):

پێویست دەکات کە هەر یەکێك لەو دووانە پێش ئەوەی تر بکەوێتەوە، واتە لەیەك کاتدا لە پاش و لەدوای هاوەڵەکەیتی.... ئەمەش مانای وایە کە شتەکە پێش بوونی خۆی هەبوو بێت ئەمەش تێکگیران و دژیەکبوونە[1].

جا بوونی عەمرو دەوەستێتە سەر زەید، و بوونی زەیدیش دەوەستێتە سەر عەمرو. ئەمەش مانای وایە کە بوونی عەمرو دەوەستێتە سەر خودی عەمرو، پاش لادانی لایەنی ناوەڕاست کە (زەیدە).

ئەمەش دەبێتە هۆی ئەوەی کە پێش بوونی خۆ ببێت واتە: پێویست دەبێت عەمرو لە پێش بوونی خۆی هەبێت، چونکە بەدیهێنەرو بەدیهێنراوە و پێشکەوتوو (سابق) و پاشکەوتوو (مسبوق)ە، جا پێویست دەبێت عەمرو هەبێت بەرلەوەی هاتبێتە خانەی بوون و ئەمەش بێ بنەماو پوچەڵە.

## نمونە لەسەر پوچەڵی خول (دور):

بوونی هێلکە بەندە و پەیوەستە بە بوونی مریشکەوە. و بوونی مریشکیش پەیوەستە بە بوونی هێلکەوە. ئەگەر وادامان نا کە هیچ هۆیەك نییە بۆ بوونی هێلکەکە یان مریشکەکە ئەوا ئەوکاتە شتێکی بێ گومانە کە هەر دووکیان بەنەبووی دەمێننەوە، تا کارتێکەرێکی دەرەکی دێت و هێلکەکە و مریشکەکە دێنێتە بوون، ئا لەوکاتە خولەکە تەواو دەبێت.

ئەگەر وترا:

هۆی بەدیهاتنی جیهان بریتیە لە: کارلێکی ناوەخۆیی ڕووتی ناو بوونەوەر، بەهۆی کاریگەری پاڵەپەستۆ و گەرما و ساردی لە ڕێگەی تێپەڕبوونی کات.

بەمە وەڵامی دەدەمەوە:

ئەمە بریتیە لە خول (دور)ی پوچەڵ، چونکە واتاکەی بریتیە لەوەی: کە

(١)ا لمواقف ١٧٧ و المقاصد ٤٨/١ والدردير على الخريدة ٦١ و الباجوري على الجوهرة ٤٨/١ و الوسيلة في شرح الفضيلة للشيخ عبدالكريم بيارة چاپی بەغداد ساڵی ١٩٧٢، ٤٦١.

بـــوونی جیهـــان بەنـــدە و بەســـتراوەتەوە بـــە بەشـــێکی وەك:(پاڵەپەســـتۆ، گـــەرما، ساردی....)، و بوونی هەندێك بەشی تر پەیوەستە بە جیهانەوە. ئەمەش مانـای وایـە: شـــتێەکە پـــێش بـــوونی خـــۆی کەوتۆتـــەوە، ئەمـــەش پوچـــەڵە هـــەروەك پێشـــتر خستمانەڕوو.

## واتای زنجیرەیی (التسلسل) و بەڵگەی پوچەڵیەکەی:

زەنجیرەیـی (التسلسـل): بریتیـە لـەوەی شـتی شـیاو (ممکـن) بـۆ بـوونی خـۆی پێویسـتی بـە هۆیـەکی کارتێکـەری هـەبێت، و ئـەو هۆیـە کارتێکـەرەش پێویسـتی بەهۆیەکی تری کارتێکەر هەبێت، بەم شێوەیە تا ئەو ئەندازەیەی کۆتایی نایەت[1].

جـا زنجیرەیـی (تسلسـل) واتـە: بـەدیهێنـراوان لەیـەکترەوە بـەدیهاتوون، تـا ئـەو ئەندازەیـەی کۆتـایی نایـەت، بەشـێوەیەك کـە هـەر یەکـە بـەهۆی ئـەوەی پـێش خـۆی بەدیهاتبێت و هۆی بەدیهاتنی ئەوەی پاش خۆیشی بێـت، بـەبێ ئـەوەی ئـەو زنجیرەیـە سەرچاوە بگرێت لە هۆیەکی کۆکەرەوەو پێویستە بوون (واجب الوجود)[2].

## بەڵگەی پوچەڵی زەنجیرەیی (تسلسل):

١- گریمان و بیرۆکەی زنجیرەیی (تسلسل) سەردەکێشێت بۆ بوونی چەندین خـوای بێ کۆتا، کە هەر هەموو خواکانیش خاوەنی چـەند سیفەتێك بـن وەك: بـەدیهێنـراوی و هەژاری و دەسەوەسانی، کە ئەمەش پوچەڵە بەنیسبەت خواوە، چونکە پێچەوانەی پلەوپایەی خوایەتیە کە خاوەنی هەموو توانایەکـە و دەوڵەمەنـد و بـێ بـاکی ڕەهایـە، چونکە دەستەوەسانی هەژار ناکرێت ببێتە بەدیهێنەری جیهان و داهێنـەری ئـەو شـتە سەرنجڕاکێش و بێ کەموکورتانە بێت[3].

٢- بیرۆکـەی زنجیرەیـی (تسلسـل) بـە بەڵگـەی هەسـت و بیـنین بـێ بنـەماو هەڵوەشـاوەیە، چـونکە چـەندین بـەدیهێنراو هـەبوون کـە لەناوچـوون و نـەماون، جـا

---

(١) المواقف ١٧٩.

(٢) کبری الیقینیات الکونیة ٨٤.

(٣) الدردیر علی الخریدة ٦١.

ئەگەر ڕاست بووایە كە بوونەوەر بەشێوەیەكی زنجیرەییە بەبێ كۆتایی هاتن - بەشێوەیەك كە هەر بازنەیەك لەوەی پێشەخۆی هاتبێتە بوون و خۆیشی هۆی بوونی ئەوەی دوای خۆی بێت - ئەوا ئەو بوونەوەرانە لەناو نەدەچوون، چونكە بازنەی كۆتایی تەنها كاری تێكراوەو وەك ئەوەی پێش خۆی هۆیەكی كارتێكەر نەبووە[1].

٣- بەڵگەی جێبەجێ كرد، ئەمەش ناودارترین بەڵگەی زانایانی كەلامە، كە بریتیە لە:

گریمان ئەگەر تۆ دوو زنجیرەت دانا، یەكێكیان سەرەتاكەی لە ئێستادا دەستپێبكات تا بێ كۆتایی هاتن. دووەمیشیان لە كاتی تۆفانەكە داتنا تا بێ كۆتایی هاتن.

هەردووك زنجیرەكەت بەرامبەر یەك دانا بەوەی لە سەرەتاوە تاكەكانی هەر دوو زنجیرەكەت هێنانە بەرامبەر یەك.

جا كە هەر بازنەیەكت لە ئێستاوە (لەكاتی ئێستادا) خستەڕوو و لەبەرامبەریشیدا بازنەیەكی تۆفانت وەك ئەو دانا ئەوا ...

بەدەر نییە لەوەی:

یان هەردوو زنجیرەكەی بەیەكەوە كۆتایی دێن، ئا لەوكاتەدا هەردووكیان كۆتاییان دەبێت،ئەمەش پێچەوانەی گریمانەكەیە. ئەگەر هەردوو زنجیرەكەش بەیەكەوە كۆتایی نەیەن - هەروەك وادامان نابوو - ئەوا پێویستە ناتەواو (ناقص) و تەواو (كامل) بەیەكسان دابنێین، كە بێگومان ئەمەش پوچەڵە.

جا ئەگەر زنجیرەی تۆفانەكە لە پێش ئێستادا كۆتا هات، ئەوا ئەو كاتە تۆفانەكە دەبێتە خاوەنی خاڵی كۆتایی، ئێستاش بەهەمان شێوە خاوەنی خاڵی كۆتاییە، چونكە بە ئەندازەیەكی كۆتایی هاتوو زیاترە تۆفانەكە كە بریتیە لەكاتی تۆفانەكە تا ئێستا، و شتێكی زانرویشە كە شتێك بە ئەندازەیەكی كۆتایی هاتوو زیاتر بێت لە

---

(١) كبرى اليقينيات الكونية ٨٤ و لاپەڕەكانی دواتر. سەیری: موقف العقل و العلم و العالم من رب العالمين لاساذ الشيخ مصطفى صبري ١٨٢/٢. بكە.

شتێکی کۆتایی هاتوو ئەوا ئەو شتە زیادەیەش دەبێتە خاوەنی خاڵی کۆتایی[1] .

## نمونە لەسەر پوچەڵی گریمانەی زنجیرەیی (تسلسل):

أ- ئەگەر ژمارەیەکی ژمێریاری دوورو درێژت دانا، لە تەنیشتیدا ئەندازەیەکی زۆر لە (سفر) دابنێیت، جا تۆ خێرا بەرلە هەموو شت تەماشای ژمارەی یەکەم دەکەیت، جا ئەگەر چاوت نەکەوێتە سەر ژمارەی یەکەم، ئەوا هیچ نرخێك نادەیت بەو هەموو (سفر)ە، ئەگەر ئەو (سفرانە) نرخ و قیمەتیان پێشتر وەرنەگرتبێت لە ژمارەیەك کە نرخ و قیمەتەکەی لە خودی خۆیەوە دەستکەوتبێت، چونکە ئەو ژمارەی کە نرخەکەی خودییە و لە خۆیەوە سەرچاوەی گرتووە هەر ئەمە ژیان و نرخ و قیمەت دەداتە ئەو (سفر)انەی کە بەشێوەی زنجیرەیی ڕیزکراون لەلا تەنیشتی ڕاستیەوە، کەواتە زنجیرەی ئەو (سفر)انەی کە دەسپێکی لە ژمارەکی قیمەتدارەوە نەبێت ئەوا هیچ نرخێکی نییە، ئەگەر واش دابنێین کە ئەو (سفرانە) زنجیرەیەکی بێ کۆتایی پێك دێنن ئەوا ئەو گریمانە هیچ نرخێکی پێ نابەخشێت.

ب- ئەگەر بانگەشەی ڕاستیەکی زانستیم کرد لەلای تۆ، تۆش داوای بەڵگەت لێکرم، منیش وەڵامی تۆم دایەوە بەبەڵگەیەك کە پشتی بەستبێت بە بەڵگەیەکی تر (واتە: بەڵگەکەش پێویستی بەوە هەبێت بەڵگەی بۆ بهێنرێتەوە[2])، کاتێك تۆ پرسیار لە بەڵگەکەی دووەم دەکەیت من وەڵامت بدەمەوە بە بەڵگەیەکی تر کە ئەوەیش پشتی بەستبێت بە بەڵگەیەکی تر .... بەم شێوەیە، ئەوا تۆ ئەم بانگەشەیەی من بە درۆ دادەنێیت، بەڵکو بوونی ئەم ڕاستیە زانستیەش بە درۆ دەزانیت.

جا هەموو ئەو بەڵگە زنجیرەییانە، کە خستمانەڕوو کە کۆتاییان نییە، ئەوا تەنها چەند سێبەرێکن کە چاوەڕوانی بنچینەو ڕەگی یەکەم دەکەن. جا ئەگەر ئەو

(١) الباجوري على الجوهرة ٤٨/١. و سەیری: الواقف: ١٧٩ و لاپەڕەکانی دواتری بکە. و المقاصد ١٦٥/١ و لاپەڕەکانی دواتری، و الوسيلة ٤٦١-٤٦٥.

(٢) وەرگێڕ.

(عقائد المفكرين في القرن العشرين - عقاد) و (العلم يدعو للايمان - كريس موريسون) و (الله يتجلى في عصر العلم) دانـراوی كۆمەڵە زانایەكە، (قصة الايمان - شێخ نـديم جسر)، ئەوا ناوی زۆرێك لە زانایان دەبینی كە جەخت دەكەنـەوە لەسـەر بـاوەڕ بـوون بەخوای گەورە.

دواتر زۆرێك لەو زانایانەی كە تۆمەتبار كراون بـە بـێ بـاوەڕی و بـێ دینـی، ئـەوا بە تێڕوانینی زانست بـێ دیـن نەبوونـە، بـەڵكو بـە تێڕوانینـی كلێسا بـێ دیـن و ئـاین بوونە كە هەر كەسێك ڕای پێچەوانەی كلێسا بووبێـت ئـەو حوكمـەی بەسـەردا دراوە، وەك (تولستوی) كـە بـێ دیـن بـووە بـە تێڕوانینـی كلێسـا، لەڕاسـتیدا بـاوەڕێكی قـوڵی هەبووە بە خوای گەورە، هەروەك ئەمە لە كتێبەكەیدا (اعترافات تولستوي) دا دیارە.

ئـەو زانایانـەی كـە بـێ بـاوەڕ بوونـە بـەخوای گـەورە، ئـەو بـێ بـاوەڕ بوونـەیان دەرەنجامی لێكۆڵینەوەیـەكی زانسـتی وورد نـەبووە، بـەڵكو لەبـەر چـەند شـتێك بـووە لەوانە:-

أ- ئەو هەڵوەستە تووندو تیژەی كلێسا لە بەرامبـەر زانایـان و پشـتگیری نـەكردنی هزری ئازاد، حوكمی بـێ بـاوەڕی و بـێ دینیـان بەسـەر درا، بەشـێوازێكی زۆر دڕندانـە حـوكمی سـوتاندن و ناشـرین كـردن و كوشـتن بەسـەر دەیـان كەسـدا جێبـەجێ كـرا و كتێبەكانیان سوتێنران، و هەڕەشەی كوشتنیشیان كرد لەوەی كە كتێبانەی لەلا بێت.

لە كتێبی (قصة النـزاع بـين الـدين و الفلسفة) دانـراوی: د. توفیـق طویـل چـەند لیستێكی تێدا هەن ناوی ئەو زانایانەی تێدا نووسراوە كە زۆر بە دڕنـدەیی و دوور لـە خەیاڵ سوتێنران، تا ئەمە لە هۆشی هەندێ لە زانایان جێگیر بوو كـە بانگەشـە كـردن بـۆ بـێ دینـی شـتێكی زۆر پێویسـتە بـۆ ڕزگـار كردنـی زانایـان لـەو دڕنـدەیی و ترسناكییە.

لە ڕاستیدا بێ دینی ئەو زانایانە وەك بنەمایەك نەبووە، بـەڵكو هەڵوێستێك بـوو لە بەرامبەر كلێسادا، تا ئەو كاتـەی كـە ئـەو تـرس و دڵەڕاوكێیـە نـەما ئـەوا گەڕانـەوە سەر هاندان بۆ باوەڕ هێنان، ئەمەش بە بەڵگەی ئەوەی كە ژمارەی ئـەو زانایانـەی كـە باوەڕیان بە خوای گەورە هەیە ڕۆژ بە ڕۆژ زیاتر دەبێت.

ب- هەڵوێستی ستەمكاری كلێسا لە بەرامبەر چەوساوەو كۆیلە و ستەم لێكراوان، بەوەی كە هەڵوێستی ناوبراو لە پاڵ پاشا و داگیركار و دەرەبەگەكان بوو، پاپاكانیش خاوەنی دەسەڵاتی ڕاستەقینە و سەروەت و سامان و پسولەی لێخۆش بوون....

ئەم هەڵوێستە زۆرێك لە هزرمەندانی پاڵنا بۆ بانگەوازی كردن فرێدانی كلێسا، هەڵبژاردنی بێ دینی بۆ ڕزگاركردنی ستەمدیدە و ژێردەستەكان لەو ستەم و ئازارەی كە دەیانچەشت.

پ- پەلهاویشتنی جولەكەی جیهانی لە ڕێگەی (ماسۆنیەت)، كە هزری بێ دینی دەچەسپاند بۆ زاڵ بوون بەسەر كۆمەڵگەی مەسیحی، و ئەم ئاراستەیە هەمان ئاراستەی ماسۆنیەتی بێ دینە كە زۆر بەڕوونی بەدەركەوت لە كۆمەڵەی (انسكلوپیدیا) و شوێنەكەوتوو و قوتابیەكانی دا، شۆڕشی فەڕەنسی لەسەر شان و باڵی ئەوانەوە هەڵسا.

ت- بێ دینی لە هەموو كات و شوێنێكدا ڕێگەیەكە بۆ بەڕەڵایی و خۆدزینەوە لە نمونەی بەرز، بۆیە بێ دینی پەناگەی هەواو هەوەسباز و ڕەوشت لادەرەكانە.

## پوختەی قسە:

ئەوەیە كە بێ دینی هەڵوێستێكی ڕەسەنی زانست نەبووە، بەڵكو چەند بارودۆخێك دروستی كردووە، و ڕێبازو پەیڕەوی زانستی خاڵی دەسپێكی باوەڕ هێنان و ناسین و ڕێزگرتن و مافدانی تەواوە بەخوای گەورە[1].

***

(١) العلم لیس كافرا - د. محسن عبدالحمید، گۆڤاری پەروەردەی ئیسلامی بە ژ ٣ ساڵی ١٩٧٣، ٨ و لاپەڕەكانی تردا بڵاوكرەوە. و بەپەیامێكی سەربەخۆ بڵاوكرایەوە. و بڕوانە: ئاماری (دینرت) بكە لە: كتاب روح الدین الاسلامي ٦٠، دانراوی طبارة، و الطب محراب للایمان ٢٥٦.

## باسی دووەم
# سیفاتەكانی خوا

هەندێ لە زانایانی كەلام سیفاتەكانی خوایان دابەش كردووە بۆ:

١- سیفاتی خودی (نفسی): كە بریتیە لە سیفەتی بوون (الوجود).

٢- سیفاتی پێچەوانە (سلبی): كە پێنجن:

لەمێژینە و دێرینی (القدم)، نەمری و هەرمان (البقاء)، پێچەوانەی پەیدابووان (مخالفة الحوادث)، بێ نیازیی و بەخۆوە ڕاوەستان (القیام بالنفس)، تەنهایی (وحدانیة)،

٣- سیفاتی واتایی (معانی): كە بریتین لە:

توانا (القدرة) و ویست (الارادة) و ژیان (الحیاة) و بیستن (السمع) و بینین (البصر) دوان (الكلام). ڕاجیاییان هەیە لەبارەی سیفەتی بەدیهێنان (تكوین)، لەجێی خۆی ڕوونی دەكەینەوە[١].

* * *

(١) بەشی چوارەمیش هەیە، كە بریتیە لە: ((سیفاتی مەعنەوی))، ئەم سیفاتانەش بریتین لە: ئەوەی خوای گەورە: بە توانایە، زانایە، ویستەر، زیندووە، بیسەرە، بینەرە، قسەكەرو بێژەر (متكلم)ە. لەسەر ئەم بەشە زانایان ڕاجیاییان هەیە و نامانەوێت بچینە ناویەوە. تەنها ئەوە نەبێت دەڵێین: سیفاتی مەعنەوی بەرهەمی سیفاتی وتایی (معانی)ە.

سەیری ئەم جۆرە دابەش كردنە بكە لە: شرح خریدة البهیة للدردیر أبي البركات و حاشیة الصاوي علیها ٥٨ و لاپەڕەكانی دواتری، و شرح الباجوری علی جوهرة التوحید میسر: ساڵی ١٩٦٤، ٤٧/١ و لاپەڕەكانی دواتر، و رسالة في التوحید و الفرق المعاصرة لشیخ كمال الدین الطائي بەغداد ١٩٧٢، ٢٤ و لاپەڕەكانی دواتر.

## ١- سیفەتی خودی ( نفسی ): سیفەتی بوون ( الوجود )

**بوونی خوای باڵادەست و خاوەن شكۆ**

**سعدالدین التفتازانی ئاوا پێناسەی كردووە:**

(صفة ثبوتية، يدل الوصف بها على نفس الذات، دون معنى زائد عنها) واتە: سیفەتێكی هەمیشەیی و جێگیرە، وەسف كردن بەم سیفەتە، ئاماژەیە بۆ خودی زاتی پاكی خوا نەوەك بۆ واتاو شتێكی زیاد و بەدەر لە زاتی خوا.

شرۆڤەكردنی پێناسەكە:

سیفەت (صفة): ڕەگەزە، هەموو سیفاتەكان لەخۆ دەگرێت.

هەمیشەیی و جێگیر (ثبوتية): ئەدرێتە پاڵ جێگیربوون (ثبوت)، چونكە ئەمە جێگیرو چەسپاوە لە هۆشدا. بەمەش سیفاتی پێچەوانە (الصفات السلبية) لەم چوارچێوەیە دەچنە دەر وەك: دێرینی و لەمێژینە (القدم) و نەمری و هەرمان (البقاء)...

بەهۆیەوە (بها): لەو سیفەتە دەتاشرێ و دروست دەبێت نەوەك بەخودی سیفەتەكە، بۆیە دەڵێین: خوا هەیە (موجود)ە، ناڵێین: خوا بوون (وجود)ە.

ئاماژەیە بۆ خودی زاتی خوا (على نفس الذات): واتە ئاماژە ناكات بۆ شتێكی بەدەر لە زاتی خوا، چونكە زاتی خوای گەورە ئەندێشە ناكرێت بەبێ بوونی ئەم سیفەتە، بۆیە ناونراوە سیفەتی بوون (وجود)ی. بەمەش سیفاتی واتایی (معانی) و معنوی لەم سیفەتەدا دەردەچن.

بەبێ ئەوەی ئاماژە بكات بە واتا و شتێكی بەدەر و زیاد لە زاتی خوای (دون معنى زائد عنها): شرۆڤەی وتەی: ئاماژەیە بۆ خودی زاتی خوا (على نفس الذات)[1].

بوونی خوای گەورە بوونێكی تەواو و كامڵ و خودیی سەربەخۆیە، واتە: بە خۆی خۆی هەیە، هیچ هۆیەك كاریگەی تێ نەكردووە. لە تایبەتمەندییەكانی

---

(١) شرح الدردير على خريدة البهية و حاشيه الصاوى عليه ٥٨. و شرح الباجورى على جوهرة التوحيد ٤٩/١.

خودیی (ذاتي) ئەوەیە: کە نەبوون قبولْ نەکات.

بـوونی شـتەکانی تـر (هـەموو شـتێك جگەلـە خـوای گـەورە) ئـەوا بوونیـان بـە ناتـەواوی هەیـە و شـوێنکەوتوو (تبعـی)ن، واتـە: بـوونی خۆیـان لـە غـەیری خۆیـان دەسـت دەخـەن، پەیوەسـتن بـە بەدیهێنەرەکەیانـەوە. چـونکە لـە تایبەتمەندیـەکانی شـوێنکەوتن (تبعـی) بریتیـە لـەوەی کـە پـێش و پاشـی نـەبوون بێـت واتـە: خـۆی لـە نێوان دوو نەبووندا بێت[1].

پێشتریش بە تێروتەسەلی لە باسی یەکەمدا دوایـن لەسـەر بابـەتی (بـوونی خـوای باڵادەست و خاوەن شکۆ).

## ٢- سیفاتی پیێچەوانە ( سلبية )

بریتین لە پێج سیفات:-

لەمێژینـە و دێرینـی (القِـدَم)،نـەمری و هـەرمان (البقـاء)، پێچـەوانەی پەیـدابووەکان (مخالفـة الحـوادث)، بـێ نیـازیی و بـەخۆوە ڕاوەسـتان (القیـام بـالنفس)، تـەنهایی (وحدانیة)[2].

کە دەڵێین سیفەتی (سلبی) مانای وانیە کە ئەو سـیفاتانە لـە خـوای گەورەدا نـین و ئەو سیفاتانە بۆ خوای گەورە بڕیار نـادرێن، ئەگـەرنا ئـەو کـات پێویسـت دەبـوو کـە سنوور بڕیار بـدەین بـۆ خـوای گـەورەو بڵێین کـە لـە ناوچوونی بەسـەردا دێـت و بـە بەدیهێنـراوان دەچـێت، بـەڵکو مەبەسـت لـە (سـلبی) ئەوەیـە: کـە هـەر سـیفەتێك لـەو سیفەتانە شتێکی لەو شتانەی ڕەتکردەوە کە شایەنی خوای گەورە نین[3].

---

(١) کبری الیقینیات الکونیة ١١٣.

(٢) الباجوري لە(شرح الجوهرة ١/٥٠). و الدردیر لە(شرح الخریدة و صاوي علیە ٥٨). و الطائي لە (رسالة في التوحید ٢٥). بەو شێوەیەیان دیاریکردووە.

(٣) الصاوي علی الدردیر ٧٦.

جا سیفەتی لەمژینە و دێرینی (القِدَم) ئەوە ڕەت دەكاتەوەو دژی ئەوەیە كە خوای گەورە سەرەتای هەبووبێت، سیفەتی نەمری و هەرمان (البقاء) دژی ئەوەیە كە خوای گەورە كۆتایی هەبێت..... بەم شێوەیە. لە ڕاستی دا سیفاتی پێچەوانە (سلبی) لەم پێنج سیفاتەدا كۆرت نابنەوە، هەروەك ئەمانەش دەچنە ڕیزی سیفاتە پێچەوانە (سلبی) كە خوای گەورە كوڕ و خێزانی نییە، نە پێكهاتەیەكی سادە (بسیط) و نە لێكدراو و ئالۆز (مركب)ە، لە ناو شوێن و كاتدا نیە، ناكەوێتە تەنیشت و ڕووێكەوە، چەندی تریش بەڵام لەبەر ئەوە تەنها لەم پێنجانەدا كورتیان كردۆتەوە، چونكە ئەمانە سەرچاوەی ئەوانی ترن[1].

هەموو زانایان كۆكن لەسەر ئەم سیفاتانە و هەمووشیان باوەڕیان پێی هەیە.

## ١- لەمێژینە و دێرینی (القِدَم):

سیفەتی لەمێژینە و دێرینی (القِدَم) بۆ خوای گەورە بە واتای ئەزەلی و هەر بووی دێت، واتە خوای گەورە سەرەتایەكی نیە كە لەوێوە بوون دەستی پێكردبێت و مەبەست لەم سیفەتە درێژی نیە بەپێی چەرخ و كات، چونكە كات و چەرخ دوو سیفەتی بەدیهێنراوەكانن[2].

یان بە دەربڕینێكی تر:

واتای لەمێژینە و دێرینی (القِدَم): نەبوون (عدم) پێش بوونی خوای گەورە نەكەوتۆتەوە، جا خوا سەرەتای نییە[3].

سیفەتی لەمێژینە و دێرینی (القِدَم): پێچەوانەو دژی بەدیهاتن و دروست بوونە.

---

(١) هەمان سەرچاوە ٦٠. و الباجوري على الجوهرة ١/٥٠.

(٢) المسامرة على المسايرة ٢٢.

(٣) هەمان سەرچاوە، و شرح ابن قُطلُوبُغا على المسايرة،لە پەراوێزی: المسامرة

## بەڵگەی عەقڵی لەسەر لەمێژینە و دێرینی (القِدَم) خوای پاك و بەرز:

خوای گەورە ئەگەر دێرین و لەمێژینەو بێ سەرەتا نەبێت ئەوا ئەوسا دەبێتە بەدیهێنراو و لێکەوتە، چونکە یان بەدیهێنەرو لەمێژینەیە یاخود بەدیهێنراو لێکەوتەیە و ناوەڕاستی نیە. و ئەگەر خوای گەورە بەدیهێنراو بوایە ئەوا پێویستی بە بەدیهێنەر دەبوو تا بەدی بێنێت، بەدیهێنەرەکەش خۆیشی پێویستی بە بەدیهێنەر دەبوو... بەم شێوەیە. لەو کاتە خول (دور) و زنجیرەیی (تسلسل) پێویست دەبێت و هەر دووکیشیان ئەستەمن، بۆیە پێویستە کە خوای گەورە کۆن و لەمێژینە بێت[1].

## بەڵگەی نەقڵی لەسەر لەمێژینەیی و دێرینی(القِدَم) خوای پاك و بەرز:

ئەم فەرمایشتەی خوای گەورەیە: ﴿ٱلۡأَوَّلُ﴾ لە ئایەتی: ﴿هُوَ ٱلۡأَوَّلُ وَٱلۡأٓخِرُ﴾ الحديد: ٣. واتە: (ئەو خوایە یەکەمینە و لەسەرەتاوە هەر هەبووەو کەس پێش ئەو نەبووە، دواهەمینە و کۆتایە، کەس دوای ئەو نامێنێت "بەڵام ئەو هەر دەمێنێت").

## ئەندێشەو تەصەوڕ کردن سیفەتی لەمێژینەیی و دێرینی(القِدَم):

شتێکی ئاسانە لەلای مرۆڤ کە تێبگات لە سیفەتی بەزەیی و دادپەروەری و شکۆداری... لەبارەی زاتی خوای گەورەدا، چونکە مرۆڤ لە شوێنەواری ئەو سیفاتانە تێدەگات، و دەتوانێت پەیی ببات بە واتاکانی لە ژیاندا بەهۆی هەستەکانی، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا شتێکی شیاوی نەبوونە کە مرۆڤ پەیی ببات بە سیفەتی لەمێژینە و دێرینی (القِدَم)، و سیفەتی نەمری و هەرمان (البقاء)، چونکە هیچ وێنەیەکی وای

---

(١) شرح المواقف ٤٨٠، و المسامرة ٢٢ و شرح الخريدة للدردير ٦٠-٦١ و الباجوري على الجوهرة ٥٠/١ و الاقتصاد في الاعتقاد - امام الغزالي بيروت ساڵی ١٩٦٩، ٩٢.

لەلا نییە لە ژیانی دا، لەبەرئەوەی تایبەت و پەیوەستن بە زاتی خوای پاك و بەرز. بەڵام مانای وانییە كە بەخەیاڵیش هەر ناتوانرێت ئەندێشەی ئەو دوو سیفەتە بكرێت، چونكە عەقڵ پێداگیری دەكات لەسەر چەسپاندنی ئەم دوو سیفەتە - هەروەك لە بەڵگەی عەقڵیدا ئەوەمان ڕوون كردۆتەوە -.

لەوانەیە عەقڵ پەیی ببات بە هاتنە بوونی یان بە نەبوونی، لە هەمان كاتیشدا عەقڵ خۆی بێ توانایە لە ئەندێشە كردن و پەیی بردن بە ناوەڕۆكەكەی، لە كۆنەوە فەیلەسوفەكان و سەرجەم زانایان وتویانە: (عدم وجدان للشيء لا يستلزم عدم وجوده في الواقع) واتە: پەیی نەبردن بەشتێك مانای وانیە شتەكە لە واقیعدا بوونی نییە[1].

## ٢- نەمری و هەرمان (البقاء):

واتاكەی: ئەوەیە كە خوای گەورە هەمیشەیی و نەمرە و هەر دەمێنێت، و بوونەكەی كۆتایی نیە، و ناكرێت نەبوون و لەناوچوونی بەسەردا بێت[2].

نەمری و هەرمان (البقاء): پێچەوانەی لەناوچوون و نەمانە.

### بەڵگەی عەقڵی لەسەر نەمری و هەرمان(البقاء)ی خوای پاك و بەرز:

١- ئەگەر خوای گەورە نەمر نەبوایە، ئەوا مردنی بەسەردا دەهات، و تووشی لەناوچوون دەبوو.

ئەگەر تووشی لە ناوچوون بوبایە ئەوا پێویست دەبوو بەدیهێنراو بێت، و ئەگەر بەدیهێنراو بوایە ئەوا پێویستی بە بەدیهێنەر دەبوو، و بەدیهێنەرەكەش پێویستی بە بەدیهێنەرێكی تر دەبوو... بەم شێوەیە، ئەو كاتە خول (دور) و زنجیرەیی (تسلسل) دروست دەبێت و هەر دووكیشیان پوچەڵن، هەر بۆیە هەرمان و نەمری خوای گەورە چەسپاوە.

---

(١) كبرى اليقينيات الكونية ١١٨-١١٩.

(٢) المسامرة ٢٤.

٢- ئەگەر خوای گەورە مردن و لەناوچوونی بەسەردا هاتبووایە ئەوا بێ سەرەتا و لەمێژینە نەدەبوو، و لەبەر سەلماندن و چەسپاندنی ئەوەی كە خوای گەورە بێ سەرەتایە و لەمێژینەیە ئەوا لەبەر ئەمە ناكرێت كۆتایی هەبێت و لەناوچوونی بەسەردا بێت[١].

٣- ئەگەر دروست بوایە خوای گەورە نەبوبایە، ئەوا لە ناوچوونی دوای ئەوەی كە هەبووە پێویستی بە هۆیەك دەبوو، و ئەمەش شتێكی شیاوی بوون نییە، چونكە پەسەند كردن بێ ئەوەی بەسەندكەرێكی هەبێت شیاوی بوون نییە و ناكرێت.

٤- ئەگەر دروست بێت كە خوای گەورە لەناو بچێت، ئەوا یان ئەوەتا لەناو دەچێت:

أ- بەخودی خۆی (بەوەی لەناوچوونی خۆی دەرەنجامی توانای خۆی و بەهۆی هێزی خۆی بێت) ئەمەش شتێكی پوچەڵە، چونكە سەلمێنرا كە خوای گەورە هۆی بوونی بوونەوەرانە، لەناوچوون قبوڵ ناكات بەهیچ شێوەیەك، بۆیە پێویستە نەمرو هەمیشەیی بێت هەروەك چۆن لەمێژینە و بێ سەرەتا بووە.

ب- نەبوو (معدم)ێكی پێچەوانەو دژی بێت، ئەمەش هەر پوچەڵە، چونكە دژەكە یان:

١- كۆنە (قدیم): ئەو كاتە پێویستە خوای گەورە بەتەواوی لەگەڵ ئەو نەبوونە لەناو بچێت هەر لەسەرەتاو لە بنەڕەتدا، چونكە دوو شتی پێچەوانەو دژیەك هەرگیز كۆنابنەوە، بێگومان بوونی خوای گەورەش سەلمێنرا.

٢- لێكەوتە و بەدیهاتوو (حادث)ە: ئەو كاتە پێویستە شتە بەدیهاتووەكە لە دژەكەی كە كۆن و مێژینەیە هەڵبچێت، چونكە شتی كۆن و لەمێژینە بەهێزترە لە شتی بەدیهاتوو[٢].

---

(١) الدردير على الخريدة والصاوي عليه ٦١.

(٢) المسامرة ٢٤-٢٥. سەیری ئەمانەش بكە: الإقتصاد في الإعتقاد ٩٢ والباجوري على الجوهرة ٥١/١، والمواقف ٤٧٠.

**بەڵگەی نەقڵی لەسەر نەمری و هەرمان(البقاء)ی خوای پاك و بەرز:**

ئەم فەرمایشتەی خوای گەورەیە: ﴿ وَٱلۡأٓخِرُ ﴾لە ئایەتی: ﴿ هُوَ ٱلۡأَوَّلُ وَٱلۡأٓخِرُ ﴾ الحدید: ٣. واتە: (ئەو خوایە یەكەمینە و لەسەرەتاوە هەر هەبووەو كەس پێش ئەو نەبووە، دواهەمینە و كۆتایە، كەس دوای ئەو نامێنێت "بەڵام ئەو هەر دەمێنێت").

ئەم فەرمایشتە:﴿ كُلُّ شَيۡءٍ هَالِكٌ إِلَّا وَجۡهَهُۥ ﴾ القصص: ٨٨. واتە: (هەرچی شت هەیە تیاچووەو لەناوچووە جگە لەو زاتە). و: ﴿ كُلُّ مَنۡ عَلَيۡهَا فَانٖ ﴿٢٦﴾ وَيَبۡقَىٰ وَجۡهُ رَبِّكَ ذُو ٱلۡجَلَٰلِ وَٱلۡإِكۡرَامِ ﴿٢٧﴾ ﴾ الرحمن: ٢٦ - ٢٧. واتە: (هەموو ئەو كەسانەی لەسەر ڕووی زەوین، هەر هەمووی فەوتاوو تیاچووەو دەبێت بمرن. تەنها زاتی پەروەردگاری خاوەن بڵندی ڕێزداری تۆیە كە دەمێنێتەوە).

## ٣- پێچەوانەی پەیدابووان ( مخالفة الحوادث )

واتاكەی: ئەوەیە كە خوای گەورە بەهیچ یەكێك لە شتە بەدیهێنراوەكان ناچێت چ لە بووندابن یان بەڕەهایی نەبووبن. جا مەبەست لێی:

خوای گەورە نە تەن و جەستە (جرْم) و نە ڕووكەش (عرض) و نە گشتی (الكلیة) و نە بەشیی (جزئیة)، بەڵكو پێویستییەكانی ئەم ناوبراوانەش ناكرێت بۆ خوای گەورە بڕیار بدرێن[1].

تەن و جەستە (جرْم) تایبەتمەندییەكەی ئەوەیە شوێنێك دادەگرێت (تحیّز)، ڕووكەش (عرض) تایبەتمەندییەكەی ئەوەیە كە پشت بە جگەلەخۆی دەبەستێت، و پێویستی و تایبەتمەندی گشتی (الكلیة) بریتییە لە گەورەیی و تایبەتمەندی و پێویستی بەشیی (جزئیة) بریتیە لە بچوكی[2].

دژەكەی سیفەتی پێچەوانەی پەیدابووان: بریتیە لە هاوێنەی پەیدابووان.

---

(١) واتە: خوای گەورە هیچ شتێك نییە لەمانەی باسمان كرد.

(٢) الباجوری علی الجوهره ٥٢/١.

## بەڵگەی عەقڵی لەسەر ئەمە:

١- ئەگەر خوای گەورە پێچەوانەی پەیدابوو و بەدیهێنراوان نەبوایە ئەوا هاوێنە و چوونیەك دەبوو لەگەڵیاندا، ئەگەر هاوێنەو چوونیەك بوایە ئەوا ئەوكات دەچووە خانەی پەیدابووانەوە، ئەگەر پەیدابوو و بەدیهێنراو بوایە ئەوا پێویستی بە پەیداكەر و بەدیهێنەرێك دەبوو، بەدیهێنەرەكەیشی پێویستی بە بەدیهێنەر دەبوو... بەم شێوەیە، ئەو كاتەش خول (دور) و زنجیرەیی (تسلسل) پێویست دەبوو، و هەر دووكیشیان بێ گومان پوچەڵن، بەم پێیە سەلمێنرا و چەسپا كە خوای گەورە پێچەوانەی پەیدابووانە.

٢-هەر شتێ لەمێژینە و بێ سەرەتا بوو ئەوا تیاچوون و لە ناوچوونی بۆ نیە، و هیچ شتێكی پەیدابووش نیە تیانەچێت، چونكە شتێك لەم پەیابووانە بێ سەرەتا و لەمێژینە نین بۆیە پێویستە خوای گەورە پێچەوانەی پەیدابووان بێت[١].

## بەڵگەی نەقڵی:

ئەو فەرمایشتەی خوای گەورە: ﴿لَيْسَ كَمِثْلِهِ شَيْءٌ﴾ الشورى: ١١. واتە: (هیچ شتێك نییە لە وێنەی ئەو زاتە "كە خوای بێوێنەیە").

نەچواندنی خوای گەورە بە پەیدابووان، ئەم شتانە بەدوای خۆیدا دێنێت:

١- خوای گەورە ڕووكەش (عرض) نییە، چونكە:

أ- ڕووكەش پێویستی بە جەستەیە تا بەهۆیەوە دەربكەوێت و بێتە كایە، بۆیە هەرگیز پێش بوونی جەستە ڕووكەش ناكرێت هەبێت، و سەلمێنرا و چەسپا كە خوای گەورە بەدیهێنەریەتی.

ب- لەبەر ئەوەی پێویست بوون بە شتێك تا پێی ڕاوەستێت و بێتە بوون سیفەتی پەیدابووە.

---

(١) هەمان سەرچاوە.

٢- خوای گەورە بەهەمان شێوە كرۆك (جوهر)یش نییە:

أ- چونكە كرۆك (جوهر) پەیوەستە بە ڕووەكەشەوەو ڕووكەشیش پەیدابووە كەواتە كرۆك (جوهر)یش پێویستە پەیدابوو بێت.

ب- لەبەرئەوەی ئەندێشەی پێكهاتن لە چەند بەشێك و مانای شوێنگرتن دەبەخشێت.

٣- خوای گەورە جەستە نییە:

لەبەر ئەوەی جەستە پێكهاتووە لە كرۆكەكان (جواهر) و ڕووكەشەكان (أعراض)، و پێشتر سەلماندمان كە هەر دوو ناوبراو پەیدابوو و بەدیهێنراون. بەپێچەوانەی:

(مجسمە)كان كە باوەڕیان وابوو خوای گەورە جەستەیەكی ڕاستەقینەیە، بەڵام ڕاجیا بوون: هەندێكیان وتیان: لە گۆشت و خوێن پێكهاتووەو هەندێكی تریان وتیان: نورو ڕووناكیەكی درەوشاوەیە وەك دارێژراوێكی سپی (السبیكة الابیضاء)ە و هەندێكی تریان وتیان: لەسەر وێنەی گەنجێكی بێ مووە، و هەندێكی تر وتیان: لەسەر وێنەی بەساڵاچوو و پیرەمێردێكی ڕیش و قژ سپییە... پاك و بەرزی بۆ خوا لەو قسە پوچانەی لەبارەیەوە دەیڵێن.

٤- خوای گەورە وێنە و ڕەنگ و بۆن و حاڵەتی دەروون و نەفسی (عوارض النفس)ی نیە وەك چێژو ئازار و شادی، چونكە ئەمانە تایبەتن بە جەستەوە.

٥- خوای گەورە وەسف ناكرێت بە بچوكی یان گەورەیی (مەبەست لە گەورەیی، گەورەیی بەرهەست نەك گەورەیی واتایی و مەعنەوی هەروەك ئەو فەرمایشتەی خوای پاك و بەرز:﴿ وَهُوَ ٱلۡعَلِيُّ ٱلۡكَبِيرُ ﴾سبأ: ٢٣. واتە: (هەر خوا بەرزو بڵندو گەورەیە).

٦- شوێنگر نییە[1]:

ئەوەی لە فەرمووده قودسیەکەدا هاتووە: (ما وسعني أرضي و لا سمائي، و انما وسعني قلب عبدي المؤمن) واتە: زەوی و ئاسمان منیان لە خۆ نەگرت بەڵکو دڵی بەندەم منی لەخۆ گرت. مەبەستی ئەوەیە کە دڵی بەندەی من هەیبەت و ڕێزو شکۆ و ڕەحمەت و بەزیی منی لە خۆ گرت.

فەرمووده قودسیەکەی تر: (وما يزال عبدي يتقرب الي بالنوافل حتى أحبه، فاذا أحببته كنتُ سمعَه الذي يسمع به، و بصرَهُ الذي يُبْصِر به، و يده التي يبطش بها و رجله التي يمشي بها. و ان سألني أعطيته، و استعاذ بي لَأُعِيذَنَّه) واتە: بەندەی من بەردەوام بەهۆی ئەنجامدانی سوننەتەکانەوە لێم نزیك دەکەوێتەوە تاکو خۆشمدەوێت، جا ئەگەر خۆشم ویست، دەبمە ئەو گوێیەی کە پێی دەبیستێ و ئەوو چاوەی کە پێی دەبینێ و ئەو دەستەی کە شتی پێ دەگرێت و ئەو لاقەی کە پێی دەڕوات و هاتوچۆی پێ دەکات. مەبەستی ئەوەیە: کە خۆشەویستی خوا هەموو کەسەکە دادەگرێت و ئاوێتە دەبێت لەگەڵ خۆشەویستی بەندە، تا پێویستی بەوە نابێت بە سەیر جگەلە خوای گەورە بکات.

٧- خوای گەورە ناکەوێتە تەنیشت و لا (جهة)تێك، لەبەر ئەوەی:

أ- چونکە هەر شەش تەنیشت و لا (جهة)ەکە پەیدابوو و بەدیهێنراون بە هاتنە کایەی مرۆڤ و جگەلەویش، جا واتای سەروو (فوق): بریتیە لە بەرامبەر بوونی لەگەڵ سەری مرۆڤ واتە لەسەری مرۆڤەوە بەرەو ژوور یان سنوری ئاسمان دەست پێدەکات لە ئاست خاڵی هەرە بەرزی پشتی ئەو گیانلەبەرەی کە لەسەر چوار پەل دەڕووات، ئا بەمە ئەڵێن ئاسمان، واتای خواروو (السفل): بریتیە لەوەی کە لەلای زەوی یەکسانە لەگەڵ پێیەکانی مرۆڤ.

---

(١) بڕوانە: سیفەتی بەخۆوە ڕاوەستان (القيام بالنفس).

فەرموودەی: ((بەردەوام بەندەی من ....)). بخاری لە: (كتاب: الرقائق - التواضع) گێڕاویەتیەوە. فتح الباري ١١/٣٤٠.

ئینجا تەنیشت و لایەکان بەشێوەیەکی ڕێـژەیی دیـاری کـراون و ڕاسـتەقینە نـین، جـا ئەگـەر مێـروو بـە بانێـك هەڵچـوو ئـەوا ڕووی زەوی بـۆ ئـەو دەبێتـە لای سـەروو، چونکە بەرامبـەر پشـتیەتی. ئەگـەر هـەر شـتێکی پەیـدابوو بازنـەیی بوایـە وەك تـۆپ ئەوا هیچ یەکێك لەو تەنیشت و لایانە بوونیان نەدەبوو.

ب- خـوای گـەورە بـەبێ سـەرەتا هـەر هـەبووەو هـیچ یـەکێك لـە بوونـەوەرانیش نەبوون، چونکە جگەلـە خـوای گـەورە هـەموو شـتێك پەیـدابووە، هـەروەك بەڵگـەمان لەمبارەیەوە خستەڕوو.

ج- تەنیشـت و لا (جهـة) تایبەتمەنـدی ئـەو شـتانەیە کـە شـوێن دادەگـرن، شـوێن داگرتنیش تایبەتە بە کـرۆك (جـوهر) و جەسـتەوە و پێشـتر ئـەوەمان خسـتەڕوو کـە خوای گەورە لەم شتانە پاکە.

ئەگەر وترا: بۆچی دەستەکان بەرەو ئاسمان بەرز دەکرێنەوە؟ وەڵـامی ئەدەمـەوە: بەوەی کە ئاسمـان ڕووگـەی دوعـا نزایـە، هـەروەك چۆن کەعبـە ڕووگـەی نوێـژە. جـا خوای گەورە لە تەنیشت و لایەك نیە، بە پێچەوانەی بۆچوونی:

کرامیـەکان: لای سـەروویان بـۆ خـوای گـەورە بڕیـارداوە، بـەبێ ئـەوەی لەسـەر عەرش جێگیر بووبێت.

(مشبهە) و (مجسمە)ەکان: بۆچوونیان وایە کە خـوای گـەورە جـێگیر بـووە لەسـەر عەرش[1].

بە یەکدەنگی عەقڵمەندان ئەمە پوچەڵ و بێ بنەمایە.

٨- خوای گەورە ناچێتە ناو چوارچێوەی کاتەوە، و کاتی بەسەردا نایەت.

٩- جوڵان و جێگۆڕین شیاوی زاتی پاکی خوای گەورە نین.

---

(١) سەرباری ئەوەی کە دەڵێن خوای گەورە جەستەی نیە، ئەوا زۆرێك لە حەنبەلیەکان باوەڕیان بەوەیە کە خوای گەورە لەلای سەرەوەیە و لەسەر عەرش وەستاوە. وە سەیری بەڵگەکانیان و وتەی زاناکانیان بکە لەم بارەوە لە: شرح العقيدة الطحاوية ٢٥١/٣ و لاپەڕەکانی دواتریش. و لوامع الأنوار البهية - سفاريني، جدة ساڵی ١٣٨٠ك، ١٩٠/١ و لاپەڕەکانی دواتری.

١٠- پەیوەنـدی نێـوان خـودی زاتـی خـوای گـەورە نییـە: چـونكە خـوای گـەورە پێكهاتەیـەكی بـەش بـەش نیـە تـا بەشـەكانی پەیوەنـدی بەیـەكترەوە بكـەن و بلكـێن بەیـەكترەوە... زاتـی خـوای گـەورە پەیوەنـدی ناكـات و نالكێـت بـە شـتەكانی تـر: بـۆ نمونـە زاتـی پـاكی خـوای گـەورە نـا لكێـت بـە جیهانـەوە، بـەوەی زاتـی خـوای گـەورە ئاوێتە ببێت لەگەڵ جیهانەوە یان بێت و بچێت تیایدا.

١١- زاتـی پـاكی خـوای گـەورە شـتێك نیـە لـە جیهـان جیـا بووبێتـەوە، چـونكە پێكـــەوەلكان و جیابوونـــەوەو... هتـــد، ســـیفات و تایبەتمەنـــدی پەیـــدابوو و بەدیهێنراوەكانن و خوای گەورە پەیدابوو نییە.

١٢- خوای گەورە وەسف ناكرێت بـە ڕەنـگ و شـێوەیەك. بەپێچەوانەی بۆچوونی (مشبهة)كان، كە خوای گەورەیان ئەچوواند بە بوونەوەرو پەیدابووەكان.

١٣- خـوای گـەورە یـەك ناگریـت و ناچـێتە نـاو هـیچ شـت و جەسـتەو تەنێكـەوە، بەپێچەوانەی:

نەصرانیەكان، باوەڕیان وایە زاتی خوا یەكی گرتووە لەگەڵ جەستەی مەسیح[1].

زیادەڕۆچووە شیعەكان دەڵێن زاتی خوای گەورە ئاوێتە بووە لەگەڵ عـەلی و كـوڕو نەوەكانی.

زیادەڕۆچووە صۆفیەكان باوەڕیان وایە زاتـی خـوای گـەورە ئاوێتـە و تێكـەڵ بـووە

---

(١) وەك ئەمانەتی زانستی، ئەوا بە پێویستی دەزانم ئاماژە بەوە بدەم كە دەقە عەرەبیەكە بەم شێوەیەیە: (النصارى القائلين باتحاد جسده بجسد المسيح) ئەم دەقە عەرەبیە وا ئەگەیەنێت كە خوای گەورە جەستەی هەیە (پەنا بەخوا)، بەڵام من وشەی (جسده) بە زاتی خوام لێك دایەوە، چونكە كرۆكی باسەكە خۆی لەخۆیدا پاكڕاگرتن و بەدوورگرتنی خوایە لەوەی كە جەستەی هەبێت. (نووسەر) وشەی جەستەی لێردا بەكارهێناوە گوزارشتە لە بیروباوەری نەصرانیەكان. (وەرگێڕ).

لەگەڵ ئەوانەی لە ڕێگای بەرەو خواچووندا گەیشتوونەتە كۆتایی و ئاكام[1].

ئـەوەی خسـتمانەڕوو بریتیـە لـە بیروبـاوەڕو بۆچـوونی سـەرجەم پێـڕو تاقمـە ئیسلامیەكان: لە موعتەزیلەكان، ماتریدیەكان، ئەشعەرییەكان و شیعەكان، بێجگـە لـە (مشبهة) و (مجسمة)ە و جگە لەوانیش كە ناومان بردن.

## ئەو دەق (نص)انەی كـە لـە ڕووكەشـدا ئامـاژەی وێچـواندن (مشـابهە)یان تێدایە:

چـەند دەقێـك لـە قورئـانی پـیرۆز و سـوننەتی بـەڕێزدا هـاتوون، كـە چـەند سـیفەتێكی خەبـەری[2] دەدەنـە پـاڵ پـەروەردگار، كـە ئـەو سـیفاتانە ئامـاژەی وێچواندنیان تێدایە وەك وەستان و جێگیر بوون (استواء) و هـاتن (مجـيء) و دابـەزین (نزول)... كە پاش كەمێكی تر دەخرێنەڕوو.

---

(١) بڕوانە: المسامرة ٢٥ و٣١ و شرح قاسم بن قُطلُوبُغا على المساير ٢٥. و مواقف و شرحه للجرجاني ٤٧٣ و٤٧٤ و٤٧٨ و الدردير و الصاوي عليه ٦٣ و٧٣ و مقاصد الطالبين و شرحه ٦٥/٢ و لاپەڕەكانی دواتریش، و عقائد الامامية للشيخ المظفر، دار نعمان - نجف ٣٦.

(٢) سیفەتە خەبەریەكان: لە سۆنگەی ئەوەوە كە سیفەتەكانی دیكەی خوای بێ وێنە (سبحانە و تعالى) عەقڵ دەزانێ كە دەبێ پەروەردگار ئەو سیفەتانەی هەبن و تاڕاددەیەك عەقڵ پێیان ئاشنایە و لەگەڵ چەمك و واتاكانی دەگونجێ، بەڵام سیفەتە خەبەریەكان، مەرج نییە عەقڵ بە پێویستی بزانێ كە خوای كاربەجێ ئەو سیفەتانەی هەبێت، واتە: نە لە عەقڵدا جێگایان دەبێتەوە كە بزانێ چۆنن، نە عەقڵ پێویستیشیان دەكات، ئەگەر گریمان خوای گەورە بۆ خۆی نەیفەرمووبایە من ئەو سیفەتانەم هەیە، عەقڵ نەیدەزانی كە هەیەتی! كەواتە: بۆیە پێیان دەگوترێ سیفەتە خەبەریەكان، چونكە ئەو سیفەتانە لە ڕێگەی خەبەرو هەواڵی پێغەمبەری خواوە (ﷺ) بە ئێمە گەیشتوون و ئێمە دەزانین كە خوا ئەو كۆمەڵە سیفەتەشی هەیە، ئەگەرنا عەقڵ ئەو سیفەتانە پێویست ناكات). ئەم پێناسەیەم وەرگرتووە لە كتێبی: (ئیمان و عەقیدەی ئیسلامی لەبەر ڕۆشنایی قورئان و سوننەت دا: م. علي باپیر ٢١٧/٣ و٢١٨). (وەرگێڕ).

سەرباری كۆك بوون و یەكدەنگیان لەسەر ئەوەی خوای گەورە بە پاك و بەرز و دوور بگرن لەو شتانەی شایەنی زاتی پیرۆزی ئەو نین، ئەوا لەگەڵ ئەوەشدا لە بارەی ئەم دەقانەوە زانایان زانستی كەلام دابەش بوون بۆ سێ ڕاو بۆچوون[1]، كە بریتین لەمانە:

## یەكەم: ڕاوەستان و خۆتێ هەڵ نەقورتاندن (التوقف):

واتە ڕەواستانی تەواو و بێ پەنابردنە بەر تەئویل كردن یان كەوتنە ناو وێچواندن (تشبیه)، ئەمە مەزهەبی پێشین (سلف)ە، ئەوانە باوەڕیان بەو سیفاتە خەبەریانە هەبووە، و چۆنە وەك خوای بەڕێیان كردووەو تێان پەڕاندووە، و خۆیان تێ هەڵ نەقورتاندووە بۆ زانینی ماناكەی یان تەئویل كردنی، لەگەڵ ئەوەی ئەو دەقانەی كە پاك و بەرزی دەسەلمێنن و دەچەسپێنن زۆر زیاتر و زاڵتر بوونە لەلای ئەوان، بەهۆی ڕوونی نیشانە و ئاماژەو زۆری و بۆریان، و شارەزا بوونیان لەوەی كە وێچواندنی خوای گەورە بە پەیدابووان شتێكی شیاوی بوون نییە و نادروستە. بۆیە زۆرێك لە پێشینان وتویانە: (چۆن هاتووە ئاوا بیخوێننەوە) واتە: باوەڕتان وابێت كە لەلایەن خوای گەورە دابەزێنراوە، خۆتان هەڵ نەقورتێنن لە تەئویل و تەفسیر و شرۆڤەكەیدا[2].

لەبەر ئەوەی تەئویل كردن شتێكی گومانـاوی (ظني)ە لەوانەیە هەڵەبێت، بۆیە

---

(١) ابن جوزی باسی ئەم سێ بۆچوونەی كردووە، وتویەتی: ((چەسپاندنی ڕووكەشی ئەم دەقانە لە دوو جۆر دەرناچێت یان مەبەست لە چەسپاندنی ڕووكەشی ئەم دەقانە حەقیقیەكەیەتی كە ئەمەش دەبێتە وێچواندن (تشبیه)، چونكە ئاماژەی هەستی هەڵدەگرێت یاخود مەبەستی لایەنی ڕاستەقینەكە نییە ئەمەش بریتیە لە تەئویل. ئینجا چ وێچواندن چ تەئویل ڕێگەو ڕێبازی پێشنان نییە، بەڵكو ڕێبازی پێشین (سلف) بریتیە لە خۆ هەڵ نەقورتاندن، مەبەستی ئەو دەقانە بەبێ پەنابردنە بەر تەئویل یاخود كەوتنە ناو وێچواندن))./ دراسات في الفرق و العقائد الاسلامیة ١٩٦ وەریگرتووە لە: دفع شبهة التشبیه دانراوی: ابن جوزی.

(٢) مقدمة ابن خلدون چاپخانەی مصطفى محمد ٤٦٣.

ناكرێت سيفاتەكانی خوای گەورە بە تەئويل شرۆڤە بكرێن، بۆ ئەوەی خۆی دوور بگرێت لە لادان و لەڕێ دەرچوون، پێويستە مانای ئەم سيفاتانە بەخوای گەورە بسپێرين.

ئيمامی (مالك)ی كوڕی (أنس) ئەم فەرمايشتە: ﴿ٱلرَّحۡمَٰنُ عَلَى ٱلۡعَرۡشِ ٱسۡتَوَىٰ ﴾ طه: ٥. واتە: (خوای گەورە بەسەر تەختی فەرمانڕەوايەتی خۆيەوە وەستاوە). بەم وتەيەی تەفسير كردووەو دەڵێت: (الاستواء معلوم، و الايمان به واجب، والكيفية مجهولة، و السؤال عنها بدعة) واتە: (استواء) زانراوە، باوەڕ پێبوونی پێويستە، و چۆنيەتيەكەی نەزانراو و شاراوەيە، وپرسيار كردن لەم بارەوە بيدعەيە.

(ابن رشد) لەمبارەيەوە دەڵێت: (سەرەتای چەرخی يەكەم گەيشتە گەورەيی و چاكەی تەواو، بەهۆی بەكارهێنانی ئەم وتانە - مەبەستی وتەی هاوشێوەی وتەكەی ئيمامی ماليكە[1] - بەبێ ئەوەی پەنابەرن بۆ تەئويل كردن).

ئەم ڕاو بۆچوونە بەردەوام بوو تا ڕۆژانی (أحمد)ی كوڕی (حنبل) و (يحيا)ی كوڕی (مَعِين) و (اسحاق)ی كوڕی (راهوية)، ناوبراوان پشتی ئەم بۆچوونەيان گرت، هەر زۆری نەخاياند، چونكە ئەم بۆچوونە ئەوە لەخۆی دەگرێت كە: (حەواڵەكرن و گواستنەوە بۆ شتی نەناسراو كە هيچ مەبەست و ئامانجێكی دياری نييە و لێی تێ ناگەين) تەنانەت (ابن حزم) ئەم بۆچوونەی داناوە بە (دەروازەيەك كە كۆتايەكەی بە وێچواندن - تشبيه - كۆتايی دێت)[2].

## دووەم:كەوتنە ناو وێچواندن (تشبيه) و قوڵبوونەوە تيايدا:

كەسانێ زاتی خوای گەورەيان بەشتی تر چواند بەهۆی باوەڕ بوونيان بەوەی گوايە خوای گەورە دەست (يد) و پێ (قدم) و ڕووی (وجه) و.... هەيە، بەمەش

(١) وەرگێڕ.

(٢) دراسات في الفرق و العقائد الاسلامية ١٩١ و١٩٤ و وتەی (ابن رشد) لە بەشی (المقال) هاتووە، چ دار المعارف، ٦٥.

کەوتنە ناو بازنـەی جەسـتە بڕیـاردانی ڕاشـکاوانە بـۆ خـوای گـەورە، پێچـەوانەی ئـەو ئایەتانەیە کە بە ڕەهایی خوای گەورەیان پاکگرتووە لەو شتە ناشیاوانە.

هەشیان بووە لە بابەتی سـیفاتدا کەوتۆتـە نـاو وێچواندنەوە وەك: چەسـپاندنی لا و تەنیشـت (جهـة) و ڕاوەسـتان (اسـتواء) و دابـەزین (نـزول) و دەنـگ و پیـت و هاوشـێوەکانیان بـۆ خـوای گـەورە، جـا ئـەم بۆچـوونەیان سـەری کێشـا بـۆ بڕیـاردانی جەستە بۆ خوای گەورە، ئەمەش بەهۆی توونـد دەست گرتنیان بە تەفسیرو شـرۆڤەی پیـت (حـرف)ی بـۆ ئـەو ئایـەت و فەرموودانـەی لـە ڕووکەشـدا وێچـواندن و جەسـتە ئەگەیەنن[1].

ئیبن جوزی حنبلـی (یەکێکە لەوانـەی کـە دەڵێـت وێچـواندن (تشـبیه) نییـە و ڕەتـی دەکاتەوە) دەڵێت: (بزانە کە بەگشـتی فەرموودەناسـان (محـدثین) ئـەوەی تایبەتـە بـە سیفاتەکانی خوای گەورەوە بەشێوەی هەستی وەریـان گرتـووە، بۆیـە کەوتوونەتـە نـاو وێچواندنەوە، ئەمەش لەبەر ئەوەبوو کـە تێکـەڵی شـەرعزانان نـەبوو بـوون، تـا بـزانن ئـەو ئـەو ئایەتانـەی فرەواتـا (متشـابه)ن بـەپێی حـوکمی خـۆی هەڵسوکەوتی لەگـەڵ بکرێت نەك بە ڕووکەش)[2].

ئەوانە چەند تاقم و پێـڕێکن، بـۆ نمونـە: (أصحاب الحدیـث)، (الحشـویة) و لـەناو ئەوانـدا: مقاتلی کوڕی سلیمان ساڵی ١٥٠ك توێژەرەوە (مفسیر). و (مشـبهە)کانی شـیعە، وەك: (هشـامی کـوڕی حکـم) کـە لـە سـاڵی ١٧٩ك مـردووە، و تـاقمی (کـرامیـة) شوێنکەوتووانی (ابن کرام السجستانی) کە لە ساڵی ٢٥٥ك مردووە[3].

---

(١) مقدمة ابن خلدون ٤٦٤.

(٢) تلبیس ابلیس ابن جوزی چاپخانەی (المنیریة) چ ٢، ١١٣.

(٣) الملل و النحل - الشهرستانی (لەگەڵ پەڕاوێزی: الفِصَل) چ (أفیست المثنی) ١٣٧/١ و لاپەڕەکانی دواتر. و بڕوانە: دراسات في الفرق و العقائد الاسلامیة ١٩٨-٢٠٠.

## سێیەم: تەئویل كردن (تأويل):

ئەمە بۆچوونی موعتەزیلە بوو و دواتر - لەگەڵ چەند دەستكارییەكی كەم - موسڵمانان بەگشتی بە شیعە و ئەهلی سوننە: ماتریدیەكان و ئەشعەریەكان، دەستیان بەم بۆچوونەوە گرت، و ئیمامی ڕازی لەمبارەوە دەڵێت: (هەموو پێڕو تاقمە ئیسلامیەكان دان دەنێن بەوەی: پێویستە ڕووكەشی هەندێ ئایەتی قورئان و هەواڵ تەئویل بكرێت)[1].

لەبەر ئەوەی بە بەڵگەی عەقڵی لەلای ئەوان چەسپاوە كە خوای گەورە پاكە لە جەستە و تایبەتمەندیەكانی جەستە و شوێن و لا و تەنیشت (جهة)، و هیچ ڕێگەیەك نیە بۆ نەهێشتنی وێچواندن (تشبیه) تەنها ئەو ڕێگەیە نەبێت كە بریتیە لە تەئویل كردنی ئەو سیفاتە خەبەریانەی كە لە دەقەكاندا هاتوون.

كاتێك زانایان بینیان كردنەوەی دەرگای تەئویل زیانێكی گەورەی هەیە بۆیە چەندین یاسا و بنەمایان دانا بۆ تەئویل، تا سەر نەكێشێت بۆ یاری كردن بە دەقەكان بەپێی هەواو هەوەس و بێ گوێدانە بنەماكانی شەریعەت و مەبەستەكانی[2].

شێخ (عزالدین)ی كوڕی (عبدالسلام) وتی: (ڕێگەو ڕێبازی تەئویل كردن بە مەرجی خۆیەوە نزیكترە لە ڕاستی و حەق لە ڕێگەكەی تر)[3].

لە نمونەی ئەو تەئویلانەی كردوویانە بۆ دەقەكانی فرەواتا (متشابه) كە یەكدەگرێت لەگەڵ حەقدا و خوای گەورە بە پاك دەگرێت لەو شتانەی لە زاتی پاك و پیرۆزی ناوەشێتەوە:

---

(١) أساس التقديس - الرازي ٧٩، قاهرة ١٩٣٥.

(٢) دراسات في الفرق و العقائد الاسلامية ٢٠٣-٢٠٤. و بڕوانە: مقدمة ابن خلدون، ٤٦٤. المسايرة: ٣٤ و لاپەڕەكانی دواتر.

(٣) المسايرة ٣٤.

## ئەو دەقانەی کە لە ڕووکەشدا مانای شوێن و تەنیشت ( جهه ) دەگەیەنن:

١- ﴿ ٱلرَّحۡمَٰنُ عَلَى ٱلۡعَرۡشِ ٱسۡتَوَىٰ ﴿٥﴾ ﴾ طه: ٥.

(إسْتِوَاء) بریتیە لە: زاڵ بوون و دەست بەسەردا گرتن (استیلاء) و دەسەڵاتدار و فەرمانڕەوایی (الملك). وەك وتەی شاعیر:

قد استوى عَمْرو على العراق    من غير سيف و دم مُهْراق

واتە: عەمرو زاڵبوو بەسەر عێراقدا بەبێ شمشێر و خوێن ڕشتن.

٢- ﴿ يَخَافُونَ رَبَّهُم مِّن فَوۡقِهِمۡ وَيَفۡعَلُونَ مَا يُؤۡمَرُونَ ﴿٥٠﴾ ﴾ النحل: ٥٠.

لەلای سەرەوە بوون (فوقیة) واتاکەی بریتیە لە: بەرزێتی لە گەورەیی و مەزنیدا، واتە: فریشتەکان لە خوای گەورە دەترسن لەبەر بەرزی و بڵندێتیەکەی لە گەورەیی و مەزنیدا.

٣- ﴿ فَإِنِ ٱسۡتَكۡبَرُواْ فَٱلَّذِينَ عِندَ رَبِّكَ يُسَبِّحُونَ لَهُۥ بِٱلَّيۡلِ وَٱلنَّهَارِ وَهُمۡ لَا يَسۡـَٔمُونَ ﴿٣٨﴾ ﴾ فصلت: ٣٨.

لەلابوون (عندية): واتە هەڵبژاردن و ڕێزگرتن.

٤- ﴿ إِلَيۡهِ يَصۡعَدُ ٱلۡكَلِمُ ٱلطَّيِّبُ ﴾ فاطر: ١٠.

واتە: خوای گەورە پێی ڕازی دەبێت. و گوفتاری شیرین (كلم الطيب) ڕووکەش (عرض)ە، و ڕووکەشیش نا گوازرێتەوە.

٥- ﴿ تَعۡرُجُ ٱلۡمَلَٰٓئِكَةُ وَٱلرُّوحُ إِلَيۡهِ ﴾ المعارج: ٤.

واتە: بەرز بوونەوە بۆ ئەو پلەیەی کە بە ئەنجامدانی پەرستش تیایدا نزیك دەبێتەوە.

٦- ﴿ ءَأَمِنتُم مَّن فِي ٱلسَّمَآءِ أَن يَخۡسِفَ بِكُمُ ٱلۡأَرۡضَ ﴾ الملك: ١٦.

(من في السماء): واتە حوکم و دەسەڵاتەکەی یان ئەو فریشتەیەی ڕاسپێراوە بە سزا.

٧- ﴿ ثُمَّ دَنَا فَتَدَلَّىٰ ﴿٨﴾ فَكَانَ قَابَ قَوْسَيْنِ أَوْ أَدْنَىٰ ﴿٩﴾ ﴾ النجم: ٨.

(الدنو): نزیك بوونەوەی پێغەمبەر (ﷺ) له خوای گەورە بە پەرستش، نزیك بوونەوەش ئەندازە کراوە بە (دوو کەوان و کەمتریش) ئەوەی بۆ ئەوە عەقڵەکان بتوانن ئەندێشە و تەصەوری بکەن بەهۆی شتی بەرهەست.

٨- ئەو فەرمایشتەی پێغەمبەر (ﷺ) کە بە کەنیزە لاڵەکەی فەرموو: ((أین الله؟)) واتە: خوا لە کوێیە؟، جاریەکەش ئاماژەی بۆ ئاسمان کرد.

پێغەمبەر (ﷺ) پرسیاری کرد و فەرمووی ((لەکوێیە؟)) بۆ ئەوەی بوو تا بیروباوەڕی ئاشکرا بکات، جا کە کەنیزەکە ئاماژەی کرد بۆ ئاسمان، پێغەمبەر (ﷺ) ئەوەی زانی کە کەنیزەکە بتپەرست نیە، و ئاماژەی کەنیزەکەیشی بەوە وەرگرت کە خوا بەدیهێنەری ئاسمانە، بۆیە حوکمی باوەڕداری بەسەر جاریەکەدا.

## ئەو دەقانەی کە لە ڕووکەشدا مانای جەستە دەگەیەنن:

١- ﴿ وَجَاءَ رَبُّكَ وَالْمَلَكُ صَفًّا صَفًّا ﴿٢٢﴾ ﴾ الفجر: ٢٢.

واتە: فەرمانی گشتگیری خوا هات کە پاداشت و سزا لەخۆی دەگرێت.

٢- ﴿ وَجَاءَ رَبُّكَ وَالْمَلَكُ صَفًّا صَفًّا ﴿٢٢﴾ ﴾ البقرة: ٢١٠.

واتە: سزای خوا بێت.

٣- ئەو فەرمایشتەی لە (صحیحین)دا هاتووە: ((ینزل ربنا تبارك و تعالى كل ليلة الى السماء الدنيا حين يبقى ثُلُثُ الآخر فيقول: من يدعوني فأستجيب لـه، و من يسألني فأعطيه، و مَن يستغفرني فأغفر لـه))[1] واتە: پەروەردگاری پاك و بەرزمان لە سێ یەکی کۆتایی هەموو شەوێ دادەبەزێت بۆ ئاسمانی دونیا، و دەفەرموێت: کێ لێم

(١) البخاری كتاب الدعوات - باب الدعاء نصف الليل - فتح الباري ١٢٩/١١).

وكتاب التوحيد - باب قوله تعالى: ﴿يُرِيدُونَ أَنْ يُبَدِّلُوا كَلَامَ اللَّهِ ﴾ فتح الباري ٤٦٤/١٣.

وصحيح مسلم - و بێژەکەی هی ئەوە - باب الترغيب في الدعاء و الذكر في آخر الليل و الاجابة فيه ٥٢١/١.

دەپاڕێتەوە تا وەڵامی بدەمەوە، و كێ داواكاری هەیە تا پێی ببەخشم، و كێ داوای لێ خۆش بوون دەكات تا لێی خۆش بم.

واتە: فریشتەی پەروەردگارمان دادەبەزێت و لە جیاتی خوا دەڵێت.

## ئەو دەقانەی كە لە ڕووكەشدا مانای وێنە (صوره) دەگەیەنن:

ئەو فەرمایشتەی كە (أحمد) و (شێخان) گێڕاویانەتەوە: كە پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: ((اذا قاتل أحدكم أخاه فَليجتنبِ الوَجه، فإِن الله خلق آدم علـى صـورته))[1]. واتە: ئەگەر یەكێك بە كێشە چوو لەگەڵ براكەی با خۆی دوور بگرێت لەوەی ئازار بە دەموچاوی ببات، خوای گەورە ئادەمی لەسەر وێنەی خۆی دروست كردووە.

مەبەست لە وێنە (صورة): سیفەتە، وەك سیفەتی بیستن و بینین و ژیان و زانست، واتە بەناو و بەشێوەیەكی پوخت هەمان سیفەتی هەن[2].

## ئەو دەقانەی كە لە ڕووكەشدا مانای ئەندام (جوارح) دەگەیەنن:

١- ﴿ وَيَبْقَىٰ وَجْهُ رَبِّكَ ذُو الْجَلَالِ وَالْإِكْرَامِ ﴿٢٧﴾ ﴾ الرحمن: ٢٧.

(وجه) واتە: زاتی.

٢- ﴿ يَدُ اللَّهِ فَوْقَ أَيْدِيهِمْ ﴾ الفتح: ١٠.

(الید) واتە: هێزو توانا.

ئەو فەرمایشتەی پێغەمبەر (ﷺ): ((إن قلب بني آدم كلها، بين اصبعين من أصابع الرحمن كقلب واحد، يصرفه حيث يشاء ))[3]. واتە: دڵی هەموو ئادەمیزادەكان وەك یەك

(١) مسند أحمد ٢٤٤/٢. و البخاري - كتاب الاستأذان - باب بدء السلام. / فتح الباري ٣/١١.
و صحيح مسلم اللفظ له، كتاب البر - باب النهي عن ضرب الوجه ٢٠١٧/٤.

(٢) دەكرێ ڕاناوەكە لە وشەی (صورته) بۆ خودی ئادەم بگەڕێتەوە. (وەرگێڕ).

(٣) مسلم هێناویەتی: - كتاب القدر - باب تصريف الله تعالى القلوب كيف شاء ٢٠٤٥/٤.

دڵ لە نێوان دوو پەنجەی خواداں، و چۆن ویستی لەسەر بێت بەوشێوەیە دەیگۆڕێت.

مەبەستە لە دوو پەنجە (اصبعين): دوو سیفەتن لە سیفەتەكانی خوا، كە بریتیە لە توانا (القدرة) و ویست (الارادة)[١].

بەمە ڕوون دەبێتەوە كە زۆربەی موسڵمانان لە پێشین (سلف) و پاشین (خلف) كۆكن لە پاكدانان و دوورگرتنی لە وێچواندن (تشبيه)، لەگەڵ ئەوەشدا ڕاجیا بوون لەبارەی ڕێگەی تەفسیرو شرۆڤەی دەقە فرەواتا (متشابه)ەكان، ئەم ڕاجیایەش بە پێی چەرخ و سەدەی خۆیان بووە كە تیایدا ژیاون، ئەویش تەنها ڕاجیاییەكی لاوەكی و شكلی بووە.

تەنها (مشبهەكان) لەمەدا ڕای جیاوازیان هەبووە، كە زاتی خوای گەورەیان بەوێنە چواندووە، بەم هۆیەوە سیفەتی جەستەییان دەدا پاڵ خوای گەورە، بەڵام ئەو (مشبهانە) قیمەت و نرخ بۆ بۆچوونەكەیان دانانرێت و حیسابی بۆ ناكرێت لە تەرازووی ڕەخنەیی زانستی دا كاتێ بەراورد دەكرێت بە دەقەكان، خوای گەورە فەردوویەتی: ﴿ هُوَ ٱلَّذِىٓ أَنزَلَ عَلَيۡكَ ٱلۡكِتَٰبَ مِنۡهُ ءَايَٰتٌ مُّحۡكَمَٰتٌ هُنَّ أُمُّ ٱلۡكِتَٰبِ وَأُخَرُ مُتَشَٰبِهَٰتٌۖ فَأَمَّا ٱلَّذِينَ فِى قُلُوبِهِمۡ زَيۡغٌ فَيَتَّبِعُونَ مَا تَشَٰبَهَ مِنۡهُ ٱبۡتِغَآءَ ٱلۡفِتۡنَةِ وَٱبۡتِغَآءَ تَأۡوِيلِهِۦۗ وَمَا يَعۡلَمُ تَأۡوِيلَهُۥٓ إِلَّا ٱللَّهُۗ وَٱلرَّٰسِخُونَ فِى ٱلۡعِلۡمِ يَقُولُونَ ءَامَنَّا بِهِۦ كُلٌّ مِّنۡ عِندِ رَبِّنَاۗ وَمَا يَذَّكَّرُ إِلَّآ أُوْلُواْ ٱلۡأَلۡبَٰبِ ﴿٧﴾ ﴾ آل عمران: ٧. واتە: (ئەو خوایە زاتێكە كە قورئانی بۆ سەر تۆ "ئەی محمد (ﷺ)" ناردە خوارەوە، بەشێك لە ئایەتەكانی دامەزراو پایەدارو ڕوون و ئاشكران، ئەوانە بناغە و بنچینەی قورئانەكەن و هەندێكی تریشی واتای جۆراوجۆر هەڵدەگرن و بە ئاسانی نازانرێن، جا ئەوانەی لە دڵیاندا لاری و لادان هەیە، حەز لە حەق و ڕاستی ناكەن، ئەوانە شوێن ئەو ئایەتانە دەكەون كە مانای جۆراو جۆرو فراوانیان هەیە، بۆ ئەوەی فیتنە و ئاشوب و ناكۆكی و دووبەرەكی دروست بكەن یان

---

(١) بۆ ئەم تەئویلانە سەیری: المواقف و شرحه ٤٧٣ و المسامرة ٣٥-٣٦ و الباجوري على الجوهرة ٨١/١-٨٤. بكەن.

بۆ ئەوەی لێکدانەوەی هەڵەی بۆ هەڵبەستن، لە حاڵێکدا کە لێکدانەوەی ئەو جۆرە ئایەتانە هەر خوا خۆی بە تەنهایی دەیزانێت).

## ٤- بێ نیازیی و بەخۆوە ڕاوەستان (القيام بالنفس):

بێ نیازیی و بەخۆوە ڕاوەستان (القيام بالنفس) دوو مانا دەگرێتە خۆ:

**یەکەمیان:** بریتیە لەوەی پێویستی بەشوێن نەبێت.

شوێن دوو تەفسیری هەیە:

١- ئەو خودو زاتەی کە پێی ڕاوەستاوە نەوەکو شوێن، چونکە نیشانەیەکە لەوەی کە پێچەوانە و جیاوازە لەگەڵ پەیدابووان.

٢- خود (ذات) و شوێن بەیەکەوە. (الغنيمى) وا ئەڵێت.

**دووەمیان:** بریتیە لەوەی کە پێویستی بە بەدیهێنەر نییە تا پەیدای بکات[1].

پێچەوانەی سیفەتی بێ نیازی و بەخۆوە ڕاوەستان (القيام بالنفس) بریتیە لە: پێویست بوون بە غەیری خۆی.

**بەڵگەی عەقڵی لەسەر ئەمە:**

١- بەڵگە لەسەر ئەوەی کە پێویستی بە پەیداکەرێك نییە:

ئەگەر پێویستی بە پەیداکەرو بەدیهێنەرێك بوایە ئەوا ئەوسا دەبووە پەیدابوو و بەدیهێنراو، جا ئەمە چۆن ئەبێت کاتێك پێشتر ئەوەمان خستەڕوو کە خوای گەورە پێویستە بوونە و بێ سەرەتا و بێ کۆتایە بە زات و سیفاتەوە؟

٢- بەڵگە لەسەر ئەوەی کە پێویستی بە شوێن نییە:

أ- ئەگەر پێویستی بە شوێن هەبوایە، ئەوا دەبووە سیفەت.

ئەگەر سیفەت بوایە، ئەوا ئەوسا خوای گەورە وەسف نەدەکرا بە سیفەتی واتایی (معانی)، کەچی ئەو سیفەتانە پێویستە لە خوای گەورەدا هەر بێنەجێ، بەهۆی

---

(١) الباجوري على الجوهرة ٥٣/١.

جەخت کردنەوە بەلگەکان پێداگیریان لەمبارەیەوە کردووە، ئەمەش پوچەڵە هەر بۆیە سەلمێنرا کە خوای گەورە پێویستی بە شوێن نییە[1].

ب- شوێنگر و جێگیر بوو (متمکن) پێویستی بە شوێن هەیە، چونکە بە نەبوونی شوێن ئەویش شیاوی بوون نیە، بەڵام شوێن پێویستی بە شوێنگر نیە چونکە دروستە شوێن بەتاڵ و بۆش بێت، بۆیە ئەو کاتە گریمانی بوونی پێویست (إمكان الواجب) شیاوی بوون و نەبوون بێت و پێویست بوونی شوێن دێتە کایە، کە هەردووکیان پوچەڵن[2].

**بەڵگەی نەقڵی لەسەر ئەمە:**

ئەو فەرمایشتەی خوای گەورە: ﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ أَنتُمُ ٱلْفُقَرَآءُ إِلَى ٱللَّهِ ۖ وَٱللَّهُ هُوَ ٱلْغَنِىُّ ٱلْحَمِيدُ ﴿١٥﴾﴾ فاطر: ١٥. واتە: (ئەی خەڵکینە ئێوە هەژارو نەدارن و هەمیشە ئاتاجی خوان، هەر تەنها خوایە کە بێ نیازە و شایەنی سوپاسە). و ئەو فەرمایشتە: ﴿إِنَّ ٱللَّهَ لَغَنِىٌّ عَنِ ٱلْعَـٰلَمِينَ﴾ العنكبوت: ٦. واتە: (بەڕاستی خوا بێ نیازە لە هەموو خەڵکی).

ئەگەر وترا: چۆن ئەندێشە و تەصەوڕ دەکرێت کە خوای گەورە لە هیچ شوێنێکدا جێگیر نەبووبێت و شوێنگر نەبێت؟

وەڵامەکە بریتیە لە: ئەندێشە و تەصەوڕکردنی شوێن بۆهەر جەستەیەك، لە دەرەنجامی تێڕوانین و خوێندنەوەیە بۆ بارو حاڵەتی جەستەکان کە دەیبینین شوێنێکیان داگرتووە، بەڵام پێوانە و قیاس کردنی خوا لەسەر جەستەکان تا بسەلمێنین شوێنگرە، ئەوا بێگومان قیاسێکی پوچەڵە، چونکە هیچ هۆ (علة)ێکی کۆکەرەوە نیە لە نێوان بنچینە (ئەصڵ) و لق و پۆپ (فرع) دا، لەبەر ئەوە:

عەقڵی مرۆڤ سنوردارە، و کەم توانایە لە پەیی بردن بە زۆر شت، هەر چەندە بڕیار دەدات لەسەر بوونی چەند شتێکی زۆر وەك ڕۆح و عەقڵ لە ناو جەستەدا و

(١) هەمان سەرچاوە، و الدردير في شرح الخريدة ٦٢.

(٢) المواقف و شرحه ٤٧٢.

كارەبا لـەو تەلانـەی كـە بـۆ پێـدا ڕۆیشـتنی ئامـادەكراوە.... تـاد، ئەگـەر چـی كـرۆك و حەقیقەتەكەی نەزانـراوە و نهێنیەكەی پەیی پێی نابردرێت.

كەواتە عەقڵی مرۆڤ ناتوانێت پـەیی بـە زۆر شـتی دەوروبـەری ببـات، جـا كەواتـە چۆن دەتوانی ئەندێشەی بكات كە خوای گەورە ناچێتە نـاو شـوێنەوەو شـوێنگر نیـە؟ لەگـەڵ ئـەوەی كـە عـەقڵ بـەبێ گومـان دانـی نـاوە بـەبوونی خـوای گـەورە، كەچـی ناتوانێت پەیی بە خودی خوا ببات و تەصەوڕی بكات و تێی بگات؟

ئـەوە بەسـە بـۆ مـرۆڤ بـاوەڕی هـەبێت بـە بـوونی خـوای گـەورە و سـیفەتەكانی، دواتر دۆش دادەمێنێـت و سەرسـوڕمانی دایـدەگرێت لـە ئاسـت تێگەیشـتن و ئەندێشـە كردنـی. ئـا ئەمەیـە حەقیقـەتی بـاوەڕ بـە غـەیب كـە خـوای گـەورە فـەرمانی بـە بەندەكانی كردووە كە باوەڕیان پێی هەبێت[١].

**٥- تەنهایی (وحدانية).**

واتاكەی: بریتیە لە تەنهایی خوا لە زات و سیفەت و كردەوەدا.

خوا بەیەكزانین لە زاتدا: بریتیە لە نەفی كـردن و دوورخسـتنەوەی چـەندی لكاو (كـم المتصـل) كـە بریتیـە لـە پێكهـاتن، واتـە: پێكهـاتنی زات لـە چـەند بەشـێك. ڕەتكردنەوەی (كم المنفصل) كە بریتیە لە زۆرتر بوون لـە یـەك (تعـدد)، واتـە بـوونی دوو خوا یان زیاتر.

خوا بەیەكزانین لـە سیفەتەكان دا: چـەندی جیـا (الكـم المنفصـل) ڕەتدەكاتـەوە، كە بریتیە لە بوونی دوو سیفەت لە یەك ڕەگەز وەك بوونی دوو توانا و زیاتر.

چـەندێتی جیـا (الكـم المنفصـل) ڕەت دەكاتـەوە، كـە بریتیـە لـە چەسـپاندنی سـیفەتی خـوا بـۆ غـەیری خـوا بـەهۆی وێكچـوونی سـیفەتەكە، وەك ئـەوەی زەیـد توانایـەكی هـەبێت شـتی پـێ بـەدیبێنێت و شـتیش لـە ناوبـەرێت وەك توانـای خـوای گەورە یان تایبەت كردنی ویست بە هەندێ شتی شیاوی بوونن (ممكنات).

(١) كبرى اليقينيات الكونية ١٢٠-١٢١.

خــوا بەیــەكزانین لــە كــردەوەدا: چــەندێتی جیــا (كــم المنفصــل)[1] بەتــەنها ڕەتدەكاتــەوە، كــە بریتیــە لــە چەسپاندنی كــردەوەی بــەدیهێنان و دروسـت كـردن بـۆ غەیری خوای گەورە[2].

پێچەوانەی ئەم سیفەتە: بریتیە لە فرەیی و زۆر بـوون لـە زات و سیفات (لكاو و جیا) و كردەوەدا بەجیا بوونە (انفصالا).

## بەڵگەی پوچەڵی و ڕەتكردنەوەی هەر پێنج چەندێتییەكان

### یەكەم: بەڵگەی ڕەتكردنەوەی چـەندێتی لكـاو (الكـم المتصـل) لـە زاتـی خوادا:

مەبەست لە ڕەتكردنەوەی چەندێتی لكاو بریتیە لەوەی كـە: (خـوای گـەورە پێـك نەهاتووە لە چەند بەشێك).

ئەگەر خوای گەورە لە چەند بەشێك پێك هاتبوایە، ئەوا ئـەو كاتـە خـوای گـەورە پێویستی بـەو بەشـانە دەبـوو كـە لێـی پێكهـاتووە و پێویسـتی بـەوەش دەبـوو كـە ئـەو بەشانەی پێك هێناوە، جا لەوكاتەدا خوای گەورە دەبێتە پەیـدابوو، بێگومـان ئەمـەش گریمانەیـەكی پوچـەڵە، لەبـەر ئـەوەی پێشـتر ئـەوەمان سـەلماند و چەسـاند كـە خـوای گەورە پێویستە بوونە (واجب الوجود).

### دووەم: بەڵگەی ڕەتكردنەوەی چەندێتی جیا (الكـم المنفصـل) لـە زاتـی خوادا:

مەبەست لە ڕەتكردنەوەی چەندێتی جیا (الكم المنفصل) لـە زاتـی خـوادا بریتیـە لەوەی كە: (خوای گەورە تاكو تەنهایـە و هـیچ هاوشـێوەو هاوبەشـی نییـە كـە بەشـدار بێت لەگەڵیدا لە بەڕێوەبردنی بوونەوەردا).

---

(١) الدردیر، سەرچاوەی پێشوو.

(٢) الدردیر، سەرچاوەی پێشوو.

ئەگەر خوای گەورە تاك و تەنها نەبووایە ئەوا دەبوایە زۆر خوا هەبووبان، بەوەی دوو خوا یان زیاتر هەبووبان، ئینجا ئەگەر دوو خوا یان زیاتر هەبووبان ئەوا یان دەبوایە كۆك و تەبابوبان لەگەڵ یەكدا یاخود ناكۆك و دژیەك دەبوون:

١- ئەگەر هەر دووكیان كۆك بووبان لەسەر بەدیهێنانی شتێك، بۆ نمونە:

أ- ئەوا یان بەیەكەوە ئەو شتە بەدیدێنن، ئەو كاتە پێویست دەبوو كە دوو هێزی كاریگەری تەواو كۆببنەوە لەسەر یەك شوێنەوار، بێگومان ئەمە پوچەڵە.

ب- یان ئەوەتا بە ڕیزبەندی بەدیدەهێنن (بەوەی خوای یەكەم لە سەرەتادا بەدی بهێنێت و خوای دووەمیش دووبارە هەمان شت بەدی بهێنێتەوە)، ئەو كاتیش بەدەستهێنانی هەمان ئەنجام (تحصیل حاصل) دێتە كایە، كە بەبێ بەڵگە ئەو گریمانە پوچەڵیەكەی دیارە.

پ- یان ئەوەتا خوایەك لە دوو خوا شتەكە بەدی دەهێنێت، و لەوكاتدا بەدیهێنەرەكە دەبێتە خوا و ئەوەی دووەم پوچەڵە.

ت- یان ئەوەتا هەر یەك لە دوو خوا بەشێك لە شتەكە بەدی بێنن، ئەو كاتیش دەسەوەسانی و بێ توانایی دەدرێتە پاڵ هەردوو خوا، چونكە كاتێك توانای یەكێكیان تایبەت دەبێت بە بەشێك ئەوا دەبێتە ڕێگر لە بەردەم ئەوەی خواكەی تر توانای بەسەر ئەو بەشدا بچێت، واتە هەر یەكەیان توانای بەسەر بەشەكەی خۆیدا دەشكێت و هیچ یەكیشیان ناتوانن كاریگەری لە بەشەكەی تر بكەن، بۆیە هیچ یەكێك ناتونێت ڕێگە لەوەی تر بگرێت، بێگومان ئەمەش بێ تواناییە، هەموو ئەو گریمانانە پوچەڵن و ئەو ڕێگانەی كە سەریش دەكێشن بۆ ئەم گریمانانە بەهەمان جۆر پوچەڵن، بۆیە گریمانی بوونی دوو خوای كۆك و تەبا لە بنەڕەتدا پوچەڵە.

ئەم بەڵگەیە پێی دەوترێت بەڵگەی هاودەنگی (برهان التوارد)، لەبەر دروستبوونی هاودەنگیان لەسەر شتەكە.

٢- ئەگەر هەردوو خوا ناكۆك بوون لەگەڵ یەكتر، بەوەی یەكێ بیەوێت جیهان بەدی بێبنێت و ئەوەی تریش بیەوێت جیهان هەر بە نەبوویی بمێنێتەوە:

أ- یان ئەوەتا ویستی هەر دوو خوا بەیەكەوە جێبەجێ دەبێت، ئەو كات پێویست

دەبێت کە دوو دژیەك کۆببنەوە، ئەمەش بەبێ گومان پوچەڵە.

ب- یان ئەوەتا ویستی یەکێکیان جێبەجێ دەبێت، لەو کاتەشدا ئەوەی ویستەکەی جێبەجێ نەبووە ئەوا پێویست دەبێت کە بێ توانایی بدرێتە پاڵی، و ئەوەی تریش بێ توانایی دەدرێتە پاڵی بەهۆی وێکچوونیان. (ابن رشد) وتویەتی: ئەوەی فەرمانەکەی جێبەجێ بووە، ئەو خوایە و ئەوەیتر خوا نییە.

پ- ئەگەر ویستی هیچ یەکێکیان جێبەجێ نەبوو، ئەوا پێویستە بێ توانایی بدرێتە پاڵ هەموویان، و ئەو کاتە پێویست دەبێت کە دوو شتی دژیەك بەیەکەوە لا بچن، و ئەمەش پوچەڵە.

بۆیە هەموو ئەو شتانەش پوچەڵن سەربکێشن بۆی کە بریتیە لە بوونی دوو خوای ناکۆك. ئەو بەڵگەیە پێی دەوترێت بەڵگەی تێکگیران (برهان التمانع)، بەهۆی تێکگیران و ناکۆك بوونیان.

جا کەواتە بوونی دوو خوای کۆکو تەبا یاخود ناکۆك و ناتەبا پوچەڵ بووەوە، بۆیە پێویستە خوا تاك و تەنها بێت[1].

دەکرێ ئەمە دیاری بکەین بەوەی ئیمامی (غزالی) لە کتێبی (احیاء علوم الدین)دا وتویەتی: (بەڵگەکەی ئەم فەرمایشتەی خوایە: ﴿ لَوْ كَانَ فِيهِمَآ ءَالِهَةٌ إِلَّا ٱللَّهُ لَفَسَدَتَا ﴾ الأنبياء: ٢٢. واتە: (ئەگەر لە هەر دووکیاندا (لە ئاسمان و زەویدا) چەند خوایەکی تر هەبوایە غەیری (الله)، ئەوە کاوڵ و وێران دەبوون و بەسەریەکدا تێکدەچوون). شرۆڤەکەی بریتیە لەوەی کە ئەگەر دووبن - هەر یەکەیان خاوەنی سیفەتی خوایی بن، وەك ویست و توانای تەواو - و یەکێکیان ویستی لەسەر شتێك بێت: جا ئەگەر ئەوەی دووەمیش ناچاربوو یارمەتی ئەوەی یەکەم بدات، ئەوا دووەمەکە تێکشکاو بێ توانایە، خوایەك نییە کە بە توانا بێت، ئەگەر ئەوەی دووەم

---

(١) بڕوانە: المقاصد و شرحه ٦١/٢-٦٣. و الدردير شرح الخريدة ٦٤-٦٥ و الصاوي عليه. و الباجوري شرح الجوهرة ٥٥/١ و الوسيلة ٤٨٤.

توانـای سەرپێچـی کردنــی ئـەوەی یەکـەمی هـەبێت و ویسـتەکەی ئـەویتر جێبـەجێ نەکات، ئەوا ئەو کاتە ئەوەی دووەم بە توانا و تێکشکێنەرە، ئـەوەی یەکـەمیش لاواز و بێ توانایە بۆیە نابێت خوابێت)[1].

## سێیەم: بەڵگەی ڕەتکردنەوەی چەندێتی لکاو (کم المتصل) لە سیفەتەکانی خوادا:

بەڵگەی ڕەتکردنەوەی چەندێتی لکاو (کم المتصل) لە سـیفەتەکانی خـوادا بریتیـە لەوەی کە: ئەگەر خوای گـەورە دوو سـیفەتی لەیـەك ڕەگـەزدا هـەبوو، بـۆ نمونـە وەك بوونی دوو توانا:

یان ئەوەتا یـەك لـەو دوو توانایـە تـەواو و کامڵـە، لـەو کاتیشـدا توانـای دووەم بـێ هودە و بەفیڕۆچوو و بێ کەڵکە.

یان ئەوەتا هەر دوو توانایە نا تەواون، لەو کاتیشـدا کـەم و کـوری دروسـت دەبێـت و هەموویشی بێ کەڵکە و کەموکوریش لە سیفەتی خوادا شتێکە شیاوی بوون نییە.

یاخود ئەوەتا هـەر دوو توانـا تـەواو و کـامڵن، ئـەو کـات پێویسـت دەبێـت کـە دوو هێـزی کاریگـەر کۆببنــەوە لەسـەر یـەك شـوێنەوار، ئەمـەش پوچـەڵە، بۆیـە گریمـانی بوونی دوو سیفەت لەیەك ڕەگەز شتێکی پوچەڵە.

## چـوارەم: بەڵگـەی ڕەتکردنــەوەی چـەندێتی جیـا (الکـم المنفصـل) لـە سیفەتەکانی خوادا:

ئەگەر هەر شتێك جگەلـە خـوای گـەورە سـیفەتێکی هـەبوو کـە بـە سـیفەتی خـوا بچێت، ئەوا ئەو کاتە خوا بە پەیدابووەکان دەچوو.

ئەگەر بە پەیدابووان بچێت ئەوا دەبێت خواش پەیدا بووبێت،

ئەگەر پەیدابوو بێت پێویسـتی بـە پەیداکـەرێك هەیـە، پەیداکەرەکـەی پێویسـتی بە پەیداکەر هەیە....

---

(١) احياء علوم الدين للامام الغزالي: چ میسر، ساڵی ١٩٣٩، ١/١١٣-١١٤. و المسامرة ٤٥.

بەم شێوەیە ئەو کاتە پێویستە خولی (دور) و زنجیرەیی (تسلسل) ڕووبدات، کە هەر دووکیشیان پوچەڵن.

بەم پێیە ئەو وتەیە پوچەڵ دەرچوو کە دەڵێت سیفەتی هاوشێوەی سیفەتی خوای گەورە بوونی هەیە.

## پێنجەم: بەڵگەی ڕەتکردنەوەی چەندێتی جیا (الكم المنفصل) لە کردەوەکانی خوادا:

بەڵگەی ڕەتکردنەوەی چەندێتی جیا (الكم المنفصل) لە کردەوەکانی خوادا، بریتیە لەوەی کە: ئەگەر جگەلە خوای گەورە کردەوەیەك لە کردەوەکان - وەك بەدی هێنان و لەناوبردن -ی هەبێت ئەوا دەبووە هاوەڵ و هاوبەشی خوا، و بوونی هاوبەش شتێك نیە کە شیاوی بوون بێت، هەروەك پێشتر خرایە ڕوو لە باسی ڕەتکردنەوەی چەندێتی جیا (الكم المنفصل) لە زاتی خوادا.

بەڵگەی نەقڵی لەسەر یەکتایی خوای پاك و بەرز:

ئەو فەرمایشتەی خوای گەورە:﴿ قُلۡ هُوَ ٱللَّهُ أَحَدٌ ١ ٱللَّهُ ٱلصَّمَدُ ٢ لَمۡ يَلِدۡ وَلَمۡ يُولَدۡ ٣ ﴾ الإخلاص: ١ - ٤. واتە: ("ئەی محمد(ﷺ)، ئەی ئیماندار" بڵێ: ئەو خوایەی کە ناوی - الله -یە خوایەکی تاك و تەنهایە "بێ هاوەڵ و هاوتایە". خوا زاتێکی پایەدارو دەسەڵاتدارە، نیازی بەکەس نییە هەمووان ئاتاجی ئەون، هەر ئەو دەتوانێت بەڵاو ناخۆشی لابەرێت و پێویستی و داخوازیەکانمان جێبەجێ بکات. هیچ کەسی لێ نەبووەو لە کەسیش نەبووە، هەرگیز هاوتاو هاوشێوەو دەسەڵاتدارێکی تر نیە کە لە بەرامبەریەوە بوەستێت و هاوشانی بێت).

﴿ وَإِلَٰهُكُمۡ إِلَٰهٞ وَٰحِدٞۖ لَّآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ ٱلرَّحۡمَٰنُ ٱلرَّحِيمُ ١٦٣ ﴾ البقرة: ١٦٣. واتە: (خوای ئێوە خوایەکی تاك و تەنهایە، جگە لەو زاتە خوایەکی تر نییە، هەر ئەو خوایەش بەخشندە و میهرەبان و بەبەزەییە). ﴿ وَإِلَٰهُكُمۡ إِلَٰهٞ وَٰحِدٞۖ لَّآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ ٱلرَّحۡمَٰنُ ٱلرَّحِيمُ ١٦٣ ﴾ محمد: ١٩. واتە: (ئەی ئینسان!! دەی کەواتە چاك بزانە و دڵنیابە

جگەلە خوا، هیچ خوایەکی تر نییە). ﴿ لَوۡ كَانَ فِيهِمَآ ءَالِهَةٌ إِلَّا ٱللَّهُ لَفَسَدَتَا ﴾ الأنبياء: ٢٢. واتە: (ئەگەر لە هەر دووکیاندا (لە ئاسمان و زەویدا) چەند خوایەکی تر هەبوایە غەیری - الله -، ئەوە کاوڵ وێران دەبوون و تێکدەچوون بەسەر یەکدا). ﴿ مَا ٱتَّخَذَ ٱللَّهُ مِن وَلَدٍ وَمَا كَانَ مَعَهُۥ مِنۡ إِلَٰهٍۚ إِذٗا لَّذَهَبَ كُلُّ إِلَٰهِۭ بِمَا خَلَقَ وَلَعَلَا بَعۡضُهُمۡ عَلَىٰ بَعۡضٖۚ سُبۡحَٰنَ ٱللَّهِ عَمَّا يَصِفُونَ ﴿٩١﴾ ﴾ المؤمنون: ٩١. واتە: (هەرگیز خوا کەسی نەکردووە بە ڕۆڵەی خۆی و هیچ خوایەکی لەگەڵدا نیە، چونکە ئەو کاتە هەر خوایەك دەچوو بەلای دروستکراوەکانی خۆیەوە و هەندێکی خۆی بڵند دەکرد بەسەر هەندێکی تردا (ئەوسا بوونەوەر تێکدەچوو)، پاکی و بێگەردی بۆ زاتی خوایە لەبەرامبەر ئەو شتانەوە کە (خوا نەناسان) هەڵی دەبەستن و دەیلێن).

## کاریگەری عەقیدەو بیروباوەڕی یەکتاناسی لە ژیاندا

بیروباوەڕو عقیدەی یەکتاناسی کاریگەری گەورەی هەیە لە ژیانی موسڵماندا. کە دەیهێنێتە دەر لە تاریکی و دەیخاتە ناو ڕووناکیەوە، جیاوازی ژیانی موسڵمان لەگەڵ ژیانی بێ دین و هاوبەش دانەر، لەم خاڵانەی خوارەوە دەردەکەوێت:

١- باوەڕ بوون بەخوای گەورە، بەوەی کە تاك و تەنهایە و زانیاری بە مرۆڤ دەدات کە: ئاسمانەکان و زەوی پەروەدگارێکی هەیە کە سەرپەرشتی و چاودێری ئەو شتانە دەکات کە تیایاندایە و ڕزق و ڕۆزیان پێ دەبەخشێت و پەروەردەیان دەکات.

و فێری دەکات کە هیچ شتێك لەو بوونەوەرەدا نییە کە بێ نیاز بێت و پێویستی بەخوای گەورە نەبێت.

بەڵام هاوبەش دانەرو بێ دین ئەو بۆچوون و بیروباوەڕەی نییە.

٢- باوەڕ بوون بە یەکتایی خوای گەورە سەربەرزی و عیزەت لە ناخی مرۆڤدا دەچێنێت و گەشەی پێدەدات. هەر خوای گەورە خاوەن توانایە و هیچ زیان گەیەنەر و سوود گەیەنەر و ژیێنەرو مردن بەخشێك نیە جگەلە خوای گەورە، بۆیە موسڵمان سەری خۆی بۆ هیچ کەسێك نا چەمێنێتەوە و لەبەر دەرگانەی هیچ کەسێك ناپاڕێتەوەو ناکوزێتەوە، لە شکۆیی هیچ کەسێك غەیری خوای گەورە ترس

دایناگرێت.

بەڵام هاوبەش دانەر و بێ دین وای بۆی دەچێت كە جگەلە خوای گەورە كەسانی تریش توانای سود و زیان گەیاندنیان هەیە، بۆیە دەپارێتەوەو لێی دەترسێت.

٣- باوەڕ بوون بە یەكتایی خوای گەورەو خۆ بەكەمزانین و خاكی بوون (تواضع) لە ناخی مرۆڤدا دەڕوێنێت. بۆیە نایبینیت كە فیز لێبدات بە سەروەت و سامان و توانا و دەسەڵات و لێهاتویی و توانا. بەڵكو دەڵێت: ئەمە بەخششە لەلایەن خوای پاك و پایەبەرزەوە.

بەپێچەوانەی هاوبەش دانەر و بێ دین كە فیز لێ دەدات كاتێ بەخشش و نیعمەتێكی كەم خایەنی پێدرا، بە لووت بەرزی بەسەر غەیری خۆی هەڵدەكێشێت.

٤- باوەردار بۆچوونی وایە كە سەركەوتن و سەرفرازی تەنها بەهۆی پاكسازی نەفس و دەروون و ئەنجامدانی كردەوەی چاك و چاكەكاری و پارێزكاری و تەقوا، بەدەست دێت.

بەڵام هاوبەش دانەر دەڵێت: كوڕی خوا بووەتە كەفارەت و تاوان هەڵوەڕێنمان یان ئێمە كوڕو نەوەو خۆشەویستی خواین، بۆیە بەهۆی تاوانەكانمان سزامان نادات یاخود داوای شەفاعەت دەكەین لە گەورەو پیاوچاكانمان یان بەهۆی نەزرو قوربانی كردن بۆ خواكان.

كەسی بێ دین، دەڵێت: ئێمە پرسیارمان لێناكرێت لەبارەی كردەوەكانمانەوە، چونكە هەواو ئارەزووی نەفسی و دەروونی خوای ئەوانەیە.

٥- باوەڕدار بێ ئومێدی تووش نابێت، بەڵكو دڵنیایە و دەروونی پڕە لە ئارامی و ئومێد، ئەگەر سوكایەتی پێ بكرێت و سزاش بدرێت.

بەڵام هاوبەش دانەرو بێ دین ناتوانێ دڵی خۆی ڕابگرێت لەكاتی ناخۆشی و چەرمەسەری دا و لەوانەیە بێ ئومێدی وای لێبكات پەنا بەرێتە بەر خۆكوشتن.

٦- باوەڕدار هێزێكی گەورەی هەیە لەوڕووەوە بەرەو پێشچوون و ئارامگری و چەسپاوی و پشت بەخوا بەستن، و ئەگەر دادوەربوو تەنها مەبەستی دەستخستنی ڕەزامەندی خوای باڵادەست و خاوەن شكۆیە، و خەمی تەنها بەرپاكردنی

دادپەروەریـە، چـونكە هێزێكـی بـەرزی لـە پشـتە كـە پشـتی دەگرێـت و چـاودێری و ئاراستەی دەكات.

بەڵام هاوبەش دانەرو بێ دین چاوەڕێی ئەو شێوەو جۆرە هێـزە ناكـات، بۆیـە لـەو كاتەدا ئەو وورەو هێزو پشت بەخوا بەستنەی نابێت كە باوەڕدار خاوەنیەتی.

٧- بـاوەڕدار چاونەترس و بـوێرە، چـونكە ئـەوەی مـرۆڤ ترسـنۆك دەكـات و وورەی دادەمركێنێتەوە، دوو شتە:

أ- خۆشویستنی نەفس و سەروەت و سامان و خانەوادە.

ب- بـاوەڕی وایـە كـە یـەكێك هەیـە جگەلـە خـوا بیمرێنێـت، و توانـای هەیـە بـە فێڵێك لە فێڵەكان مردن لەسەر خۆی لاببات.

بـاوەڕدار بـڕوای وایـە كـە خـاوەنی نـەفس و سـەروەت و سـامان و خانـەوادە هـەر خوای گەورەیـە، خـوای مـەزن مـردن دەبەخشێت لـەو كاتـەی كـە بـێ دواكـەوتن بـۆی دیاری كردووە، لەو كاتەدا پیاو لـە جـەنگ ناترسێت، بۆیـە هـیچ كەسێك نیـە بـوێرو چـاونەترس بـە ئەنـدازەی بـاوەڕداری ڕاسـتەقینە. بـە پێچـەوانەی كەسـی بـێ دیـن و هاوبەش دانەری ترسنۆك، كە تـرس دەیگرێـت لـەكاتی پێكـدادانی هێزەكـان و بینینـی دوژمن.

٨- بـاوەڕ ڕێـزی مـرۆڤ زیـادو بـەرز دەكـات، و قەناعـەت و بـەرزی و بـێ نیـازی لـە ناخی دا دەڕوێنێت، دڵی لـە چاوچـنۆكی وڕژدی و چـرووكی و هەسـت و سـۆزی نـزم و پەست و سیفەتی ناشرین پاك دەكاتەوە، ڕزق و ڕۆزی تەنها بەدەسـتی خوایـە، هـەموو سەركەوتن و ژێركەوتنێك بە دەستی خوای گەورەوەیە.

بـەڵام كەسـی بـێ دیـن و هاوبـەش دانـەر، بەنـدەی چاوچـنۆكی و خراپەكەیـەتی، خەفەت و خواستێكی بەدەستهێنانە چ بە ڕێگەی شەرعی یاخود ناشەرعی.

٩- باوەڕ وا لەمرۆڤ دەكات كە پابەند بێت بە یاسای خـوای گـەورە، و ئـەو یاسـایە بپارێزێت. جا ئەگەر شەو و ڕۆژ خۆی بەتەنها بێـت، ئـەوا دەزانێـت كـە خـوای گـەورە چـاودێری دەكـات و لێـی دەپرسـێتەوە لەسـەر هـەموو شـتێكی بچـوك و گـەورە، بۆیـە دەیبینـی خێرایـە لـە ئەنجامـدانی چاكەكان و فـەرمان بەچـاكە و ڕێگـری لـە خراپـە

دەكات. ڕێنماكارە دەروونیەكەی هانی دەدات لەسەر چاكەكاری و ڕێگری لێ دەكات لە هەر خراپەیەك. بەڵام بێ دین و هاوبەش دانەر بڕوای بەهیچ شتێكی لەوجۆرە نییە[١].

## ٣- سیفەتە واتاییەكان ( معاني )

**بریتین لە حەوت سیفەت:**

توانا (القدرة)، ویست (الارادة)، ژیان (الحیاة)، بیستن (السمع)، بینین (البصر)، دوان (الكلام)[٢].

مەبەستمان لەوەی ئەوانە سیفاتی واتایی (معانی)ن: بریتیە لەوەی كە هەر یەكێك لەم سیفەتانە بوونێكی واتایی (معنىً وجودي)ە، و پەیوەستن بەزاتی خوای پاك و بەرزەوە. بۆیە ناونراوە سیفەتی زاتی: چونكە لێی جیا نابێتەوە.

كە دەڵێین بوونی (وجودی)ە: واتە بوونێكی لە مێژینەو كۆنی هەیە لە خودی خۆیدا وەك زانستی خوای گەورە، و بوونێكی پەیدابووشی هەیە وەك زانستی ئێمە[٣].

لەسەر ئەم بەشەیە كە موعتەزیلە و ئەشعەری و هاوڕاكانیان مشتومڕیان هەیە[٤].

***

---

(١) مبادىء الاسلام ٧١-٧٧.

(٢) ماتریدیەكان سیفەتێكی تریان بۆ سەر ئەو حەوت سیفەتە زیاد كردووە كە بریتیە لە سیفەتی بەدیهێنان (تكوین) كە لەو فەرمایشتەی خوای گەورەدا ئاماژەی بۆ كراوە: ﴿كُن فَيَكُونُ﴾ واتە: ببە ڕاستەوخۆ شتەكە دەبێت. مەبەستی ماتریدیەكان لەمە: سیفەتێكی كۆن و لە مێژینەی خوایە و پەیوەستە بە زاتی پیرۆزەوە و تایبەتە بەو شتانەی دەچنە شیاوە بوون (الممكنات)، و كاریگەری دەكات لەو شتەدا بەوەی بەدی دەهێنێت بەپێی ویستی خوا، وەك بەدیهێنان و ژیان بەخشین و مراندن و دیاری كردنی خۆشبەخت یان بەدبەخت.

(٣) الدردير والصاوي عليه ٧٦ و الوسيلة ٤٩١.

(٤) شرح المقاصد ٢/٧٢.

## مشتومڕ لەسەر سیفەتە واتاییەکان (معانی)

هەموو موسڵمانان بە فەیلەسوف و زانایانی کەلامەوە، کۆکن لەسەر ئەوەی خوای گەورە یەکە و تاکە، و خاوەنی هەموو ئەو سیفەتانەیە کە تەواو و کامڵ و پەیوەستن بەزاتی خوای پاك و بەرزەوە، ئەو سیفەتانەش کە خوای گەورە پاڵی داوەتە لای خۆی، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا ڕاجیا بوون لە لێکدانەوەو تەفسیر کردنی سیفەتە واتاییەکان، و بۆ دوو ڕا دابەش بوون:

یەکەم: ڕای زۆربەی ئەشعەری و ماتریدیەکانە، کە بریتیە لەوەی:

خوای گەورە بیسەرە بەو سیفەتەی کە ناوی بیستن (سمع)ە، بینەرە بەو سیفەتەی کە ناوی بینین (بصر)ە، زانایە بە سیفەتی زانین (علم)، بەتوانایە بە سیفەتی توانین (قدرة)، زیندووە بە سیفەتی ژیان (حیاة).

**ئەم سیفەتانە:**

١- بێ سەرەتان، واتە: پەیدابوو نین، چونکە خوای پایەبەرز پێویستە بوون (واجب الوجود)ە، بۆیە شتی پەیدابوو بە خودی خۆی ڕاوەستاو و بێ نیاز نییە.

٢- ڕاوەستاون بە زاتی خواوە، واتە ئەو سیفەتانە شتێك نین بێ نیازو بەخۆوە ڕاوەستاو بن، واتە: بوونێکی دەرەکی سەربەخۆ نین.

٣- ئەو سیفەتانە شتێکی جیا نین لە زاتی خوای گەورە، و خودی زاتی خوای گەورەش نین، بەڵکو زیادن لەسەر زاتی خوای گەورە[(١)]. واتە: ئەندێشەو تەصەوڕ ناکرێت کە زات و سیفات لەیەك ناترازێن لە ڕووی بوونەوە، ئەگەرچی لە ڕووی واتا زات جیا بێت لە واتای سیفەت[(٢)].

لەوکاتەدا سەر ناکێشێت بۆ گریمانی بوونی چەند خوایە، چونکە نامۆیی و لێك ترازان لە نێوان سیفەت و زاتدا نیە، و هیچ گوێزرانەوەو هەڵوەشانەوەیەك نییە لە

(١) المسامرة ٧٠ و المواقف ٤٧٩.

(٢) المسامرة٧٢ و الصاوي على الدردير ٨٩.

نێوانیان دا[1].

هەندێ لە بەڵگەكانیان، ئەمانەن:

١- خوای گەورە لە كتێبەكەی دا و لەسەر زمانی پێغەمبەرەكەی ئەو سیفەتانەی پاڵداوەتە لای خۆی، و مەبەست لە واتای وشەی زانا (علیم) لە زماندا: بریتیە لەو زاتە كە زانستی هەیە، واتای بەتوانا (قدیر): بریتیە لە زاتێك خاوەن توانا بێت.... تاد هەموو ئەو سیفەت و هاوەڵناوانەی كە داتاشراون. تەنانەت شتێكی نەگونجاو مەحاڵە لەلایەن زانایانی زمانەوە: زانایەك هەبێت بەبێ زانست، و هەروەك ئەستەمە زانست هەبێت بەبێ بوونی زانراو، و ناشكرێت هیچ یەكێك لەم وشانە واتاكەیان بگۆڕیت مەگەر بە بەڵگەیەكی بڕەر (قطعی) نەبێت، هیچ گومانێ نەبوو تا پاساو بدات بە گۆڕینی واتاكان چ جای بوونی بەڵگە[2].

٢- ئەگەر سیفەتی زانست خودی زات بوایە، و سیفەتی توانا خودی زات بوایە، هەروەك ئەوانی تر ئەڵێن، ئەوا ئەوسا پێویست دەبو كە سیفەتی زانست خودی سیفەتی توانا بوایە، هەردووكیان هەر یەك واتایان دەگەیاند، ئەمەش بێگومان پوچەڵە، هەمان حاڵەت لەسەر هەموو سیفەتەكانی تریش جێبەجێ دەبێت كە بانگەشەی ئەوەیان كردووە كە بریتین لە خودی زاتی خوای گەورە[3].

٣- ئەگەر سیفەتی زانستی خوای گەورە خودی زات بوایە، ئەوا سیفەتی زانست - بۆ نمونە - دەبووە پێویستە بوون و پەرستراو بەدیهێنەری جیهان و خاوەنی هەموو

(١) لەبەر ئەمە پێویست بوو كە نەصرانیەكان بەكافر دابنرێن، چونكە بڕوایان وابوو كە زات لەگەڵ سیفەت دوو شتی لەیەك جیان، دەكرێت گوێزرانەوەو لێكترازان لە نێوان زات و سیفەتدا ببێت./شرح رمضان أفندي على العقائد النسفية، استنبول ساڵی ١٣١٤ك، ١٢٢-١٢٣، و الصاوي لا ٨٩ و دراسات في الفرق ٢٤٠.

(٢) المسامرة ٧١.

(٣) المواقف و شرحه ٤٨٠.

**سیفەتێكی تەواو كامڵ[١].**

**دووەم: ئەمە مەزهەبی موعتەزیلە و فەیلەسوف و ئیمامیەكانە:**

**كە بریتیە لە لابردن و نەفی كردنی هەموو ئەو سیفەتانەی غەیری زات، واتە خوا زانایە بەزاتی خۆی بەبێ زانست، بە توانایە بە زاتی خۆی بەبێ هێز و توانا، بیسەرە بەزاتی خۆی بەبێ بیستن، ئەوانە وتیان: تەنها یەك زات كۆن و لەمێژینەیە و دروست نییە چەند زاتێك بەیەكەوە كۆن و لەمێژینەو بێ سەرەتابن[٢].**

---

(١) المقاصد و شرحه ٧٣/٢.

(٢) المواقف و شرحه ٤٨٠. و شرح ابن قطلوبغا على المسايرة ٧١ و الاقتصاد في الاعتقاد و شرحه ١٥٠ و١٥٥ وحاشية محمد محيي الدين عبدالحميد على المسايرة ٧٠-٧٣ و المقاصد و شرحه ٧٢/٢ و العقائد المامية: شيخ محمد رضا مظفر ٣٩ و الشيعة بين الأشاعرة و المعتزلة: الحَسَني١٩٢/١ وەریگرتووە لە: كشف الحق و نهج الصدق: علامة الحِلّي ٢١.

بەڵام موعتەزیلە تێكگیران لە مەسەلەی ڕەتكردنەوەی هەر دوو سیفەتی دوان و قسەكردن (كلام) و ویست (ارادة)، چونكە ئەو دوو سیفەتەیان بە سیفەتی واتایی دانا بە جیا لە زاتەوە، و وا بۆی چوون كە دوو سیفەتن پەیدابوو و بەدیهێنراون بەخودی خۆیان ڕاوەستاون - بەزاتی خواوە ڕانەوەستاون - جا سیفەتی ویست شت بەدی دێنێت بەبێ بوونی شوێن، بەڵام سیفەتی دوان (كلام) لە جەستەی بێ گیاندا پەیدا دەكات، بۆیە بەو سیفەتە دەدوێت ./ سەیری: المواقف و شرحه ٤٩٣ و٤٩٦ و الاقتصاد في الاعتقاد ١٥٠ و ابن قطلوبغا ٧١ و شرح المقاصد ٩٤/١ و١٠٠. الاقتصاد في الاعتقاد. بكە.

بەڵام فەیلەسوفەكان تەنها لەبارەی سیفەتی كەلام تێكگیراون و مشتومڕیان هەیە، و تویانە: خوای گەورە قسەكەرو وتەبێژە، بەو واتایەی: لە زاتی پێغەمبەردا (ﷺ) بیستنی چەند دەنگێكی ڕێكخراو بەدیدەهێنێت ئەمەش یان ئەوەتا لە نوستندا یاخود لە حاڵەتی بێ داریدا، و ئەو دەنگانە بوونێكی دەرەكیان نیە، هەروەك كەسی نوستوو كە هەندێ كەس ئەبینێت یان هەندێ دەنگ ئەبیستێ كە لە دەرەوەدا هیچ بوونیان نیە، بەڵكو تەنها لەناو دەماغی نوستوەكەدا بوونی هەیە. بەرپەرچی ئەو ڕایە دراوەتەوە بەوەی:

ئەم بەڵگانەیان بۆ پشتگیری ڕای خۆیان هێناوەتەوە:

بوونی چەند شتێکی لەمێژینە و بێ سەرەتا - زات و سیفەتەکان - بە یەکدەنگی کوفرە، بەم هۆیەش بوو حوکمی کوفر بەسەر نەصرانیەکاندا درا، کاتێ بڕوایان هێنا بەسێ زاتی لەمێژینەو بێ سەرەتا.

بەرپەرچی ئەم بەڵگەیە دراوەتەوە:

بەوەی کە کوفرە ئەگەر بوونی چەند زاتێکی لەمێژینە و بێ سەرەتا و کوفر نییە کاتێ بوونی زاتێکی بێ سەرەتا و لەمێژینە دەسەلمێنێت لەگەڵ بوونی چەند سیفەتێکی لەمێژینەی بێ سەرەتا[1].

ئەگەر سیفەتەکان ڕەتبکەینەوە ئەوا خوایەتی دەبێتە هزرو فیکرێکی ڕووتی بێ ناوەڕۆك، کە وەك ئەوە وایە هەر نەبوو بێت.

فخری رازی وتویەتی: (ئەوەی مشبیهەیە بت دەپەرستێت، (معطَّل) ئەوەی سیفەتەکانی خوا لەکار دەخات ئەوا نەبوو - عدم - دەپەرستێت)، (ابن تیمیە) وتویەتی: (چەسپاندنی بوونی زیندووی زانای بەتوانای دانای بیسەری بینەر، بەبێ بوونی ژیان و زانست و توانا و دانایی و بینین و بیستن، بەربەرەکانێی عەقڵە وەك چەسپاندنی نوێژکەر بەبێ بوونی نوێژ، و ڕۆژگر بەبێ بوونی ڕۆژوو و ڕاوەستاو

---

أ- ئەگەر خوای گەورە بێژەرو قسەکەر بێت بە دوان و قەسەکردنی کەسێکی غەیری خۆی، ئەوا ئەو کاتە پێویست دەبوو کە بجوڵێت و دەنگی هەبێت وەك بە جوڵە و دەنگی غەیری خۆی، و ئەمەش مەحاڵە و شیاوی بوون نیە.

ب- ئەگەر زانیاری پێغەمبەرمان (ﷺ) گێڕایەوە بۆ سەر خەونی پڕوپوچ، ئەوا ئەو کاتە زانیاری و زانستەکەی نابێتە زانست و زانیاری، بەوهۆیەش دەبێت هەموو شەرع ڕەتکەینەوە، چونکە متمانەی پێ ناکرێت./ الاقتصاد في الاعتقاد ١٥٥ و حاشیه محمد محیی الدین ٧٠-٧١.

(١) المواقف و شرحه ٤٨٠ و المقاصد ٢/ ٧٥-٧٧.

بەبێ ڕاوەستان)[١].

(سید شریف جرجانی) وێنەی مەزهەبی موعتەزیلەو هاوڕاكانیانی كردووە بەم وتەیەی خۆی: (ئەگەر وتت: چۆن ئەندێشەو تەصەوڕ دەكرێت سیفەتی شتێك بریتی بێت لە خودی حەقیقەتی شتەكە، لەگەڵ ئەوەی كە وەسفكراو و سیفەت خۆیان گەواهی دەدەن لەسەر جیاواز بوونیان؟ بەڕاستی ئەمە تەنها وتەیەكی خەیاڵاویە، ناكرێت بڕوای پێ بكرێت، وەك سەرجەم بابەتە خەیاڵاویەكانی تر، كە ناكرێت بڕوای پێ بكرێت؟ بۆیە پێویست ناكات هەڵسین بە هێنانەوەو خستنەڕووی بەڵگە لەسەر پوچەڵیەكەی.

دەڵێم: ئەوەی كە ئەوان باسیان كرد ماناكەی بریتی نیە لەوەی كە زاتێك هەیە و خاوەن سیفەتە و هەمووشیان یەكیان گرتووە، هەروەك تۆ وای بۆچوویت، بەڵكو مانای بریتیە لەوەی: كە زاتی خوا ئەوەی لێ ساز دەبێت كە بەهۆی زات و سیفەت بەیەكەوە ساز دەبێت. بۆ نمونە: زاتی تۆ ناتوانێت شتەكانت بۆ ئاشكرا بكات، بەڵكو پێویستی بە سیفەتی زانست هەیە، كە بەتۆوە ڕاوەستاوەو پەیوەستە، بە پێچەوانەی زاتی خوای گەورە كە بۆ ئاشكرا كردنی شتەكان و دەرخستنیان پێویستی بە سیفەتێك نیە كەبە زاتی ئەوەوە پەیوەست بێت، بەڵكو هەموو واتاكان بەگشتی لە پێناو زاتی ئەو ئاشكران، جا بەم پێیە زاتی خوا دەبێت بریتی بێت لە حەقیقەتی زانستەكەی، و بەهەمان شێوە تواناكەی دەبێت بریتی بێت لە خودی زاتی خوا، كەواتە زاتی خوای گەورە كارتێكەرو كاریگەر بێت بە خودی زاتەكە، نەوەك بە سیفەتێكی زیادی جگەلە زات، هەروەك ئەمە لە خودی ئێمەدا هەیە جا بەم دانانە

---

(١) دراسات في الفرق و العقائد الاسلامية ٢٣٢ و٢٣٧ و لەم سەرچاوەدا تەماشای: جیاوازی و بنەماكەی بكە لە نێوان نەفی كردنی ڕووتی سیفەت لەلایەن فەیلەسوفەكان كە سەردەكێشێت بۆ لەكارخستنی كامڵی ئەو سیفەتانە، و لە نێوان نەفی میانڕەو كە موعتەزیلە دەیكەن، كاتێ هەڵدەستن بە چەسپاندنی ئەوەی كە سیفەت خودی زاتە و نەفی ئەویان كرد كە سیفەت شتێكی زیادبێت لەسەر زات.

دەبێت توانا خود وحەقیقەتی زات بێت، بەم پێیە دەبێت زات و سیفەتەكان لە ڕاستیدا یەكگر و ئاوێتەبن، و بە واتا و چەمك لەیەك جیابن، سەرچاوەی ئەمە ئەگەر بێتەجێ: دەگەڕێتەوە بۆ ڕەتكردنەوەی سیفەت و لەگەڵ هاتنە كایەی بەرهەم و دەرەنجامەكانی سیفاتەكان تەنها لە زاتدا)[1].

ئەو ڕاجیاییە لە نێوان تاقمە ئیسلامیەكان بەوە كۆتایی دێت كە دان دەنێن بە یەكتایی خوای گەورە و پاك و بەدوور گرتنی لە هەموو ئەو شتانەی كە شایەنی ئەو نین.

بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا سیاسەتی موعتەزیلە لە سەردەمانی (مأمون) و (المعتصم) و (واثِق)، ئاراستەیەكی توندی وەرگرت دژی دژەڕاكانیان، بەمەش درزی ڕاجیایی لە نێوان هەر دوو لا زیادی كرد.

بەڵام كاتێك مەشخەڵەكان ڕوونـاك بوونەوە، گوفتارەكان لە یەكتر جیاكرانەوەو پاڵفتە كران، دەروونەكان ئارام بوونەوە، زانایانی كەلام ڕایان گەیاند كە ئەم ململانێیە نابێتە هۆكاری تەكفیر كردنی هیچ لایەك.

ئیمامی (دوانی) لە (حاشية)كەیدا لەسەر (العقائد العَضُدية) دەڵێت:

(بزانە مەسەلەو بابەتی زیاد بوونی سیفەت و زیاد نەبوونی لەو بابەتانە نییە كە بەهۆیەوە تەكفیری یەكێك لە لایەنەكان بكرێت. گوێم لە هەندێ لە پیاوچاكان و دەروون سازو پاكەكان بووە كە وتویانە:

لەلای من بابەتی زیاد بوون یان زیاد نەبوونی سیفات، پەیی پێنابردرێت مەگەر بەهۆی دەركەوتن و كەشف نەبێت، و هەر كەسێ ئەم بابەتە بداتە پاڵ غەیری كەشف، ئەوا ئەو شتەی بۆ دەردەكەوێت كە زاڵبووە بەسەر تێڕوانینن و هزری و فیكریەكەی، من هیچ زیانێك نابینم لەو مەسەلەیەدا لەوەی چ نەفی بێت یان بی چەسپێنێت)[2].

---

(١) شرح المواقف ٤٨٠.

(٢) حاشية الدواني على العقائد العضدية ١/ ٣٠٠-٣٠١.

تەنانــەت پێشــەوا (محمــد عبــده) ڕێگــری كــردووەو فــەرمانی كــردووە بــە خــۆ دوورگــرتن لـە خـۆ هەڵقوڕتانـدن لـەو بابەتـەدا، چـونكە لێكۆڵینـەوە لـەو بابەتـەدا لـە مەبەستی شەڕع دوورە، لەوبارەوە وتویەتی:

(سەبارەت بە بابەتی زیادبوونی سیفات لەسەر زات.... كە یەكێكە لـەو بابەتانـەی دروسـت نییـە موسـڵمان لێـی قـوڵ ببێتـەوە، چـونكە عـەقڵی مرۆڤـەكان نـاتوانن پێـی بگەن، بەڵگە هێنانـەوەش لەسـەر هـەر بەشـێكی ئـەم بابەتـە بـە وشـەو بێـژەی هـاتوو لاوازی عەقڵ دەسەلمێنێت و فریودانە بە شـەڕع، چـونكە بـەكارهێنانی زمـان تـەنها لـە لایەنی حەقیقی دا كورت هەڵنایەت، چونكە ئەگەر لەو لایەنەدا كورت بوبایـەوە ئـەوا بــارودۆخی زمــان ڕەچــاوی بوونــەوەرەكانی نــەدەكرد بــە نــاوەرۆك و لایەنــە شاراوەكانیان، بـەڵكو ئەوانـە ڕێبـازی فەلسـەفین ئەگـەر چاكترینیشـیان تیایـدا گـومڕا نەبێت، ئەوا تاقمێك تیایدا نەگەیشتووە بەشتێكی دلگیرو دڵنیاكەرەوە)[1].

زۆریش بەخێرایی بەسەر ئەو ڕاجیاییەدا تێپـەڕین، تـا بـۆ خوێنـەر ڕاسـتی وتـەی ئیمـامی (دوانـی) دەربكـەوێت، شـارەزای ڕێبـازی زانایـانی كـەلامیش ببێـت لـە تەفسـیر كردنی سیفاتدا.

## هۆكاری سەرهەڵدانی كێشەو مشومڕ:

توێژەران دوو ڕای جیاوازیان هەیە لەمەڕ هۆكـاری سـەرهەڵدانی كێشـەو مشـتومڕ لە سیفەتەكانی خوادا:

یەكەمیان: كێشە و مشتومڕ لەو بابەتـە سـەری هەڵـدا بـەهۆی كاریگـەری بیـانی و دەرەكی، بەڵام ڕاجیابوون لەسەر ئەم سەرچاوەیە، كە بەهۆی:

١- زانسـتی كـەلامی مەسـیحی بـوو. بەتایبـەتی لـە ڕێگـەی كتێبـەكانی قەشـەی دیمەشقی (یوحنا)، بـە بەڵگـەی: بـوونی ڕووی لێكچـوون لـە نێـوان هـزری مەسـیحی و ئیسلامی، بەوەی زیاتـر لە هزرێكیان پێك دەچێت لە چارەسەر كردنی ئـەم كێشـەیەدا،

---

(١) رسالة التوحيد للشيخ محمد عبده ج ١٧ (دار المنار) ميسر ٥٢.

و ئەوەی پشتی ئەم ڕایە دەگرێت:

ئەوەیە کە (شهرستانی) وتویەتی لەکاتی بەرپەرچدانەوەی (أبي هُذَيْل العلاّف): (ئەگەر "أبي هذيل" ئەو سیفەتانە بچەسپێنێت وەك چەند ڕووێکی زاتی خوا، ئەوا ئەو بۆچوونەی بریتیە لە خودی سێ خواکەی نەصرانیەکان).

**٢- هزری جولەکە، بەبەڵگەی:**

وتەی موعتەزیلەکان، کە دەڵێن: (قورئان بەدیهێنراوە)، وەرگیراوەو هەڵێنجراوە لە وتەی جولەکەکان، کە دەڵێن (تەوڕات بەدیهێنراوە).

(ابن أثير) لە کتێبەکەیدا (الکامل) دەڵێت: (یەکەم کەس کە ئەو بیرۆکەیەی کە (قورئان بەدیهێنراوە)، بڵاوکردەوە (لبید)ی کوڕی (الأعصم) بوو، دواتر خوشکەزاکەی (طالوت) ئەو بیرۆکەیەی لێ وەرگرت، و کتێبی نووسی لەبارەی قورئان بەدیهێنراوە. بۆیە یەکەم کەس بوو ئەمەی کردووە لە ئیسلامدا، جا ئەو (طالوت)ە بێ دین بوو، بۆیە بێ دینی بڵاو دەکردەوە).

(ابن قتیبة) باسی کردووە کە: (یەکەم کەس باسی ئەو بیرۆکەیەی کرد کە (قورئان بەدیهێنراوە) بریتی بوو لە (مغیرە)ی کوڕی (سعید العجلي)، ناوبراو یەکێك بوو لە شوێنکەوتووانی (عبدالله)ی کوڕی (سبأ)ی جولەکە).

**٣- فەیلەسوفەکان:**

بەهۆی بوونی پەیوەندی هزری و فیکری لە نێوان فەیلەسوف و زاناکانی کەلام، بەتایبەتی لە نێوان موعتەزیلە و فەیلەسوفەکانی یۆنانی.

دووەمیان: ئەم کێشەو مشتومڕە سەریهەڵدا وەك دەرەنجامێك بێ پیچوپەنای گەشەی هزری لەناو خودی ئیسلامدا، بە بەڵگەی ئەوەی:

١- بەهۆی ئەو گفتوگۆو دەمەتقێی ئایینی کە سەریهەڵدا، کە ڕوویدا لەنێوان ڕیزەکانی خەواریجەکان لەبارەی حوکمی ئەنجامدەری تاوانی گەورە، کە ئەمەش سەری کێشا بۆ لێکۆڵینەوە لە کێشەی بابەتی قەزاو قەدەر، دواتر کێشەو مشتومڕی سیفەتەکانی خوا.

٢- پابەندبوون و وابەستەبوون بە سیفەتە خەبەریەکان کە لە قورئانی پیرۆزدا

هاتوون، لێكدانەوەو تەفسیر كردنی ئەو سیفەتانە بە شێوەیەكی حەقیقی نەوەكو مەجازی، ئەمەش گەشەی سەند لە كێشەیەكی زمانەوانیەوە بۆ كێشەیەكی فەلسەفی بە واتا زاراوەییەكەی[1].

## مێژووی كێشەو مشتومڕەكە:

دەڵێن یەكەم كەس كە نەفی سیفەتەكانی خوای گەورەی كرد دوو كەس بوون: (جعد)ی كوڕی (درهم)، و (جهم)ی كوڕی (صفوان)، و (جعد) فیكرەی خۆی دامەزراند لەسەر دوو بنچینە كە بریتین لە:

أ- لایەنی زمانەوانی: وتی: هاوێنە بوون (المماثلة) بریتیە لە: بەژداربوون لە ناو (اسم). دەیوت: خوای گەورە بە سیفەتێك وەسف ناكەم لە كاتێكدا دروست بێت غەیری خوای گەورە پێی وەسف بكرێت وەك: سیفەتی زیندوویی و زانایی و ویست.... بۆیە (جهم) سیفەتی توانا و بەدیهێنانی دایە پاڵ خوای گەورەو بۆی چەسپاند، چونكە هیچ یەكێك لە بوونەوەر بەمانە وەسف ناكرێن.

٢- لایەنی فەلسەفی: (جهم) جەبری بوو، بۆیە توانا و هێزی مرۆڤی نەفی كرد و نكوڵی لێكرد، بڕوای وابوو كە مرۆڤ ناچاركراوە لە كارەكانی دا.

موعتەزیلەكانیش هاتن و سیفەتەكانی خوایان ڕەتكردەوەی. و (واصلی كوڕی عطاء) بە شێخی موعتەزیلە دادەنرێت، لەبەر ئەوەی یەكەم موعتەزیلی بوو كە سیفەتەكانی ڕەتكردەوە، وتی: (هەر كەسێ بڕوای بەبونی واتا یان سیفەتێكی لەمێژینە و كۆن هەبوو ئەوا بڕوای وایە دوو خوا هەن)[2].

***

---

(١) دراسات في الفرق و العقائد الاسلامية ٢١٤-٢١٩. و ئاماژەی داوە بۆ: الكامل ابن أثير ٤٩/٧ و عيون الأخبار لابن قتيبة الدينوري ١٤٨.

(٢) دراسات في الفرق و العقائد الاسلامية ٢١٩-٢٣١.

# سیفەتی واتاییەکان (معاني)

## ١- توانا (القدرة)

سیفەتێکی هەر بوو (أزلی)ە، کە لە میانەیدا هەموو شتە شیاو (ممکن)ەکان بەدیدەهێنرێن و لەناویش دەبرێت[1].

دژەکەشی بریتیە لە: دەسەوەسانی و بێ توانایی.

## بەڵگەی عەقڵی لەسەر ئەمە:

أ- ئەگەر خوای گەورە خاوەنی توانا نەبێت، ئەوا دەبوایە بێ توانا بوایە.

ئەگەر بێ توانا بوایە، ئەوا هیچ شتێك لەو پەیدابووانە کە بە شێوەیەکی زۆر قەشەنگ و تووندو توکمە و ڕێك و پێك دروست کراو نەدەهاتنە بوون، و بێگومان گریمانی نەبوونی ئەو پەیدابووانە پوچەڵە هەر بە بینین.

ب- ئەگەر خوای گەورە بێ توانا بوایە، ئەوا بە کەموکورتی و کرچ و کاڵی وەسف دەکرا، بوونی کەموکوری لە خوادا شتێکی شیاوی بوون نییە ئەستەمە.

پ- ئەگەر بێ توانا بوایە، ئەوا بە کەموکورتی دەبوو، ئەگەر بە کەموکورتی وەسف کرا، ئەوا پێویستی بەیەکێك دەبوو کە کاملی بکات و کەموکورتیەکانی نەهێلێت، تەواوکەرەکەی خۆیشی پێویستی بە تەواوکەرێك هەیە.... بەم شێوەیە ئەو کاتە گریمانی خول (دور) و زنجیرەیی (تسلسل) خۆی دەسە پێنێت، و بێگومان هەر دوو گریمانەکەش پوچەڵن[2].

ت- خوای گەورە دروستکەرو لە مێژینەو بێ سەرەتایە، خاوەنی دروستکراوێکی پەیدابووە، دروست بوونی بەدیهێنراو لە لایەن زاتێکی لە مێژینەو بێ سەرەتا تەنها لە ڕێگەی توانا دەبێت، جا کەواتە توانا پێویستە بۆ خوای گەورە[3].

---

(١) شرح الدردير على الخريدة ٧٨.

(٢) المواقف و شرحه ٤٨١ و حاشية محيي الدين على المسيارة ٥٨.

(٣) المقاصد و شرحه ٢/٧٩-٨٠ و الباجوري على الجوهرة ١/٥٩.

## بەڵگەی نەقڵی:

ئەو فەرمایشتەی خوای گەورە: ﴿ إِنَّ ٱللَّهَ عَلَىٰ كُلِّ شَيْءٖ قَدِيرٌ ﴾ البقرة: ١٠٩. واتە: (بێگومان خوا دەسەڵاتی بەسەر هەموو شتێكدا هەیە).

و ئـــەو فەرمایشـــتە: ﴿ وَمَا كَانَ ٱللَّهُ لِيُعۡجِزَهُۥ مِن شَيۡءٖ فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَلَا فِي ٱلۡأَرۡضِۚ إِنَّهُۥ كَانَ عَلِيمٗا قَدِيرٗا ﴾ فاطر: ٤٤. واتە: (وەنەبێت خوا هیچ شتێك دەستەوەسانی بكات لە ئاسمانەكان، یان لە زەویدا، چونكە بەڕاستی ئەو زاتە هەمیشە و بەردەوام زانایە و بەدەسەڵات و توانایە).

**چەند سودو وەدەستهاتوێك:**

١- توانای خوای گەورە تەنها پەیوەستە بە شتی شیاو (ممكن) بەدەر لە شتی پێویست (واجب) و ئەستەم (مستحيل)[1].

واتە توانای خوای گەورە تەنها كار لە شتی شیاو (ممكن) دەكات، چونكە شتی شیاو دێتە بوون و لەناو دەچێت واتە بوون و نەبوون قبوڵ دەكات.

بەڵام شتی پێویست (واجب): هیچ كاریگەریەك قبوڵ ناكات، چونكە هەیە و نەبوون قبوڵ ناكات.

بەهەمان شێوە شتی ئەستەم (مستحيل): هیچ كاریگەریەك قبوڵ ناكات، چونكە نەبووەو بوون قبوڵ ناكات.

ئەگەر كەسێك پرسیاری كرد: ئایا خوای گەورە توانای بەدیهێنانی خوایەكی هاوێنەی خۆی هەیە؟ یان شتێكی لەو جۆرەو دەتوانێت كاریگەری دروست بكات لە شتی پێویست (واجب) و ئەستەم (مستحيل)؟

وەڵامەكەی ئەوەیە: ئەوەی تۆ وتت بە شێوەی پرسیار هاتووە ئەگەرنا لە ڕاستیدا پرسیار نیە، بەڵكو بریتیە لە ڕێكخستنی قسەیەكی بۆش و پوچ، چونكە ئەگەر خوای گەورە هاوەڵێكی بۆ خۆی بەدیهێنابوایە ئەوا ئەو هاوەڵە نەدەبووە

(١) المواقف و شرحه ٤٨٤ و المقاصد و شرحه ٨٥/٢ و المسامرة ٦٢ و الباجوري على الجوهرة ٥٨/١.

پێویستە بوون (واجب الوجود)، چونكە نەبوون (عدم) پێش ئەو هاوەڵە كەوتۆتەوە.... جا ئەم پرسیارە وەك وتەی كەسێكە كە پێت بڵێت:

گەر زەحمەت نەبێت لەبەر خاتری من لەبەردەممدا ڕاوەستە و ونیش بە لەیەك ساتدا؟ جا ئەمە پرسارێكە هچ واتا و سودێكی نییە، بەڵكو وەك گشت وتە بێ سەروبەرو تێكەڵ و پێكەڵەكانی ترە، قسەكەرەكە وتەیەكی وای نەوت كە وەڵامدانەوەی پێویست بێت، بەڵكو ئەندێشەیەكی خەیاڵاویە وەك پرسیاری منداڵێك وایە كە بۆش و بەتاڵە و هیچ مانایەكی نییە.

تەنانەت پرسیاركەرەكە پێویستی بەوە هەیە فێری ئەوە بكرێت كە شتی ئەستەم (مستحیل) و پێویست (واجب) و شیاو (ممكن) چییە، جا وەڵامی تۆ بۆ پرسیارەكە بریتیە لە فێركردنی كەسێكی نەزان نەك وەڵامی پرسیاركەرەكە[1].

(باجوری) وتویەتی:

بۆیە (سنوسی) لە (شرح الصغری) زۆر بەتووندی هێرشی كردۆتە سەر (ابن حزم) ڕەخنەی لێ گرتووە، لەسەر ئەو وتەیەی: كە وتویەتی خوای گەورە توانای هەیە كە منداڵێك بۆ خۆی بڕیاربدات، و ئەگەرنا دەبوایە خوا بێ توانا بوایە[2].

واتای پەیوەست بوون بریتیە لە:

ئەم سیفەتە ویستن و پەیوەستن بوون بە شتێكی زیاد سەرباری پەیوەست بوون و ڕاوەستانی بەزاتی خواوە، جا سیفەتی توانا پەیوەستە بەشتێك كە لە چوارچێوەی تواناادا بێت و سیفەتی ویست پەیوەستە بەشتی ویستراو، سیفەتی بیستن و بینین پەیوەستن بە شتی بینراو بیستراو، زانست پەیوەستە بەشتی زانراو، سیفەتی دوان (كلام) پەیوەستە بە واتا (مدلول)ەوە، بەڵام سیفەتی ژیان تەنها پەیوەستە بە زاتی خوای گەورە بەدەر لە شتی تر[3].

---

(١) كبرى اليقينيات الكونية ١٣٧-١٤٠

(٢) الباجوري على الجوهرة ٥٨.

(٣) شرح الدردير على الخريدة ٨٥.

٢- سیفەتی توانا (القدرة) دوو جۆر پەیوەست بوونی هەیە:

یەکەمیان: پەیوەست بوونێکی گونجاوی (صلوحی) لەمێژینەی بێ سەرەتایە.

واتە: توانای خوای گەورە بێ سەرەتا و لە ئەزلدا گونجاو بووە بۆ ئەوەی شتی شیاو بێنێتە بوون و لەناوی ببات بەردەوام ئەو توانایەی هەر هەیە و گونجاوە لە ئەزەلەوە بۆ ئەوەی بوونەوەر بێنێتە بوون و لەناویان ببات.

دووەمیان: پەیوەستبوونێکی جێبەجێکەر (تنجیزی) پەیدابووە:

واتە: خوای گەورە شتی شیاو (ممکن) دێنێتە بوون و لەناوی دەبات کە بەردەوام لە ژێر توانای ئەودان[1].

٣- سیفەتی توانا ئەرکی جێبەجێ کردنی ئەو شتەیە کە سیفەتی ویست (ارادة) دیاری کردووە، وەك هێنانەدی شتی شیاو (ممکن) لە نەبوونەوە بۆ بوون، ئەگەر سیفەتەکە ئاراستەکرا بۆ بەدیهێنانی، بەڵام ئەگەر ئاراستە کرا بۆ گۆڕینی لە بوونەوە بۆ نەبوون، ئەمەش ئەگەر سیفەتی ویست بڕیاری دا نەبێت[2].

**٢- ویست (الارادة)**

سیفەتێکی هەربوو و بێ سەرەتایە، شتی شیاو (ممکن) تایبەت دەکات بە بەشێك لەو شتانەی کە دروست و ڕەوان بۆی، لە بوون یان نەبوون، و ئەندازە و کات، و شوێن و ئاراستەکەی[3].

دژەکەیشی: زۆری لێکردن و ناچار کردن (الاکراه)ە.

---

(١) الباجوري على الجوهرة ٥٨ و الباجوري على السنوسية میسر چ ١ ساڵی ١٣٦٩ك، ٢١ و رسالة في التوحيد للطائي ٤١.

(٢) رسالة في التوحيد للطائي ٤٨.

(٣) الدردير على الخريدة ٧٨.

## بەڵگەی عەقڵی لەسەر ئەمە:

١- خوای گەورە سەرپشك بووە لە دروست كردوونی جیهان، و هەر كەسێكیش سەرپشك بووبێت دەبێت خاوەنی ویست (ارادة) بووبێت، كەواتە پێویستە خوا خاوەن ویست (ارادة) بێت[1].

٢- ئەگەر خوای گەورە خاوەن ویست نەبوایە، ئەوە دەبوو ناچاركراو بوایە، و ئەگەر ناچاركراو بوایە، ئەوا بێ توانا دەبوو، و ئەگەر بێ توانا بوایە، ئەوا هیچ یەكێك لەم بوونەوەرانە نەدەبوون، و نەبوونی ئەو بوونەوەرانە شتێكی پوچەڵە هەر بە بینین، بەم جۆرەی سەلمێنرا كە خوای گەورە خاوەن ویستە.

٣- ئەگەر خوای گەورە خاوەن ویست نەبوایە، ئەوە دەبوو ناچاركراو بوایە، و پاڵدانی ناچار بوون بۆ خوا كەموكوریە، و بێگومان ئەمەش پوچەڵە.

٤- ئەگەر خوای گەورە ناچار كراو بوایە ئەوا نەدەبوو خاوەن توانا بوایە، چونكە پەیوەست بوونی توانا بەستراوەتەوە بە پەیوەست بوونی سیفەتی ویست (واتە: مەبەست بۆ ئەنجامدانی كارێك)، كەواتە سیفەتی توانا پەیوەستە بەو شتەی كە سیفەتی ویست پێیەوە پابەندبووە.

## بەڵگەی نەقڵی:

ئەو فەرمایشتەی خوای گەورە:﴿ فَعَّالٌ لِّمَا يُرِيدُ ﴿١٦﴾ ﴾ البروج: ١٦. واتە: (هەرچی بیەوێت ئەنجامی دەدات، هەرچی بیەوێت كەس ناتوانێت بهێنێتە ڕێی).

و ئەو فەرمایشتەی:﴿ يُرِيدُ ٱللَّهُ بِكُمُ ٱلْيُسْرَ وَلَا يُرِيدُ بِكُمُ ٱلْعُسْرَ ﴾ البقرة: ١٨٥. واتە: (خوا ئاسانكاری بۆ ئێوە دەوێت و نایەوێت (پەرستن و فەرزەكانتان) لەسەر قورس و گران بكات). ﴿ إِنَّمَآ أَمْرُهُۥٓ إِذَآ أَرَادَ شَيْـًٔا أَن يَقُولَ لَهُۥ كُن فَيَكُونُ ﴿٨٢﴾ ﴾ یس: ٨٢. واتە: (بێگومان هەر كاتێك فەرمانی خوا دەرچوو، ویستی شتێك جێبەجێ

(١) شرح الباجوري على الجوهرة ١/٦٠ و شرح المقاصد ٢/٩٤.

بکات و بهێنێته دی، پێی دەڵێت ببە؟! ئەویش دەستبەجێ بێ دواکەوتن پێش دێت و ئەنجام دەدرێت و دروست دەبێت).

**چەند سودو وەدەستهاتوێک:**

١- هەندێ کەس هەندێ کات چەمکی (ارادة) (مشیئة) بەکاردێنن[(١)].

٢- سیفەتی ویست (ارادة) وەك سیفەتی توانا (قدرة) وایە تەنها پەیوەستە بە شتی شیاو (ممکن)ەوە، پەیوەست نییە بەشتی پێویست (واجب) و ئەستەم (مستحیل)[(٢)].

٣- پەیوەست بوونی سیفەتی ویست (ارادة) جێبەجێ کاری لەمێژینەو بێ سەرەتایە.

واتە: سیفەتی ویست (ارادة) لە کۆن و ئەزلەوە پەیوەست بووە بە تایبەت کردنی ڕووداوەکان بە کاتەکانیانەوە[(٣)]، بەو سیفەتانەی کە دەزانێت ئەو شتانە بەهۆیەوە پەیدا دەبن[(٤)].

جا خوای گەورە لە ئەزەلەوە ویستویەتی کە: تۆ ببیت، و محمدیش وەك نێردراوی خۆی ڕەوانە بکات.

---

(١) الباجوري شرح الجوهرة ٥٩/١.

(٢) الباجوري شرح الجوهرة ٦٠/١.

(٣) المسايرة ٦٤.

(٤) الباجوري شرح الجوهرة ٥٩/١.

مەبەست لە جێبەجێ کاری لە سیفەتی ویست بریتە لە تەواو پەیوەست بوونی سیفەتی ناوبراو بە شتێکی شیاو لە شتە شیاوەکان (ممکنات)، جا ئەو شتە شیاوە هاتبێتە بوون یاخود هێشتان نەهاتبێتە بوون، دەکرێ ویستی مرۆڤ پەیوەست بێت بە کارێك لە کارەکان، کەچی جێبەجێی ناکات و چەند ساڵێکی زۆر دوای دەخات، جا ئەمە پێی دەوترێت ویستی جێبەجێ کاری، واتە: تەنها گونجانی تەواو نییە، بەڵکو ئاراستە کردنێکی جێبەجێ کارییە بۆ مەبەستێکی دیاریکراو/ کبری الیقینیات الکونیة ١٢٦.

**٤- ویست (ارادة) پەیوەست نییە ڕەزامەندی (الرضا).**

**ئەو بۆچوونەی ئەهلی سوننە و جەماعەتی لەسەرە، ئەوەیە کە: خوای گەورە ویستی لەسەر ئەوەیە کە کەسی بێ باوەڕ کوفر بکات، بەڵام ڕازیش نییە بە کوفر و خۆشیشی ناوێت، جا کوفری دەوێت و ویستی لەسەرە وەك یاسایەکی کەونی و بوونەوەری نەك پێی ڕازی بێت وەك دین و ئایین[1].**

---

(١) بۆ زیاتر ڕوونکردنەوەی ئەو بابەتە چەند دێرێك لە کتێبی (ئیمان و عەقیدەی ئیسلامی لەبەر ڕۆشنایی قورئان و سوننەت) دانراوی (م. علی باپیر) دەخەمەڕوو، کە بەڕاستی کتێبێکی ناوازەو بەهێزە، خوای گەورە پاداشتی بداتەوە بە چاکە، جا دانەر لە کتێبی ناوبراوا لە (بەرگی سێیەم ٣٩٨-٤٠٠) دەڵێت : (ئەم واقیعە و هەر واقیع و کارو کارەسات و ڕووداوی چاك یان خراپ هەر بەویستی خواو بەگوێرەی نەخشەو بەرنامەیەك کە خوا دایناوە دێنەدی، بەڵام هەر ئەو خوایەی کە ئەو یاسا سروشتیانە (القوانین التكوينية)ی داناون کە بەپێی وان هەموو شتێك (چاك و خراپ) دێتەدی، هەمان خواش چەند یاسایەکی شەرعی (القوانین التشريعية)ی داناون، کە فەرمانمان پێدەکەن ڕاپەڕین و هەر واقیعێك و هەر دیاردەیەك کە لەگەڵ بەرنامەو شەرعی خوادا نەگونجاون لابەڕین. ئینجا دەبێ بزانین کە ویست و ڕەزامەندی (الارادة و الرضى)ی خودا مەرج نیە هەموو دەمێ پێکەوە گونجاوو پەیوەست بن، بەڵکو جاری وایە لێك دەترازێن و دژی یەکدی دەوەستن، بۆ وێنە خوا لە قورئانێ دا دەفەرمووێ: (مەی مەخۆنەوە)، بەڵام ویستی وایە کە شەراب خۆرەکان بیخۆنەوە، لێرەدا ویست و ڕەزامەندی خوا لێك جودان! کەواتە: مەرج نییە هەر واقیعێك کە بەویستی خوا دروست بوو، بەپێی ڕەزامەندی خواش بێ، بەڵکو دەبێ بۆ ئەوەی داخۆ فڵان واقیع یان فڵان کردەوە خوا پێی ڕازییە یان نا، لە بەرنامەکەیدا بۆی بگەڕێین، چونکە بەرنامەو ئایینی خوا هەموو دەمێ لەگەڵ ڕەزامەندی دا پێکەوە جووتن و لێك ناترازێن. کەواتە پوختەی قسان: لەبەر ئەوەی خوا بەدیهێنەرو پەروەرگاری هەموو شتێکە، ناگونجێ هیچ شتێك بەبێ ویست و توانای وی دروست بێ و هەرچی پەیدا دەبێ چاك و خراپ هەر بەپێی ویستی خواو بەهۆی توانای وییەوەیە، بەڵام مەرج نییە هەرچی بەپێی ویستی خوا پەیدابوو، خوا لێی ڕازی بێت.

بەپێویستی دەزانم بۆ پتر ڕوون بوونەوەی مەبەست وێنەیەك بێنینەوە (لە ژیانی ڕۆژانەماندا) بۆ چۆنیەتی لێك جیا بوونی (ویست و ڕەزامەندی): =

**(قدرييەكان) و (معتزيلەكان) لەمەدا ڕايان جياواز بوو، واى بۆچوون كە خواى گەورە ويستويەتى كەسى بێ باوەڕو كافر باوەڕ بێنێت بەڵام كافرەكە كوفرى هەڵبژاردووە، جا لەبەرئەوە ئەو دوو تاقمە بۆ ئەم ڕايە چوون، تا نەڵێن: ويستى كافر كوفر هەڵبژێرێت و سزاشى دا لەسەر كوفرەكەى، جا ئەوانە وەك ئەوايان بەسەرهات پەنايان بردە بەر گەرماى ئاگر، لەبەر شتێك هەڵاتن كەوتنە ناو شتێكى لەو خراپتر، بەپێى بۆچوونەكەى ئەوان ئەوا پێويست دەبێت كە ويستى كافرەكە زاڵ ببێت بەسەر ويستى خواى گەورە، و خواى گەورە ويستويەتى باوەڕ بێنێت - بە پێى بۆچوونى ناوبراوان - بەڵام كافر كوفرى هەڵبژاردووە، بەم جۆرە ويستى كافرەكە هاتەجێ و يستى خواى گەورە نەهاتەجێ، ئەمەش خراپترين بيروباوەڕو بۆچوونە، وتەيەكى بێ بەڵگەيە، تەنانەت پێچەوانەكەى بەڵگەيە.**

---

= بابێك دوو كوڕى هەن پێيان دەڵێ: ڕۆڵەكانم ئەوە باڵغ بوون و لەمڕۆ بەدواوە پياون و تەكليفى شەرعيتان لەسەرە، جا داواتان لێدەكەم موسڵمانى چاك بن و بێفەرمانى خواو پێغەمبەر (ﷺ) مەكەن، هەر كامێكتان پياوى چاك بێ و بێ فەرمانى خوا نەكات، با لە ماڵى مندا بمێنێتەوە، بەڵام هەر كامێكتان بێ فەرمانى و سەرخەرى بكات و ڕێى خوارو خێچ و هەڵەت و هەڵدێر بگرێ، لێى تورە دەبم و لە ماڵى خۆم وەدەرى دەنێم، پاشان نەڵێن ئاگادار نەبووين و نەمانزانى!! پاشان دواى ماوەيەك يەكيان ڕێى چاكە و خواپەرستى گرت و يەكيشيان سوارى كەرێ شەيتانى بوو و نەهاتە ژێربار، جا هەرچەندە بابەكە چەند جارى ديكەش ئامۆژگارى كرد و ئاگادارى كردەوەو ترساندى، بەڵام فايدێى نەبوو!! تا لە ئاكامدا بابەكە كوڕە بەدفەڕەكەى لە ماڵێ وەدەرنا!! جا سەرنج بدەين! بێگومان هەم مانەوەى كوڕە گوێڕايەڵ و موسڵمانەكە و هەم دەركرانى كوڕە بەدفەڕو لاسارەكەش، هەردووكيان بەويستى بابەكە هاتنەدى، بەڵام ديارە بابەكە هەرچەندە لە مانەوەى كوڕە چاكەكەدا ڕەزامەندى هەبوو، بەڵام لە دەركرانى كوڕە بەدكارەكەيدا ڕەزامەندى نەبوو، واتە مانەوەى كوڕە چاكەكەى پێ خۆش بوو، بەڵام دەركرانى كوڕە بەدەكەى پێ خۆش نەبوو، كەواتە: ڕاستە جارى وايە ئينسان شتێك دەكات و ويستى لەسەر پەيدابوونى شتێكە، بەڵام پێى خۆش نييە و لێى ڕازى نييە!). بەكەمێك دەستكارييەوە (وەرگێڕ).

(عمرو) کوڕی (هیثم) گراویەتیەوەو وتویەتی: لە کەشتیەکدا لەگەڵ کەسێکی قەدەری و یەکێکی مەجوسی گەشتمان کرد، جا قەدەریەکە بە مەجوسیەکەی وت: موسڵمان بە. لەوەڵامدا مەجوسیەکە وتی: تا خوا ویستی لەسەر نەبێت موسڵمان نابم. قەدەریەکە وتی: خوا ویستی لەسەرە، بەڵام شەیتان ویستی لەسەر نیە. ئینجا مەجوسیەکە وتی: خوا ویستی و شەیتانیش ویستی بەڵام ویستی شەیتان هاتەجێ. بەڕاستی ئەو شەیتانە بەهێزە. لە ڕیوایەتێکی تردا هاتووە: کە مەجوسیەکە وتویەتی: من لەگەڵ بەهێزترینیانم.

عەرەبێکی دەشتەکی ڕاوەستا لەلای کۆمەڵێك خەڵك کە (عمرو)ی کوڕی (عبید) لەناویاندا بوو، وتی: ئەی خەڵکینە، وشترەکەم دزراوە، بۆم لە خوا بپاڕێنەوە تا وشترەکەم بۆ بگەڕێنێتەوە. جا (عمرو)ی کوڕی (عبید) وتی: خوایەگیان تۆ ویستت لەسەر نەبووە کە وشترەکەی بدزرێت بەڵام وشترەکە هەر دزرا، خوایە داوات لێدەکەم بۆی بگەڕێنیتەوە. عەرەبە دەشتەکیەکە پێی وت: پێویستیم بە پاڕانەوەکەی تۆ نییە. وتی: بۆچی؟ وتی: ئەترسم هەروەك چۆن خوای گەورە ویستی نەدزرێت بەڵام هەر درزا، بەهەمان شێوە خوای گەورە بیەوێت بیگەڕێنێتەوە بەڵام نەگەڕێتەوە.

سەرچاوەی ئەو گومڕاییەش بریتیی بوو لە وەك یەك دانان و یەکسان کردنی ویست (الإرادة و المشیئة) و ڕەزامەندی و خۆشویستن (الرضا والمحبة)یە.

جا (جبریە) و (قدریە)کان ئەم چەمکانەیان وەك یەك دانا، دواتر ڕاجیاییان تێکەوت:

جبریەکان وتیان: بوون بە قەزاو قەدەری خوایە بۆیە خۆشەویستەو جێگای ڕەزامەندییە.

قەدەریەکانیش وتیان: لەبەرئەوەی تاوان و خراپە لەلایەن خوای گەورە خۆشەویست نین و هۆی ڕەزامەندی ئەو نین، بۆیە تاوان و خراپەکان بە قەدەرو قەزای خوا نین، کەواتە تاوان و خراپە لەدەرەوەی ویستی خوای گەورەن و خوای گەورە بەدییان ناهێنێت.

بەڵام ئەهلی سوننە و جەماعەت جیاوازیان کردووە لە نێوان ویست (مشیئة) و

خۆشویستن (محبة)، و چەند بەڵگەیەكیان هێناوەتەوە لەسەر ویست، وەك:

١- ئەم فەرمایشتەی خوای پاك و بەرز:﴿ وَمَا تَشَآءُونَ إِلَّآ أَن يَشَآءَ ٱللَّهُ ﴾ الإنسان: ٣٠، و التكوير: ٢٩. واتە: (ویستی ئێوەش نایەتەدی مەگەر كاتێك خوای پەروەردگاری جیهانیان بیەوێت).

٢- ئەم فەرمایشتەی خوای گەورە:﴿ مَن يَشَإِ ٱللَّهُ يُضْلِلْهُ وَمَن يَشَأْ يَجْعَلْهُ عَلَىٰ صِرَٰطٍ مُّسْتَقِيمٍ ﴾ الأنعام: ٣٩. واتە: (بێگومان ئەوەی خوا بیەوێت گومڕای دەكات، و ئەوەش كە بیەوێت دەیخاتە سەر ڕێبازی ڕاست و ڕەوان).

٣- و ئەم فەرمایشتە:﴿ فَمَن يُرِدِ ٱللَّهُ أَن يَهْدِيَهُۥ يَشْرَحْ صَدْرَهُۥ لِلْإِسْلَٰمِ ۖ وَمَن يُرِدْ أَن يُضِلَّهُۥ يَجْعَلْ صَدْرَهُۥ ضَيِّقًا حَرَجًا كَأَنَّمَا يَصَّعَّدُ فِى ٱلسَّمَآءِ ﴾ الأنعام: ١٢٥. واتە: (جا ئەو كەسەی خوا بیەوێت هیدایەتی بدات، ئەوە سینەی ساف و پاك و ئامادە دەكات بۆ ئایینی ئیسلام، ئەو كەسەش خوا بیەوێت گومڕای دەكات، ئەوە دڵی دەگوشێت و سنگی توووند دەكات و هەناسەی سوار دەبێت، هەر وەك ئەوەی بەرەو ئاسمان بەرز دەبێتەوە).

چەند بەڵگەیەكیان هێناوەتەوە لەسەر خۆشویستن و ڕەزامەندی، وەك:

١- ئەم فەرمایشتەی خوا:﴿ وَٱللَّهُ لَا يُحِبُّ ٱلْفَسَادَ ﴾ البقرة: ٢٠٥. واتە: (بێگومان خوا فەسادو خراپە و تاوانی ناوێت).

٢- ئەم فەرمایشتە:﴿ وَلَا يَرْضَىٰ لِعِبَادِهِ ٱلْكُفْرَ ﴾ الزمر: ٧. واتە: (ڕازی نابێت كە بەندەكانی بێ باوەڕ بن و ڕێبازی خوانەناسی بگرن).

٣- ئەم فەرمایشتەی خوای گەورە لەدوای ئەوە هاتووە كە ڕێگری كردووە لە هاوبەش دانان و ستەم و كاری خراپە و خۆبەزل زانین:﴿ كُلُّ ذَٰلِكَ كَانَ سَيِّئُهُۥ عِندَ رَبِّكَ مَكْرُوهًا ﴿٣٨﴾ ﴾ الإسراء: ٣٨. واتە: (هەموو ئەو شتانەی كە لە ئایەتەكانی پێشوودا باسمان كرد، خراپەكانی لای پەروەردگارت ناپەسەندو نابەجێیە).

٤- و ئەم فەرمایشتەی پێغەمبەر (ﷺ): ((ان الله كره اليكم ثلاثاً: قيل و قال، وكثرة السؤال، و اضاعة المال))[١] واتە: خوای گەورە سێ شتی بۆ ئێوە بە ناپەسەند داناوە، قسەو قسەڵۆك، و پرسیاری زۆر، بەفیرۆدانی ماڵ و سامان.

٥- و ئەم فەرمایشتەی تری پێغەمبەر (ﷺ): ((ان الله يحب أن يؤخذ برخصه، كما يكره أن تؤتى معصيته))[٢] واتە: خوای گەورە پێی خۆشە ئەو شتانە ئەنجام بدەن كە مۆڵەتی پێداوە، هەروەك چۆن پێی ناخۆشە سەرپێچی ئەو بكەن.

ئەگەر وترا: چۆن خوا ویستی لەسەر شتێك دەبێت، كەچی خۆشی ناوێت و پێی ڕازیش نیە؟ ئەی چۆن دەیوێت و پێكی دێنێت؟ و چۆن ویستی لەسەر ئەو شتە دەبێت و ڕق لێ بوونەو پەسەند نەكردیشی بەیەكەوە كۆ دەكرێنەوە؟ وەڵامی دەدەمەوە:

بەوەی ویست دوو جۆرە: ئەو شتەی كە بە خودی خۆی ویستراوە، ئەو شتەی كە لەبەر خودی خۆی ویستراو نەبێت.

ئەو شتەی كە بە خودی خۆی ویستراوەت: ئەو شتە ویستراوە لە خودی خۆیدا خوشەویستە و هەموو ئەو شتانەی كە چاكن، جا ویستی مەبەست و ئامانجەكانە.

ئەو شتەی كە بە خودی خۆی ویستراو نەبێت: دەكرێ بە خودی خۆی ویستراو نەبێت، كە تەماشای خودی شتەكە دەكرێت هیچ بەرژەوەندیەكی تێدا بەدی نەكرێت. ئەگەر هۆكارێك بێت بۆ مەبەست و ئامانجەكەی، ئەوا بە خودی خۆی ویستراو نییە، بەڵكو لەڕووی قەزای خوداو گەیشتن بە مەبەستەكەی ویستراوە. جا هەردوو شتەكە كۆ دەبنەوە: ڕق لێ بوونەوەو و ویستنی، ڕق لە شتێك بوونەوەو لەهەمان كاتدا ویستنی یەكتر ڕەت ناكەنەوە، چونكە لە ڕووی پەیوەست بوونەوە جیاوازن. نمونەی ئەمەش وەك دەرمانی نەویستراو و ناخۆشەویستە، ئەگەر دەرمان وەرگرەكە زانی كە چارەسەرو شیفاكەی لەو دەرمانەدایە، بڕینی ئەندامە

(١) متفق عليه، بخاری لە (استقراض) و مسلم لە (الأقضية) گێڕاویانەتەوە.

(٢) أحمد و جگەلەویش بە سەنەدێكی صەحیح و ڕاست گێڕاویانەتەوە.

داخوراوەكـەی ئەگـەر زانـی بـەو بڕینـە لاشـەكەی سـاغ و سـەلامەت دەبێـت، بڕینـی ڕێگایەكی قوڕس و گران ئەگەر زانی دەیگەیەنێتە مەبەست و خۆشەویستەكەی.

تەنانەت كەسـی عاقـڵ ئـەو شـتە نەویسـتراو ناخۆشـە پەسـەند دەكات بـە گومانـە زاڵبووەكەی ئەگەر سەرەنجامەكەی لێ شاراوە بێت، ئەی چی دەڵێی بۆ ئـەو زاتـەی كـە هیچ شتێكی لێ شاراوە نیە.

خوای گەورە شتێكی خـۆش ناوێـت، لەگـەڵ ئەوەشـدا مانـای وانیـە ویسـتی لەسـەر نییە ئەمەش لەبەر غەیری خۆی، و لەبەر ئەوەی هۆكارە بۆ شـتێك كـە بـەرزترە لـەو شتە نەویستراوە[1].

## ٣ ،٤- بیستن (السمع) و بینین (البصر)

سـیفەتی بیسـتن (سمـع): سـیفەتێكی هـەربووی بـێ سـەرەتای ئەزەلییـە، كاریشـی بریتیە لە پەیی بردن بە هەموو شتێكی بیستراو، ئەگەر ئەو شـتە بیسـتراوەش شاراوە بێت[2].

ئەمـە سـیفەتێكە شـتی بیسـتراو ئاشـكرا دەكـات بـەبێ ئـامرازو ئـامێر. جـا هـیچ شـتێك شـاراوە نابێـت لەلایـەن سـیفەتی بیسـتنی خـوای گـەورە ئەگـەر زۆر نـادیریش بێت، بەبێ بوونی زەردەواڵەكانی گوێچكە (أصمخة) و دەنگ و بانگ (آذان).

دژەكەی ئەم سیفەتەش: بریتیە لە نەبیستن و كەڕبوون.

سـیفەتی بیـنین (بصـر): سـیفەتێكی هـەربووی بـێ سـەرەتای ئەزەلییـە، كـاری ئـەم سیفەتە پـەیی بردنـە بەهـەموو بینـراوێـك، ئەگـەر بینراوەكـە زۆر ورد (لطیـف)یـش بێت[3].

ئەمە سیفەتێكە شتی بینـراوی پێ ئاشكرا دەكرێت بەبێ ئامراز، جـا هـیچ شـتێكی

(١) شرح العقیدة الطحاویة ٢١٥ و لاپەڕەكانی دواتر.

و بڕوانە: شرح المقاصد ٩٧/٢.

(٢) المسامرة ٦٨ و بڕوانە: الباجوری علی الجوهرة ٦٦/١.

(٣) المسامرة سەرچاوەی پێشوو، و بڕوانە: الباجوری سەرچاوەی پێشوو ٦٧.

بینـراو هەرچـەندە زۆر ووردیـش بێـت ئـەوا لەلایـەن ئـەو سـیفەتە شـاراوە نابێـت، و تـاریکی ڕێگـەی بینینــی لــێ ناگرێــت، و بــەبێ ڕەشــێنەی چـاو (حـدقـة) و پێڵوەکـان (أجفان) دەبینێت.

دژەکەی ئەم سیفەتەش: بریتیە لە نەبینین و کوێری.

ئەم دوو سیفەتە سنوردار نین، بەپێچەوانەی گوێچکە (ئامرازی بیسـتن[1]) و چـاو (ئامـرازی بینـین[2])ی مرۆڤ.

## بەڵگەی عەقڵی لەسەر ئەمە:

أ- سیفەتی بیستن و بینین دوو سـیفەتی کـامڵن، بـەدیهێنـراو و پەیـدابوانیش بـەم دوو سـیفەتە وەسـف دەکـرێن، کەواتـە خـوای گـەورە شـایەنترە کـە بـەو دوو سـیفەتە وەسف بکرێت. ئەگـەرنا ئەوکاتـە پێویسـت دەبێـت کـە بـەدیهێنـراو وەسـف بکرێـت بـە چەند سیفەتێکی کامڵ کەچی ئەو کات بەدیهێنەر خاوەنی ئەو دوو سیفەتە نابێت.

ب- ئەگـەر خـوای گـەورە وەسـف نـەکرێت و خـاوەنی سـیفەتی بیسـتن و بیـنین نەبێت، ئەوکات پێویست دەبێـت کـە بەپێچـەوانەی ئـەو دوو سـیفەتە وەسـف بکرێـت، ئەگـەر چەسـپێنرا کـە خـوای گـەورە خـاوەنی دوو سـیفەتی پێچـەوانەی دوو سـیفەتە ناوبراوەکەیـە، ئـەوا کـەموکوری ڕودەدا لـە خـوای گـەورەدا، و بـوونی کوموکـوری لـە خوای گەورە شتێکی ئەستەمە.

کەواتە چەسپا کە خوای گەورە خاوەنی سیفەتی بیستن و سیفەتی بینینە.

پ- ئەگەر چەسپا کە خوا نابیسـتێ و نـابینێ، ئـەوا کـەموکورتی لـە زاتـی دا ڕووی ئـەدا، و ئەگـەر خـوا کـەموکورتی تێبکـەوێت، ئـەوا پێویسـتی بـەوە دەبـوو کـە کـامڵی بکـات، و کامڵکارەکـەی خۆیشـی پێویسـتی بـە یـەکێك هەیـە تـا کـامڵی بکـات.... بـەم شـێوەیە ئـەو کـات گریمانــەی خـول (دور) و زنجیرەیـی (تسلسـل) پێویسـت دەبـوو، و

---

(١) وەرگێڕ.

(٢) وەرگێڕ.

هەردووكيشيان پوچەڵن[1].

## بەڵگەی نەقڵی:

ئەم فەرمايشتەی خوای پاك و بەرز: ﴿إِنَّ ٱللَّهَ سَمِيعٌۢ بَصِيرٌ﴾ الحج: ٧٥، لقمان ٢٨. واتە: (بەڕاستی خوا بيسەرو بينايە).

و ئـەم فەرمايشـتە:﴿وَهُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلۡبَصِيرُ﴾ الشـورى: ١١. واتـە: (هـيچ شـتێك لەوناچێت، هەر ئەويش بيسەرو بينايە).

## چەند سودو وەدەستهاتوێك:

١- ئاشكرا كردنی هەموو بوونەوەران بە سيفەتی بيستن و بيـنين، جيـاوازە لەگـەڵ سيفەتی زانست، هەروەك ئاشكرا كردن بـە يـەكێك لـە دوو سيفەتی نـاوبراو جيـاوازە لەگەڵ ئەوەی تر[2].

٢- باجوری و سنوسـی بۆچـوونيان وايـە كـە: سـيفەتی بيسـتن و بيـنين پەيوەسـتن بـە هـەموو بوونەورانـەوە بـە پەيوەسـت بـوونێكی زيـاتر لـە سـيفەتی زانسـت، جـا سيفەتی بيستن و بينينی خوا پەيوەستن بەهەموو ئەو شتانەی كە بـە نيسبەت ئێمـە شياوی بيستن و بينينن و بەو شتانەش كە بۆ ئێمە شياوی بيستن و بينين نين.

بەڵام ئيمام (سعد الدين التفتازانی) وتويەتی:

سيفەتی بيستن پەيوەستە بە شتە بيسـتراوەكان، و سـيفەتی بيـنين پەيوەسـتە بـە شتە بينراوەكان، لەو كاتەدا پەيوەست نين بەسەرجەم ئەو شتانەی كە هەن.

سەبارەت بەو شتانەش كە نەبوو (معـدوم)ن، زانايـان كـۆكن كـە هـەردوو سـيفەتی نـاوبراو پەيوەسـت نـين پێيانـەوە، چـونكە ناچـێتە عەقڵـەوە، و ئەگـەر پەيوەسـت بووبان بە شتی نەبوو (معدوم)ەوە ئەوكاتە شـتی نـەبووش دەچـووە نـاو چوارچێوەی

---

(١) المسامرة سەرچاوەی پێشوو ٦٩،

(٢) الدردير على الخريدة ٨٣.

ئەو شتانە كە هەن[1].

## ٥- زانست ( العلم )

سیفەتێكی هەربووی بێ سەرەتای ئەزەلییە، كە زانیاری ئاشكرا دەكات لەوكاتەی پێیەوە پەیوەست دەبێت[2].

دژەكەی ئەو سیفەتەش: بریتیە لە نەزانین، و ئەو شتانەی ئەچنە ڕیزیەوە وەك گومان و دودڵی و ئەندێشە و وڕبوون و بێ ئاگایی و لەبیرچوونەوەو بەهەڵەداچوون[3].

## بەڵگەی عەقڵی لەسەر ئەمە:

أ- كارەكانی خوای گەورە لەوپەڕی ڕێكوپێكی و جوانی و توونـدو تـۆڵی دان، ئەمە شتێكی دیارو بەرچاوە بۆ كەسێك كە تەماشای ئاسۆكان و خودی مرۆڤ و زیندەوەرەكانی كردبێت، بێگومان ئەوەی كاری ڕێكوپێك و قەشەنگ بێت ئەوا زانایە.

چونكە هەر كەسێ ڕستەیەكی بینی كە پێكهاتبێت لە وشەی شیرین و قەشەنگ و پاراو و هەڵگری چەند واتایەكی ورد، بێگومان بەبێ چەندوچوون زانیویەتی كە نووسەرەكەی زانایە[4].

ب- ئەگەر خوای گەورە زانا نەبوایە، ئەوا دەبوو نەزان بوایە، و ئەگەر نەزانیش بوایە، ئەوا ئەو جیهانە بەو سیستەمە ووردو ڕێكوپێكە نەدەبوو، كە نیشانە و بەڵگەیە لەسەر ئەوەی بەدیهێنەرەكەی زانایە بە بەرژەوەندیەكانی ئەو جیهانە بە

---

(١) كبرى اليقينيات الكونية ١٢٨ و١٤٠.

(٢) شرح العقائد النسفية ٧٥.

(٣) رسالة التوحيد: الطائي ٤٨.

(٤) المواقف و شرحه ٤٨٧ و المقاصد و شرحه ٢/٨٧.

زانینێکی تەواو.

بۆیە چەسپا کە خوای گەورە زانایە[1].

پ- ئەگەر خوای گەورە نەزان بوایە، ئەوا کەموکورت لە زاتی دا دەبوو، و بوونی کەموکورتی لەخوای گەورەدا شتێکی ئەستەمە.

ت- ئەگەر کەموکورتی لە خوادا هەبوایە ئەوا پێویستی بە یەکێك دەبو تا کاملی بکات، و ئەوەی کە کاملیشی دەکات پێویستی بەیەکێکی تر هەیە تا کاملی بکات.... بەم شێوەیە، ئەوکاتە گریمانەی خول (دور) یان زنجیرەیی (تسلسل) پێویست دەبێت، هەردوو گریمانەکەش پوچەڵن، کەواتە سەلمێنرا کە خوای گەورە خاوەن زانستە[2].

## بەڵگەی نەقڵی:

ئەو فەرمایشتەی خوای پاك و بەرز:﴿إِنَّ ٱللَّهَ عَلِيمُۢ بِذَاتِ ٱلصُّدُورِ﴾ لقمان: ٢٣. واتە: (بێگومان خوا ئاگادارە بەهەموو ئەو شتانەی کە لە سینەو دڵ و دەروونەکاندا حەشاردراون).

و فەرمایشتی:﴿وَهُوَ بِكُلِّ شَيْءٍ عَلِيمٌ﴾ البقرة: ٢٩. واتە: (هەر خۆیشی بەهەموو شتێك زاناو ئاگادارە).

فەرمایشتی:﴿إِنَّكَ أَنتَ عَلَّٰمُ ٱلْغُيُوبِ﴾ المائدة: ١٠٩، ١١٦. واتە: (بەڕاستی خوایە هەر خۆت ئاگات لە هەموو نهێنی و شاراوەکانە و بەهەموو پەنهانێك دەزانیت).

فەرمایشتی:﴿وَعِندَهُۥ مَفَاتِحُ ٱلْغَيْبِ لَا يَعْلَمُهَآ إِلَّا هُوَ ۚ وَيَعْلَمُ مَا فِى ٱلْبَرِّ وَٱلْبَحْرِ ۚ وَمَا تَسْقُطُ مِن وَرَقَةٍ إِلَّا يَعْلَمُهَا وَلَا حَبَّةٍ فِى ظُلُمَٰتِ ٱلْأَرْضِ وَلَا رَطْبٍ وَلَا يَابِسٍ إِلَّا فِى كِتَٰبٍ مُّبِينٍ ﴿٥٩﴾﴾ الأنعام: ٥٩. واتە: (کلیلی هەموو شاراوەکان و زانینی هەموو نهێنیەکان بەدەست خوایە و هەر لای ئەوە، کەس نایزانێت جگەلەو زاتە هەرچی لەسەر

---

(١) المواقف سەرچاوەی پێشوو.

(٢) بڕوانە: الباجوري شرح الجوهرة ٦٢/١ و ابن قطلوبغا على المسايرة ٦٠ و٦٢.

وشكانيه خوا پێی دەزانێت، هەروەها هەرچی لە دەرياكانيشدا هەيە ئاگای لێيەتی و هيچ گەڵايەك ناكەوێتە خوارەوە خوا پێی نەزانێت، هەروەها دەنكێك يان تۆوێك لە تاريكيەكانی زەويدا نيە، ئەو دەنكە چ شێدار بێت يان وشك بێت، هيچ شتێك نيە لە خوا پەنهان بێت و لە (لوح المحفوظ)دا، ياخود لە دۆسيەی و دەزگای تايبەتدا تۆمار نەكرابێت).

**چەند سودو وەدەستهاتوێک:**

١- سيفەتی زانست پەيوەستە بە هەموو چەمكەكان چ ئەوانەی هەن چ ئەوانەی نين، واتە: پەيوەستە بە شتە شياو (ممكن) و پێويست (واجب) و ئەستە (مستحيل)ەكان، كەواتە خوای گەورە زانايە بە هەموو شتەكان بە لايەنی وردو درشتيانەوە[1].

٢- پەيوەست بوونەكەی سيفەتی زانست جێبەجێ كاری لەمێژينە و بێ سەرەتايە:

جا خوای گەورە زانايە بەشتەكان وەك خۆيان هەر لە ئەزەلەوە. ئينجا پەيدابوونی ئەو شتانەی كە لە ڕابردوو داهەبوون ياخود كە لە ئێستادا هەن يان لە داهاتوودا پەيدا دەبن، هەموو ئەوانە تەنها چەند قۆناغێكن لە زانياری، چونكە هيچ گۆڕانكارييەك پێويست ناكات لە پەيوەست بوونەكەی سيفەتی زانست دا.

و سيفەتی زانست: پەيوەست بوونی گونجاوی (صلوحی) نييە، چونكە ئەگەر ئەم سيفەتە گونجاويی بوايە ئەوا خوای گەورە بە نەزان وەسف دەكرا، چونكە شتێك شياوی زانين بێ نابێتە زانا، سيفەتی زانست بەهەمان شێوە جێبەجێ كاری پەيدابوو نييە، چونكە ئەگەر وابوايە ئەوا دەبوايە پێش زانين خوای گەورە بە نەزانين وەسف بكرابايە[2].

٣- شتی شياوە بوون، ئەكرێ بێتە بوون و لە ناويش بچێت بەڵام بەدوای يەكدا،

---

(١) المسامرة ٦٠ و٦٢ و المواقف و شرحه ٤٨٨ و شرح المقاصد ٩٠/٢.

(٢) شرح الباجوري على الجوهرة ٦١/١ به لاسايی كردنەوەی سنوسی، و رسالة التوحيد: الطائي ٤٨.

جا ئەگەر حاڵەتی شتەكە گۆڕا ئایا زانستی خوای گەورەش دەگۆڕێت؟ و چۆن زانستی خوای گەورە دەگۆڕێت كەچی لەمێژینەو بێسەرەتایە؟

وەڵام: سیفەتی زانست ناگۆڕێت، بەڵكو ئەو شتەی بەو سیفەتە پەیوەستە دەگۆڕێت (كە بریتیە لە: زانراوەكە).

٤- زانستی خوای گەورە بێ سەرەتا و لەمێژینەیە ناكرێت لەگەڵ زانستی شتە پەیدابووەكان قیاس بكرێت و بپێورێت، خوای گەورە زانایە بە شتەكان بەر لە بەدیهێنانیان وەك ئەو حاڵەتەی كە لەسەری بەدیان دەهێنێت[1].

٦- دوان (الكلام)

سیفەتێكە ئاماژە و نیشاندەری هەموو زانیاریەكانە.

و ڕاجیایی زانایانی كەلام لە دیاریكردنی ئەم سیفەتە دەخەینەڕوو.

دژەكەی ئەم سیفەتەش: لاڵییە.

## بەڵگەی عەقڵی لەسەر ئەمە:

ئەگەر خوای گەورە نەیتوانیبوایە بدوێت، ئەوا پێویست بوو بە پێچەوانەی ئەم سیفەتە وەسف كرابایە، كە لاڵیە، و گریمانەی ئەوەی كە خوا لاڵ بێت ئەوا كەموكوریە، و بوونی كەموكورتی لە خوادا پوچەڵە، چونكە نەك خوا تەنانەت بەدیهێنراویش ڕازی نابێت بە كەموكوری، كەواتە چەسپا كە خوای گەورە خاوەنی سیفەتی دوان (كلام)ە[2].

## بەڵگەی نەقڵی:

ئەم فەرمایشتەی خوای پایەبەرز:﴿ وَكَلَّمَ ٱللَّهُ مُوسَىٰ تَكۡلِيمٗا ﴾ النساء: ١٦٤.
واتە: (بەڕاستی خوای گەورە خۆی لەگەڵ موسادا گفتوگۆی یەكسەری و ڕاستەوخۆی

---

(١) شرح الباجوري سەرچاوەی پێشوو.

(٢) رسالة في التوحيد: الطائي ٥٢.

ئەنجامداوە).

ئـەم فەرمایشـتـە:﴿ وَمَا كَانَ لِبَشَرٍ أَن يُكَلِّمَهُ ٱللَّهُ إِلَّا وَحۡيًا أَوۡ مِن وَرَآيِٕ حِجَابٍ أَوۡ يُرۡسِلَ رَسُولًا فَيُوحِيَ بِإِذۡنِهِۦ مَا يَشَآءُ ﴾ الشـوری: ٥١. واتـە: (كـەس بـۆی نیـە هـیچ كـات "لـە دنیادا" خوای گەورە وتوێژی ڕاستەوخۆی لەگەڵدا بكات مەگەر لە ڕێگەی وەحی و نیگاوە، یان لە پشتی پەردەوە، وەك موسا، یان نێردراوێكی وەك فریشتە - جوبرەئیل - دەنێرێت كە بە گوێرەی فەرمان و مۆڵەتی خوا چی پێ سپێردراوە دەیگەیەنێت، بەڕاستی ئەو زاتە خوایەكی بڵندو داناو كاربەجێیە).

زانایانی زانستی كەلام ڕاجیا بوونە سەبارەت بە سیفەتی دوان (كلام)ی خوای گەورە بۆ چەند ڕایەك:

## ١- ئەهلی سوننە و لەوناویشیاندا ئەشعەری و ماتریدیەكان:

وتویانە كە وتەی پەروەردگار دوو جۆرە:

أ- وتـەی نەفسی: ئەمـە لـە ڕاسـتیدا وتـە و قسـەیە، كـە بـەهۆی چـەند بێـژەو دەربڕینێك دەردەبڕدرێت، و لە ڕەگەزی دەنگەكان و پیتـەكان نیـە، بـەڵكو سیفەتێكی هـەربویی ئەزەلییـە و پەیوەسـتە بـە زاتـی خـوای گـەورە، ئـەوەی دوور دەخاتـەوە كـە خوای گەورە هێزی دوان و قسەی نەبێت، هەروەك چۆن كەسی لاڵ و منـداڵ نـاتوانن بە قسە بێن، و خـوای گـەورە بـەم سیفەتە فـەرمان دەكـات و شـت قەدەغـە دەكـات و هەواڵ دەدات، و جگە لەمانەش[١].

ئەمـە سـیفەتێكی لەمێژینـەی بـێ سـەرەتایە، (چـونكە شـتی پەیـدابوو بـە زاتـی خواوە ڕاناوەست و وابەستەی نابن).

ئەم سیفەتە ڕاوەستاوەو وابەستەیە بەزاتی خواوە. ئەم سیفەتە بریتی نیە لە: دەربڕین: چونكە دەربڕینەكان دەگۆڕێن بەهۆی كات و شوێن و هۆزەكان، بـەڵكو دەكرێـت شـت دەربڕیـت بـەهۆی ئامـاژە و نووسـین، هـەروەك دەربـڕین و داواكـاری

(١) شرح المقاصد ٢/٩٩.

نیشانەن لەسەری.

بریتـی نیـە لـە زانسـت: لەوانەیـە شـتی وا بـە مـرۆڤ بڵێـت كـە نایزانێـت، بـەڵكو شتێكی پێچەوانەی دەزانێت یان گومانی لێی هەیە.

بریتی نیە لە ویست: چونكە لەوانەیە فـەرمان بـە مـرۆڤ بكات بەشتێ كـە خـۆی ویستی لەسەر نییە، وەك تاقیكردنەوەی بەندەكەی، ئایا پێی دەبەخشێت یان نا[1]؟

وتـەی نەفسـی وێنەیەكـە بـۆ زانسـتی خـودی لـە دەروونـدا، هـەروەك زانسـت وێنەیەكە بۆ زانراو، بۆیە وتەی پەروەردگار كۆتایی بۆ نییە وەك زانستەكەی[2].

وتە و قسەی نەفسی لە ڕووی زمانەوە چەسپاوە، چونكە شتێكی بڵاو و بـاوە كـە نـاوی وتـە و قسـە بـەكاردێنن بـۆ واتایـەكی ئامـادە هـەبوو لـە دەروونـدا، هـەروەك لـە وتەی (أخطل)دا هاتووە:

ان الكلام لفي الفؤاد و انما     جُعل اللسان على الفؤاد دليلاً

واتە: بەڕاستی وتە لە دڵ و دەروونـدایـە، بـەڵام زمـانیش كـراوە بـە ڕێنیشـاندەر و ئاماژە بۆ دڵ و دەروون.

لــە قورئــانی پیرۆزیشــدا هــاتووە: ﴿وَيَقُولُونَ فِيٓ أَنفُسِهِمۡ﴾ المجادلـة: ٨. واتــە: (لــە دەروونی خۆیاندا دەڵێن).

ئـەم وتەیەشـیان كـە دەڵـێن: (زوَّرْتُ في نفسـي مقالـة) واتـە: لـە دەروونـی خۆمـدا قسەیەكم گۆڕی. و: (في نفسي كلام)[3] واتە: لە دەروونمدا قسەیەك هەیە.

٢- **وتەی بیژەیی و دەربڕین (لفظي)**: ئەمە پێكهـاتووە لـە پیـت و دەنـگ، و ڕایـان وایە ئەم جۆرەی دووەم پەیـدابووە و بـە زاتـی خـواوە ڕانەوەسـتاون و وابەسـتەی نـین،

(١) المواقف و شرحه ٤٩٦ و المسامرة ٧٧.

(٢) لە: تعليقات محمد رشيد رضا على رسالة التوحيد - محمد عبده ٤٥.

(٣) شرح المقاصد ١٠٢/٢. و الباجوري على الجوهرة ٦٥/١.

کە بریتین لە قورئانی پیرۆزو گشت کتێبە دابەزێنراوەکانی تر[١].

جا قورئانی پیرۆز بە واتای وتەی نەفسی پەدابوو و بەدیهێنراو نییە، بەڵام قورئان بە واتای وتەی بێژەیی و دەربڕین (لفظي) کە ئێمە دەیخوێنینەوە ئەوا بەدیهێنراوە. بەڵام ناکرێت و نابێت بوترێت: قورئان بەدیهێنراوە. مەبەست لێی ئەو بێژەو دەربڕینەیە کە دەیخوێنینەوە، تەنها لەوکاتە دروستە کە بۆ فێربوون بێت، چونکە لەوانەیە وا خەیاڵ بکرێت کە قورئان بەو واتایەی کە فەرمایشتی خوا بەدیهێنراوە، و بۆیە تاقیکردنەوەکەی (ابن حنبل) و (شعبی) و (بخاری) و (عیسا)ی کوڕی (دنیار) ڕوویدا.....[٢].

## ٢- موعتەزیلە و شیعەی ئیمامی:

وتە و قسەی خوای گەورە پێکهاتووە لە پیت و دەنگ، و وابەستە و ڕاوەستاوە نییە بە زاتی خوا، بەڵام خوای گەورە بەدیدەهێنێت لە غەیری خۆیدا وەك تۆماری پارێزراو (اللوح المحفوظ) یان لە فریشتە جوبرەئیل یاخود لە پێغەمبەردا، کەواتە وتەی پەروەردگار پەیدابوو و بەدیهێنراوە[٣].

جا موعتەزیلە بۆچوونیان وایە کە وتە پەیدابوو و بەدیهێنراوە، چونکە گومانیان وایە کە لە پێداویستیەکانی وتە و دوان بریتیە لە پیت و دەنگ، و بوونی پیت و دەنگ بۆ خوای گەورە شتێکی نەبوو و مەحاڵە، جا لەلای موعتەزیلەکان فەرمایشتی خوای گەورە بەدیهێنراوە، چونکە خوای گەورە لە هەندێ تەن (أجرام)دا بەدیدەهێنێت[٤].

---

(١) المواقف و شرحه ٤٦٩.

(٢) الباجوري على الجوهرة ٨٤/١.

(٣) المواقف و ابن قطلوبغا و المسامرة، سەرچاوەکانی پێشوو، و بڕوانە: الشيعة بين الأشاعرة و المعتزلة: هاشم الحسني چ ١ ساڵی ١٩٦٤، ١٨٩ بە وەرگرتن لە کتێبی: کشف الحق للعلامة الحلّي ١٨ و١٩ و توحيد الصدوق ٢٨٨ و أوائل المقالات: الشيخ المفيد ١٩.

(٤) الباجوري على الجوهرة ٨٤/١.

ئەشعەرییەكان بەرپەرچیان داوەتەوە:

بـەوەی ئـەو قسـە و بۆچـوونە بـە ناپەسـەند نـازانین، بـەڵكو ئێمـەش وا دەڵـێین هەمان ڕای ئێوەمان هەیە بەڵام ناوی دەنێین وتـەی بێـژەیی (لفظي)، بـەڵام ئێمـە لـە پشتی ئەم وتە و دوانەی ناوبراو وتە و دوانـی نەفسی دەچەسپێنین، كـە بـە بێـژەكان (ألفاظ) دەری دەبڕین[1].

بەڵام موعتەزیلەكان وتیان: ئـەوەی كـە ئێـوە نـاوی ئـەنێن (وتـە و دوانـی نەفسـی) دەگەڕێتەوە بۆ سیفەتی زانست ئەگـەر واتاكـەی هـەواڵ بێـت، و ئەگـەر فـەرمان (أمـر) یان ڕێگری (نهی) بوو ئەوا دەگەڕێتەوە بۆ سیفەتی ویست[2].

كـاتێ موعتەزیلـە ئـەو ڕاو بۆچـوونانەیان پەسـەند كـرد، وتیـان: قورئـانی پـیرۆز فەرمایشت و وتەی بەدیهێنراوی خوایە.

موعتەزیلـە تێڕوانینیـان وابـوو بـۆ بۆچـوونی ئـەهلی سـوننە، كـە پێـی وابـوو قورئان فەرمایشت و وتـەی خوایـە و بەدینـەهێنراوە، كە لەوانەیـە نەصـڕانیەكان بـە بەڵگـەی بێننـەوە یـان وەك هۆكارێـك بـەكاری بێـنن بـۆ بڵـاو كردنـەوەی گومـان، تـا موسـڵمانان ناچـار بكـەن بـۆ بـاوەڕ هێنـان بـەوەی: مەسـیح خوایـە یـاخود مەسـیح لەمێژینە و هەربووە.

گێردراوەتەوە لە (یوحنـا)ی (دمشـقی) كـە هەنـدێ لـە مەسـیحیەكانی فێردەكـرد، بـۆ ئـەوەی مشـتومڕو دەمەتـەقێ بكـەن لەگـەڵ موسـڵماناندا، جـا دەیـوت: (ئەگـەر موسـڵمانێك پێـی وتـی: چـی دەڵێـی سـەبارەت بـە مەسـیح؟ تـۆش بڵـێ: فـەرمانی خـوا (كلمة الله)یـە. دواتـر بـا نەصـڕانیەكە لـە موسڵمانەكە بپرسێت: ئایا مەسـیح بەچـی ناونراوە لە قورئاندا؟ لەو كاتـەدا نەصـڕانیەكە بـا هـەموو وتـەكانی موسڵمانەكە ڕەت بكاتەوە تا موسڵمانەكە وەڵامی دەداتەوە، لەو كاتەشدا ناچار دەبێت كـە بڵێـت: ﴿إِنَّمَا

---

(١) المواقف و شرحه ٤٩٦ و المسامرة ٧٧ و ابن قطلوبغا ٧٩.

(٢) كبرى اليقينيات ١٣١.

ٱلۡمَسِيحُ عِيسَى ٱبۡنُ مَرۡيَمَ رَسُولُ ٱللَّهِ وَكَلِمَتُهُۥٓ أَلۡقَىٰهَآ إِلَىٰ مَرۡيَمَ وَرُوحٞ مِّنۡهُ ﴾ النســــاء: ١٧١. واته: (بەڕاستی مەسیح، عیسای كوڕی مەریەم جگە لەوەی كە فرستادەی خوایە "شتێكی تر نەبووە"، لە دایك بوونەكەی بە فەرمانی خوا بووە كە لە مەریەمدا "بەرجەستە بوو"، عیسا ڕۆح و گیانێكی "تایبەتە" لەلایەن خواوە بەخشراوە). ئەو كاتە با نەصرانیەكە بپرسێت لە بارەی ئەوەی كە: فەرمانی خوایە تایبەت لەلایەن ئەو بەخشراوە (كلمة الله و روحه)، كە ئایا بەدیهێنراوە یان بەدیهێنەرە؟ ئەگەر وتی بەدیهێنراوە، ئەوا با بەرپەرچی بداتەوە بەوەی: كە خوای گەورە هەر هەبووە و هیچ فەرمان (كلمة) و بەخششی تایبەت (ڕوح) نەبوون. ئەگەر ئەمەت وت ئەوا موسڵمانەكە دەبەزێت، چونكە بە تێڕوانینی موسڵمانان كەسێك كە بۆچوونی وابێت شتێكی تر لە مێژینە و بێ سەرەتایە وەك خوای گەورە ئەوا بە بێ دین ئەژمار دەكرێت)[1].

كاتێ موعتەزیلە بۆچوونیان وابوو كە قورئان بەدیهێنراوە، ئەوا لە ڕاستیدا بۆ بەرپەرچ دانەوەی نەصرانیەكان نەبوو، بەڵكو ئەم بۆچوونەی موعتەزیلەكان سەرچاوەی گرت لە بابەتێكی فەلسەفی كە ڕوون دەبێتەوە لەوەی پێشتر خستمانەڕوو لەبارەی بۆچوونی ئەوان لەمەڕ سیفەتی دوان (كلام). بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا موعتەزیلەكان وای بۆچوون: وتنی ئەوەی كە قورئان بەدیهێنراو نییە لەوانەیە سەر بكێشێت بۆ هەمان بۆچون كە نەصرانیەكان سەبارەت بە مەسیح هەیانە، بۆ باوەڕ بوون بە هەبوونی چەند شتێكی لە مێژینە و بێ سەرەتا (تعدد القدماء)، هەروەك ئەمە زانراوە لە بۆچوونی موعتەزیلەكان لەمەڕ نەفی كردنی سیفەتەكان هەروەك پێشتر خرایە ڕوو.

بەڵام سەبارەت بە ئایەتی:﴿ إِنَّمَا ٱلۡمَسِيحُ عِيسَى ٱبۡنُ مَرۡيَمَ رَسُولُ ٱللَّهِ وَكَلِمَتُهُۥٓ أَلۡقَىٰهَآ إِلَىٰ مَرۡيَمَ وَرُوحٞ مِّنۡهُ ﴾ النساء: ١٧١. واتە: (بەڕاستی مەسیح، عیسای كوڕی

---

(١) المذاهب الاسلامية - أبو زهرة ٢٦٠ و ئەم دەقەی وەرگرتووە لە كتێبی (تراث الاسلام).

مەریەم جگە لەوەی کە فرستادەی خوایە "شتێکی تر نەبووە"، لە دایك بوونەکەی بە فەرمانی خوا بووە کە لە مەریەمدا "بەرجەستە بوو"، عیسا ڕۆح و گیانێکی "تایبەتە" لەلایەن خواوە بەخشراوە). ئینجا مەبەست لە دەستەواژەی (كَلِمَتُهُ) لە ئایەتەكە بریتیە لەوەی: كە عیسا هاتۆتە بوون بە وشەی (ببە: كن) بەبێ ئەو مادە كە عادەت وایە مرۆڤ لێی بەدیبێت، بە بەڵگەی ئەم فەرمایشتەی خوای گەورە: ﴿ إِنَّمَآ أَمۡرُهُۥٓ إِذَآ أَرَادَ شَيۡـًٔا أَن يَقُولَ لَهُۥ كُن فَيَكُونُ ﴿٨٢﴾ ﴾ یس: ٨٢. واتە: (بێگومان هەر كاتێك فەرمانی خوا دەرچوو، ویستی شتێك جێبەجێ بكات و بێنێتەدی، پێی دەڵێت ببە، ئەویش دەستبەجێ و بێ دواكەوتن پێش دێت و ئەنجام دەدرێت و دروست دەبێت).

ئەم فەرمایشتەی پەروەردگار: ﴿ إِنَّ مَثَلَ عِيسَىٰ عِندَ ٱللَّهِ كَمَثَلِ ءَادَمَۖ خَلَقَهُۥ مِن تُرَابٖ ثُمَّ قَالَ لَهُۥ كُن فَيَكُونُ ﴿٥٩﴾ ﴾ آل عمران ٥٩. واتە: (بەڕاستی نمونەی دروستبوونی عیسا لەلایەن خواوە؛ وەك نمونەی ئادەم وایە كە لە خاك دروستی كرد و لەوەو دوا فەرمانی دا و پێی وت: ببە - بە ئینسان - ئەویش بوو).

ئیمامی غەزالی وتویەتی: هەموو لە دایك بوویێك هۆكارێكی نزیك و دووری هەیە، جا هۆكاری یەكەم كە هۆكاری نزیكە: بریتیە لە نۆواو (منی)، دووەم: ووتنی وشەی (ببە: كن)ە. كاتێ بەڵگە ئاماژەی دا بۆ ئەوەی كە هۆكاری نزیك نەبووە سەبارەت بە عیسا (سەلامی لێ بێت)، ئەوا پەیدابوونی عیسای داوەتە پاڵ هۆكاری دوور، كە بریتیە لە فەرمانی (ببە: كن)، ئەمەش وەك ئاماژەیەكە بۆ ئەوەی كە هۆكاری نزیك لە پەیدابوونی عیسادا بوونی نەبووە. خوای پاك و بەرز بەم فەرمایشتە ڕوونی كردۆتەوە: ﴿ أَلۡقَىٰهَآ إِلَىٰ مَرۡيَمَ ﴾ النساء: ١٧١. واتە: لە مەریەمدا بەرجەستەی كردووە پێ گەیاندی وەك ئەو تۆواوەی فڕێدەدرێتە ناو ڕەحمەوە[١].

(١) روح المعاني ٢٤/٢ و بڕوانە: ١٦٠/٣.

## بنچینەی ڕاجیایی لە نێوان موعتەزیلە و ئەهلی سوننە لەسەر بابــەتی دوان ( كلام ):

تفتـازانی لـە (شـرح المقاصـد)داله كـاتی ڕوون كردنــەوەی بنچـینەی ڕاجیـایی لـە نێوان موعتەزیلە و ئەهلی سـوننەدا وتویـەتی: (لـە كاتی لێكۆڵینـەوە لـەم ڕاجیاییـەدا بەدەردەكـەوێت كـە دەگەڕێتــەوە بـۆ چەسـپاندن یـان نەچەسـپاندنی وتــەو قسـەی نەفسی، ئایا قورئان فەرمایشتی نەفسییە یان ئەوەیـە كـە پێكهاتووە لـەو پیتانـەی كـە بریتین لە وتەی بەرهەست، ئەگەرنا هـیچ ڕاجیاییـەكیان نییـە لـە بـارەی پەیـدابوونی وتــەی بەرهەســت و لەمێژینــەیی وتــەی نەفســی بــەو مەرجــەی وتــەی نەفســی بچەسپێت)[1].

كەواتـە ئـەو ڕاجیایـەی كـە هەیـە لـە نێـوان ئـەهلی سـوننە و موعتەزیلـە كـورت هەڵدێت لە ناونانی وتەو فەرمایشت بە نەفسی.

جا موعتەزیلە دەڵێن وتەو قسەی نەفسی پێـی ناوترێـت وتـەو فەرمایشـت، بـەڵكو ئەگـەر واتاكـەی فـەرمان (أمـر) یـان ڕێگـری كـردن (نهـی) بـوو ئـەوا دەگەڕێتـەوە بـۆ سیفەتی ویست، ئەگەر هەواڵ بێت ئەوا دەگەڕێتەوە بۆ سیفەتی زانست.

بـەڵام ئـەهلی سـوننە دەڵێـت: ئێمـە نـاوی دەنـێین: وتـەو فەرمایشـتی نەفسـی، سیفەتێكی سەربەخۆیەو ڕاوەستاوەو وابەسـتەیە بـە زاتـی خـواوە و پاشـكۆی سـیفەتی ویست و زانست نییە.

### ٣- حەنبەلیە بیدعەچییەكان:

وتویانە كە فەرمایشتی خوای گەورە پێكهـاتووە لـە پیـت و دەنـگ، ڕاوەسـتاون بـەهۆی زاتی پاكی بەرزی خواوە، فەرمایشـەكەی بـەو وەسـفەی لەمێژینـە و بـێ سـەرەتایە، تـا

(١) شرح المقاصد ٢/١٠٠. و بڕوانە:
المواقف و شرحه ٤٩٦ و المعتقد الایماني شرح منظومة الشیباني ١٥-١٦.

هەندێکیان بە نەزانی زۆر زیادەڕەوی زیاتریان کرد، بەوەی وتیان ڕووپۆش و بەرگی قورئانیش لەمێژینە و بێ سەرەتایە چ جای خودی قورئان[1].

ئەم بۆچوون و قسەیە پوچەڵە لەبەر ئەوەی:

دروست بوون و هاتنە کایەی هەر پیتێك نایەتەجێ تەنها لەدوای کۆتایی هاتنی پیتی پێش خۆیدا نەبێت، بەم جۆرەش پیتی یەکەم لە ناوچوو دەبێت و ئەوەی کە لەدوای ئەویشدا هاتووە یەکەمە. زانیمان ئەو شتەی کە لە ناودەچێت و کۆتایی دێت یان سەرەتای هەبێت، ئەوا هەرگیز نابێت کە لەمێژینەو بێ سەرەتا و کۆن بێت، بەڵکو دەچێتە ڕیزی پەیدابوو و بەدیهێنراوانەوە[2]، ئەو شتەی بەدەر نەبێت لە پەیدابووەکان ئەوا خۆیشی پەیدابووە.

### ٤- کەڕامیەکان:

ئەم تاقمەش کۆك و هاوڕابوون لەگەڵ حەنبەلیەکان لەوەی فەرمایشت و وتەی خوای پاك و بەرز پێکهاتووە لە پیت و دەنگ، بەڵام ناویان نا فەرمایشتی خوا، و دانیان نا بەوەی کە پەیدابووە، وتیان: ڕاوەستاوەو وابەستەیە بە زاتی خوای گەورە چونکە پێیان دروست بوو کە شتی پەیدابوو وابەستەی زاتی خوا بێت، بێگومان بۆچوونێکی پوچەڵە[3]، چونکە ئەو شتەی کە پەیدابوو وابەستەیەتی ئەویش پەیدابووە، و پێشتر خستمانەڕوو کە چەسپێنراوە خوای گەورە لەمێژینە و بێ سەرەتایە.

## پەیوەست بوونی سیفەتی دوان (کلام):

سیفەتی دوان (کلام) پەیوەستە بە شتی پێویست (واجب) و شیاو (ممکن) و ئەستەم (مستحیل)، چونکە پەیوەست بوونی ئەم سیفەتە بریتیە لە پەیوەست بوون لە

---

(١) المواقف و شرحه ٤٩٥ و المسايرة ٧٧ و ابن قطلوبغا على المسايرة ٧٩.

(٢) المواقف و شرحه ٤٩٦ و ابن قطلوبغا سەرچاوەی پێشوو.

(٣) المواقف سەرچاوەی پێشوو. و المسامرة ٧٧ و ابن قطلوبغا على المسايرة ٧٩.

ڕووی واتــا و ڕوونكردنــەوە یــان فــەرمان و (أمــر) و ڕێگــری كــردن (نهــی)، و ڕوونكردنـەوەو فـەرمان و ڕێگـری (نهی)یەكـەی خـوای گـەورە بەتـەواوی باسـی شـتی پێویسـت (واجـب) و شـیاو (ممكـن) و ئەسـتەم (مسـتحیل) لـەخۆ گرتـووە، هـەروەك ئایەتەكانی قورئانی پیرۆز گەواهی لەسەر ئەمە دەدەن[١].

## ٧- ژیان (الحياة)

سـیفەتێكی هـەربوو و ئەزەلییـە، دروسـتی سـیفەتی زانسـت و ویسـت و سـەرجەم سـیفاتە واتـایی (معـانی) و (معنوی)ەكـانی تـر پێویسـت دەكـات[٢]. و كـە ژیـان پـاڵ دەدەینـە لای پـەروەردگار مانـای بـەو شـێوەیە نییـە وەك كەسـێكی سروشـتگەڕا بـۆی دەچێت چونكە سیفەتی ژیـانی خـوا بـریتی نیـە لـە هێـزی هەسـت و هـەرس كـردن و ئەو هێزەی پاشكۆی هاوسـەنگی جۆریـە[٣]، هـەروەك خـوای گـەورە بـەبێ گیـان و ڕۆح دەژیەت بەپێچەوانەی پەیدابووانەوە كە ژیانیان وابەستەیە بە ڕۆحەوە[٤].

دژەكەی ئەم سیفەتەش، بریتیە لە: مردن.

## بەڵگەی عەقڵی لەسەر ئەمە:

أ- ئەگەر خوای گـەورە وەسـف نەكرابوایـە بـە سـیفەتی ژیـان و خـاوەن ژیـان نەبوایـە، ئـەوا نەدەبوایـە وەسـفی بكرێـت بـەوەی خـاوەنی توانـا و ویسـت و زانسـتە، چـونكە ناچێتە عەقڵەوەو ئەندێشە ناكرێـت كـە ئـەو سـیفەتانە هـەبن بـەبێ بـوونی سـیفەتی ژیان، بێگومان بوونی ئەم سیفەتانە بەبێ ژیان شتێكی نەبوو مەحاڵە[٥].

---

(١) كبرى اليقينيات الكونية ١٣٦-١٣٧.

(٢) الدردير على الخريدة ٧٨ و صاوي عليه.

(٣) المسامرة ٦٢.

(٤) الصاوي على الدردير ٧٨.

(٥) المواقف ٤٩٢ و المقاصد و شرحه ٩٧/٢ و الباجوري على الجوهرة ٦٤/١.

ب- ژیان سیفەتی كاملّیە، پێچەوانەی ئەو سیفەتە كەموكورتییە، خوای گەورەش پاك و دوورە لە كەموكورتی[1].

پ- ئەگەر خوای گەورە وەسف بكرێت بە سیفەتێك بە پێچەوانەی سیفەتی ژیان، ئەوا دەبێتە هۆی ئەوەی كە خوای گەورە بەخشەری ژیان نەبێت، چونكە كەسێك خۆی شتێكی نەبێت چۆن دەتوانێت ببەخشێت[2].

## بەلّگەی نەقلّ:

ئەم فەرمایشتەی خوای گەورە:﴿ ٱللَّهُ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ ٱلۡحَيُّ ٱلۡقَيُّومُ ﴾ البقرة: ٢٥٥. واتە: (خوا زاتێكە جگە لەو هیچ خوایەكی تر نییە كە شایەنی پەرستن بێت و هەمیشە زیندووە و ڕاگرو سەرپەرشتیاری هەموو دروست كراوەكانیەتی").

ئەم فەرمایشتە:﴿ هُوَ ٱلۡحَيُّ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ فَٱدۡعُوهُ مُخۡلِصِينَ لَهُ ٱلدِّينَۗ ٱلۡحَمۡدُ لِلَّهِ رَبِّ ٱلۡعَٰلَمِينَ ٦٥ ﴾ غافر: ٦٥. واتە: (ئەو زاتە هەمیشە و بەردەوام زیندووە، جگەلەو خوایەكی تر نییە، كەوابوو هاناو هاوارو نزاتان ڕوو لەو بێت، ملكەچ و فەرمانبەرداری بەرنامە و ئاینەكەی ئەو بن).

## پەیوەست بوونی سیفەتی ژیان (الحیاة):

سیفەتی ژیان پەیوەست نیە چ بەو شتانەی كە هەن (موجود)ن چ ئەوانەی نەبوو (معدوم)ن، جا پێویستی بەشتێكی زیاد نیە تا یارمەتی بدات بەلّكو ئەم سیفەتە بەخۆی بێ نیازە، هەروەك پێشتر لە باسی پەیوەست بوونی ئەم سیفەتەدا خستمانەڕوو.

***

(١) ابن قطلوبغا على المسايرة ٦٢.

(٢) رسالة في التوحيج: الطائي ٤٩.

# دەروازەی دووەم
# دەرەنجام و بەرهەمی باوەڕ بوون بە سیفاتەكانی خوا

## باسی یەكەم
## ئەو شتانەی بۆ خوای گەورە نەبوو و ئەستەمن

دژەكانی سیفەتە پێویست (واجب)ەكان كە پێشتر خستمانەڕوو و چەسپاندمان ئەستەمن بۆ خوای گەورە، كە بریتین لە:

نەبوون دژی سفەتی بوون و هەبوونە، پەیدابوون دژی لەمێژینەیی و بێ سەرتا بوونە، لە ناوچوون و فەوتان دژی هەرمانە، هاوشێوەبوون وێكچوون بە بەدیهێنراوان دژی سیفەتی پێچەوانە بوونە لەگەڵ بەدیهێنراوان، پێویست بوون بە شوێن دژی سیفەتی بەخۆوە ڕاوەستان و بێ نیازییە، فرەیی دژی یەكتاییە، دەستەوەسانی دژی توانایە، ناچاریی دژی سیفەتی ویستە، نەزانین دژی زانین و زانستە، مردن دژی سیفەتی ژیانە، نەبیستن دژی بیستنە، كوێری دژی بینینە، لاڵی دژی دوانە[1].

### بەڵگە لەسەر ئەمە:

هەموو شتێك یان بەشێكن لێی یان دژ و پێچەوانەیتی:

خوای گەورە قابیلی ئەم سیفەتە پێویستانەیە، ئەگەر وەسف نەكرێت بەم سیفەتانە ئەوا پێویستە كە بە سیفەتە دژ و پێچەوانەكان وەسف بكرێت، و ئەم سیفەتە دژانەش كەموكورتین، بوونی كەموكورتی لەخوای گەورەدا شتێكی

---

(١) الدردير شرح الخريدة ٩٢-٩٣ و الباجوري شرح الجوهرة ٨٦ بە شوێنكەوتنی سنوسی، و رسالة في التوحيد - الطائي ٢٧.

ئەستەمە.

کەواتە بوونی ئەو سیفەتە دژو پێچەوانانە ئەستەمن بۆ خوای مەزن[١].

## باسی دووەم
## ئەو شتانەی بۆ خوای گەورەدروستن

دروستە بۆ خوای گەورە کە هەر کارێك شیاوی بوون (ممکن) بێت بیکات یان نەیکات، وەك بەدیهێنان و ڕەحمەت و سزا و مراندن و زیندوو کردنەوە....

هیچ شتێك لەسەر خوای گەورە پێویست نابێت، بەڵکو خوای گەورە کاراو ئەنجامدەری سەرپشکە بە ویستی خۆی چۆن دەیەوێت ئاوا هەڵسوکەوت لە موڵك و بەدیهێنراوانی خۆیدا دەکات، هیچ کەسێك بەژدار نییە لەگەڵیدا لە بەڕەیوەبردندا، و هیچ کەسێك لە ژێر سەرپەرشتی و دەسەڵاتی ئەو دەرناچێت و بەدەر نییە.

کردەوەکانی خوای گەورە هەموویان سەرتاپایان دانایی و حیکمەت و دادگەری و ڕاستپێکانن، جا تۆ ئەو دانایی و حیکمەتە بزانیت یان نەزانیت[٢].

### بەڵگەی عەقڵی لەسەر ئەمە:

ئەگەر ئەنجامدانی هەر شتێکی شیاوی بوون (ممکن) لەسەر خوای گەورە پێویست بوو یان مەحاڵ بوو بۆی، ئەوا ئەو کاتە شیرازەی حوکمە عەقڵیەکان تێکدەچوون و شیاوی بوون (ممکن) دەبووە پێویست (واجب) یان دەبووە ئەستەم (مستحیل)، بێگومان ئەمەش پوچەڵە[٣].

### بەڵگەی نەقڵی:

ئەم فەرمایشتەی خوای پاك و بەرز: ﴿وَرَبُّكَ يَخْلُقُ مَا يَشَآءُ وَيَخْتَارُ﴾ القصص:

---

(١) الباجوري على السنوسية ٣٨.

(٢) رسالة التوحيد - الطائي ٢٧ و غاية المرام في عقائد أهل الاسلام - الحاج حمدي الأعظمي ج ٢، ٣٠.

(٣) الباجوري على السنوسية ٣٨.

٦٨. واتە: (پەروەردگاری تۆیە هەر چیەكی بوێت دروستی دەكات و هەڵی دەبژێرێت).

ئـەم فەرمایشتـە: ﴿ رَّبُّكُمْ أَعْلَمُ بِكُمْ إِن يَشَأْ يَرْحَمْكُمْ أَوْ إِن يَشَأْ يُعَذِّبْكُمْ ﴾ الإسـراء: ٥٤.
واتە: (ئەگەر بیەوێت ڕەحمتان پێ دەكات یان ئەگەر بیەوێت سزاتان دەدات).

ئـــەم فەرمایشـــتە: ﴿ وَإِن يَمْسَسْكَ ٱللَّهُ بِضُرٍّ فَلَا كَاشِفَ لَهُۥٓ إِلَّا هُوَ وَإِن يُرِدْكَ بِخَيْرٍ فَلَا رَآدَّ لِفَضْلِهِۦ يُصِيبُ بِهِۦ مَن يَشَآءُ مِنْ عِبَادِهِۦ وَهُوَ ٱلْغَفُورُ ٱلرَّحِيمُ ﴿١٠٧﴾ ﴾ یـونس: ١٠٧.
واتە: ("ئەی ئینسان" ئەگەر خوا تووشی ناخۆشی و زیانێكت بكات، ئـەوە هـیچ كـەس ناتوانێت فریات بكەوێت و لەسەرتی لابـەرێت جگـە لـەو زاتـە یـاخود ئەگـەر بیـەوێت تووشی خێرو خۆشیەكت بكات، ئـەوە هـیچ كـەس ناتوانێـت بـەری فـەزڵ و بەخششی خوا بگرێت، هەر كام كە بیەوێت لە بەندەكانی بـەهرەوەر دەكـات - لـە نـازو نیعمـەتی بێ شومار - ئەو زاتە هەمیشە لێ خۆشبوو و میهرەبانە).

***

## بینینی خوای پاك و بەرز

تاقم و پێڕەكانی موسڵمانانان ڕایـان جیـاواز بـووە لـەبارەی بینینـی خـوای پـاك و بەرز لە ڕۆژی دواییدا، و لەم بارەوە بۆ دوو بۆچوون دابەش بوون:

**بۆچوونی یەكەم:**

ڕای زۆربەی موسڵمانانە، پێی وایە كە بینینی خـوای گـەورە شـتێكی دروسـتە، بـە بەڵگەی عەقڵی و نەقڵی.

وتیان: خوای گەورە دەبینـرێت بەبێ هیچ چۆنیەتیەك لـەو چـۆنیەتیانەی كـە لـە بینینـی جەسـتەكاندا پێویسـتە و بـەبێ ئـەوەی بـەو بینینـەی دەوری بـدات، بـەڵكو بەندە سەرسام دەبێت لەبەر گەورەیی و شكۆداریەكەی، تەنانـەت وای لێـدێت ناویشی نازانێـت، و هەسـت بـە بوونـەوەری دەوروبـەری ناكـات، چـونكە عـەقڵ لـەو حاڵەتـەدا دەستەوەسان و بێ توانـا دەبێـت لـە تێگەیشـتن، هـەموو شـتێك دەپوكێتـەوە لـە ئاسـت

گەورەیی خوای پاك و بەرز[1].

## بەڵگەی نەقڵی هەڵگرانی ئەم بۆچوونە:

١- ئەم فەرمایشتەی خوای گەورە: ﴿ وُجُوهٌ يَوْمَئِذٍ نَّاضِرَةٌ (٢٢) إِلَىٰ رَبِّهَا نَاظِرَةٌ (٢٣) ﴾ القيامة ٢٢ - ٢٣.

(نَاضِرَةٌ): واتە جوان و قەشەنگە، و (نَاظِرَةٌ): لە تەماشاكردنەوە هاتووە واتە بینین.

چونكە ئەگەر (النظر):

سنووری بەزاند (تعدى) كرد بە (الى) ئەوا بەواتای بینین دێت، هەروەك لەم ئایەتەدا هاتووە.

ئەگەر (النظر):

بەخودی خۆی سنوور بەزێنی (تعدى) بكات، ئەوا بەمانای چاوەڕوانی دێت، هەروەك لەم فەرمایشتەی خوای پایەبەرزدا هاتووە: ﴿ ٱنظُرُونَا نَقۡتَبِسۡ مِن نُّورِكُمۡ ﴾ الحديد: ١٣.واتە: (چاوەڕێیەكمان بكەن تا لە نووری ڕوخسارتان بەهرەوەر ببین).

ئەگەر (النظر):

بە (في) سنوور بەزێنی (تعدى) بكات، ئەوا بەمانای زۆر بیركردنەوەو بایەخدان دێت، بۆنمونە، دەڵێیت: تەماشای پەرتوك و كارەكەم كرد.

بەمانای میهرەبانیش دێت ئەگەر سنوور بەزێنی (تعدى) كرد بە (لام)، بۆ نمونە: حوكمڕان بە چاوی میهرەبانیەوە ڕوانیە فڵانە كەسە[2].

---

(١) الباجوري على الجوهرة ١٩/٢. بڕوانە: الدردير شرح الخريدة و الصاوي عليه ١٠٠ و لە: المسايرة على المسامرة ٤٣: هاتووە: (بینین جۆرێكە لە زانستی تایبەت كە خوای گەورە لە تاكی زیندوودا بەدی دەهێنێت، مەرجدار نییە بە بەرامبەر بوون و هەر مەرجێكی تر).

(٢) الدَّواني على العقائد العضدية ١٧٦/٢ و شرح العقيدة الطحاوية ١٤٣ و حادي الأرواح لابن القيم چ ٤ ساڵی ١٩٦٢، ٢٣٠ و بڕوانە: أصول الدين - بغدادي ١٠٠.

٢- ئەم فەرمایشتەی خوای پاك و بەرز:﴿ لِّلَّذِينَ أَحۡسَنُواْ ٱلۡحُسۡنَىٰ وَزِيَادَةٌ ﴾ يونس: ٢٦.
(الْحُسْنَى): بەهەشتە، و (وَزِيَادَةٌ): بریتیە لە بینینی خوای پاك و بەرز، هەروەك ئەمە چەسپاوە بە فەرموودەی ڕاست (صحیح) کە موسلیم گێڕاویەتیەوە[(١)].

٣- ئەم فەرمایشتەی خوای پاك و بەرز: ﴿ لَن تَرَىٰنِي ﴾ الأعراف: ١٤٣.بەڵگە هێنانەوە لەسەر بینینی خودا بەم ئایەتە لە چەند ڕوێکەوەیە دەبێت:

أ- گومان نابرێت بە موسا کە لەگەڵ خوای گەورە دواوە (كليم الله)یە و نێردراو و پێغەمبەریەتی، و شارەزاترین کەسی سەردەمی خۆی بووە سەبارەت بە پەروەردگاری، پرسیار بکات و داوای شتێك بکات لە خوای گەورە کە شیاو و دروست نەبێت بۆی، تەنانەت ئەمە هەر زۆر نەبوو و ئەستەمە[(٢)]چونکە ناکرێت کە هیچ یەکێك لە پێغەمبەران شارەزایی نەبێت بە ئەحکامەکانی ناسینی خوایەتی و بیروباوەڕ[(٣)]. جا چۆن دەکرێت کەسی موعتەزیلی - کە نکۆڵی دەکات لە بینینی خوا هەروەك دەخرێتەڕوو - لە موسا زیرەکترو شارەزاتر بێت، لەبارەی ئەوەی کە چ شتێك پێویستە و چ شتێکیش ناشیاو مەحاڵە بەنیسبەت خوای گەورە، لەگەڵ ئەوەی ئامانج و مەبەست لە ڕەوانەکردنی پێغەمبەران (عليهم السلام) بانگەوازی کردنە بوو بۆ عەقیدەو بیروباوەڕی ڕاست و ڕەوان و کارو کردەوەی چاك[(٤)].

ب- خوای پاك و بەرز فەرموویەتی:﴿ لَن تَرَىٰنِي ﴾ نەیفەرمووە: من نابینرێم یان بینینی من دروست نییە یاخود من شتێکی بینراو نیم.

جیاوازی لە نێوان هەر دوو وەڵامەکە ڕوون و ئاشکرایە، ئایا نابینیت کە کەسێك

---

(١) شرح العقيدة الطحاوية ١٤٣-١٤٤ و لوامع الأنوار البهية - السَّفَّاريني ٢/٢٤٠ و لاپەڕەکانی دواتریش و الباجوري على الجوهرة ٢/١٧.

(٢) شرح العقيدة الطحاوية سەرچاوەی پێشوو، و حادي الأرواح ٢٢٣ و المسامرة على المسايرة ٤٠.

(٣) الباجوري على الجوهرة ٢/٢٠، و بڕوانە: المواقف ٥٠٤.

(٤) المسامرة لا ٤١، و الدَّوَّاني ٢/١٦٨.

بەردێكی لە دەمـدابوو و كەسـێكی تـر واگومـانی بـرد خواردەمەنیـە، جا وتـی: بـدەرە منـیش، جا وەڵـامی ڕاسـت ئەوەیـە: كـە ناخورێـت. بـەڵام ئەگـەر خواردەمـەنی بـوو، دروسـتە بووترێـت: تـۆ نایخۆیـت. ئەمـەش بەڵگەیـە لەسـەر ئـەوەی كـە خـوای گـەورە بینـراوە (مرئی)ە بەڵام تواناو هێزی موسا -لەم دونیایەدا- بەرگری ئـەو بینینـە ناكات بەهۆی لاوازی توانای مرۆڤ لەم دونیایەدا لە بەرامبەر بینینی خوای پاك و بـەرز. جا ئـەم فەرمایشـتەی خـوای گـەورە ئەمـە ڕوون دەكاتـەوە:﴿ وَلَٰكِنِ ٱنظُرۡ إِلَى ٱلۡجَبَلِ فَإِنِ ٱسۡتَقَرَّ مَكَانَهُۥ فَسَوۡفَ تَرَىٰنِي ﴾ الأعراف: ١٤٣. واتە: (بەڵام سەیری ئەم چیایە بكـە، جا ئەگـەر مایـەوە لـە جێگـەی خۆیـدا ئـەوا لـەوەو دوا تـۆش مـن دەبینیـت). بـە موسـای ڕاگەیاند كە چیاكە لەگـەڵ ئـەو هێـزو توونـدو تۆكمەییـەی كـە هەیـەتی ئـەوا بەرگـە ناگرێت لە بەرامبەر درەوشانەوە (تجلی)یەكە لەم دونیایـەدا، جا چـی ئـەڵێی بـۆ ئـەو مـرۆڤەی كە بەلاوازی دروست كراوە[1].

٤- ئــەم فەرمایشــتەی خــوای پــاك و بــەرز:﴿ لَّا تُدۡرِكُهُ ٱلۡأَبۡصَٰرُ وَهُوَ يُدۡرِكُ ٱلۡأَبۡصَٰرَ ﴾ الأنعام: ١٠٣.

ڕووی بەڵگە هێنانەوە بەم ئایەتە: خوای گەورە ئەمـەی بـاس كـردووە لـە میانـەی مـەدح و سـتایش، زانـراویشـە مـەدح و سـتایش بـە سیفاتی نـەفی و چەسـپاویش بێـت، ئەگەر شتێكی بوون (وجود)ی بوو وەك: ڕەتكردنەوەی وەنەوزە و نوستن كـە ئەمـەش بەدەرخستنی تەواوی راگری و سەرپەرشتاریی (قیـومیـة)ە، ڕەتكردنـەوەی مردنـە كـە تەواو و كامڵی ژیان دەگەیەنێت....

جا ئایەتەكە ئاماژەو بەڵگەیە لەسەر تەواو و كامڵی گەورەیی خـوا، و ئاماژەیـە بـۆ ئەوەی كە گەورەترە لە هەموو شتێك، بەڵام لەبەر ئەوەی خوای گەورە سنوردار نییـە و بێ سنورو جێگەیە، ئەوا چاو ناتونێت پەیی پێ ببات و دەوری بـدات، خـوای گـەورە

(١) حادي الأرواح ٢٢٣ و شرح العقيدة الطحاوية ١٤٥ و سەیری چەند لایەنێكی تریش بكە جگەلەوەی من باسم كردن.

**فەرموویەتی: ﴿ وَلَا يُحِيطُونَ بِهِۦ عِلْمًا ﴾ طـه: ١١٠. واتـه: (هەرگیز نـاتوانن ئاگـاداری زانست و زانیاری بێ سنوری ئەو زاتە پەیی پێ ببەن).**

**٥- فـەرموودەی ڕاسـت (صـحیح)ی (أبـي هريـرة) - ڕەزای خـوای لێبێـت -: هەنـدێ لـه خـەڵكی بـه پێغەمبـەریان وت: ئایـا پـەروەردگارمان لـه دواڕۆژدا ئـەبینین؟ جـا پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموو: ((هل تضارون في القمر ليلـة البـدر؟)) واتـه: ئایا بـه بینینی مانگی چوارده لەشەودا سەغڵەتتان دەكات. وتیـان: نـا ئـەی پێغەمبـەری خـوا، جا فەرمووی:((فهل تضارون في الشمس لـيس دونهـا سـحاب؟)) واتـه: ئایا بـه بینینـی خۆر كه دەوری به هەور نـەگیرابێت سـەغڵەتتان دەكات. وتیـان: نـا ئـەی پێغەمبـەری خوا، فەرمووی: ((فانكم ترونه كذلك)) واتە: جا خـوای گـەورە بەڕۆشـنی و بـێ گومـان وەك وێنەی ئەمانە دەبینن.**

**٦- فــەرمودەی ڕاســت (صـحیح)ی (صـهیب): وتویـەتی پێغەمبــەر (ﷺ) ئـەم ئایەتـەی خوێنـدەوە: ﴿ لِّلَّذِينَ أَحْسَنُواْ ٱلْحُسْنَىٰ وَزِيَادَةٌ ﴾ یـونس: ٢٦. واتـه: (بـۆ ئەوانـەی چاكەیان كردووە، پاداشتی چاكترو بەهەشتی بەرین و زیـاتریش ئامادەیە بەچـەندەها قات). جا فەرمووی: ((اذا دخل أهل الجنةِ الجنة و أهلُ النارِ النار، نـادى منـادٍ: يـا أهـل الجنة ان لكم عند الله موعداً، يريد أن ينجزَكُموه، فيقولون: ومـاهو؟ ألمْ يُثقـل موازينَنـا، ويُبَيض وجوهنا، ويُدخلنا الجنة، و يُجرنا من النار؟ قـال فيكشـف لهـم الحجـاب، فينظـرون اليه، قال: فوالله ما أعطاهم شيأً أحب اليهم من النظر اليـه و لا أقـر بـأعينهم))[1] واتـه:**

---

**(١) شرح العقيدة الطحاوية: ١٤٣-١٤٨ و لوامع الأنوار البهية ٢٤٠/٢ و لاپەڕەكانی دواتریش، و الباجوري شرح الجوهرة ٢/ ١٧.**

**زانایان وتویانە: وێچواندنەكە بۆ بینینەكەیە كە بینەرە نەوەك بۆ بینراوەكە، واتاكەی بریتیە لەوەی: ئێوە پەروەردگارتان دەبینن بەشێوەیەك گومان ناهێڵێت و دوودڵی لەناودەبات، وەك چۆن مانگ دەبینن بەبێ گومان و دوودڵی./ لوامع الأنوار ٢٤٣/٢. و فەرموودەكەی صهیب لە: (مسند)ی (أحمد)دا هاتووە و بێژە (اللفظ)ەكەش هی ئەوە، صحيح مسلم له (كتاب الايمان - باب اثبات رؤية المؤمنين في الآخرة ربهم سبحانه ١٦٣/١ و سنن الترمذي -كتاب صفة أهل الجنة - باب ما**

دوای ئەوەی بەهەشتیەکان چوونە بەهەشت و نیشتەجێ بوون و خەڵکی دۆزەخیش چوونە دۆزەخەوە، ئەوا بانگدەرێك بانگدەکات: ئەی دانیشتووانی دۆزەخ خوای پایەبەرز پەیمانێکی بەئێوە دابوو دەیەوێت پاداشتتان بداتەوە بەم هۆیەوە، جا دانیشتووانی بەهەشت دەڵێن: دەبێت چی بێت؟! ئەدی کردەوە چاکەکانمانی گران نەکردووە و ڕوومانی گەش و جوان نەکردووە؟! ئەدی نەیخستووینەتە بەهەشتەوەو، و لەدۆزەخ ڕزگاری نەکردین، وتی: ئینجا پەردە لا دەچێت، تەماشای خوای گەورە دەکەن و دەیبینن، و وتی: سوێند بەخوا هیچ شتێکیان نەدراوەتێ و خۆشەویستر بێ لە تەماشا کردنی پەروەردگاریان، و چاویان بە هیچ شتێك ئۆقرە ناگرێت بە ئەندازەی ئەم تەماشا کردنە.

و ئیبن قیم لە کتێبی (حادي الأرواح) گێڕەڕەوە (رواة)ەکانی ئەم فەرموودەیەی ژماردووە کە گەلەك زۆرن[1] (نزیکەی سی هاوەڵ گێڕاویانەتەوە)[2].

## یەکدەنگی (الاجماع):

هاوەڵانی پێغەمبەر و شوێنکەوتووان یەکدەنگ و کۆك بوون لەسەر: ئەوەی خوای گەورە لە دوارۆژدا دەبینرێت، و ناوبراوان زۆر بەجۆش و خرۆش بوون و دەپاڕانەوەکە خوای گەورە خۆشی و چێژی بینیی خۆی بەوان ببەخشێت و باوەڕیان بەمە هەبوو، ئەمەش بەهۆی چەند ئاماژەیەك لە حاڵی پێغەمبەری خوا (ﷺ) و کۆمەڵێك لە دەربڕینە ڕاشکاوەکانی کە گەلەك زۆرن[3].

مالیك (ڕەزای خوای لەسەر بێت) وتویەتی: کە خوای گەورە دوژمنەکانی بێ بەش کردن لە بینینی خۆی ئەوا خۆشەویستەکانی شاد کرد بە بینینی خۆی، ئینجا

---

جاء في رؤية الرب تبارك و تعالى ب ٧ لا ٢٣٠ و سنن ابن ماجه - المقدمة - باب فيما أنكرت الجهمية ٦٧/١.

(١) حادي الأرواح ٢٣١ و لاپەڕەکانی دواتریش. و لوامع الأنوار البهية ٢٤٣/٢.

(٢) شرح العقيدة الطحاوية: سەرچاوەی پێشوو ١٤٨.

(٣) الاقتصاد في الاعتقاد ١١٢ و بڕوانە: (من ابتهل بالدعاء) له (حادي الأوراح).

ئەگەر باوەڕداران خوای گەورە نەبینن لە دواڕۆژدا ئەوا سەرزەنشتی بێ باوەڕان نەدەكرا بەوەی بێ بەش بوونە لە بینینی خوا، خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿ كَلَّآ إِنَّهُمْ عَن رَّبِّهِمْ يَوْمَئِذٍ لَّمَحْجُوبُونَ ﴿١٥﴾ ﴾[1] المطففين: ١٥. واتە: (نەخێر، ڕزگار بوونیان نییە، چونكە بەڕاستی ئەو ڕۆژە بەربەست هەیە لە نێوان تاوانباران و پەروەردگاریاندا و بێ بەش دەبن لە بینینی ئەو زاتە).

و شافیعی وتویەتی: (كاتێ تاوانباران بەهۆی تاوانەوە لە بینینی خوا بێ بەش بوون، ئەوا ئەمە بەڵگەیە كە خۆشەویست و وەلیەكانی خوا بە ڕەزامەندی پەروەردگار پەروەردگار دەبینن)[2].

## بەڵگەی عەقڵی:

أ- خوای گەورە هەبوو و هەیە (موجود)ە، هەر شتێكیش هەبێت دروستە ببینرێت، كەواتە دروستە خوای پاك و بەرز ببینرێت[3].

ب- چۆن دروستە خوای پاك و بەرز بەبێ چۆنیەتی و شێوازو وێنە بناسرێت، ئەوا بەهەمان شێوە دروستە بەبێ چۆنیەتی و شێوازو وێنە ببینرێت[4].

**بۆچوونی دووەم:**

ئەمە بۆچوونی (جهمیە) و (معتزلە) و (خوارج) و (امامیە) و (نجاریە) و (زیدی)یەكانە لە شیعەكان، كە پێیان وایە خوای گەورە نابینرێت و دروست نیە

---

(١) الباجوري شرح الجوهرة ٢/١٧-١٨.

(٢) شرح الطحاوية ١٤٤ و حادي الأرواح ٢٢٨ و سەیری وتەی ئیمامی شافیعی بكە لە كتێبەكەیدا (أحكام القرآن ٤٠).

(٣) الباجوري على الجوهرة: ١٧/٢.

(٤) المسامرة ٤٣.

بەپێی عەقڵ ببینرێت[1].

بەڵگەی نەقڵی و عەقڵیان هێناوەتەوە.

## بەڵگەی نەقڵی هەڵگرانی ئەم بۆچوونە:

ئەم فەرمایشتەی خوای گەورەیە ﴿لَن تَرَىٰنِي﴾ و ئەم فەرمایشتە:﴿ لَّا تُدۡرِكُهُ ٱلۡأَبۡصَٰرُ ﴾[2].

بەرپەرچیان دراوەتەوە: بەوەی ئەم دوو ئایەتە وەك بەڵگە پشتی بۆچوونی ئەوان ناگرن بەڵكو بەڵگەن لە دژیان.

(زمخشری) - لە موعتەزیلەكانە - وا گومانی برد كە ئامرازی (لن) لە ئایەتەكەدا مەبەستی ئەوە دەگەیەنێت، كە بۆ هەتایی و هەرگیز خوای گەورە نابینن، بەم جۆرەی لێكداوەتەوە تا پشتی ئەو بۆچوونەی خۆیان بگرێت لەوەی كە دەڵێن هەرگیز ناكرێت و دروست نییە خوای گەورە ببینرێت.

بەرپەرچیان دراوەتەوە بەم بەڵگانەی خوارەوە:

أ- كە ئامرازی (لن) مەبەستی هەتا هەتایی و هەمیشەیی (تأبید) ناگەیەنێت، بەڵگەش لەسەر ئەمە ئەوەیە كە: خوای گەورە هەواڵی داوە لەبارەی جولەكەكان كە هەرگیز و هەتا هەتا ئاواتی مردن ناخوازن، خوای گەورە لەم بارەوە فەرموویەتی:﴿ وَلَن يَتَمَنَّوۡهُ أَبَدَۢا بِمَا قَدَّمَتۡ أَيۡدِيهِمۡ ﴾ البقرة: ٩٥. واتە: (هەرگیز بەهۆی رەفتاری نادروست و دەست پێشخەری ناپەسەندیانەوە ئاواتی مەرگ ناخوازن). لەگەڵ ئەوەی جولەكەكانیش لە دوارۆژدا ئاواتی مردن دەخوازن تا لە سزاكە رزگاریان ببێت ﴿ وَنَادَوۡاْ يَٰمَٰلِكُ لِيَقۡضِ عَلَيۡنَا رَبُّكَۖ قَالَ إِنَّكُم مَّٰكِثُونَ ٧٧ ﴾ الزخرف: ٧٧.

---

(١) شرح ابن قطلوبغا على المسايرة ٣٧ و شرح الطحاوية ١٤٤ و حادي الأرواح ٢٢٢ و المواقف ٥٠٢ و مقالات الاسلاميين ٢١٨/١ و عقائد الامامية- مظفر ٣٦ و الشيعة بين الأشاعرة و المعتزلة - الحسني ١٩٥ كە وەریگرتووە لە: كشف الحق - حلي ١١ و توحید الصدوق.

(٢) شرح الطحاوية و حادي الأرواح، هەر دوو سەرچاوەی پێشوو.

واتـە: (دۆزەخیـەکان هـاوار دەکـەن، ئـەی مالـك "کـە فریشـتەی سەرپـرشـتیارە": دەبـا پەروەردگارت بمانکوژێت). ئەگەر ئامرازی (لن) بۆ هەتا هەتایی و هەمیشەیی بوایـە لـە دونیـا و دواڕۆژدا وەك موعتەزیلـە واگومـان دەبـات ئـەوا نـەدەبوو جولەکـەکان لـە دواڕۆژدا ئاواتی مەرگ و مردن بخوازن.

ب- ئامرازی (لن) بۆ جەخت کردنەوەیـە، بـە ئامـاژەو بەڵگەی فەرمایشـتی (أبـدا: واته هەرگیز)، (ابن مالك) وتویەتی:

ومَن رأى النفي بلَن مؤبَّدا      فقولَه اردُدْ وسواه فاعضُدا

واتە: هەرکەسێ بۆچوونی وابێت ئامرازی (لن) لـە پـاڵ وشـەی هـەرگیز (أبـدا) بـە مانـای نـەرێ و نـەفی کردنـی هەمیشـەییە، ئـەوا وتەکـەی ڕەتکـەرەوەو پشـتگیری پێچەوانەی وتەکەی ئەو بکە.

ئەگـەر مەبەستیشـی ئـەوە بێـت کـە هـەتا هەتایـە خـوای گـەورە نـابینن ئـەوە مەبەستی نەبینینە لە دونیادا نەوەك لە دواڕۆژ، بە بەڵگەی ئامرازی (لـن) لـە ئایـەتی پێشوودا ﴿وَلَن يَتَمَنَّوْهُ﴾[1].

## بەڵگەی عەقڵی:

ئەگـەر خـوای گـەورە بینـراو بوایـە، ئـەوا دەکەوتـە بەرامبـەر بینـەر، ئەوکاتـە دەهاتە ناو شوێن و جێگەدا.

---

(١) شرح الطحاوية ١٤٥-١٤٦ و الدَّوَاني ١٨٠-١٨١ و أصول الدين ٩٩.

زمخشری نە لە تەفسیرکەیدا و نە لە کتێبەکەی (المفصَّل في النحو) باسی ئەوەی نەکردووە کە ئامرازی (لن) مەبەستی نەفی کردنی هەتا هەتایی بێت، بەڵکو ئەوەی خستۆتەڕوو کە واتاکەی بریتیە لە جەخت کردنەوە لەسەر نەفی.

بەڵام لە هەندێ لەبەرگیراو (نسخ)ەکانی کتێبەکەیدا (ئەو نمونانە لە کتێبی: النحو،ی ناوبراودا هەن): کە دەڵێت ئامرازی (لن) بۆ نەفی هەمیشەیە. لە هەندێ لەبەرگیراوەی تردا هاتووە، کە بۆ جەخت کردنەوەیە، هەروەك (اردبیلی) ئەمەی دەربڕیوە بە ڕاشکاوی لە لێکدانەوەکەی لەسەر (الأنمُوذَج) ٢٩٢.

بەرپەرچیان دراوەتەوە: بەوەی شوێن و جێگە بۆ خوای پاك و تاك ئەستەم و قەدەغەیە، چونکە بینین جۆرێکە لە دەرخستن و زانیاریە بۆ بینەر کە خوای گەورە وەك هێزێك لە بینەردا ئامادەی دەکات و پێکی دەهێنێت، بەبێ ئەوەی ئەندازەی پەیی پێ بردنەکە کەم ببێتەوە، مەرجیش نییە لە بینینەکەدا: بینراو بکەوێتە بەرامبەر بینەر یان بکەوێتە شوێنێك و ماوەشی هەبێت، مەرجیش نییە بینەر دەوری بینراو بدات(١).

## لە کۆتاییدا:

ئەم ڕاجیاییە شتێکی مەترسیدار نیە، مادەم هەردوو تاقمەکە خوای گەورە بەپاك دەزانن لە جێگە و جەستە.

جا ئەو تاقمەی کە نکۆڵی دەکات لەوەی خوا ببینرێت، ئەوە بەو نکۆڵی کردنەی مەبەستی پاك ڕاگرتن و بەدوور گرتنی خوای گەورەیە لە شوێن و جەستە.

ئەو تاقمەش کە بۆچوونی وایە خوای گەورە دەبینرێت، ئەوا بۆچوونی وایە کە دەق و بەڵگەکان زۆر ڕاشکاون لەبارەی بینرانی خوا بۆیە ئەم تاقمەش بینینی خوای گەورەی چەسپاند، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا خوای گەورە بەپاك دەزانێت لە شوێن و

---

(١) المسامرة ٤١ و٤٣ و الدواني ١٧٨/٢ و الباجوري على الجوهرة ١٨/٢ و الدردير شرح الخريدة ١٠٠، بەڵام ئەوەی لێکدانەوەی بۆ (الطحاوية) کردووە - لەو کەسانەیە کە سیفەتی بەرزی (العلو) بۆ خوای گەورە دەچەسپێنن - پاش ئەوەی بەڵگەی لە قورئان و سوننەتەوە هێناوەتەوە لەسەر بینینی خوای گەورە، ئەوا لە ١٤٩ وتویەتی: (لەمانە بەڵگەی ئەوەی دەست دەکەوێت کە خوای گەورە لەلای سەرەوەی بوونەوەرو بەدی هێنراوەکانیەتی، ئەگەرنا ناچێتە عەقڵەوە خوای گەورە ببینرێت بەبێ ئەوەی لە بەرامبەر بینەر بێت، و هەرچی بڵێ خوای گەورە دەبینرێت بەبێ ئەوەی پێویست بەوەبکات خوای گەورە لە شوێندا بێت، ئەوا با پێداچوونە بۆ عەقڵی خۆی بکات، جا یا ئەوەتا ململانێ لەگەڵ عەقڵی خۆی دەکات یاخود شتێ لە عەقڵی دا هەیە. ئەگەر وتی: خوای گەورە دەبینرێت بەبێ ئەوەی لە بەرامبەر و لە پشتەوەو لە پێشەوەو لە لەلای چەپ یان ڕاستی یان لای ژوورەوەی یان ژێرەوەی بێت ئەوا هەر کەسێ کە گوێبیستی بێت بە فیترەتی سەلامەت و پاکی خۆی بەرپەرچی دەداتەوە ). سەیری: حادي الأرواح ٢٦٩. بکە. ئەمە بۆچوونی (حشويه)کانە کە شوێن و جێگەیان بۆ خوای گەورە بڕیارداوە/ الاقتصاد في الاعتقاد ١١٤.

جەســـتە، ئــەم تاقمـــە وتویـــەتی: (خـــوای گـــەورە بـــەبێ چـــۆنیەتی و دەورەدران دەبینـرێت).

دواتــر ئــەو بینینــەی كـە چەسـپاندوویانە بـۆ خـوا ئـەوا بۆچـوونیان وایـە لـە دوارۆژدایـە، هـەروەك زانـراوە كـە بـارودۆخی ژیـانی دوارۆژو قیامـەت بـە بـارودۆخی ژیانی دونیا ناچێت.

## بینینی خوای گەورە لە دونیادا :

ئوممەت یەكدەنگ و كۆك بووە لەسەر ئەوەی كە هیچ كەسێك لـە دونیـادا خـوای گەورە نابینێت.

بـەڵام ڕاجیابوونـە لـە بـارەی بینیـی پێغەمبـەر (ﷺ) لـە دونیـادا، و هەنـدێكیان دەڵێن بینویەتی و هەندێكیشیان وتویانە نـەیبینیوە، و هـەر دوو تاقمەكـەش بەڵگـەی نەقلّی (سمعی)یان بەدەستە.

لەبەر ئەوەی ئەم ڕاجیاییە هەبووە، ئەوا هاوەڵـان هـەر یەكـەیان ڕایـەكی لـەم دوو ڕایەی هەبووە، دەكرێ بینی بێتـی یـان نـەیبینی بێـت ئـەوا پێویست ناكـات پێـداگیری بكرێت لەسەر یەكێك لەم دوو ڕایە[1].

(١) الشفا - قاضي عياض ١٩٥ و شرح العقيدة الطحاوية ١٥١.

# باسی سێیەم
# قـــەزاو قـــەدەر

زانایانی كەلام لە لێكدانەوەو تەفسیری قەزاو قەدەر ڕاجیاییان هەیـە، و بۆیـە لـەم بارەوە بۆ چەند ڕاو بۆچوونێك دابـەش بوونـە، بـۆ نمونـە بۆچـوونی (ماتریـدی)ەكان، كە دەڵێن:

قـەزا: بریتیـە لـەوەی خـوای گـەورە شـتەكان بـەدی بهێنێـت بـە وردەكـاری و ڕێكوپێكی و لێزانیەكی تەواو.

قەدەر: بریتیـە لـە زانسـتی بـێ سـەرەتا و هـەربووی پـەروەردگار بـە سـیفاتەكانی بەدیهێنـراو و بوونەوەران، واتە: سیفەتی باش یان خـراپ و سـوود یـان زیـان گەیەنـەر دەبن...

بەم پێیە: قەزا دەبێتە پەیدابوو، چونكە سیفەتی كار (ئاوەڵكار)ە.

قەدەر لە مێژینەو بێ سەرەتا دەبێت، چونكە بۆ سیفەتی زانست دەگەڕێتەوە.

ئەم بۆچوونەی ماتریدیەكان كۆكـە لەگـەڵ زمانەوانیـدا، شیاوترین بۆچـوونە بـۆ قبـوڵ كـردن، چـونكە نـاودارترین واتـای قـەزا لـە زمانـدا بریتیـە لـە (حـوكم)، كـە دەگەڕێتەوە سەر كار، بۆیە گونجاوە لەگەڵ تەفسیرەكەی لەلایەنی زاراوەدا.

سەبارەت بە قەدەر ئەوا لە زمانەوانیدا بـە مانـای (كـار) نـەهاتووە، بۆیـە وا شـیاو تربوو كە لە زاراوەدا بە زانست تەفسیر بكرێت نەك بە كارو فرمان.

ئەشعەریەكان بۆچوونیان ڕێـك پێچـەوانەی بۆچـوونەكەی ماتریدیەكانـە، بـەوەی پێناسەی قەزا بۆ قەدەر و پێناسەی قەدەر بۆ قەزایان داناوە[1].

ئـەوەی كـە خسـتمانەڕوو ئـەوا قـەزاو قـەدەر دەگەڕێنـەوە بـۆ سـیفەتی زانسـت و سـیفەتی ویسـت و پەیوەسـت بـوونی سـیفەتی توانـا، بـەڵام لەبـەر گـەورەیی و مەترسـیداری نەشـارەزایی و نـەزانی لـەم بابەتـەدا ئـەوا زانایـانی كـەلام بەڕاشـكاوی

(١) الباجوري على الجوهرة ١٦/٢ و رسالة في التوحيد - الطائي ١٢٣، و پێناسەی ئەشعەریەكان بۆ ئەم ئەم دوو چەمكە لە: الموقف ٥٢٩.

لەبارەی دوواون[1].

***

## باوەڕ بوون بە قەزاو قەدەر و پەیوەندی بە بیرۆکەی ( جەبر )

باوەڕ بە قەزاو قەدەر بنەمایەکە لە بنەماکانی باوەڕ. ئەمەش بە فەرموودەی ڕاست (صحیح) هاتووە، کاتێ (جبریل) هاتە لای پێغەمبەر (ﷺ) و پرسیاری لێ کرد لە بارەی ئیسلام و باوەڕ، کە مەبەستیش لەمە فێرکردنی موسڵمانانە لە ئەحکام و یاساکانی ئایینی خۆیان. جبریل ووتی: ((فأخبرني عن الايمان؟ قال: أن تؤمن بالله و ملائكته و كتبيه و رسله و اليوم الآخر، و تؤمن بالقدر خيره و شره، قال: صدقت)). واتە: پێم بڵێ باوەڕ چییە؟ لەوەڵامدا فەرمووی: باوەڕت هەبێت بەخواو فریشتەکانی و کتێبەکانی و پێغەمبەرانی و بە ڕۆژی دوایی و قەزاو قەدەر چ چاکە یان خراپە بێت. وتی: ڕاستت وت. موسلیم گێڕاویەتیەوە[2].

مەبەست لە باوەڕ بوون بە قەزاو قەدەر بریتیە لە:

١- دان پێدانان و بەڕاست دانانی ئەوەی خوای گەورە زانایە بە بەدی هێنراوان هەر لە ئەزەلەوە، ئاگادارە بەوەی کە لە داهاتوودا پێش دێت، بۆ نمونە: لە ئەزەلەوە زانیویەتی و ئاگادار بووە بەوەی تاك بەویست و ڕەزامەندی تەواوی خۆی هۆکارەکان دیاری دەکات و دەیگرێتەبەر، دواتر پاداشت یان سزای دەداتەوە لەسەر کارەکەی.

٢- بەڕاست دانان و باوەڕ بوون بەوەی کە بوونەوەر و بەدی هێنراوان بە ویستی خوای گەورەو بەپێی زانستە بێ سەرەتاو هەربووەکەی هاتوونەتە بوون. خوای گەورە فەرموویەتی:﴿ إِنَّا نَحْنُ نُحْيِ الْمَوْتَىٰ وَنَكْتُبُ مَا قَدَّمُوا وَآثَارَهُمْ ۚ وَكُلَّ شَيْءٍ أَحْصَيْنَاهُ فِي إِمَامٍ مُبِينٍ ﴿١٢﴾ ﴾ یس: ١٢. واتە: (بێگومان هەر ئێمە مردووان زیندوو

---

(١) الباجوری سەرچاوەی پێشوو ١٧.

(٢) مسلم گێڕاویەتیەوە لە: کتاب الایمان - باب بیان الایمان و الاسلام و الاحسان ٢٧/١.

دەکەینەوە، هەرچی کردویانەو دەیکەن تۆماری دەکەین لەگەڵ ئاسەوارەکانیشیاندا، هەموو شتێکمان لە کتێبێکی ئاشکرادا "تۆمارگەی تایبەتدا" بەوردی تۆمارو ئامار کردووە).

کەواتە بەم پێیە هیچ پەیوەندیەك نییە لە نێوان قەزا و قەدەرەوە، لە نێوانی بیرۆکەی ناچاری (جبری) و سەرپشکی (اختیار)، چونکە سیفەتی زانست ئەرکی دەرخستنی ئەو شتانەیە کە لە داهاتوودا ڕوودەدەن[(١)].

ئیمامی نەوەوی لە لێکدانەوە (شرح)ی صەحیح موسلیمدا باسی کردووە کە:

(خەتابی وتویەتی: زۆرێك لە خەڵکی لەوانەیە واگومان ببەن کە واتای قەزاو قەدەر بریتیە لەوەی خوای پاك و بەرز بەندە ناچار دەکات لەسەر کردنی ئەو شتەی کە خوای گەورە ئەندازەگیری بۆ کردووەو بڕیاری لەسەر داوەو زانیویەتی کە دێتەجێ، واتاکەی بەو شێوەیە نیە کە ئەوان وای بۆ چوون، بەڵکو مانای بریتیە لە: هەواڵدان لە بارەی ئەوەی کە خوای پاك و تاك زانابووە بەوەی بەندە چ دەکات ئەمەش بە ئەندازەگیری لەلایەن پەروەردگارەوە، خێرو خراپەشی بۆ بەندە بەدیهێناوە)[(٢)].

پرسیار کرا لە (عبداللە)ی کوڕی (عمر) لەبارەی ئەو کەسەی گوناهی گەورە ئەنجام دەدات، لەگەڵ ئەنجامدانی گوناهەکانیش پاساوی ئەوە دێننەوە بەوەی دەڵێن ئەمە لە زانستی خوادا هەبووە، جا ئیبن عمر توڕەبوو، و وتی: بەڵێ خوای گەورە پێشتر زانیویەتی بەڵام ئەم زانینە پاڵنەر نەبووە تا ئەوان گوناهەکە بکەن[(٣)]، بەڵکو خوای گەورە بە زانستە بێ سەرەتاکەی دەزانێت کە خەڵکی ڕێگەی جیا جیا هەڵدەبژێرن، بۆ ئەم مەبەستەش ڕێگەیان بۆ ئاسان دەکرێت، و لەسەر ئەو شتەش دەیانهێڵێتەوە.

---

(١) بڕوانە: کبری الیقینیات الکونیة ١٦٧-١٦٩ و رسالة في التوحید ١٢٣.

(٢) النووي علی صحیح مسلم ١٩٩/١ بهامش ارشاد الساري - قصطلاني چ ٧ لە ولاق ساڵی ١٣٢٣ك.

(٣) رسالة في التوحید ١٢٤.

زانست و زانینی پەروەردگار مانای ناچار كردنی بەندە نییە لە هەر كارێكدا، بۆ نمونە مامۆستا پێشتر دەزانێت كە ئەو قوتابیە وانەكانی فەرمۆش بكات ئەوا لە تاقیكردنەوەدا سەركەوتوو نابێت. ئینجا دەكرێت ئەو قوتابیەی كە سەركەوتوو نەبووە ڕەخنە لە مامۆستا بگرێت و پێی بڵێت: كە پێشتر زانیت من سەركەوتوو نابم ئەمە هۆكار بوو كە سەركەوتوو نەبم؟ تەنانەت هیچ كەسێك قسەی لەم جۆرە ناكات.

جا زاستی پەروەردگار سیفەتێكی دەرخەرە، كە كاریگەری وەك توانای نییە، كەواتە ماناكەی بریتی نیە لە ناچار كردنی بەندە لەسەر شتێك.

## دەست گرتن بە هۆكارەكان و باوەڕ بوون بە قەزاو قەدەر

باوەڕ بە قەزاو قەدەر تێك ناگیرێت و دژی دەست گرتن نیە بە هۆكارەكانەوە، بەڵكو لەسەر مرۆڤ پێویستە هەوڵبدات و تێ بكۆشێت.

خوای گەورە فەرموویەتی:﴿ فَٱمۡشُواْ فِي مَنَاكِبِهَا وَكُلُواْ مِن رِّزۡقِهِۦۖ وَإِلَيۡهِ ٱلنُّشُورُ ﴾ الملك: ١٥. واتە: (بگەڕێن بەهەموو گۆشەو كەنارێكدا، لەو ڕزق و ڕۆزیەش بخۆن كە پێشكەشتان دەكات، دڵیاشبن كە سەرەنجام گەڕانەوەتان بۆ لای ئەو زاتەیە). جا تەمبەڵی قبوڵ نیە و ناكرێت پاڵ بدەیتەوەو بشڵێیت بە تەمای خوای.

و فەرمانی بە مرۆڤ كردووە كە خۆی بەرەو تیاچوون نەبات، خوایگەورەفەرموویەتی: ﴿ وَلَا تُلۡقُواْ بِأَيۡدِيكُمۡ إِلَى ٱلتَّهۡلُكَةِ ﴾ البقرة: ١٩٥. واتە: (خۆتان بەرەو تیاچوون مەبەن).

و فەرمانی پێداوە كە تێ بكۆشێت لە پێناوی خوادا، خوای گەورە فەرموویەتی:﴿ وَجَٰهِدُواْ بِأَمۡوَٰلِكُمۡ وَأَنفُسِكُمۡ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ ﴾ التوبة: ٤١. واتە: (جیهادو تێكۆشان بكەن بەماڵ و سامان و گیانتان لە پێناوی خوادا). خوای گەورە فەرموویەتی:﴿ خُذُواْ حِذۡرَكُمۡ ﴾ النساء: ٧١. واتە: (ئەوەی خۆتان پێدەپارێزن

بیگرنە دەست و ئامادە باش بن).

***

## دەركەوتنی بابەتی قەزاو قەدەر

بابەتی قەزاو قەدەر لەلایەن سەرجەم زانایانی موسڵمانەوە دەركەوت، كاتێك بینیان كە بەڵگەكانی قورئان و سوننەت و عەقڵ لە ڕووكەشدا تێكگیرانیان لەم بارەوە هەیە.

جا لەو بەڵگانەی كە لە ڕووكەشدا بەڵگەن لەسەر ئەوەی مرۆڤ ناچار كراوە:

أ- ئەم فەرمایشتەیە:﴿ قُل لَّن يُصِيبَنَآ إِلَّا مَا كَتَبَ ٱللَّهُ لَنَا ﴾ التوبة: ٥١. واتە: ("ئەی پێغەمبەر (ﷺ)" بڵێ: هەرگیز لەوە زیاترمان بۆ پێش نایەت جگە لەوەی كە خوا بۆی نوسیوین).

ب- ئەم فەرمایشتە:﴿ وَٱللَّهُ خَلَقَكُمْ وَمَا تَعْمَلُونَ ﴿٩٦﴾ ﴾ الصافات: ٩٦. واتە: (خوای گەورە بەدیهێنەری ئێوەو كردەوەكانیشتانە).

پ- ئەم فەرموودەی پێغەمبەر (ﷺ): ((الشقيُّ من شَقِيَ في بطن أمه، و السعيد مَن وُعِظَ بغيره)) مسلم گێڕاویەتیەوە. واتە: بەدبەخت ئەوەیە كە لە سكی دایكی دا بەدبەختە، و خۆش بەختیش كەسێكە پەند بەهۆی كەسانی تر وەردەگرێت.

ت- نمونە لە بەڵگەی عەقڵی: ئەگەر بڵێین بەندە خۆی سەرپشكە و بەدیهێنەری كردەوەكانیەتی، ئەوا دەبوا توانای خوای گەورە دیاریكراو بووایە نەوەك گشتگیر، و ئەو كاتە بەندە دەبووە هاوبەشی خوا لە بەدیهێنانی جیهاندا.

ئەو بەڵگانەی جەخت دەكەنەوە لەسەر ئەوەی بەندە سەرپشكە نەوەك ناچار كراو، ئەم بەڵگانەی خوارەوەن:

أ- ئەم فەرمایشتەی خوای گەورە:﴿ كُلُّ نَفْسٍۭ بِمَا كَسَبَتْ رَهِينَةٌ ﴿٣٨﴾ ﴾ المدثر: ٣٨. واتە: (هەموو كەس بارمتەی دەست پێشكەری خۆیتی).

ب- ئەم فەرمایشتەی خوای گەورە:﴿ فَمَن شَآءَ فَلْيُؤْمِن وَمَن شَآءَ فَلْيَكْفُرْ ﴾ الكهف:

٢٩. واتە: (ئەوەی دەیەوێت با باوەڕ بێنێت و ئەوەی دەیەوێت با کافرو بێ باوەڕ بێت).

پ- نمونە لە بەڵگەی عەقڵی: ئەگەر وتمان مرۆڤ ناچار کراوە، ئەوا مانای وایە توانای هیچ کاریگەریەکی نییە، بەڵام ئەگەر مرۆڤ خاوەن توانای کاریگەر نەبێت ئەوا هیچ واتایەك بۆ فەرمان و ڕێگری و پاداشت و سزاکان نامێنێتەوە[1].

## مەزهەبی موسڵمانان لەبارەی قەزاو قەدەر

زانایان کردەوەکانیان بۆ دوو بەش دابەش کردووە:

١- **کردەوە ناچاریی و خۆنەویستەکان** (اضطراري): بریتین لەو کردەوانەی کە مرۆڤ دەستی تێدا نیە و توانای بەسەردا ناشکێت و تیایدا سەرپشك نییە، وەك: جوڵەی لەرزینی دەست و جوڵەی کۆ ئەندامی دەمار و دەزگای هەرس.

گشت تاقمە ئیسلامیەکان کۆکن لەسەر ئەوەی ئەم کردەوانە بەدیهێنراون لەلایەن خواوە و بەندە هیچ ڕۆڵێکی تیایدا نییە، مرۆڤ هیچ پاداشتێك یان سزا لەسەر ئەم کردەوانە وەرناگرێت.

٢- **کردەوە سەرپشکی و خۆویستەکان** (اختياري):بریتین لەم کردەوانەی کە مرۆڤ توانای بەسەردا دەشکێت و سەرپشکە تیایدا وەك ڕۆیشتن و قسە کردن.

تاقمە ئیسلامیەکان لەسەر ئەم کردەوانە ڕاجیاییان هەیە، چەند بۆچوون و تێڕەوانین و مەزهەبێکی جیایان هەیە لەم بارەوە، کە بریتین لەمانە[2]:

**یەکەم: مەزهەبی جەبریەکان** (الجبرية): شوێنکەوتووی جعدی کوڕی درهم و جهمی کوڕی صفوانی راسبین.

---

(١) بڕوانە: دراسات في العقائد - د. عرفان ٢٤٥ و دواتریش.

فەرموودەی: ((بەدبەخت ئەوەیە کە بەدبەختە لە ...)) لە: صحيح مسلم - كتاب القدر - باب كيفية الخلق الآدمي... ٢٠٣٧/٤.

(٢) كبرى اليقينيات الكونية ١٦٩ و رسالة في التوحيد ١٢٧.

ئەمانـە پێیـان وابـوو كـە مـرۆڤ توانـا و خـاوەن ویسـت و سەرپشك نییـە، وتیـان: مرۆڤ ناچارە لەهەموو كارەكانیدا، وەك پەڕەی مریشكە لە باوەشی بادا.

دەڵـێن خـوای گـەورە كردەوەكـانی لـە مرۆڤـدا دروسـت كـردووە بـە هـەر دوو جۆرییـەوە چ ئـەو كردەوانـەی خۆویسـت و سەرپشـكە چ ئـەو كردەوانـەش كـە مـرۆڤ تیایاندا خۆنەویست و ناچارە، ئەمەش وا بە ئەندێشەی هەنـدێ كەسـدا دەهێنێـت كـە ئەو كردەوانە خۆویسـتن و مـرۆڤ تیایـدا سەرپشـكە كەچـی وانیـە و پـاڵ دەدرێنـە لای مـرۆڤ تـەنها لـە ڕووی خـوازراو (مجازی)یـە واتــە نــاوی بــێ ناوەرۆكـە، هـەروەك پاڵدەدرێتە لای شتی بـێ گیـان و ڕووەك، دەڵێن: ڕووەك خۆراكەكـەی هـەرس كـرد، و بەردەكە جوڵا.

پێیان وابوو: سزاو پاداشت و تەكلیف و ئەركداری شەرعی هەمووی ناچارییە.

بە بەڵگەكانی پێشتر بەڵگەیان هێنایـەوە كـە لـە ڕووكەشـدا مانـای ناچـار كراویـان دەگەیاند[(١)].

بەرپەرچیان دراوەتەوە:

بەوەی دەبێت ئەم دەقانە تەئویل بكرێن، تـا ڕێـك بكـەون و كـۆك بـن لەگـەڵ ئەو دەقانەی لەگەڵیان تێك دەگیرێن، ئەو دەقانـەی كردەوەیەك دەدەنە پـاڵ بەنـدە كـە شایەنی سزاو پاداشـت و سـوپاس و سەرزەنشـت وەرگـرتن بێـت، چـونكە خـوای گـەورە سـتەمی لەسـەر خـۆی قەدەغـە كـردووە، تـەنها لەسـەر ئـەو كردەوەیـە لێپرسـینەوە لەگەڵ بەندە دەكرێت كە بە ویست و ڕەزامەنی خۆی ئەنجامی دابێت.

خــوای پــاك و تــاك فەرموویــەتی:﴿ يَوْمَ تَأْتِي كُلُّ نَفْسٍ تُجَادِلُ عَن نَّفْسِهَا وَتُوَفَّىٰ كُلُّ نَفْسٍ مَّا عَمِلَتْ وَهُمْ لَا يُظْلَمُونَ ﴿١١١﴾ ﴾ النحـل: ١١١. واتــە: (ڕۆژێـك دێـت كـە هەموو كەس خەمی خۆیەتی، بەرگری لەخۆی دەكات، پاكانە بۆ خـۆی دەكـات، "گـوێ

---

(١) دراسات في الفرق و العقائد الاسلامية ٢٥٥ و الفَرق بين الفِرَق - بغدادي ١٢٨ و المِلَل ة النّحَل - شهرستاني ١٠٨/١ و الفصل في الملل و الأهواء و الأهواء والنحل ٢٢/٣ و التبصير في الدين ٩٦ و نشأة الفكر الفلسفي في الاسلام ٣٢٤/١ و لاپەڕەكانی دواتری.

بەکەسی تر نادات، ئەو ڕۆژە" هەر کەسە پاداشتی کردەوەکانی دەدرێتەوە و ئەو خەڵکە ستەمیان لێ ناکرێت).

قسەی ئەمانە سەر دەکێشت بۆ ئەوەی کە هیچ کەسێك ئەرکدار (مكلف) نیە بە فەرمان و ڕێگری (الأوامر و النواهي)، و هیچ واتایەك بۆ ڕەوانەکردنی پێغەمبەران نامێنێتەوە، و هیچ سودێکیش ناهێڵێت لەوەی پاداشتی چاکە و سزای خراپە بدرێت.

**دووەم: مەزهەبی موعتەزیلەکان:** ئەمانە کۆکن لەسەر چەند بابەت و بۆچوونێك، لەوانە:

١- بەندەکان خۆیان کردەوەکانیان بەدیدێنن و دروست دەکەن، و لەلایەن خوای گەورە هیچ ئەندازەگیری و بەدیهێنانێکی نییە بۆ کردەوەکانی بەندەکان چ بە دروست کردن چ بە لە ناوبردن.

٢- خوای گەورە لە دێرین و هەربووەوە زانایە بە کردەوەکانی بەدیهێنراوانی و هەر زاناشە بەوەی کە کامە باوەڕ دێنێت و کامە بێ باوەڕ دەبێت. ئەم بۆچوونەی موعتەزیلە جیایان دەکاتەوە بەتایبەت لە قەدەریەکان - شوێنکەوتووانی معبد الجهنی و غیلان الدمشقی - ئەوانەی کە نکۆڵیان دەکرد لە بوونی زانستی هەربوو (أزل)ی خوای گەورە، جا قەدەریەکان پێیان وایە کە خوا زانا نیە سەبارەت بە کردەوەکانی بەندە تا دوای ئەنجامدانی.

٣- مرۆڤ بکەرو ئەنجامدەری سەرپشکە، بەو توانا پەیدابووەی کار دەکات کە خوای گەورە بە چاودێری خۆی پێی بەخشیوە، جا بەندەش چۆن ویستی بوو ئاوا تواناکەی ئاراستە دەکات.

٤- فەرمان و ویستی خوای گەورە پەیوەستن بەیەکەوە.

خوای گەورە دەیەوێت کە بەتاك و تەنهای بزانین و باوەڕمان بە پێغەمبەرانی هەبێت، نوێژ ئەنجام بدەین.... بەهەمان شێوە فەرمانیشمان پێ دەکات بە ئەنجامدانی کارە ناوبراوەکان، نایەوێت تاوان و کوفر ئەنجام بدەین و فەرمانیش بەو شتانە ناکات، بەڵکو هەموو کارەکان مرۆڤ لە ویستی و کاری خۆیەتی.

موعتەزیلە بەڵگەی هێناوەتەوە بەمانەی خوارەوە:

ئەگەر خوای گەورە کردەوەی بەندەکانی بەدیهێنابا و دروست کردبا، ئەوا بەندەکان سەرپشك نەدەبوون، چونکە:

أ- ئەوا ئەرکداری (تکلیف)ی شەرعی بە فەرمان و ڕێگریەکان (الأوامر و النواهي) پوچەڵ و بێ بنەما دەبوون.

ب- سزاو پاداشت پوچەڵ دەبوونەوە.

پ- سوودی ڕەوانەکردنی پێغەمبەران نەدەما[1].

ئەم بۆچوونەی موعتەزیلەش بەرپەرچ دراوەتەوە، بە بەڵگەی:

ئەم فەرمایشتەی خوای گەورە:﴿ وَخَلَقَ كُلَّ شَيْءٍ فَقَدَّرَهُۥ تَقْدِيرًا ﴾ الفرقان: ٢. واتە: (هەموو شتێکی دروست کردووە بە ئەندازەو نەخشەی ڕێك و پێکی بۆ هەموو شتێك داناوە). ﴿ وَٱللَّهُ خَلَقَكُمْ وَمَا تَعْمَلُونَ ﴾ الصافات: ٩٦. واتە: (خوای گەورە بەدیهێنەری ئێوەو کردەوەکانیشتانە). هەروەك بەو بەڵگانەی ئەشعەرییەکان دەیهێننەوە پاش کەمێکی تر دەخەینەڕوو.

**سێیەم: مەزهەبی ئەشعەریەکان:**

بریتین لە شوێنکەوتووانی (أبي حسن الأشعري) و بۆچوونیان وایە:

١- کردەوەکانی بەندە کە تیایاندا سەرپشکە ئەوا بەدیهێنراوی خوان، بەندە هیچ کاریگەریەکی نییە لە بەدیهێنانی کردەوەکانی دا، خوای گەورە هێز لە بەندەدا دروست دەکات بۆ ئەوەی بتوانێت کردەوە ئەنجام بدات.

کەواتە کردەوە لەلایەن خواوە بەدیدەهێنرێت و بەندەش ئەنجامی دەدات و دەستی دەخات (کسب)ی دەکات[2].

---

(١) دراسات في الفرق و العقائد ٢٦١-٢٦٢ و الفَرق بين الفِرق ٩٤ ة الفصل ٣٣/٣ و نهاية الإقدام - شهرستانی ٧٩ و سەیری: مذاهب الاسلاميين - عبدالرحمن بدوي ١/ ٤٨ و لاپەڕەکانی دواتری بکە.

(٢) دراسات في الفرق و العقائد ٢٦٣ و شرح المقاصد ١٢٥/٢ و لاپەڕەکانی دواتری ، و احياء علوم الدين، و المواقف ٥١٥ و لاپەڕەکانی دواتری.

دەست خستن (كسب) بریتیە لەوەی توانای بەندە و هاوتەریب بێت لەگەڵ كردەوەی خوای گەورە، بەو واتایەی:

ئەگەر بەندە ویستی كردەوەیەك لە كردەوەكان ئەنجام بدات، ئەوا خوای گەورە لە هەمان ساتدا توانا لە بەندەدا دروست دەكات بۆ ئەنجامدانی، و بەمەش بەندە دەستی دەخات نەوەك دروستی بكات[1].

ئەم بۆچوونەیان میانڕەوە لە نێوان بۆچوونی جبریەكان و معتزلەكان.

بەمانەی خوارەوە بەڵگەیان هێناوەتەوە:

أ- ئەم فەرمایشتەی خوای گەورە:﴿ وَخَلَقَ كُلَّ شَيْءٍ فَقَدَّرَهُ تَقْدِيرًا ﴾ الفرقان: ٢. واتە: (هەموو شتێكی دروست كردووە بە ئەندازەو نەخشەی ڕێك و پێكی بۆ هەموو شتێك داناوە).﴿ خَـٰلِقُ كُلِّ شَىْءٍ ﴾ (الأنعام: ١٠٢، الزمر: ٦٢، الغافر: ٦٢) واتە: ( بەدیهێنەری هەموو شتێكە). كردەوەش دەچێتە ناو شتەكانەوە، و كەواتە كردەوەش دروستكراو بەدیهێنراوی خوایە.

ب- ئەگەر بەندە بەدیهێنەری كردەوەكانی بوایە و سەرپشك و سەربەخۆش بوایە، ئەوا پێویست بوو بە تێروتەسەلی زانابوایە بە بەدیهاتنی كردەوەكەی، شتێكی نەبوو ئەستەمیشە مرۆڤ دەوری هەموو لایەنەكانی كردەوە بدات، چونكە لە كاتی بێ ئاگایی و بێ هۆشیدا كردەوە ئەنجام دەدات بە شێوەیەكی ڕێك و پێك و تۆكمە، كەچی بەندە ئاگاشی لێ نییە.

كەواتە پێویست بوو كە سەرچاوەی كردەوەكان خوای پاك و بەرز بێت[2].

**چوارەم: مەزهەبی ئیمامی**: شێخ (مظفر) بەم شێوەیە بۆمان ڕوون دەكاتەوە:

(كردەوەكانمان لەلایەك، لە ڕاستیدا كردەوەی ئێمەن و ئێمەش هۆكاری سروشتیانین، لەژێر توانا و ویستی ئێمەدان، و لەلایەكی ترەوە ئەندازەی بۆ كراوە

---

(١) مناهج الأدلة ١١٠.

(٢) دراسات في الفرق و العقائد الاسلامية ٢٦٧.

لەلايەن خوای گەورە و لەژێر دەسەڵاتی ئەو دايە، چونكە هەر خوايە كە بەديهێنەری بوونەوەرو بوون و بەخشەريەتی، جا ئێمەی ناچار نەكردووە لە كردەوەكانماندا تا ئەو سزايەی لەبەرامبەر تاوانەكانمان پێمان دەدات ستەم كردن بێت لێمان، چونكە ئێمە توانامان هەيە و سەرپشكين لە ئەنجامدانی كردەوەكانماندا، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا بەديهێنانی كردەوەكانی بەئێمە نەسپاردووە، تا وای لێبێت لە ژێر دەسەڵاتی دەربچێت، بەڵكو بەديهێنان و فەرمان تەنها بۆ خوايە، و هەر ئەويشە توانای بەسەر هەموو شتێكدا هەيە و دەوری بەندەكانی داوە)[1].

ئەمە ئەو مانايەيە كە لە ئيمامەكان گێردراوەتەوە: بەندە نە ناچاركراوەو نە سەرپشكە، بەڵكو لەو نێوەندەدايە[2].

**پێنجەم: مەزهەبی (ابن روشد)**: پێی وايە ئەو تێكگيرانەی كە لە دەقەكاندا هاتووە بە هەڕەمەكی و بێ هودە نيە، بەڵكو مەبەستێكی خوای ياسادانەر بووە، تا بەو زانايانە ڕابگەيەنێت كە توانای تێگەيشتنيان هەيە لە قورئان و سوننەت بە شێوەيەكی دروست چارەسەری ئەم كێشەيە بكەن بەشێوەيەك كە ئەو گومانە لا ببات، لەوانەيە بوو بێتە هۆی پەرتبوونی نێوان ئەوانەی موشتومڕ دەكەن.

ناوبراو بۆ ئەوەچووە:

ناكرێت مرۆڤ تەواو ناچار كراوبێت، و ناشبێت بە ڕەهايی سەرپشك بێت، بەڵكو ڕاستی لە ميانڕەو بووندايە لە نێوان دوو ڕاو بۆچوونەكە و بەمە دەبێت كە دان بنێين بەوەی كردەوەكانمان تەواو سەرپشك نين تيايدا و ناچاريش نين بەڕەهايی، و دەشوەستێتە سەر دوو هۆكار: ويستێكی ئازاد كە لەهەمان كاتدا پەيوەستە بە هۆكاری دەرەكی كە بەردەوام لەسەر يەك ئاراستە دەڕەوات كە خوای گەورە لە

---

(١) عقائد الامامية - مظفر ٤٤.

(٢) الشيعة بين الأشاعرة و المعتزلة - الحسني ٢١٢ و بڕوانە: أصول الدين الاسلامي - محمد على ناصر - صيدا ٤٠ و لاپەڕەكانی دواتر. و عقائد الامامية الاثني عشرية - سيد ابراهيم الزنجاني چ ٢ ساڵی ١٩٧٣، ٣٦ - ٣٧.

بوونەوەردا بەدیهێناوە[1]. مامۆستا محمود قاسمیش ڕاو بۆچوونی وایە كە:

ئەوە چارەسەرێكی لۆژیكی و مەنتیقییە بۆ ئەو كێشەیەی كە زانایانی كەلام مشتومڕیان لەسەر بوو[2]، كە زانستی سەردەمیش مەیلی بۆ ئەوە دەچێت، كە نكۆڵی لە ئازادی هەڵبژاردن (اختیار) ناكات، و بڕواشی هەیە بە بوونی یاسای گشتی و ڕێكو پێك لە سروشتدا[3].

## پرسیارو وەڵام:

ئەگەر وترا بە دیهێنانی بوونەوەران لایەن خواوە بە ئەندازەی دیاری كراو بەپێی زانستی پێشووتری، ئەوە دەگەیەنێت كە: مرۆڤ ناچاركراوە لە كارەكانیدا.

وەڵامەكەی بریتیە لەوەی:

ئەو كردارانەی كە خۆنەویست و ناچارین مرۆڤ پێی ئەركدارو تەكلیف نەكراوە، هەروەك پێشتر خرایەڕوو.

سەبارەت بەو كردارانەی كە بەندە تیایاندا سەرپشكە ئەوا بەدیهێنراون، هەروەك پێشتر لە ڕای ئەشعەریەكاندا خرایەڕوو، ئەمە مانای وانیە كە مرۆڤ لە ئەنجامدانی كارەكانیدا ناچار كراوبێت، و ئەمەش بەوەی:

مرۆڤ لە كردەوەكانیدا سەرپشكە بەو وەسفەی كردەوەكانی بەدەست دەخات نەوەك بەو وەسفەی بەدیهێنەری كردەوەكانی بێت.

لەبەرئەوەی بەدەستهێنانی كردەوە (واتە خۆڕازاندنەوەت پێ) لەسەر دوو شت بەندە:

أ- بوونی سەرجەم بنەماكانی كردەوە لە دەرەوەی مرۆڤ چ ماددی و چ مەعنەوی.

ب- بەدەست هێنانی ئەو كردەوانەت بەهۆی پاڵنرانت بە ئاراستەیدا.

كەواتە تۆ دەتەوێت و سەرپشكی بەو وەسفەی دەست خەری و پاڵ نراویت بە

---

(١) مناهج الأدلة ١١٨-١٢٠ (پێشەكیەكە هی محومد قاسمە).

(٢) هەمان سەرچاوە ١٠٥.

(٣) هەمان سەرچاوە ١٢٠.

ئاراستەیدا، نەوەك بەو وەسفەی کە بەدیهێنەرو پەیداکەری بنەما و ڕەگەزەکانیەتی.

ئەمە ڕوون دەکەینەوە بەم نمونە بەرهەستە:

دەست بەو هەموو خوێنبەرو دەمارو توانا لە بەدیهێنانی خوای پاك و تاکە.

کاغەز بەو شێوەو تایبەت مەندییەکانییەوە لە بەدیهێنانی خوای گەورەیە.

پێنووس بەهۆی ئەو شیاویەی کە تیایدایە لە بەدیهێنانی خوایە.

هەموو ڕەگەزە ناوبراوەکان بەیەك گەیشتن بۆ ئەوەی نووسینێك لەسەر پەڕاو (تێنووس) بکێشن کە ئەویش هەر لە بەدیهێنانی خوایە.

کەواتە مانای وایە خوای گەورە بەدیهێنەری کردەوەکانی مرۆڤە.

پێویستە بۆ ئەوەی بتوانی بنووسیت، لە دەروونی خۆتدا جەخت بکەیتەوە لەسەر نووسین، و ویستی تۆ پاڵنەر بێت بۆ جێبەجێ کردن، ئا لەو کاتەدا خوای گەورە ڕێگە دەدات بەو توانایەی لە دەستەکانی تۆیدا داینـاوەو بـە مەرەکەبەکە کە چۆنت دەوێت ئاراستەی بکەیت، و ڕێگە دەدات بە پەڕاوەکە کە کارتێکراو بێت بە مەرەکەبەکە بەو شێوەیەی کە نووسینەکە ئەنجام دەدرێت، ئا لەو کاتەدا ناودەبرێیت بە نووسەر، و ئەو کردەوەیە دەدرێتە پاڵ تۆ. جا مەبەست و پێداگیری و بەدەست هێنان لە تۆوەیە، ئەمەش بە نهێنی ئەو ویستەی کە لە تۆدا دایناوە.

بەدیهێنانی کردەوەو هۆکارەکانی لە خواوەیە، لێ پێچینەوەو دادگایی کردن لەسەر مەبەست و دەست خستنەکە دەبێت، نەوەك لەسەر خودی بەدیهێنانی هۆکارەکان و کردەوە. وەك ئەو کەسەی بە ئوتومبیلەکەی خۆی بە کەسێکدا ئەکێشێت و دەیکوژێت، جا بەتایبەت لەسەر خودی کردەوەکە داداگایی ناکرێت چونکە خاوەنی ڕاستەوخۆی کردەوەکە بریتیە لە ئوتومبیلەکە، بەڵکو لەسەر بەدەست هێنانەکە لێی دەپێچرێتەوە.

ئەگەر وترا خوای گەورە دەفەرموێت:﴿ وَلَوْ شَآءَ لَهَدَىٰكُمْ أَجْمَعِينَ ﴾ النحل: ٩. واتە: (خۆ ئەگەر خوا بیویستایە هیدایەتی هەر هەمووانی دەدا بە گشتی).﴿ وَلَوْ شَآءَ رَبُّكَ لَآمَنَ مَن فِي ٱلْأَرْضِ كُلُّهُمْ جَمِيعًاۚ أَفَأَنتَ تُكْرِهُ ٱلنَّاسَ حَتَّىٰ يَكُونُواْ مُؤْمِنِينَ

﴿٩٩﴾ ﴾ یونس: ٩٩. واتە: (خۆ ئەگەر پەروەردگارت بیویستایە (دەیتوانی بە زۆر و بەناچاری) هەر هەموو دانیشتووانی سەر ڕووی زەوی باوەڕ بهێنن، جا ئایا تۆ "ئەی محمد (ﷺ)، ئەی ئیماندار" ئەتەوێ زۆر لە خەڵکی بکەی بۆ ئەوەی بڕوادار بن؟!).

ئەمە ئەوە دەسەلمێنێت کە ویستی مرۆڤ لە دەستی توانستی خوای گەورەدایە.

وەڵامەکەی ئەمەیە کە:

واتای ئەم ئایەتانە: ئەوەیە کە خوای باڵادەست و خاوەن شکۆ ئەگەر بیویستایە ئەوا بە میهری خۆی وای لێ ئەکردن کە باوەڕ هەڵبژێرن، و هەواو هەوەسیان ڕەت بکەنەوە، بەڵام خوا ئەمەی نەویست، بەڵکو ویستی وابوو کە مرۆڤ لە نێوان دوو ڕێگە و لادا دابنێت و هەر یەکەشیان کێشی بکات بۆ لای خۆی، کە بریتین لە: نەفس بە ئارەزوو هەواو هەوەسەکەی و عەقڵ بە دانایی و لێزانیەکەی.

ئالێرەوە خوای گەورە ویستی مرۆڤی دانا لە نێوان میهری خواو سزاکەی.

جا هەر کەسێ باوەڕی بە خواو پێغەمبەرەکەی (ﷺ) هەبێت، و نەفسی خۆی ڕاهێنا لەسەر ئەوەی ڕووبەڕووی حەق و ڕاستی نەبێتەوە، و تێکۆشا دژی ئارەزووەکانی، ئەوا خوای گەورە سەری دەخات و یارمەتی دەدات، خوای پاك و پایەبەرز فەرموویەتی:

﴿ وَٱلَّذِينَ ٱهۡتَدَوۡاْ زَادَهُمۡ هُدٗى وَءَاتَىٰهُمۡ تَقۡوَىٰهُمۡ ﴾ محمد: ١٧. واتە: (ئەوانەش ڕێبازی هیدایەت و ئیمانداریان گرتۆتە بەر بە گوفتاری پێغەمبەر (ﷺ) هیدایەت و دینداریان گەشە دەکات و پەرەدەسێنێت، خوایش شارەزایی و پارێزکار و دڵنیایی زیاتری پێبەخشین.

﴿ وَيَزِيدُ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ ٱهۡتَدَوۡاْ هُدٗى ﴾ مریم: ٧٦. واتە: (ئەوانەی ڕێبازی هیدایەتیان گرتۆتەبەر خوا زیاتر هیدایەتیان دەدات).

﴿ يَهۡدِي بِهِ ٱللَّهُ مَنِ ٱتَّبَعَ رِضۡوَٰنَهُۥ سُبُلَ ٱلسَّلَٰمِ وَيُخۡرِجُهُم مِّنَ ٱلظُّلُمَٰتِ إِلَى ٱلنُّورِ بِإِذۡنِهِۦ ﴾ المائدة: ١٦. واتە: (خوا بەو قورئانە پیرۆزە هیدایەت و ڕێنموویی ئەو کەسانە دەکات کە: شوێن ڕەزامەندی خوا کەوتوون، بەرەو

ڕێبازەكانی ئاشتی ئاسوودەیی و لە تاریكیەكانی دەریاندەهێنێت و ڕزگاریان دەكات و دەیانخاتە ناو ڕووناكیەوە).

بەڵام ئەوەی لاڕێی كردن و دوژمنایەتی خواو پێغەمبەرەكەی كرد، بووە خزمەتكاری هەوەس و ئارەزووەكانی، و كاتێك ئامۆژگاری كراو بەخششەكانی خوایان بەبیریان هێنایەوە ئەوا گوێكانی كەڕ كردن لە ئاستی دا، نمونەی ئەو كەسانە ئاوێتە ئەكرێن لە گومڕایی و سەر لێشێواویدا، خوای پایەبەرز فەرموویەتی: ﴿ سَأَصۡرِفُ عَنۡ ءَايَٰتِيَ ٱلَّذِينَ يَتَكَبَّرُونَ فِي ٱلۡأَرۡضِ بِغَيۡرِ ٱلۡحَقِّ وَإِن يَرَوۡاْ كُلَّ ءَايَةٖ لَّا يُؤۡمِنُواْ بِهَا وَإِن يَرَوۡاْ سَبِيلَ ٱلرُّشۡدِ لَا يَتَّخِذُوهُ سَبِيلٗا وَإِن يَرَوۡاْ سَبِيلَ ٱلۡغَيِّ يَتَّخِذُوهُ سَبِيلٗا ﴾ الأعراف: ١٤٦. واتە: (ئەو كەسانەی بە ناحەق فیز دەكەن لە زەویدا و خۆیان بە گەورە دەنوێنن (لە خەڵكی)، لەمەودوا ڕووی دڵیان وەردەچەرخێنم لە تێگەیشتنی ئایەت و فەرمانەكانم، خۆ ئەوانە ئەگەر هەر بەڵگەو نیشانەیەك ببینن ئەوە باوەڕی پێ ناكەن، ئەگەر ڕێبازی بەرژەوەندی دنیاو قیامەت ببینن ئەوە نایگرنەبەر، خۆ ئەگەر ڕێبازی ئارەزوو پەرستی و گومڕایی ببینن، ئەوە دەیگرنەبەر و پەیڕەوی دەكەن).

﴿ يُضِلُّ بِهِۦ كَثِيرٗا وَيَهۡدِي بِهِۦ كَثِيرٗا ﴾ البقرة: ٢٦. واتە: (زۆرێكی پێ گومڕا دەكات و زۆرێكی تریشی پێ هیدایەت و ڕێنموویی دەكات، بەڵام دیارە جگەلە لارو وێرو یاخی و تاوانباران كەسی تر گومڕا ناكات).

ئەم یاسایە خواییە لێكدەرەوەو تەفسیری ئەو فەرمایشتەی خوای گەورەیە:

﴿ فَإِنَّ ٱللَّهَ يُضِلُّ مَن يَشَآءُ وَيَهۡدِي مَن يَشَآءُ ﴾ فاطر: ٨. واتە: (بەڕاستی خوا بیەوێت هەر كەس گومڕا بكات دەیكات، هەر كەسێكیش هیدایەت بدات دەیدات).

﴿ وَمَن يُضۡلِلِ ٱللَّهُ فَمَا لَهُۥ مِنۡ هَادٖ ﴾ الرعد: ٣٣. واتە: (جا هەر كەس بەهۆی كارو كردەوەی خراپیەوە خوا ون بكات، ئیتر كەس نییە هیدایەتی بدات).

مەبەستی ئەوەیە كە: خوای گەورە بێ توانا نییە لەوەی هۆكارەكانی ڕێنموویی و هیدایەت بخاتە دڵی گومڕاترین بێ باوەڕەوە، و هۆكارەكانی گومڕایش بخاتە دڵی چاكترین بەندەی باوەڕداری.

بەڵام خوای گەورە لەسەر خۆی پێویست کردووە کە: کەس گومڕا نەکات مەگەر یەکێك پشت لە هۆکارەکانی ڕێنوویی و هیدایەت بکات و هۆکارەکانی هیدایەت نزیك بخاتەوە لە هەر کەسێك کە پێداگیری بکات لەسەر وەڵامدانەوەو جێبەجێ کردنی فەرمانەکانی خوای گەورە.

ئەگەر وترا:

ئەم فەرمایشتەی خوای گەورە:﴿ وَمَا تَشَآءُونَ إِلَّآ أَن يَشَآءَ ٱللَّهُ ﴾ الإنسان: ٣٠. واتە: (ئێوە چیتان پێناکرێت و هیچ کارێکتان پێ ئەنجام نادرێت، مەگەر خوا ویستی لەسەر بێت). ئاماژەیە بۆ ئەوەی کە مرۆڤ هیچ ویستێکی نییە مەگەر بە ویست و ڕەزامەندی خوای گەورە.

**وەڵامەکەی:**

ئایەتەکە ئەوە ڕوون دەکاتەوە کە مرۆڤ نەدەبووە خاوەنی ویست لە ناخی خۆیدا و نەشی دەتوانی سەرپشك بێت و ئەو ڕەفتارە بکات کە خۆی دەیەوێت ئەگەر خوای گەورە ئەو نهێنیە مەزنەی لە ناخی مرۆڤ دانەنابوایە[(١)].

ئەگەر وترا:

ویستی خوای گەورە تەواو ڕەهایە، جا چۆن دەکرێت ئەندێشەی ئەوە بکەین کە مرۆڤ خاوەن ویست بێت لە پاڵ ویستی خوادا، پاش ئەوەی داماننا بەوەی مرۆڤ ئازاد و سەرپشکە لە ویستەکەیدا؟.

وەڵامەکەی:

ئەوەیە کە کردەوە خۆنەویست و ناچارییەکانی مرۆڤ ئەوا مرۆڤ هیچ توانا و ویستێکی بەسەردا ناشکێت، بەڵام ئەو کردەوانەی کە مرۆڤ سەرپشکە و بە ویستی خۆی ئەنجامی دەدات ئەوا چەقی تەکلیف و ئەرکدارییە. جا خوای پایەبەرز ویستی وابووە مرۆڤ ویستی هەبێت، کەواتە ویستی خوای گەورە لەگەڵ هەموو ئەو

(١) کبری الیقینیات الکونیة ١٦٦ لاپەڕەکانی دواتر، سەیری ئەمەش بکە: رسالة القضاء و القدر - الشیخ محمد متولي الشعراوي، چ: دار الشروق لە میسر.

شتانەدایە کە مرۆڤ ئەنجامی دەدات و هەڵی دەبژێرێت، کەواتە تێکگیران نییە لە نێوان ویستی خوای گەورە و ئەوەی تۆ بە ویستی تایبەتی خۆت دەست نیشانی دەکەیت و ئەنجامی دەدەیت.

گریمان ئەگەر خوای گەورە ویستی لەسەر شتێك نەبوو کە تۆ هەڵت بژاردبوو بەویستی خۆت، واتای وایە خوای گەورە ویستی لەگەڵ ویستەکەی تۆ دا نیە کە تۆی ئاراستە کردووە بۆ ئەو کارە، پێچەوانەیە لەگەڵ ئەوەی کە چەسپا خوای گەورە ویستویەتی تۆ خاوەن ویست بیت.

**نمونە لەسەر ئەمە:**

خزمەتکارێکت هەیە و دەتەوێت شارەزای ڕاستگۆییەکەی ببیت لە خزمەت و کرین و فرۆشتنیدا، بۆ ئەم مەبەستە ئەندازەیەك پارەی پێ ئەدەی، تا پێداویستیەکان بکڕێت لە بازار، و تەواوی ئازادی هەڵسوکەوت بەو پارەیە دەکات بەبێ ئەوەی چاودێرێکی لەسەر بێت.

تۆ ویستوتە لەو کارەدا خزمەتکارەکە ئازاد بێت لەوەی هەر شتێك بکات یان نەیکات، تەنها بە قسەی دەروونی دەکات، و تۆش ویستوتە کە خزمەتکارەکە بە ئازادی هەڵسوکەوت بکات تا لایەنە شاروەکانی بزانیت، جا چ ناپاکی بکات لە سپاردەکەی یان سپاردەکەی بپارێزێت ئەوا تۆ هەر دوو دەرەنجامەکەت مەبەستە، جا ئەو دەرەنجامەت پێ خۆش بێت یان پێت ناخۆش بێت.

بەم پێیە دەرەنجامی ویستی مرۆڤ لە ئاست ویستی خوای گەورە وەك ویستی خزمەتکارەکەیە لە ئاست ویستی گەورەکەی، تەنها ئەو شتە لە موڵکی خواو بوونەوەردا ڕوودەدات کە خوای گەورە ویستی لەسەر بێت، و ئەمەش دژ نییە و تێك ناگیرێت لەگەڵ ئەوەی کە ویستی داوەتە بەندە تا ئەو شتە دەست بخات کە دەیەوێت بەبێ ناچار کردن، تا لایەنە شاراوەکەی بەندە لە هەڵسوکەوتەکەیدا دەربکەوێت، بەمەش شایەنی پاداشت یان سزای خوایی بێت[1].

(١) کبری الیقینیات الکونیة لا ١٦٢.

# بەشی سێیەم
# پێغەمبەرایەتی (النبوه)

لە چوار دەروازە پێک دێت:

## دەروازەی یەکەم: عەقلی مرۆڤ و پێویستی بە ڕێنمایی و هیدایەتی پێغەمبەرایەتی:

**باسی یەکەم: بوونی عەقڵ.**

**باسی دووەم: پێویستی عەقڵ بە ڕێنمایی و هیدایەتی پێغەمبەرایەتی.**

## دەروازەی دووەم: مشتومڕ کردن لەگەڵ ئەوانەی نکۆڵی لە پێغەمبەرایەتی دەکەن.

## دەروازەی سێیەم: پێغەمبەرایەتی بەشێوەیەکی گشتی:

**باسی یەکەم: پێغەمبەرایەتی و ئەرکەکەی.**

**باسی دووەم: تایبەتمەندییەکانی پێغەمبەرایەتی، سیفاتی پێغەمبەران، سروش (الوحی)، موعجیزە.**

**دەروازەی چوارەم: پێغەمبەرایەتی بەشێوەیەکی تایبەت:**

**باسی یەکەم: سەلماندنی پێغەمبەرایەتی محمد (ﷺ).**

**باسی دووەم: پەیامەکەی پێغەمبەر (ﷺ) و بنەماکانی بانگەوازەکەی تەواوکەرو کۆتایی شەریعەتەکانە.**

# دەروازەی یەکەم
# عەقلی مرۆڤ و پێویستی بە ڕێنمایی و هیدایەتی پێغەمبەرایەتی

**لە دوو باس پێك دێت:**

**یەکەم: زانینی عەقڵی (المعرفة العقلية).**

**دووەم: پێویستی عەقڵ بە ڕێنمایی و هیدایەتی پێغەمبەرایەتی.**

## باسی یەکەم
## زانینی عەقڵی

### بوونی عەقڵ:

باوەڕ بوون بەبوونی عەقڵ و پەیپێبردنەکانی بە تێڕوانینی ڕاست و دروست دەگاتە زانست و زانین، و ئەمەش ڕای عەقڵمەندان بەگشتی و فەیلەسوفە موسڵمانەکانە بە تایبەتی.

**بەر هەڵستکاران لەمەدا دوو دەستەن:**

**دەستەی یەکەم:** دان دەنێت بە بوونی عەقڵدا، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا نکوڵی دەکەن لە زانینە عەقڵیەکان و ڕاستیە زانستیەکان و هیچ نرخێك دانانێن بۆ پەیپێبردنەکانی عەقڵ. ئەمانە کۆمەڵێکن لە فەیلەسوفە کۆنەکانی یۆنان (سۆفستائیەکان)[1].

---

(١) بڕوانە: قصة الايمان - شیخ ندیم جسر ٣٧. سۆفستائی وشەیەکی یۆنانیە کە بە واتای (دانا: الحکیم) دێت، و سۆفستائیەکان کۆمەڵێکن لە مامۆستایانی دانایی و حیکمەت کە دەرکەوتن لە سەدەی پێنچەمی پێش زاینی لە یۆنانی کۆن. بە ناوبانگترین بانگەشەکارانی ئەوانەن: =

تاقمێك لە موسڵمانان، تێڕوانینیان وەك مەزهەب و تێڕوانینی ئەم دەستەیەیە، ئەمانەش بریتین لە:

شیعەی ئیسماعیلی كە بۆ ئەوەچوون: تێڕوانینی عەقڵی بەس نییە بۆ دەستخستنی زانست و زانیاری. وتویانە: (پێویستی بە یارمەتی خواییە). بەم پێیە بە پێویستی دەزانن بگەڕێنەوە بۆ ئەو مامۆستایە (ئیمامە) بەبێ بەندوبارو مەرج، چونكە - بە پێی گومانی ئەو شیعە ئیسماعیلیانە - تەنها دەبێت ئیمام شارەزا بێت لە ناوەرۆكی دەقە ئایینیەكان! تەنها ئیمام حەق و ناحەق و هیدایەت و گومڕایی لێك جیا دەكاتەوەو، پارێزراوە لە هەڵەی بە ئەنقەست و لەبیر چوونەوە، ڕاستی تەنها لەلایەن ئیمامە![1]

هەندێكی تریش، كە خۆ بەصۆفیدەزانن بۆ ئەوە چوون كە: ئیلهام تاكە ڕێگەی زانینە نەوەك عەقڵ[2].

جا عەقلگەراكان پڕوپاگەندەی دەستەی ناوبراویان پوچەڵ كردۆتەوە، بێ بنەماییەكەیان ڕوونكردۆتەوە، و بەڵگەكانیان بەتاڵ كردۆتەوە، گەندەڵیەكەشیان سەلماندووە، جگە لە دووربوونی لە ڕاستی و واقیع.

ئەبو حامدی غزالی كتێبێك دادەنێت: (القسطاس المستقيم) بۆ بەرپەرچ دانەوەی پڕوپاگەندە و بانگەشەی ئیسماعیلیەكان، لەو كتێبەدا بێ بنەمایی مەزهەبو پوچی بیروباوەڕی ئەوانی خستۆتەڕوو.

غەزالی لەم كتێبەدا بنەماكانی بیركردنەوەی ڕاستی دیاری كردووە كە سەردەكێشێت بۆ زانینی ڕاست و دروست، ڕێگەشی خۆش كرد بۆ تێڕوانینی عەقڵی

---

= بروتاكوراس (٤٨٠ پ.ز) و دانتفون و بروديكوس. سەيرى: مذاهب و مفاهيم في الفلسفة و الاجتماع - د. عبدالرزاق مسلم ماجد ٦٦. بكە.

(١) بڕوانە: راحة العقل - كرماني ١٣٧ و١٩٤. و توضيح المراد في شرح تجريد الاعتقاد ٦٧٦/٢ و الملل و النحل - الشهرستاني ٢٩/٢ و مقدمة القسطاس المستقيم - ڤيكتور شلحت ١٠.

(٢) بڕوانە: الأحكام - ابن حزم ١٤/١.

بۆ ئەو كەسەی كە دەیگرێتەبەر بە سەلامەتی بتوانێت حەق و ناحەق لەیەك جیا بكاتەوە[(١)]. و ئەوە بەشێك لەو وتەیەی بۆت دەخەمەڕوو كە لە (مشكاة الأنوار)دا هاتووە لەبارەی ڕوونكردنەوەی حەقیقەتی عەقڵ و تواناكانی: عەقڵ توانای پەیپێبردنی هەیە بەوەی كە زانایە و شت دەناسێت، پەیی بە ناسینی خودی خۆی دەبات، بە تێڕوانین بۆ شتەكان دەڕوانێت و لە ڕاستییەكەیان تێدەگات، هۆكار و حوكمەكانی لە شتەكە هەڵدەهێنجێت، واتە سەرچاوەی شتەكە و هۆی پەیدابوونی و پلەوپایەكەی لە ناو بوونەوەردا دیاری دەكات. ئەم چالاكیەی عەقڵ بە ئاراستەی هەموو بوونەوەرە بە بەرهەست و مەعقولەكانەوە. عەقڵ پەییان پێ دەبات و هەڵسوكەوت لە هەموویاندا دەكات، و چەند حوكمێكی بێ گومانی یەقینی ڕاستیان بەسەردا دەدات. دواتر بە شێوەیەكی تایبەت پەیی بەشتە مەعقولەكان دەبات كە بێ كۆتان، هەروەك پەیی دەبات بە ژمارەكان، هەر چەند گەورەو زیاتر بن، سەرباری ئەمەش عەقڵ پاكە لەو هەڵانەی كە بەسەر هەستەكاندا دێن ...[(٢)].

إبن حزم لە بەرپەچی ئەوانەی دەڵێن ئیلهام ڕێگەی زانست و زانینە نەوەك عەقڵ، وتویەتی: ئەوانەی پڕوپاگەندەی ئیلهام دەكەن بەوەی پەیی بەو شتانە دەبەن، كە غەیری ئەوان بە عەقڵی سەرەتا پەیی پێ نابەن، ئەمەش دوو كەس لەوان لەسەر شتێك كۆك نین كە بانگەشەی ئەوە دەكەن كە بە ئیلهام دەیزانن و پەییان پێ بردووە، كەواتە بێگومان چەسپا كە ئەوانە كۆمەڵێك درۆزنن... بەهەمان شێوە ئیهام بانگەشە و پڕوپاگەندەیەكی بێ بەڵگەیە، ئەگەر هەر كەسێكیش زۆر بەجوانی ڕووخساری بانگەشەو پڕوپاگەندەكەی برازێنێتەوە ئەوا هیچ ڕاستیەكی پێ ناچەسپێت و هیچ ناحەقی و بەتاڵێكیشی پێپوچەڵ نابێتەوە[(٣)].

**دەستەی دووەم**: نكۆڵی لە عەقڵ دەكات بە تێگەیشتنی پێشوو، و بۆ ئەوە

---

(١) مقدمة القسطاس المستقيم - ڤيكتور شلحت ١٤، ١٨.

(٢) هەمان سەرچاوە.

(٣) الأحكام ١/ ١٧.

دەچێت كە: (هەستە ديارەكانمان و ئەندێشە كراوەكان تەنها هۆكارن بۆ زانين، ئەوەى بە عەقڵ ناو دەبرێت تەنها كۆمەڵە كارێكە بۆ هەستەكان دەگەڕێتەوە)[1].

خاوەنانى ئەم مەزهەبە ناسراون بە (هەستگەرا) يان (ئەزموونگەرا) ياخود (ماددەگەرا)كان، ئەم مەزهەبە لەم دواييانەدا لە فەلسەفەى ئەوروپيدادەركەوت. ئەوەى ڕێگەى بۆ ئەم مەزهەبە خۆشكرد (فرنسيس بيكۆن) بوو كە لە ساڵى ١٦٢٦ز مردووە و لە گرنگترين پياوەكانى ئەم مەزهەبە (جون لوك) (١٦٣٢ - ١٧٠٤ز) و (دڤيد هيوم) (١٧١١ - ١٧٧٦ز) بوون، ئەم ئاراستە و مەزهەبە بەشێوەيەكى زۆر بەرچاو بازارى گەرم بوو و بڵاوبووەوە، لەلايەن بەشێكى زۆر لە فەيلەسوفەكان و تەنانەت فێرخوازو لايەنگريشى هەن لە هەموو شوێنێك.

لەگەڵ ئەوەشدا نەيارە (عەقڵگەراكان) بەتووندى ڕووبەڕووى بوونەتەوە، هەندێ لە عەقڵگەراكان هەڵسان بە لێكۆڵينەوەى زانستى ئەزمووندار بۆ ڕووكەشە دەروونيە دەراساكان و سەلماندىيان كە عەقل ماددە نيە و دەتوانێت پەيى بەشت ببات بەبێ هەستەكان، گرنگترين ديارەى (تلبثائي) واتە:گواستنەوەى فيكرو هزر. و (د. راين) پێناسەى بۆ ئەم ديارديە كردووە: كە بريتيە لە هەست كردن و پەيپێبردن بە فيكرو هزرەكانى كەسێكى تر، بەبێ ئەوەى هەستەكان هيچ ڕۆڵێك ببينن لەمەدا[2].ديارەى ڕەوانى بينين (الجلاء البصري) و (د. راين) پێناسەى كردووە بە: هەست كردن بە شتەكان يان ڕووداوەكان بەبێ ئەوەى هەستەكان هيچ ڕۆڵێك ببينن[3]. هەروەك ئەم لێكۆڵەرانە چەسپاندوويانە كە هەر دوو ديارەى (گواستنەوەى فيكر) و (بينينى ڕەوان) تەنها دوو ڕووى يەك ديارەن ناويانناوە:(پەيى بردن لە دەرەوەى هەستەكان).

---

(١) العقل و الوجود - يوسف كرم ٨ و سەيرى (دائرة معارف القرن العشرين) ماددەى (عقل) بكە.

(٢) العقل و سطوته ٢٦-د.ج. براين مامۆستاى دەروونناسى لە زانكۆى ديوكى ئەمريكى، وەرگێڕانى د. محمد حلوجى.

(٣) هەمان سەرچاوە.

هەروەها چەسپاندوویانە کە ئەم دیاردەیە، واتە دیاردەی پەیبردن لە دەرەوەی هەستەکان، ملکەچ نابێت بۆ پەیوەندی شوێنی و کاتی کە دیاردە ماددیەکان و هێزیەکان ملکەچن بۆی جا چ کارەبا یان گەرمی یان ڕووناکی یان جگەلەمانە بێت.

دەرەنجامەکانی ئەم لێکۆڵینەوانە خرانەڕوو لە کۆنگرەی زانایانی ویلایەتە یەکگرتووەکان، یەکەمیان: لەبارەی بیرکاری ئاماری بوو کە لە ساڵی ١٩٣٧ گرێدرا. دووەمیان: بۆ زانایانی دەروونناسی گرێدرا لە ساڵی ١٩٣٨ز، و کۆنگرەکە دانی نا بەم لێکۆڵینەوانە و ملکەچی دەرەنجامەکانی بوو کە لێی بەدەست هاتبوون[1].

تێکڕای مەزهەبە ئیسلامیەکان کۆك بوون لەسەر ئەوەی کە تەنها پشت بە زانیارییە عەقڵیەکان نەبەسترێت، دانیان ناوە بەوەی عەقڵی مرۆڤ پێویستی بە یارمەتی دەر هەیە لە دیاریکردنی کاروبارەکاندا، دیاریکردنی چۆنیەتی باوەڕ بوون بە سیفەتەکانی خوای گەورە، زانینی ئەو زانیاریانەی کە پێویستن سەبارەت بە بارودۆخی ڕۆژی دوایی، و تا عەقڵ ئاگادار بکاتەوە سەبارەت بەو شتەی کە لێی بێئاگابووە یان لاوازە لە پەیی پێبردنی و ئەو یارمەتیدەرەش پێغەمبەرە، و ڕایان کۆك بووە لەگەڵ مەزهەبە ئیسلامیەکان و زۆربەی فەیلەسوفەکان، هەموو ئەوانەش کە باوەڕدارن بە شەریعەتە ئاسمانیەکان. هەندێ لە فەیلەسوفەکان ڕایان لەمەدا جیاواز بووە وەك (براهیمەکانی هیند) و تەنها ئەو چەند زانیارییەیان بەباش زانی، وتیان عەقڵی مرۆڤ پێویستی بە ڕێنمایی و هیدایەتی پێغەمبەرایەتی نییە.

***

---

(١) بڕوانە: هەمان سەرچاوە ١٨٥.

## باسی دووەم

# پێویستی عەقڵ بە ڕێنمایی و هیدایەتی پێغەمبەرایەتی

### باوەڕی عەقڵ... باوەڕی سروش...

هەروەك چۆن باوەڕ بوون، بە بوونی خوای گەورە و بە سیفەتە تەواو و كامڵەكانی، بەهۆی ئەو كەسانەوە دەبێت، كە خوای گەورە تایبەتی كردوون بە مژدەدان و ترساندن، ئەوا ئەم باوەڕە بەهەمان شێوەی سەربەخۆ لە ڕێگەی عەقڵی مرۆڤیش دەكرێت دەستەبەر بكرێت. ئەگەر یەكێك بە بەڵگەوە گەیشتە ئەوەی باوەڕی بە بوونی خواو سیفەتەكانی هێنا. بەبێ بەڵگەی بیستراو و بەبێ ئەوەی بانگەوازی پێغەمبەرێكی پێ بگات. هەروەك ئەمە ڕوویداوە لەلایەن هەندێ كەس كە عەقڵیان بەهێزو بەرزە، و دەروونیان لە ناو مرۆڤەكاندا پاك و پوختە، دواتر لەم تێڕوانینەیدا بۆ ئەوەچوو كە باوەڕی هێنا بەوەی نەفسی مرۆڤ دەمێنێت لە دوای مردن، ژیانێكی تری هەیە لە دوای ژیانی دونیا ئەوساش یان ئەوەتا خۆش ڕادەبوێرێت یاخود سزا دەدرێت. باوەڕی بۆ دروست بوو كە خۆشبەختی و بەدبەختی لە دواڕۆژدا بەردەوام دەبێت و پەیوەستیشە بە كردەوەكانی مرۆڤ لەم ژیانە كۆتا هاتووەدا، جا كردەوەكانی دڵی یاخود جەستەی بن، وەك سەرجەم جۆری پەرستشەكان، دواتر لە دەرەنجامدا بگاتە ئەوەی كە خۆشبەختی نەفس بە ناسینی خواو كردەوەی چاكە دەبێت، پێچەوانەكەی بەدبەختیە، ئالەو كاتەدا هیچ شتێك ڕێگر نییە لەوەی ئەو مرۆڤە كە پەیی بردووە بانگەواز بكات بۆ ئەو ڕاستیانەی كە ئاراستەكارن بەرەو خوا، بۆ ئەم مەبەستەش چەندین یاسا دابڕێژێت، بۆ ئەوەی تێكڕای مرۆڤایەتی بانگ بكات، بۆ باوەڕ هێنان پێی و ئەنجامدانی هەمان كارو كردەوەكانی، مادەم شەریعەتێك نەبوو كە لەگەڵی تێك بگیرێت[1].

---

(١) بڕوانە: (رسالة التوحيد - شيخ محمد عبده ٧٢ و٨٩ و٩٠)، دەڵێت: ((مرۆڤەكان بەگشتی بە یەكتاناسان و بتپەرستان و فەیلەسوفەكان جگەلە كەمێك نەبن كە هیچ نرخێكیان نییە ئەوا =

وەك: ئەخناتۆن لە فیرعەونەکانی میسرٍ، برهام لە هیند، کنفیشیوس لە چین، زەردەشت لە فارس، زۆرریێك لە فەیلەسوفەکانی یۆنان وەك: (ئەرٍستۆ و فیساغۆرس و سۆقرٍات و ئەفلاتۆن) بەمە هەڵسان.

بەڵام... لەبەر ئەوەی ئەمە حاڵەتێکی گشتی نەبووە بۆ خەڵك. تەنها لەوانەیە بۆ چەند کەسێك فەراهەم بێت، کە خوای گەورە تایبەتی کردوون بە عەقڵی تەواو و کامڵ و تێرٍوانینی رٍۆشن، ئەگەر بانگەوازی پێغەمبەریشی پێ نەگەیشتبێت، جا ئەگەر بانگەوازی پێغەمبەرایەتیشی پێ بگەیشتایە ئەوا خێراترین کەس دەبوو لە ملکەچ بوون بۆی، هەتا ئەوانەش سەرباری بە هێزییەکەیان لەوانەیە بگەن بە شتێك کە شیاو نەبێت لە میانەیدا بۆ خوای گەورە برٍوانرێت.

لەبەر ئەوەی پێویستی مرۆیی سنوردار نەبوو و ژیان و گوزەرانیشی تایبەت نەبوو تەنها بەیەك کەسەوە، ئەوا بەم پێیە ئەو هێزە پەیی پێبەرەش کە پێی درابوو ئەوا جیاواز بوو بە جیاوازی جۆرو گەل و کەسەکانی بەشێوەك کە جیاوازی و پلەکانی کۆتایی نایەن، لەوانەیە شتێك بە بەرژەوەندی دابنرێت لەلایەن کۆمەڵێك لە خەڵکی، کەچی لەلایەن کۆمەڵێکی ترەوە بە خراپە دابنرێت، شت هەیە لەلایەن تاقمێك شتی بەرزو پیرۆزە و لەلایەن تاقمێکی ترەوە بێ رٍێزو نزمە.

جا ئەگەر یاسادانان و رٍێککاری بۆ عەقڵی مرۆیی جێ هێڵرٍابوایە ئەوا لێیان ئاڵۆز دەبوو کە چاك و خراپ لەیەك جیا بکەنەوە لەمەرٍ هەڵسوکەوتیان لەگەڵ یەکتریدا، و نەدەکرا جیاکاری بکرێت لە نێوان شتی (باش، جوان، بەرز) و (خراپ، ناشرین، نزم)، بۆ نمونە: لەو کاتەی کە سەرمایەداری بەپوختی بۆچوونی وایە: کە

---

= تێرٍوانین و بۆچوونیان وایە: کە نەفسی مرۆڤ ژیانێکی تری هەیە لە پاش جیابوونەوە لە جەستە و لەناو ناچێت بە دوایی (واتە بە رٍەهایی لەناو ناچێت)، و ئەو مردنەی کە پێویستە بەسەریدا بێت بریتییە لە جۆرێك لە شاراوە بوون و ونبون. ئەگەر چی تاقمە ناوبراوەکان شێوازیان جیاواز بێت، لە وێنە کردنی ئەو مانەوەیە و بارودۆخ نەفس تیایدا، بەڵگە هێنانەوەکانیشان جۆراو جۆر جیاواز بوون)).

ژیاری مرۆیی مەترسی لە ناوچوونی لەسەری هەیە ئەگەر ئیشتراکیەت جێگەی ئازادی ئابوری بگرێتەوە، ئەوا ئیشتراکیەتیش بە کورتی لەبارەی سیستەمی ناوبراوی هاوەڵەکەی دەڵێت: (تەنها یەك هۆکار هەیە بۆ پاراستنی ژیاری مرۆیی، ئەویش بریتیە لە ڕەت کردنەوەو هەڵوەشاندنەوەی سیستەمی سەرمایەداری و سیستەمی ئیشتراکی جێگەی بگرێتەوە)[1].

لەگەڵ ئەوەی هەمووان کۆکن، لەسەر ئەوەی کە کار هەیە خراپە و هەیە چاکە، لە ناو عەقڵمەندان و ئەوانەی ڕاست ئەڕوانن و فیکری میانڕەویان هەیە ئەوا دەکرێت بتوانرێت لای حەق بپێکێت و بزانێت، بەڵام بەهۆی جیاوازی سەرچاوەو بیرکردنەوەیان ئەوا تێڕوانینیان بۆ هەر کارێك جیاوازە. عەقڵی مرۆڤ بەتەنها لە توانایدا نییە کە خاوەنەکەی بگەیەنێتە خۆشبەختی لە ژیانی دونیادا تەنها لە چەند حاڵەتێکی دەگمەندا نەبێت[2].

لەبەرئەوەی پلەکانی ڕەوشت فرەو جیاوازن لەلایەن مرۆڤ، بەلەبەر چاوگرتنی ئامادەییان و جیاوازی جۆرو کەش و باردۆخەکانیان، ئەوا ئەگەر مرۆڤ مەیدانی بۆ عەقڵی خۆی چۆڵ بکردایە ئەوا هەر نەیدەتوانی ڕەوشتی تەواو بکات و پاکسازی دەروونی کامڵ بکات.

لەبەرئەوەی بارودۆخی دوارۆژ بە عەقڵ وێنە ناکرێت و عەقڵ پێی ناگات، ئەویش بریتیە لە بەخشینی خۆشی و ئازار و ڕێگەکانی لێپرسینەوە لە کردەوەکان بەهەر جۆرێك بێت.

بۆیە عەقڵی مرۆڤ پێویستی بە ڕابەرێك بوو تا ڕابەرایەتی بکات لە هێزی پەیی پێبردنی جەستەیی کە بۆی باشترە لە هەر دوو ژیانەکەدا ئەوا پێویستی بە یارمەتی دەرێك بوو تا یارمەتی لێ وەربگرێت لە ڕوونکردنەوەی چۆنیەتی باوەڕ بوون بە

---

(١) بڕوانە: منهاج الاسلام في الحكم - محمد أسد ٢٣، و رسالة التوحيد ٧٦، و أصول الدين الاسلامي - شيخ محمد علي ١٥٣، و الاسلام وحاجة الاسلام اليه ١٢١-١٢٧.

(٢) هەمان سەرچاوە.

خـــوای گـــەورە و ســـیفەتەكانی و دیـــاریكردنی جۆرەكـــانی كارەكـــان و ئـــەوەی سـوودگەیەنەرە و ئـەوەی زیانگەیەنـەرەو ئـەو شـتەی كـە پێویسـتە بزانـرێ لـەبارەی ژیانی دوارۆژ.

بـەپوختی عـەقڵی مـرۆڤ پێویسـتی بـەوە هەیـە كـە یارمـەتی دەدات لـە فەراهـەم كردنی هۆیەكانی خۆشبەختی لە دونیاو دوارۆژدا.

ئەم یارمەتیدەرە پێویستە لە ڕەگەزی مرۆڤ بێت، بۆ ئەوەی لێی تێبگەن و لەو شتانەی دەرەباری ئەو بگەن، و لەو پەیامەی حاڵی ببن كە لەلایەن پەروەردگاریەوە هێناویەتی، ئەم یارمەتیدەرەش پێغەمبەرە:﴿لَقَدۡ مَنَّ ٱللَّهُ عَلَى ٱلۡمُؤۡمِنِينَ إِذۡ بَعَثَ فِيهِمۡ رَسُولٗا مِّنۡ أَنفُسِهِمۡ يَتۡلُواْ عَلَيۡهِمۡ ءَايَٰتِهِۦ وَيُزَكِّيهِمۡ وَيُعَلِّمُهُمُ ٱلۡكِتَٰبَ وَٱلۡحِكۡمَةَ وَإِن كَانُواْ مِن قَبۡلُ لَفِي ضَلَٰلٖ مُّبِينٍ ١٦٤﴾ آل عمران: ١٦٤. واتە: (سوێند بێت بێگومان خوا منەتی ناوەتە سەر ئیمانداران كاتێك پێغەمبەرێكی بۆ ڕەوانە كردوون لە خۆیان ئایەتەكانی ئەویان بەسەردا دەخوێنێتەوە، دڵ و دەروونیان پاك و پوخت دەكاتەوە، هەروەها فێری قورئان و داناییان دەكات، بەڕاستی پێشتر لە گومڕاییەكی ئاشكرادا ڕۆچوو بوون).

***

# دەروازەی دووەم
# مشتومڕ كردن لەگەڵ ئەوانەی نكوڵی لە پێغەمبەرایەتی دەكەن

ئەو دەرەنجامەی كە لە دەروازەی پێشتر بەدەستمان كەوت بریتیە لەوەی كە:

مرۆڤ بەخۆی ناتوانێت تەنها پشت بە عەقڵ و ویژدانی خۆی ببەستێت لە هەموو ئەو شتانەی كە پێویستە بیزانێت كە پەیوەستە بە خواو سیفەتەكانی، بەڵكو پێویستی بە بەرمانە و شەریعەت هەیە بۆ ڕێكخستنی ژیانی سەرەتای و چاك كردنی ئەو كۆمەڵگایەی تیایدایە، و سەبارەت بەژیانی دوارۆژی كە خۆشی هەمیشەیی یان سزای نەبڕاوەیە.

ئالێرەوە ئەوە بەدەركەوت كە عەقڵی مرۆیی زۆر پێویستی بە پشتوانێك هەیە كە پشتی پێببەستێت لە پەیبردن بەو شتەی كە تەنها خۆی ناتوانێت پەیی پێببات.

لەگەڵ ئەمەشدا خەڵكانێك بۆ ئەوە چوون كە مرۆڤ پێویستی بە ڕێنمایی و هیدایەتی پێغەمبەرایەتی و سروش و نیگای پەیام نیە.

واگومانیان بردووە كە مرۆڤ دەتوانێت تەنها پشت بەخۆی ببەستێت، و تەنها بە عەقڵی خۆی ژیانی ڕێك بخات و پێداویستیەكانی دابین بكات.

**ئەمانەی ئەم بۆچوونەیان هەیە، دوو پێڕن:**

**پێڕێك:** نكوڵی دەكات لە پێغەمبەرایەتی و پەیامەكانی ئاسمانی، چونكە نكوڵی لە خوا دەكات و دان بە بوونی دا نانێت. و شتێكی گومان هەڵنەگرە كە كەسێ نكوڵی بكات لە پەیامنێرو ڕەوانەكار كە خوای گەورەیە و دان بە بوونی دا نەنێت ئەوا بەبێ چەندو چوون نكوڵی دەكات لە پەیامبەرو نێردراوەكەی، و دان نانێت بە هیدایەت و ڕێنمایی و پەیامەكەی، ئەمانە لە مێژوودا بە بێ دین و خوانەناس و ماددەگەراكان ناسراون.

كۆمەڵێك لەم بەشە لە هەموو كات و شوێنێكدا هەر هەبوونە. لەگەڵ ئەمەشدا

نەیانتوانیوە کاریگەری دروست بکەن لە ڕای گشتی مرۆڤایەتی دا، و لا بدەن لەسەر فیتڕەتەکەی، مرۆڤ هەر باوەڕدار مایەوە بەخوای گەورە، ئەمەش خۆ ڕۆشن کردنەوە بە پەیامەکانی خوا لە قۆناغە تاریکەکانی ژیاندا.

گفتوگۆو مشتومڕ کردن لەگەڵ ئەم پێڕەدا بەوە نابێت لەسەر سەلماندنی پێغەمبەرایەتی یان پێویستی عەقڵ مرۆڤ بە ڕێنمایی و هیدایەتی پێغەمبەران دەمەتەقێیان لەگەڵ بکرێت، بەڵکو دەبێت لەسەر سەلماندنی بوونی داهێنەری یەکەم و بەدیهێنەری هەرە گەورەی ئەم بوونەوەرە بە پێکهاتەکانیەوە گفتوگۆیان لەگەڵ بکرێت. شوێنی ئەمە ئێرە نیە بەڵکو دەروازەی (ئیلاهیاتە).

پێڕی دووەم: دان دەنێت بەبوونی خوای باڵادەست و خاوەن شکۆ و باوەڕیشی پێ هەیە، بەڵام نکۆڵی دەکات لە پەیامە ئاسمانیەکان، و تەنها پشت بە عەقڵی خۆیان دەبەستن لە دیاریکردنی چاکە و خراپە و شتی بەرزو نزم، بەو گومانەی کە ڕەوانەکردنی پێغەمبەران پێچەوانەی دانایی و حیکمەتە، و ئەمەش لە خوای گەورەو مەزن ناوەشێتەوە.

زۆرێك لە براهیمەکانی هیند[1] و صابئە[2] و هەندێ لە فەیلەسوفەکان ڕیزی سەرەوەو پێشەوەی ئەم پێڕە دەگرن، هەندێ لە خوانەناسە بێ باوەڕەکانی

---

(١) براهمە: لە (برهم)ەوە هاتووە، ناوی خوایە بە زمانی (السنسكريتية). وە لەلای ئەوان بریتیە لەو خوایە کە بە زاتی خۆی هەیە، و هەستەکانی پەیی پێ نابەن، بەڵام عەقڵ پەیی پێی دەبات، و سەرچاوەی هەموو بوونەورانە و سنوری نییە، هەر ئەو زاتەیە کە بناغە و ئەصڵی هەربوو و ئەزەلییە کە جیهان و بوونەکەی لێوە بەدەست دەخات.

و هندوسیە: ئایینی یەکتاناسیە لەلایەك، لەلایەکی تر ئایینی فرە خوایيە. چەند بیروباوەڕێکی سەرەتایی تێدایە وەك پەرستنی هێزی سروشت و باوباپیران و مانگا بەشێوەیەکی تایبەت.

بڕوانە: أديان الهند الكبرى - د. أحمد شبلي لە لا ٤٩ تا لا ٩٤ و الفصل في الملل و النحل - ابن حزم ٦٩/١ و الملل و النحل - الشهرستاني ٤٦/١، و الأديان دراسة تأريخية مقارنة - د.رشدي عليان ٨٧.

(٢) بڕوانە: کتێبەکەمان: كتاب الصابئون - حرانيين و مندائيين - ١٠٣.

موسڵمانان بە فەلسفەی ئەوان كاریگەر بوونە[1].

ئەمانە بۆ تێڕوانینەكەیان كۆمەڵێك بەڵگەیان هێناوەتەوە، و ئێمەش گرنگترین بەڵگەكانیان دەخەینەڕوو و پوچی و بێ بنەمایی و دووریان لە ڕاستی ڕوون دەكەینەوە:

١- **وتویانە**: ئەوەی پێغەمبەران دەیهێنن لە دوو حاڵەت بەدەر نییە یان ئەوەتا عەقڵ دەیزانێت یان نایزانێت.

ئەگەر ئەو شتەی هێنا كە عەقڵ دەیزانێت ئەوا هیچ سوودێكی نەبووە، و ئێمەش پێویستیمان پێی نیە، و عەقڵ منەت و پێویستی پێی نییە.

ئەگەر شتێكی هێنا كە عەقڵ نایزانێت، ئەوا عەقڵ بۆی هەیە كە قبوڵی نەكات و ڕەتی بكاتەوە، چونكە شتێك قبوڵ كراوە كە عەقڵ پەیی پێی ببات.

**وەڵامی ئەدەمەوە بەوەی**: ئەم بەڵگەیە ڕوونە كە پوچەڵ و بێ بنەمایە، چونكە هەر كەسێك شارەزای پەیامە ئاسمانیەكان بێت ئەوا دەزانێت كە هەر دوو لایەن لەخۆی دەگرێت چ ئەوەی عەقڵ دەیزانێت و چ ئەوەی كە نایزانێت.

---

(١) لەوانە (أبو الحسين أحمد)ی كوڕی (یحیای كوڕی اسحاق الراوندی) كە لە ساڵی ٢٤٥ مردووە و وتراوە لە ٢٥٠ك لە مردووە، و ڕاوند گوندێكە لە گوندەكانی قاسان لە دەوروبەری ئەسفەهان. و (الزندقە) بریتیە لەو بزوتنەوەیەی كە دوژمنایەتی خۆی بۆ ئیسلام ڕاگەیان و هەوڵی ڕووخاندنی دا، و پشتی بەست بە بنچینەیەكی فیكری پێچەوانەی ئیسلام. سەیری: الاسلام وحاجة الانسانية اليه - د.محمد يوسف موسا ١٢٣ و الغلو و الفرق الغالية في الحضارة الاسلامية - د. عبدالله سلوم السامرائي ٧٩. وابن الراوندي الملحد - د. عبدالأمير الأعسم. بكە.

(١) وەك ماچ كردنی بەردە ڕەشەكە، و ڕۆیشتن، و بەرد باران كردنەكان (رمي الجمار)، جا بێگومان عەقڵی ڕووت بێ توانایە لەوەی ئامانجەكەی تێبگات، و جێبەجێ كردنی ئەم شتانە لە میانەی پەرستش و لاسایی كردنەوەی پێغەمبەرە: ﴿ لَّقَدْ كَانَ لَكُمْ فِي رَسُولِ ٱللَّهِ أُسْوَةٌ حَسَنَةٌ ﴾ الأحزاب: ٢١. واتە: (بەڕاستی لە پێغەمبەری خوادا چاكترین نمونەی تەواو و ڕێك و پێك هەیە).

جا ئەوەی کە عەقڵ دەیزانێت ئەوا ئەرکی پەیامەکان جەخت کردنەوە بووە لەسەری و هاندانە بۆ پابەند بوون پێیەوە، ئەمەش پاڵپشتی کردنی پلەوپایەی عەقڵە، دەربڕینێکی کردارییە لەسەر گرنگی پێگەی عەقڵ لە بیناکردنی ژیاندا.

سەبارەت بەوەی کە عەقڵ نایزانێت - ئەمەش زیاترە لەلایەنەکەی تر - ئەوا پەیامە ئاسمانیەکان ڕۆڵی ڕێبەرو ڕێنوێنی کەری عەقڵ دەبینن بۆ ئەو زانیاریانە، کە عەقڵ لە هەگبەیدا نیەتی، چاك و بەسوودی بۆ ڕوون دەکاتەوەو چارەسەری پێویست دەخاتە بەردەم عەقڵ بۆ ئەو کێشانەی بەرەو ڕووی خەڵك دەبنەوە بەبەردەوامی و ئاڵۆزن.

ئەو یاسا ئاسمانیانەی کە لە ڕووکەشدا وادیارن پێچەوانەی عەقڵن وەك هەندێ پەرستش و کردەوانەی لە (حەج)دا ئەنجام دەدرێن[1]. جا ئەمە لە بێ توانایی عەقڵ سەرچاوە دەگرێت لەوەی کە هەندێ کات ناتوانێت پەیببات بەشتی چاك و

---

(١) وەك ماچ کردنی بەردە ڕەشەکە، و ڕۆیشتن، و بەرد باران کردنەکان (رمي الجمار)، جا بێگومان عەقڵی ڕووت بێ توانایە لەوەی ئامانجەکەی تێبگات، و جێبەجێ کردنی ئەم شتانە لە میانەی پەرستش و لاسایی کردنەوەی پێغەمبەرە﴿ لَّقَدْ كَانَ لَكُمْ فِي رَسُولِ ٱللَّهِ أُسْوَةٌ حَسَنَةٌ ﴾ الأحزاب: ٢١. واتە: (بەڕاستی لە پێغەمبەری خوادا چاکترین نمونەی تەواو و ڕێك و پێك هەیە).

هەر ئەمەش بوو وای لە عومەڕی کوڕی خەتتاب کرد کە بڵێت، کاتێ بەردە ڕەشەکەی ماچ کرد: (دەزانم تۆ بەردێکی نە سوود نە زیان ناگەیەنیت، و سوێند بەخوا ئەگەر پێغەمبەری خوام (ﷺ) نەدیبایە کە ماچی دەکردی ئەوا ماچم نەدەکردی). بێگومان شوێنکەوتن و لاسایی کردنەوەی پێغەمبەرو پابەند بوون بە پەیامەکەی دەستەبەری بەرژەوەندی قیامەتی و سوودی دونیای دەکات ﴿ وَأَذِّن فِي ٱلنَّاسِ بِٱلْحَجِّ يَأْتُوكَ رِجَالًا وَعَلَىٰ كُلِّ ضَامِرٍ يَأْتِينَ مِن كُلِّ فَجٍّ عَمِيقٍ ﴿٢٧﴾ لِّيَشْهَدُواْ مَنَٰفِعَ لَهُمْ ﴾ الحج: ٢٧ - ٢٨. واتە: (جا بانگی خەڵکی بکە و جاربدە لە ناویاندا با بێن بۆ حەج، ئەوانیش بە پیادە دێن بەدەم بانگەوازەکەتەوە، یان بەسواری - ئەو وشترانەی کە دوورە ماوە - لاوازی کردوون و لە هەموو ڕێگەیەکی دوورەوە هەر دێن. بۆ ئەوەی سوودو کەڵکی ماددی و مەعنەوی بەدەست بهێنن و ببینین).

خراپی حەقیقی و ناتوانێت دەوری زانیاری و بەرژەوەندییەکانی دواڕۆژ بدات[1].

**٢- وتویانە**: پێغەمبەر لە ڕەگەزی ئەوانەیە کە بۆ لایان ڕەوانەکراوە، و بەبەرز دانان و بە گەورە زانینی تاکێك لەناو هاوڕەگەزەکانی و هاوشێوەکانی ستەمە و دەرچوونە لە دادپەروەری و دانایی، و ئەمەش شتێکی نەشیاو و نادروستە بۆ خوای دانا و دادگەر.

**وەڵامی ئەدەمەوە**[2]:

١- خوای گەورە بە دانایی خۆی بۆی هەیە بە فەزڵ و بەخششی خۆی یەکێك هەڵبژێرێت لە بەدیهێنراوەکانی هەروەك چۆن بۆی هەیە جیاوازی نەکات لە نێوانیاندا.

ئەوەش دژ نییە لەگەڵ ئەوەی کە خوا دادگەرو دانا بێت.

٢- بەپێی بەڵگەکەی ئێوە پێویست دەبێت... کە جگەلە خوای گەورە دادگەرە، چونکە خوای گەورە هەندێ لە بەندە و بەدیهێنراوەکانی بە تایبەت زانست و زیرەکی و جەستە و هەستی تەواوی پێداوە و لە هەندێکی تریشیاندا نەزانی و گێڵی و کەموکوری جەستەیی و هەستی تیایاندا بەدیهێناوە.

ئێوە وا ناڵێن، بەڵکو دەڵێن ئەمە بۆ بەرژەوەندی هەر دوو لاکەیە و ڕێگەیەکە بۆ سوودێکی گەورە، و خوای گەورە زاناترە پێی.

دەسا با هەندێ بەندە تایبەتمەندبن بە پەیامداری و پێغەمبەرایەتی یان جگە لەم تایبەت مەندیانە بۆ بەرژەوەندی هەردوولا - چ ڕەوانەکراو چ ئەوانەی بۆیان ڕەوانە کراوە - و بەزەیی و بەخششێك بێت بۆ ڕوانین لە بەڵگەی عەقڵی کە فەرمانیان پێکراوە بۆی بگەڕێنەوەو کاری پێبکەن.

**٣- وتویانە**: خوای گەورە داناو کارلەجێیە. چۆن زاتێکی وا دانا نێردراو و پێغەمبەر ڕەوانە دەکات بۆ لای ئەوانەی کە دەزانێت باوەڕی پێ ناهێنن و بەدرۆی

---

(١) بڕوانە: كشف المراد في شرح تجريد الاعتقاد - الحلّي ٢٧٣.

(٢) بڕوانە: التمهيد - الباقلاني ١٠٤-١٠٦.

دەخەنــەوەو تەنانــەت ئــازاری دەدەن و گاڵتــەی پێدەكــەن، بەڕاســتی ئەمــە كــارێكی نابەجێیــە. بۆیــە لەبــەر ئــەوەی كــار ناتــەواوی شــیاوی خــوا نییــە بۆیــە ڕەوانــەكردنی پێغەمبەرانیش كاری ئەو نییە.

**وەڵامی ئەدەمەوە:** بەوەی بە بەڵگەی ئێـوە ئـەوە دەسـەلمێنێت كـە دروسـتە پێغەمبـەر ڕەوانە بكرێت بۆ لای ئەوانەی كە دەزانرێت هەنـدێكیان لەناویانـدا هـەن بانگەوازەكە قبوڵ دەكەن.

هەروەك ئەوەشی لەسەر بنیات دەنرێت كـە خـوای گـەورە بەڵگـە بـە عەقڵـەكان و بەڵگەو نیشانەكانی نەهێنێتەوە لەسەر ئەوانەی كە نكوڵی لێ دەكەن.

ئەگەر وتتان: زۆرێك بە عەقڵ بەڵگەیان هێناوەتەوەو هیدایەتیان وەرگرتووە.

دەڵێین: زۆرێكیش پێغەمبەرانیان بە ڕاست زانیوەو هیدایەت دراون.

ئینجا چ ڕێگرێك هەیە لەوەی خـوای گـەورە بەڵگـە بـەرپابكات لەسـەر بەنـدەكانی ئەمـەش لـە ڕێگـەی ڕەوانـەكردنی یـەكێك لـە پێغەمبـەران بۆیـان ﴿ وَيُزَكِّيهِمْ وَيُعَلِّمُهُمُ ٱلْكِتَـٰبَ وَٱلْحِكْمَةَ ﴾ الجمعـة: ٢. واتــە: (دڵ و دەروون و ڕواڵــەت و ئاشــكرا و نادیاریــان پوختە دەكات، فێری قورئان و دانـایی و شـەریعەتیان دەكـات). و هونـەرەكانی زانسـت و زانــین. هــەروەك بەڵگــەی لەســەر بــەرپاكردوون بــە عــەقڵ. و گێڕاوەیــەتی بــە سەرچاوەیەك بۆ زانیاری[(١)].

٤- **وتویانە:** ئەگەر خوای گەورە پێغەمبەرانی ڕەوانـە كـردووە بـۆ ئـەوەی ڕێنمـایی و هیدایەتی خەڵكی بدات بۆ باوەڕ پێهێنانی، و ئاراستە كردنیان بۆ ئـەو شـتانەی خێـرو چاكەیان تێدایە، ئـەوا چاكتر دەبـوو و مەبەسـتی خـوای گـەورەی باشـتر دەگەیانـد كـە عـەقڵی بەنـدەكانی ناچـار بكردایـە بـۆ بـاوەڕ هێنـان و بـۆ ئـەوەی كـە خێـرو چاكەی تێدایە بۆ بەندەكانی.

**وەڵامی ئەدەمـەوە:** بـەپێی بەڵگەی ئێـوە پێویست دەبێـت كـە بوترێـت باشـتر وابـوو،

---

(١) التمهيد - الباقلاني ١٠٤-١٠٦.

کارەکە لێزانتر دەبوو ئەگەر هاتبوایە خوای گەورە بانگی خەڵکی نەکردبوایە بۆ باوەڕ هێنان پێی و ناسینی شەریعەتەکەی لە ڕێگەی تێڕامانی عەقڵی و بەڵگە هێنانەوەی لۆژیکی و مەنتیقی، بەتایبەتی کە خوای گەورە دەشزانێت کە کەسانێك هەن لەناو بەندەکانی دا ناتوانن بەڵگە بێننەوەو بەڵگەش کاریان تێ ناکات.

جا واباشتر بوو کە کە عەقڵەکانیان ناچار بکات بۆ باوەڕ هێنان بەخوا...، ئەرکی تێڕامان و بەڵگە هێنانەوەیان نەخاتە سەر مل، بە میهرو بەخشندەیی خۆی بەزیی بە هەر هەموویان بکات کە بەهۆیەوە مل بۆ باوەڕ شل بکەن وەك فریشتەکان.

ئەگەر وتتان: خوای گەورە زانیویەتی ئەگەر ئەرکی باوەڕ هێنان بخاتە ئەستۆیان لە ڕێگەی تێڕوانین و بەڵگە هێنانەوەدا ئەوا بۆ بەرژەوەندی ئەوانە و ڕێزگرتنە لە عەقڵیان.

دەڵێین: جا چ شتێك ڕێگرە لەوەی پێغەمبەریان بۆ ڕەوانە بکرێت ﴿ يَتْلُوا عَلَيْهِمْ ءَايَـٰتِهِۦ وَيُزَكِّيهِمْ وَيُعَلِّمُهُمُ ٱلْكِتَـٰبَ وَٱلْحِكْمَةَ ﴾ الجمعة: ٢.[1] واتە: (ئایەتەکانی قورئانی قورئانی ئەویان بەسەردا دەخوێنێتەوەو دڵ و دەروون و ڕواڵەت و ئاشکرا و نادیاریان پوختە دەکات، فێری قورئان و دانایی و شەریعەتیان دەکات). بە تایبەتی لە ڕەوانەکردنی پێغەمبەران دا - بەبێ گومان - بەرژەوەندی دەستەبەر دەبێت بۆ ئەوان، و پشتیوانیە بۆ زانیاری و پەیی پێبردنە عەقڵیەکانیان.

**٥- وتویانە**: مەبەست لە ڕەوانەکردنی پێغەمبەر بۆ ڕەوایی دانە بە پاداشت لەسەر باوەڕهێنان و گوێڕایەڵی، سزادان لەسەر بێ باوەڕی و تاوان کاری.

دەتوانین بەهۆی عەقڵەکانمان سەیری بەدیهێنراوانی خوای گەورە بکەین و سوپاسی بکەین لەسەر بەخشش و نیعمەتەکانی کە بەسەر ئێمەدا ڕژاندوویەتی.

ئینجا گەر خوای گەورەمان ناسی و سوپاسیشمان کرد ئەوا ئەو کاتە شیاوی پاداشتی و نیعمەتەکانی دەبووین، بەڵام بەپێچەوانەوە ئەگەر نکۆڵیمان لێ کرد و

(١) بڕوانە: التمهيد - الباقلاني ١٠٤-١٠٦ و القص في الملل و النحل - ابن حزم ٦٩/١، ٧٠.

نەمانناسی و بێ باوەڕ بووین بە بەخشش و نیعمەتەکانی ئەوا ئەو کاتە شیاوی سزاکەی دەبین. بەم پێیە هیچ شتێك لە ئارادا نییە کە ڕەوانەکردن و هاتنی پێغەمبەران پێویست بکات.

**وەڵامی ئەدەمەوە:** عەقڵەکان - هەرچەندە بەتوانا و بەرزو کامڵ بن - ئەوا ناتوانن بگەن بە حەقیقەتی باوەڕو مەرجەکانی و شێوازی پەرستشەکان و ئەو شتانەی کە شیاون بۆ سوپاس و ستایش کردنی خوای پاك و بەرز بەبێ ڕوونکردنەوە لەسەر زمانی پێغەمبەرانی خوا.

بەهێزترین بەڵگە لەسەر ئەمە (ئەوەیە کە دەبینین چ گومڕاییەك هەبووە لە پێش پەیامە خواییەکان و تەنانەت هەموو جیهانی گرتبووەوە لە چەرخە کۆنەکاندا، بەڵکو ئەو شتانەش کە دەیان بینین لەدوای نزم بوونەوەو خەفە بوونی دەنگی پێغەمبەران، کە بەهۆیەوە مەشخەڵەکانی پەیامە کۆنەکان کزبوون و لاوازبوون تا بەر لەهاتنی کۆتا پێغەمبەر و نێردراو، چونکە لە کۆندا و پێش هاتنی کۆتا پێغەمبەر (ﷺ) - هەروەك هەمووومان دەیزانین - خەڵکی بە ئارەزووی خۆیان شتیان دەپەرست وەك بەرد و دار و بتە داتاشراوەکان و تەنانەت هەندێکیان هەندێکی تریان بەخوا ئەزانی و بەشێکیان بەشێکی تریان ئەچەوساندەوە.

میسرییە کۆنەکان سەرباری ئەو هێزە زانستیەی کە هەیانبوە، ئەوا هی وا هەبووە کە فیرعەونەکانی پەرستووە یان گوێرەکەی پەرستووە.

بەهەمان شێوە یۆنانیە کۆنەکانیش، لەگەڵ زیرەکی و لێهاتوویان لە فەلسەفە و زانست دا، ئەوا بت پەرست بوونە و ڕۆمانیە کۆنەکانیش لەگەڵ ئەو بەشدار بوونە کارایەی هەیان بووە لە بوارەکانی فەلسەفە و ڕەوشت و یاسا دا کەچی بت پەرست بوونە. ئەی دەبێت ئوممەتەکانی تر چۆن بن لە بیرکردنەوەدا لە چاو ئەو ئوممەتە ناوبراوە کۆن و خاوەن پێگە و شارستانیە بەهێزەکان، ئەو ئوممەتانەی بێ بەش بوون لە ئامادەیی عەقڵی و فیکری)[1].

---

(١) الاسلام و حاجة الانسانية اليه - د. محمد يوسف موسى ٢٢٣.

٦- **وتویانە**: ئەو شتەی هۆی پوچەڵ بوونەوەی پەیامە ئەوەیە كە بینیمانە چەند كەسێ كە بانگەشەی پەیامداریان كردووە ئەوا بەڵگە بە شتە نەشیاوە عەقڵیەكان دێننەوە لەسەر ڕاستی پەیامەكان. وەك: (شەق بوونی دەریا، بەدیهێنانی وشتر لە بەرد، بوونی گۆپاڵ بە مار، چاك كردنەوەی لاڵ و بەڵەكی زگماك، ڕۆیشتن لەسەر ئاو، بەقسە هێنانی گورگ و وردە بەرد... و هاووێنەكانیان). لەبەر ئەوەی ئەو شتە ناوبراوانە لەڕووی عەقڵیەوە بوونیان نەشیاوە بەم هۆیە ئەو شتە پوچەڵ بووەوە كە بانگەشەی بۆ دەكەن.

**وەڵامی ئەدەمەوە**: نەشیاوی ئەو شتانە - لە دیدی ئێوەدا - دەرناچێت لەوەی:
یان لە چوارچێوەی توانای خوای گەورە دابێت یاخود لە نەریت و عادەتەكان بێت.

ئەگەر وتیان: ئەمە لە چوارچێوەی دەسەڵاتی خوای گەورەدا نییە، ئەوا بەمە بێ باوەڕ بوونە و دەرچوونە لە ئایینەكەیان، چونكە ئەوان باوەڕیان بەخوا هەیە و یەكێك لە سیفەتەكانی خوا بریتیە لە سیفەتی توانا ﴿ فَعَّالٌ لِّمَا يُرِيدُ ﴾ هود: ١٠٧. واتە: (بەڕاستی پەروەردگارت كارایە بۆ هەر شتێك بیەوێت). ﴿ وَمَا كَانَ ٱللَّهُ لِيُعْجِزَهُۥ مِن شَيْءٍ ﴾ فاطر: ٤٤. واتە: (وە نەبێت خوا هیچ شتێك دەستەوەسانی بكات).

ئەگەر وتیان ئەمە شتێكە بەپێی نەریت ناكرێ ببێت.

پێیان دەوترێت: جا چ شتێك ڕێگرە لەوەی خوای گەورە نەریتەكان تێك بشكێنێت و موعجیزە بەرپا بكات لەسەر دەستی پێغەمبەرانی وەك بەڵگەیەكی درەوەشاوە و گومان هەڵنەگر لەسەر ڕاستگۆییان و دروستی بانگەوازەكەیان.

پێشەوا (محمد عبده[1]) بەڵگەی هێناوەتەوە لەسەر ئەوەی كە ڕوودانی ئەو

---

(١) بریتییە لە: محمدی كوڕی عبدەی كوڕی حسن خیرالله كە لە ١٢٦٥ك لە دایك بووە. قورئانی پیرۆزی لەبەر كردووەو زانستی تەجویدی خوێندووە لە مزگەوتی (أحمدی) لە (طنطا) و دواتر

کردەوانــە - کــە بــە مــوعجیزە نــاودەبرێ - شــتێك نییــە بــەپێی حوکمــە عەقڵیــەکان نەشـیاو نـەبوو بێـت، لـەم بـارەوە دەڵێـت: (مـوعجیزە ناچـێتە نـاو چوارچـێوەی ئـەو شتانەی کە بەپێی عەقڵ شیاوی بوون نین). جا پێچەوانە بوون لـە ڕێـڕەوی سروشـتی شتێکی ناسراوەو هـیچ بەڵگەیـەکیش نییـە لەسـەر ئـەوەی کـە ڕێگـری لـە بـوونی ئـەو جۆرە شتانە بکات، بەڵکو ئەمە زۆرجار دەبینـرێت لە بارودۆخی کەسـی نەخۆشـدا کـە ناتوانێت بۆ ماوەیەك خواردن و خواردنەوە بخوات کەچی ئەگەر لـەش سـاغ بوایـە بـە ئەندازەی ئەو ماوەیەش خواردنی نەخواردبایە ئـەوا دەمـرد، سـەرباری ئـەوەی کەسـی نەخۆش هۆکارێکی زیادی هەیە لەوەی زیاتر پێویستی بە خۆراك هەیە.

وتمــان ئـــەوەی بەرنامـــەو یاســـاو ڕێـــی بوونـــەوەری دانـــاوە بەدیهێنـــەری بوونەوەرەکانە، کەواتە بوونی دەراسا شتێك نین شیاوی بوون نەبن.

ئەگـەر وتـرا: پێویسـتە ئـەو کـارە دەراسـایانە پابەنـدی ڕێسـاو بەرنامەیـەکی تـری سروشــتی بــبن. پێویســتە ڕێســای تــری تایبــەت دابنێــت بــە شــتە دەراســاکان، ئــەوا ئەوپەڕی ئەو شتە ئەوەیـە کـە ئێمـە نایانناسـین و پێمـان نـەزانیوە بـەڵام شـوێنەواری ئـەو کارانـە دەبیـنین لەسـەر دەسـتی ئـەو بەندانـە کـە بەتایبـەت خـوای گـەورە هـەڵی بژاردوون بە فەزڵ و بەخششی خۆی، ئێمـەش دوای ئـەوەی باوەڕمـان بـەوە هەیـە کـە بەدیهێنەری بوونـەوەر خـاوەن توانـای ڕەهایـە و سەرپشـکە ئـەوا پێویسـتە لەسـەرمان کـە بـزانین خـوای گـەورە بـۆی هەیـە شـتێك دابێنێـت و پەیـدای بکـات مـادام شـیاوی پەیدابوونە، جا بەهەر شێوەیەك و شوێنکەوتووی هەر هۆیەك بێت، ئەگەر پێشتر لـە زانستی خوای گەورە بڕیاری لەسەر درابوو کە بەوشێوەیە بەدیبهێنێت.

---

لە ساڵی ١٢٨٢ك چووەتە (أزهر). لە ١٢٨٧ك پەیوەندی کردووە بە (جمال الدین الأفغاني) پێی کاریگەر بووە، گەشتی کردووە بۆ سوریا و ئەوروپا و لەگەڵ مامۆستاکەی (أفغانی) لە ساڵی ١٣٠١ك هەڵسان بە دەرکردنی ڕۆژنامەی (العروة الوثقی)، سەرگەرمی وانە وتنەوەو دادوەری و فەتوادان بووە و بانگەشەی کردووە بۆ چاکسازی. کۆچی دوایی کردووە لە ساڵی ١٣٢٣ك کۆچی دوایی کردووە ١٩٠٥ز.

موعجیزە پێویستە پەیوەست بێت بە تەحەداوە لەکاتی بانگەشەی پێغەمبەرایەتی و دەرکەوتنی لەو بەڵگانەی کە پێغەمبەرایەتی دەسەلمێنن بۆ ئەو کەسەی لەسەر دەستی موعجیزەکە بەرپابووە، چونکە پێغەمبەر لەو بانگەشەیەی کە ڕایدەگەیەنێت پەیامبەری خوایە ئەوا پشت بە موعجیزە دەبەستێت، جا کە خوای گەورە لەکاتی بانگەشەی پێغەمبەرەکەدا ئەو موعجیزەیەی لەسەر دەستی بەرپادەکات وەك پشتیوانیەکە بۆ سەلماندنی ڕاستی بانگەوازەکەی.

شتێکی ئەستەمە کە خوای گەورە پشتیوانی لە درۆ بکات، چونکە پشتیوانی کردنی درۆ بەڕاست دانانیەتی و بە ڕاست دانانی کەسی درۆزن درۆیە، ئەمەش ئەستەمە بۆ خوای گەورە. هەر کاتێ موعجیزە کە ئەو شتەیە لە توانای مرۆڤ بەدەرەبەدەرکەوت، دەرکەوتنەکەشی لەلایەن کەسێکەوە بوو کە بانگەشەی پێغەمبەرایەتی دەکرد ئەوا پێویستە بزانرێ ئەو کارە تەنها لەبەر ئەوە خوای گەورە بەرپای کردووە لەسەر دەستی بانگەشەکارەکە بۆ ئەوەی ڕاستی بانگەشەکەی دەربخات. و ئەگەر هەندێ کەس لەگەڵ ئەمەشدا نکۆڵی لێ بکەن[1].

٧- **وتویانە**:ئەو شتانەی پێغەمبەران هێناویانە وەك کردارەکانی نوێژ لە هەڵسان و دانیشتن و خۆچەماندنەوە (رکوع) و کرنوش بردن. و کردارەکانی حەج هەر لە هاتن و چوون لە نێوان (صفا) و (مروة) و سوڕانەوە بە دەوری بەردە ڕەشەکە و ماچ کردنی و بەردبارانکردنەکان (رمیالجمار)، ڕۆژوش بە برسێتی و تێنوێتیەکەی، هەموو ئەو شتە ناوبراوانە شتی نەخوازراو ناشرینن لەلایەن عەقڵەوە، بۆیە پێویستە ئەو کردەوانە کە پێغەمبەران فەرمانی پێدەکەن ڕەت بکرێنەوە بە ڕوویاندا و لێیان قبوڵ نەکرێت[2].

**وەڵامی ئەدەمەوە**:ئێمە نکۆڵی ناکەین لەوەی هەندێ شت هەیە لەو کردارە ناوبراوانە کە عەقڵ پەیی بە سوودەکەیان نابات واتە لە خودی کردارەکەدا سوودەکە

---

(١) رسالة في التوحيد ج ١٤/٨٠.

(٢) بڕوانە: شرح الأصول الخمسة - عبدالجبار بن أحمد.

بەدیار ناکەوێت، بەڵام ملکەچ بوون و جێبەجێ کردنی فەرمانەکانی خوای گەورە خۆی لەخۆیدا چاکن، ئەگەر ئێمەش تێبینی سودێکی تایبەت نەکەین تیایدا.

پاشان - گومان لەوەدا نییە - کە ئەو کردارانە و هاو وێنەکانیان، حیکمەتی خۆیان هەیە کە عەقڵ درکی پێ ناکات. بۆیە پێغەمبەر هاتووە تا فەرمانی پێبکات و وەك هۆکارێك بێت بۆ چاکسازی کردن لە بەدیهێنرواندا و بۆ ئەوەی ستایشی بیروباوەڕی خوا بەیەکزانین بکات و هانیان بدات بۆ خۆ ڕازاندنەوە بە بیروباوەڕی ناوبراو. زۆر شتی تریش کە بەندە بەهۆیەوە پاداشت و بەخششی دەست دەکەوێت لە دنیاو دوارۆژدا.

٨- **وتویانە**: هیچ ڕێگەیەك نییە کە بەهۆیەوە پێغەمبەر پەیام و سروش لە خوای گەورە وەربگرێت، چونکە خوای گەورە بەر هەستەکان ناکەوێت و بە چاو نابینرێت تا بەخۆی بدوێت لەگەڵ پێغەمبەر و شتی فێر بکات و پێی بدات، بەڵکو پێغەمبەر بەمە بانگەشەی پێغەمبەرایەتی دەکات کە دەنگێکی گوێ لێ بووە یان کتێبێکی بۆ دابەزیوە یاخود گوێی لە کەسێك بوو گوایە فریشتەی خوایە. جا کێ دەزانێ؟ لەوانەیە خاوەن دەنگەکە و قسەکەرەکە فریشتە یان جنۆکە یان مرۆڤ بێت کە خۆی لێ شاردبێتەوە.....

جا ڕێگەیەك نییە بۆ زانینی ئەوەی لە گەڵی دا دەدوێت خوایە، بەهەمان شێوە هیچ ڕێگەیەك نیە بۆ زانینی ئەوەی کە پەیامەکەی پێداوە، فریشتەیەکی گەورەی نزیك بارەگای خوای گەورەیە، چونکە لەوانەیە هەندێ جادووگەر و چاوبەست لەگەڵی بدوێن ... لەو کاتەشدا کتێبێکی بکەوێتە بەردەست کە گومان ببات لەلایەن خواوە بۆی هاتووە، جا ئەمە زۆر دوورە لە ڕاستی، چونکە گریمانی ئەوە هەیە کە ئەو کتێبە لە کارو دەستکردی مرۆڤ بێت و با هەڵی گرتبێت و بۆ لای ئەو هێنابێتی و فرێی دابێتە لای.

هەروەك بۆمان چەسپا کە بۆچوونی وەرگرتنی پەیام لە خوا بێ بنەما و پوچ بوو ئەوا بەهەمان شێوە بۆ ئێمە سەلما کە بۆچوونی پێغەمبەرایەتی و پەیامداری ڕاهای خوایی پوچەڵ و بێ بنەمایە.

**وەڵامی ئەدەمەوە:** چەند ڕێگەیەك هەن كە قسە بۆكراو دەزانێت قسەكەرەكە خوای گەورەیە.

لەوانە: خوای گەورە قسە بۆكراو ناچار دەكات كە خودی خۆی بناسێت و هەست بە بوونی خۆ بكات و دواتر ناچاری بكات كە خوایە لەگەڵی دەدوێت و ئەوەی گوێبیستی دەبێت فەرمایشتی خوایە.

لەوانە: خوای گەورە لە كاتی گفتوگۆدا هەواڵی غەیبی و ئەو شتانەی لە دەروونەكان دان پێی ڕادەگەیەنێت - بەتایبەتی ئەوەی لە دەروونی قسە بۆكراودایە و ئەوەی كە خۆی باوەڕی پێیەتی و هیچ یەكێك لە بەدی هێنراوان ئاگادار نین لێی - ئا لەوكاتەدا قسە بۆكراو دەزانێت كە قسەكەر خوای پەنهان زانە، چونكە پێشتر كەسەكە زانیویەتی هەواڵدان لەبارەی شتی پەنهان و ڕاست پێكان لە هەموو هەواڵدانەكان دا ئەوا بە بەدیهێنراوان ناكرێت و تەنها خوای پەنهان زانە كە زانایە بە هەموو شتەكان.

لەوانە: خوای گەورە لەوانەیە فێری قسە بۆكراوەكە (پێغەمبەرەكە) بكات كە ئەوەی قسە دەكات خوایە، ئەمەش بەوەی پێی بڵێت : (من خوای گەورەم) و بەڵگە و نیشانەش لەسەر ئەمە: (شتی بێگیان دەكەم بە زیندەوەر، دەریا دوو لەت دەكەم، دەستت سپی هەڵ دەگێرم، مردوو زیندوو دەكەمەوە...) ئا لەو كاتەدا پێغەمبەرەكە دەزانێت ئەوەی قسەی لەگەڵ دەكات خوای گەورەیە كە نیشانە و بەڵگەكان دیاری دەكات و موعجیزە دێنێتە بوون، چونكە پێشتر پێغەمبەرەكە زانیویەتی كە بەدی هێنراوان ئەو توانایەیان نییە.

لەوانە: پێغەمبەرەكە دەكرێ بزانێت ئەوەی پەیامی بۆ هێناوە فریشتەی خوایە نەوەك جادووگەر یاخود شەیتان، ئەمەش بەوەی پەیامەكە هەواڵی غەیبی و شتی هاوشێوە لە خۆی بگرێت.

سەبارەت بەو كتێبەش كە بۆ پێغەمبەرەكە هاتووە ئەوە پێویستە - تا كتێبەكە قبوڵ بكرێت - موعجیزەیەكی لەگەڵدا بێت كە لەسەر دەستی فریشتەكە ڕووبدات

و... هتد[1].

مادەم سەلمێنرا كە ڕێگە هەن بۆ وەرگرتنی پەیام لە خوای گەورە، ئەوا بەهەمان شێوە پێغەمبەرایەتی و پەیامداریش سەلمێنرا.

٩- **وتویانە**: لە كۆنەوە وتراوە كە مرۆڤ خۆی دەتوانێت تەنها بەس بە عەقڵی خۆی كاروباری ژیان و گوزەرانی ڕێكبخات و پێداویستیە سەرەكیەكانی دابین بكات، هەروەك لەم دواییانەشدا وتراوە: كە مرۆڤ تەنها بە زانست دەتوانێت لایەنەكانی ژیانی ڕێكبخات، هۆكارەكانی بەختەوەری و ئاشتی دابین بكات.

**وەڵامی ئەدەمەوە**: ئێمە نكۆڵی ناكەین لە گرنگی و بایەخی زانست لە ژیانی خەڵكیدا، چونكە زانست ڕابەرو سەركردەی ژیار و پاڵنەری بەرەو پێشچوون و گەشەسەندنە...، زۆرێك خزمەتگوزاری پێشكەش كردووەو پێشكەشیشی دەكات بۆ مرۆڤایەتی.

بەڵام ئێمە دەڵێین: تەنها زانست بەس نییە بۆ بەختەوەر كردنی مرۆڤایەتی و ڕێكخستنی سەرجەم لایەنەكانی ژیان و دابین كردنی پێداویستیەكانی، جا سەرباری گەشە سەندنی زانست و فراوان بوونی ئاسۆكانی و بەخشش و خزمەتە زۆرەكانی ئەوا هێشتان هەر لە بێشكەدایە و بچوكە زۆر زۆری ماوە بۆ ئەوەی كامڵ ببێت و تەواو پێ بگات تا ئەوكاتەی كە شایەنی ئەوە بێت كە پێی بوترێت: زانست دەتوانێت سیستەم و یاسایەكی تەواو و كامڵ دابنێت بۆ ژیانی مرۆڤایەتی. هێشتان زانست - بە دان پێدانانی پێشەنگەكانی زانست و هزر - دەستەوەسانە لە ئاشكرا كردنی زۆرێك لە نهێنیەكانی بوونەوەرو مەتەڵەكانی ژیان...، پاشان زۆربەی بۆچوون و ڕاكانی گوماناوی و نزیكخەرەوەن (تقریبی)ن، شتانێك هەبوون دوێنێ چەسپاو بوون كەچی ئەمڕۆ جێگای گومانن یاخود دەركەوتووە كە هەڵەیە.

د. بول كلارنس أبرسولا[1] دەڵێت:

---

(١) زیاتر لەم بارەوە دەدوێین لەكاتی خستنەڕووی بابەتی سروش و چۆنیەتیەكەی.

لـە سـەرەتای لێكۆڵینـەوە زانسـتیەكانم زۆر سەرسـامی بیركردنـەوەی مرۆیـی و هێزی شێوازەكانی زانستی ببووم بەشێوەیەك كە وای لێكردبوم تـەواو متمانـەم ببێـت بە توانای زانستەكان لە چارەسەر كردنـی هـەر كێشـەیەك لـەو بوونـەوەرەدا، تەنانـەت چارەسەر كردنـی بابـەتی سەرچاوەی ژیـان و عـەقڵ و پـەیی بـردن بـە مانـای هـەموو شـتێك. كـاتێ زانسـتم زیـادبوو و شـتەكانم زیـاتر ناسـین هـەر لـە گەردیلـە تـا گەلـە ئەستێرە و لە وردە زیندەوەر (میكرۆب) تا مـرۆڤ، لـەو كاتـەدا بـۆم دەركـەوت كـە زۆر شت هـەن زانسـتەكان تـا ئـەمڕۆ نـەیان توانیـوە تەفسیرێكی بـۆ بدۆزنـەوە یـان پـەردە لەسەر نهێنیەكانی لابدەن.

مامۆستا (ولیم جیمس)[2] وتویەتی:

ئـەو زانسـتەی ئێمـە تـەنها خاڵێكـە، كەچـی نـەزانینمان دەریایـەكی زۆر گەورەیـە، تەنها شتێك كـە دەكرێـت بـە كـەمێك پشـت ڕاسـتیەوە بوترێـت ئەوەیـە: ئـەو جیهانـە زانیارییـە سروشـتیەی ئێسـتای ئێمـە دەوردراوە بـە جیهـانێكی لـەو فـراوانتر كـە لـە جۆرێكی ترە، كە پەییمان نەبردووە بە پێكهاتە تایبەتیەكانی.

زانای بلیمەت (أنشتاین) وتویەتی:

... زانسـت هـەواڵی ئـەوەمان پێـدەدات كـە دەبێـت. بـەڵام تـەنها سروشـە كـە ئـەو هەواڵەمان پێدەدات كە پێویستە چی ببێت.

بێگومـان پێشـكەوتنی زانسـتی ئـارامی و بەختـەوەری بـۆ مرۆڤایـەتی دەسـتەبەر ناكات ئەگەر هاوشان نەبێت لەگەڵ پێشكەوتنی ڕەوشـتی و دەروون بـەرزی و ئـارەزوو

---

(١) مامۆستای سروشتی زیندەییە، بەڕێوبەری بەشی هاوتاكان و هێزی گەردیلەیی (النظائر و الطاقة الذرية) لە كارگەكانی (أوك ريدج)، ئەندامی كۆمەڵەی لێكۆڵینەوەی ناوكیەكان و سروشتی ناوكییە (النووية).

بڕوانە: جون كلوفر مونسما/ الله يتجلى في عصر العلم ٣٦.

(٢) مامۆستایە لە زانكۆی (هارفارد)، لە كتێبی:(ارادة الاعتقاد)، وەریگرتووە لە: سید مهدی سەرچاوەكەی: (أصول العقيدة في النبوة ٧).

ڕێـك و پێـك نــەکرێن و هەوەســەکان کـپ نــەکرێن، خۆشەویسـتی مرۆڤایـەتی بڵـاو نەکرێتــەوەو هەسـت نــەکرێت کـە ئەرکـە و قوربـانی نــەدرێت لـە پێنـاو چـاکە و بەختەوەریەکەی.

شـتێکی ڕوونـە کـە ڕازاندنـەوەی تاکـەکان بـەم سیفەتانە و بڵاو بوونـەوەی ئـەم سـیفەتانە لـەناو کۆمەڵگـەی مرۆڤایەتیـدا لـە کـاری زانسـت و پێداویسـتیەکانی نییـە، بەڵکو ئەمـە - بـەبێ گومـان - لـە دەرەنجام و کاریگەرییـەکانی سـروش و بـاوەڕ بوونـە بەخوای گەورە.

مامۆستا (کریس موریسون)[1] وتویەتی:

پێشــکەوتنی مــرۆڤ لەلایــەنی ڕەوشــتی و هەســت کردنــی بــە ئەرکــەکانی، شـوێنەوارێکە لـە شـوێنەوارەکانی بـاوەڕ بـوون بـەخوا و بـە نـەمری. بێگومـان ئـەو دینداریـیـە زۆرە کـە هـەوڵی ئاشـکرا کردنـی ڕۆحـە و بـەرز کردنەوەیـەتی هـەنگاو بـە هەنگاو تا هەست بە پەیوەندی بکات لەگەڵ خوای گـەورە... و سـەنگینی و ڕێـزداری و جـوامێری و شـکۆداری و ... هــەموو ئەوانــەی بــە سـیفەتە خواییــەکان نــاودەبرێن سەرچاوە ناگرن لە بێ دینی و بـێ بـاوەڕی، بێگومـان بـێ بـاوەڕی تـەنها ڕووخسارێکی سەرسوڕهێنە لە ڕووخسارەکانی تاك، کە مرۆڤ لە جێگای خوادا دادەنێت.

بێگومــان بــەبێ بــاوەڕ شارســتانیەت مایــەپوچ و مــوفلیس ئــەبوو، گێــژاو و ئاژاوەچــێتی جێگــرەوەی سیســتەم دەبــوو، هــەر ڕێکخــەرێك و هــەر هــەوڵێك بەفیڕۆدەچوو، خراپە و شەڕ جیهانی دادەگرت...

شتێکی تێبینی کراوە کە ئەو پێشکەوتنە زانستییە - چـەندین شـتی دەراسـای بـۆ مــرۆڤ دەســتەبەرکرد کــە پێشــتر نــەبووەو خەونیشــی پــێ نــەبینیوە - ئــەوا هاوشــان

---

(١) سەرۆکی پێشووی ئەکادیمیای زانستییە لە نیۆیۆڕك، ئەندامی دەستەی جێ بەجێکاری ئەنجومەنی لێکۆڵینەوەی نەتەوەییە لە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا، هاوکات ئەندامە لە مۆزەخانەی مێژووی سرووشتی ئەمریکی. سەیری کتێبە بەپێزەکەی بکە بەناوی: (الانسان لایقوم وحده) کە ناونیشانەکەی بەو شێوەیە وەرگێڕدراوە (العلم یدعو للایمان ٢٠٥).

نــەبوون لەگــەڵ بەرزبوونــەوەو گەشــەی ڕەوشــتی. بــەڵكو بەپێچــەوانەوە تێبینــی ئەوەدەكـەین كـە ئـەو نەتـەوەو ئوممەتانـەی پێشكەوتوون لـە ڕووی زانسـتی و ژیـاری ئــەوا دەنــاڵێنن لــە قــەیرانی خنكێنــەردا لــە بــێ دینــی و بــێ ڕەوشــتیدا و دەبیــنین سەرســامە لــە گومڕاییەكەیــدا، ڕۆچــوونە لــە زەلكــاوی هەوەســبازی و تاوانباریــدا، تاكــەكانی بــەڕەڵایی و خراپــەكاری و لادانــی سێكســی و ژیــانی ڕووت و قــوت و بــێ بەندوباریان هەڵبژارد، حكومەتەكانی ئـەو ئوممەتانـە پێشبڕكێیان كـرد لـە داهێنـانی چــەكی كۆمــەڵكوژی ڕەگــەزی مرۆیــی و چــەندین شــێوازو هونــەریان گرتەبــەر لــە كۆیلەكردنی نەتەوە لاوازەكان و بردنی سەروەت و سامانیان، ئەمـەش جـەخت لەسـەر ئــەو وتەیــە دەكاتــەوە كــە وتمــان زانســت بەتــەنها دەستەوەســانە لــە بــەدیهێنانی بەختــەوەری مرۆڤایــەتی و ڕێكخســتنی كاروبارەكـانی ژیـان و گـوزەرانی، پێویسـتیەكی زۆر هەیە بە فیكری ڕۆحی كە بەرهـەم و شـوێنەوارێكە لـە شـوێنەوارەكانی سـروش و باوەڕ.

زانای بلیمەت (كامبل فلامریون) وتویەتی:

بە ئاشكرایی شتێكی دژیەك و تێكگیراوە كـە وا بـڕوانین ئـەو گەشـەی زانسـتییە و ئەو سەركەوتنە یەك لەدوای یەكانەی مرۆڤ لە سروشـتدا نمونـەی نیـە لـە مێـژوودا... سەرباری ئەوەی عـەقڵەكانی ئێمـەی بـەرز كردۆتـەوە بـۆ پلـە بـەرزەكان ئـەوا لەهـەمان كاتـدا مرۆڤایـەتی ئێمـەی دابەزانـدووە بـۆ كـەمترین و نـزمترین دەروازەكـان، شـتێكی خەماویە كاتێك هەست دەكەین بە گەشەی هێـزی خۆمـان ڕۆژ لـە دوای ڕۆژ... كەچـی گەرمایەتی هێزمان كز ببێتەوە و گـۆڵی ژیـانی دەروونیمـان بپوكێتـەوە بـە كاریگـەری ئارەزووە مادییەكان و ئارەزووە جەستەییەكان[1].

زانای بلیمەت (ماكس نوردو) وتویەتی:

مرۆڤایـەتی ئەكۆڵێتـەوە لـە زانسـت و بەختـەوەری و ڕەنجـیش لـەوپێناوە ئـەدات، بەڵام مرۆڤایەتی لە هیچ سـەردەمێك لـە سـەردەمەكان بـە ئەنـدازەی ئـەو سـەردەمەی

(١) الاسلام في عصر العلم ٢٨٣ له: سيد مهدى صدر/ أصول العقيدة في النبوة ٢٩.

ئێستا نەحەساوەتەوەو خۆشگوزەران نەبووە، بەڵێ زانست و ژیاریی لەهەموو شوێنێك بەردەوام لە بڵاو بوونەوەدایە، هەر ڕۆژێكیش شتێكی نوێی ئاشكرا دەبێت كە زیاتر گونجاوی گۆی زەوی بۆ نیشتەجێ بوون بەدەردەخات، ناخۆشیەكانی ژیان كەمتر دەسەڵاتی هەیە بەسەر دەرووندا، بەڵام سەرباری فەراهەم بوونی مەرجەكانی بەختەوەری و خۆشگوزەرانی ئەوا دەبینین مرۆڤایەتی زیاتر وەڕس و پەژارەیە و هۆشی شڵەژاوە[1].

ئەگەر واش دابنێین زانست پاش پێگەیشتی و گەیشتنی بە قۆناغی كامڵ بوون كە دەتوانین بەختەوەری بۆ مرۆڤایەتی دابین بكات و كاروبارەكانی گوزەرانی ڕێك بخات. بەڵام شتێكی گومان هەڵنەگرە كە زانست ناتوانێت زاڵ بێت بەسەر دەروونی مرۆیی هەروەك چۆن پێغەمبەرایەتی و یاسا خواییەكان بەسەریدا زاڵ دەبن، بۆیە پێغەمبەرایەتی دەسەڵات و ڕۆڵە سەرەكیەكەی هەر دەمێنێت پاكسازی كردن بۆ دەروون و كپ كردنی لاسارییەكانی و ئاراستەكردنی بەرەو خێرو چاكە و خۆشەویستی و ئاشتی.

خوای پاك و بەرز فەرموویەتی: ﴿ وَتَعَاوَنُواْ عَلَى ٱلۡبِرِّ وَٱلتَّقۡوَىٰ ﴾ المائدة: ٢. واتە: (یارمەتی و كۆمەكی یەكتر بكەن لەسەر چاكە و خواناسی). و پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: ((لا يؤمن أحدكم حتى يحب لأخيه ما يحب لنفسه)) واتە: هیچ یەكێك لە ئێوە باوەڕی تەواو نابێت تا چی بۆخۆی پێ خۆشە بۆ براكەشی پێ خۆش نەبێت. بەهەمان شێوە پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: ((خير الناس مَن نفع الناس)) واتە: باشترین كەس لەناو خەڵكدا ئەوەیە كە چاكە و خێری هەبێت بۆ خەڵك. هەروەها فەرموویەتی: (لن تنالوا البر حتى تحابوا) واتە: ناگەن بە پلەی چاكەكاری تا یەكترتان خۆش نەوێت.

١٠- **وتراوە:** عەقڵی مرۆڤ و زانستی هاوچەرخ پێویستیان بە ڕێنمایی و

(١) لماذا أؤمن بالقرآن الكريم و بمحمد ٣٩٣ - الهلال على هلال.

هیدایەتی پێغەمبەرایەتی نیە، تەنانەت دەشتوانن ژیانێکی بەختەوەرو ئارام بۆ مرۆڤایەتی فەراهەم بکەن. وتراوە کە یاساو ڕێسا دەستکردەکانی مرۆڤ سەرچاوە دەگرێت لە نیگای ئەزموونەکەیی و پێویستیە بەردەوام بەرەوپێش چووەکەی، بەمەش پێویستی بە هیدایەتی پێغەمبەرایەتی نییە و مرۆڤایەتی بێ نیاز دەکات.

**وەڵامی ئەدەمەوە:**

١- زاڵ بوونی یاسا دەستکردەکانی مرۆڤ بەسەر دەروونی مرۆڤایەتی زۆربەی کات زاڵ بوونێکی ڕووکەشیەو بەس، تەنانەت جێبەجێ کردنی ئەم یاسا دەستکردانەش لەلایەن تاکەوە بەشێوەیەکی ڕووکەشی دەبێت تا کاتێ دێت و لێی ڕادەکات و خۆی لێ ڕزگار دەکات، جا هەر کاتێك تاك توانی لێی ڕابکات و خۆی لێ ون بکات یان یاری پێ بکات، ئەوا زۆر دەگمەنە یاسا دەستی پێ بگات، چونکە یاسا دڵ و دەروونەکان ناناسێت و پەیی پێنابات، تەنانەت چەندین تاوانی ڕووپۆش و دەمامکدار هەن کە چاوی یاسا نایان بینێت و تاوانکارەکانیش زۆر بە ئاسانی ساختەی دەکەن. خەمیش لەسەر تاوانەکە ناخۆن بەڵکو زۆرێکیان دەنازێت بە تواناکانی و لێهاتووەکانی لەبواری ساختەکاری و خۆدزینەوە لە دەستی سزاو دەسەڵاتی یاسا.

لە کاتێکدا یاسا ئایینیەکان دەسەڵاتی هەیە بەسەر لایەنی دەروونی کەسی دیندار و زاڵ دەبێت بەسەر دڵ و هەستەکانیدا، ئایین بە دەرو و دەروون (ظاهر وباطن) جێبەجێ دەکات، چونکە بڕوای وایە کە دانەری ئایین و داڕێژەی یاساکانی: ﴿ يَعۡلَمُ خَآئِنَةَ ٱلۡأَعۡيُنِ وَمَا تُخۡفِي ٱلصُّدُورُ ﴿١٩﴾ ﴾ غافر: ١٩. واتە: (ئەو خوایە هەمیشە چاوە خیانەتکار و ناپاکەکان دەناسێت و دەزانێت چی لە دڵ و دەروون و سینەکاندا حەشاردراوە).

جێبەجێ کردنی یاساکانی ئایین هۆی ڕەزامەندی و بەخششی خوایە، لەبەرامبەردا سەرپێچی کردنی هۆیە بۆ توڕەیی و سزاکەی.

بەشێوەیەك کە ئەگەر تاکی دیندار هەڵسوکەوتی کرد بە پێچەوانەی یاسا ئایینیەکان، ئەوا دەبێتە هۆی دوو ئاراستەیی لە کەسایەتیەکەیدا و ململانێ دێتە

كایه لەناو دەرونیدا، چونكه بیروباوەڕ و ڕەفتارەكەی یەك ناگرێت، بۆیە لە كاتی ئەنجامدانی تاوانەكە، هەست بە ئێش و ئازار و پەشیمانی و خەمباری دەكات لە دەروونیدا، چونكه بەپێچەوانەی ئامۆژگاری و ڕاسپاردەكانی ئایینەكەی هەڵسوكەوتی كردووە، هەر چەندە ئەو تاوانەشی لە شوێنی تاریك و پەناگەدا ئەنجام دابێت یان بەشێوەیەك هیچ كەسێك نەی بینیبێت یاخود پشبینی كردبێت كە كەس نای بینێت. و تەنها كورت نابێتەوە لە پەشیمان بوونەوە لەسەر تاوان یاخود ئازار خواردنی دەروونی - ئەمە بەپێی خۆیی و ناكرێت زیادەڕووی لە ئەندازە كردنی بایەخ و نرخەكەیدا بكرێت - بەڵكو خاڵی هەرە گرنگ كە هەر ئەوەشە مەبەستمان بریتیە لە ڕاستگۆییڕاگەیەنەر (الموحي) بەوەی هەست و سۆز و یەكاویەكە لەگەڵ جۆری هەڵسوكەوت، ئەگەر وانەبوایە ئەوا مرۆڤ دووڕوو دەردەچوو، باوەڕی ڕاست و دروستی لە دەست دەچوو. ئایین بەهیچ شێوەیەك ڕێز لە تاكی دووڕوو ناگرێت، تەنانەت پلەی خراپترو لەخوارترە لە كەسی بێ باوەڕو كافری سەركەش... بێگومان شتێكی سەرسوڕهێنیش كاتێك قورئانی پیرۆز كەسی دووڕوو دەخاتە[1] ﴿ إِنَّ ٱلْمُنَٰفِقِينَ فِى ٱلدَّرْكِ ٱلْأَسْفَلِ مِنَ ٱلنَّارِ ﴾ النساء: ١٤٥. واتە: (لە چینی هەر خوارووی ناو دۆزەخدان).

٢- یاسا دەستكردەكان ڕەنگ ئەبن و كاریگەر ئەبن بە ڕاو میزاجی یاسادانەرەكە و بارودۆخی تایبەت و ئاراستە كەسی و چینایەتی و هزریەكانیان.... ، تەنها ئەوەش بەسە كە یاسا دەستكردە باوەكانی ئێستا بە نمونە بهێنرێتەوە لە كاریگەر بوون بە ململانێ و تێكگیران.

سیستەمی شیوعی دژی سیستەمی سەرمایەدارییە، تەنانەت دوژمنایەتیشی دەكات، هەوڵیش دەدات لەباری بەرێت و لەناوی ببات و هەڵوێستی سەرمایەداریش هەمان شتە لە بەرامبەریدا.

سیستەمی دیموكراسی دژی سیستەمی تاكڕەوی (دیكتاتۆری)یە، بەهەمان شێوە

(١) بڕوانە: الدین المقارن ٧٩، ٨٠ - د. محمد كمال ابراهیم جعفر.

تێڕەوانینی سیستەمی تاکڕەویش لەبەرامبەریدا هەمان شتە. و کامە زاڵ ببێت لە دانەرانی ئەم سیستەمانە ئەوا خۆی بەرنامە ڕێژی دەکات بەپێی هەوەس و ئارەزوو و بەرژەوەندیەکانی.

بۆیە جیهان دابەش بووە بۆ چەندین پێڕو کوتلە و حیزب کە بەشێوەیەکی وا بەگژ یەکتردا دەچن کە هۆشداری لەناوچوون ئەداتە مرۆڤایەتی[1].

له کاتێکدا کە سەرچاوەی یاساکانی ئایینی و ئامۆژگارییەکانی پێغەمبەرایەتی، بریتیە لە خوای بەدیهێنەری مرۆڤ، کە خاوەن و تواناو زانایە، شارەزایە بە واقیعی مرۆڤ و نهێنییە دروونی و جەستەییەکانی و ئەو شتانەی کە سوود یان زیانی پێدەگەیەنن. و چ شتێك دەبێتە هۆی بەختەوەری یان بەدبەختی لە هەموو لایەنەکانیدا چ ڕۆحی چ ماددی و چ دونیایی چ دوارۆژیی، خوای گەورە چینێك یان کۆمەڵێك بە پلەی بەرزتر دانانێت لە چین و کۆمەڵێکی تر، بەڵکو خوای هەموو مرۆڤەکانە و هەموو مرۆڤەکانیش لەلای ئەو وەك یەکن و جیاواز نین، تەنها بە کردەوەی چاك نەبێت[2].

خوای پایەبەرز فەرموویەتی:﴿ إِنَّ أَكۡرَمَكُمۡ عِندَ ٱللَّهِ أَتۡقَىٰكُمۡ ﴾ الحجرات: ١٣. واتە: (بەڕاستی بەڕێزترینتان لای خوا ئەو کەسانەتانە کە زۆرتر لە خواترسە). و پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: (الناس سواسية كأسنانِ الْمُشط) واتە: مرۆڤەکان یەکسانن وەك ددانەکانی شانە.

مامۆستاکەمان (د. دراز) لە ژێر ناونیشانی (ئەرکی ئایینەکان لە کۆمەڵگەدا) دواوە لەسەر پێویستی هەبوونی یاسایەك کە پەیوەندی تاکەکان ڕێك بخات و ئەرك و مافەکانیان دیاری بکات. ئەوەی ڕوون کردۆتەوە کە یاسای دەستکرد و زانستەکان، بەتەنها ناتوانن ژیانێکی بایەخدار بۆ کۆمەڵگای مرۆڤایەتی دابین بکەن، پاشان تایبەتمەندی و خاسیەتەکانی دینداری ڕوون کردۆتەوە لەوەی دەتوانێت ڕێزی

(١) أصول العقيدة في النبوة ٣٢، ٣٣.

(٢) بڕوانە: هەمان سەرچاوە ٢٣، ٣٣.

یاساکان فەراهەم بکات و تاکەکان ئاراستە بکات بەرەو چاکسازی کردن لە کۆمەڵگادا.
و فەرموو ئەوە تۆ و ئەوەش وتەکەی[1] :

پێویستیمان بەوە نیە هۆشداری بدەین کە ژیانی کۆمەڵی ساز نابێ تەنها بە (یارمەتی نەبێ) لە نێوان تاکەکانی، ئەو یارمەتیەش تەنها بە (یاسا) دەبێت بۆ ئەوەی پەیوەندی تاکەکان ڕێکبخات، ئەرك و مافەکانی دیاریی بکات، ئەو یاسایەش پێویستی هەیە بە (دەسەڵاتێك)ی داماڵەری ئاراستەکار، کە پارێزگاری بکات لە ڕێزو شکۆی یاسا لە دەروونـدا و ڕێ نەدرێت بە شکاندنی سنورەکانی. ئەمانە هەموویان بنەمای دانپێدانراون، دووبارە قسەکردن لەسەری بێزارکەرە.

ئایا ئەرکی سەرەکی ئەم دەسەڵاتە داماڵەرو ئاراستەکارە: چییە؟ جا ئەوەی دەمانەوێ بیسەلمێنین لەو بەشەی لێکۆڵینەوەدا، بریتیە لەوەی لەسەر ڕووی زەوی دا هێزێك نییە هاوتا بێت لەگەڵ دینداری یان هاوتا بێت لەگەڵیدا لە دەستەبەرکردنی ڕێزی یاسا و گرەنتی پابەند بوونی کۆمەڵگا پێیەوەو خۆڕاگری سیستەمەکەی و پێکەوە لکاندنی هۆکارەکانی بەختەوەری و ئارامی. نهێنی ئەمەش ئەوەیە کە مرۆڤ جیاوازە لە هەموو بوونەوەرە زیندووەکان بەوەی ئەو جوڵەو ڕەفتارانەشی کە سەرپشکە تیایاندا شتێك ئاراستەی دەکات کە نەبینین و نەبیستنی مرۆڤەکە خۆی پەیی پێی نابات و دەستی ناختە ناودەستی یاخود دەستی ناخاتە گەردەنیەوە...، بەڵکو ئەمە واتای مرۆڤی ڕۆحانییە، کە ناوەکەی (هزرو بیروباوەڕە).

گەلانێك گومڕا بوون، کاتێك ئەمەیان ژێراو ژوور کرد، بەوەی بۆ ئەوەچوون کە هزرو ویژدان کاریگەر نین لەسەر ژیانی ماددی و ئابووری بەڵکو پێی کاریگەر دەبن.

بەر لەهەموو شت ئەم بۆچوونە هێنانە خوارەوەی مرۆڤە لە تەخت و عەرشی ڕێزەکەی و گەڕاندنەوەیەتی بۆ دۆخی ئاژەڵی. دواتر ئەم بۆچوونە وێنەکردێکی هەڵگەڕاوەیە بۆ ئەو ڕاستی و حەقیقەتانەی کە بینراون لە ڕەفتاری تاك و

---

(١) الدين - بحوث ممهدة لدراسة تأريخ الأديان ١٠١، ١٠٢.

كۆمەڵەكان لە هەموو سەردەمێكدا، جا بۆ ئەوەی مرۆڤ بەشێوەیەكی ماددەگەرا ژیانی بگوزەرێنێت كە هیچ پەیوەندی نیە بە دڵ و ڕۆحەوە، ئەوا پێویستە لە زووەوە قەناعەت بەخۆیان بكەن كە بەختەوەریان لەم جۆرە ژیانەدایە، جا لەم جۆرە ژیانەی ناوبراودا مرۆڤ ونبووە چ بە هزر (فكر)ێكی دروست یان پوچ و نادروست. ئینجا ئەگەر مرۆڤ بیروباوەڕەكەی چاك بوو هەموو شتێكی چاك دەبێت، ئەگەر خراپیش بوو هەموو شتێكی خراپ دەبێت.

بەڵی مرۆڤ لە دەروونیەوە ئاراستە دەكرێت نەوەك لە ڕووكەشیەوە، یاسای كۆمەڵەكانیش و تەنانەت دەسەڵاتی حكومەتەكانیش بەس نین بۆ بنیاتنانی ژیارێكی چاك كە تیایدا ڕێز لە مافەكان بگیرێت و ئەركەكان وەك خۆیان جێبەجێ بكرێن، جا ئەوەی ئەركەكەی جێبەجێ دەكات لە ترسی قەمچی یان بەندیخانە یاخود سزای دارایی ئەوا هەر كاتێك هەستی كرد ڕزگاری دەبێت لە دەستی یاسا ئەوا ئەركەكەی فەرامۆش دەكات.

هەڵەیەكی ڕۆشنە ئەگەر واگومان ببەین كە تەنها بە بڵاوكردنەوەی زانستەكان و ڕۆشنبیری دەتوانین ئاشتی و خۆشگوزەرانی دەستەبەر بكەین، تەنانەت جێگرەوەی ئەو پاكسازیەیە كە ئایین بۆ دەروون و ڕەوشت دەیكات، پێویستە بزانین كە زانست چەكێكی دوو سەرە: دەگونجێ كاری ڕووخاندن و لەناوبرنی پێ بكرێت، هەروەك چۆن دەكرێ كاری بنیاتنان و ئاوەدان كردنەوەی پێ بكرێت. پێویستە زانست بەچاكی بەكار بهێنرێت لەلایەن چاودێرێكی ڕەوشت بەرز بۆ ئەوەی خزمەتی مرۆڤایەتی و ئاوەدان كردنەوەی زەوی پێ بكرێت، نەوەك خراپە و تاوانكاری بەهۆیەوە بڵاو بكرێتەوە.

ئەو چاودێرە بیروباوەڕو ئیمانە.

بەڵام ئیمانیش دوو جۆرە:

یەكەمیان: ئیمانێكە بەهۆی چاكەكاری و ڕێزی مرۆڤایەتی و شتە چاكەكانی هاو شێوەیان كە دەروونە بەرزەكان بەچاكی دەزانن، جا ئەم ئیمانە هاوتایە لەگەڵ ئەم دەروونە پاكە لە سەرپێچی كردنی داواكارییەكانی دەروون، ئەگەر ئەو دەروونە

پارێزراو بێت لە كاریگەری دەرەكی و پێكهاتە مادییەكان.

دووەمیان: باوەڕ بوونە بە زاتێكی بەرزی خاوەن شكۆ، كە چاودێرە بەسەر نهێنییەكان و یاسا دەسەڵاتەكەی لە فەرمان و ڕێگری (أمر و نهی) زاتی ناوبراو بەدەست دێنێت و هەست و جۆش و خرۆشەكان گڕ دەگرن بە ژیان وەرگرتن لەم زاتە یان بەخۆشویستنی یاخود لێ ترسانی.

گومان لەوەدا نییە كە جۆری دووەم دەسەڵاتی بەهێزترە بەسەر دەروونی مرۆڤەكان و زیاتر بەرگری دەكات لەبەر دەم گەردەلولی هەواو هەوەس و ئارەزووەكان و خێراتر دەچێتە ناو خەڵكی تایبەت و گشتی.

لەبەر ئەمە دینداری چاكترین دەستەبەركار بووە بۆ هاتنە كایەی هەڵسوكەوت لە نێوان خەڵكی لەسەر بنەمای دادپەروەریدا، بۆیە دینداری پێویستیەكی كۆمەڵایەتی بوو، هەروەك چۆن بریتیە لە فیترەتی مرۆڤایەتی.

ئەمانەی خرانەڕوو، دیارترین بەڵگەی ئەوانەبوون كە نكوڵیان دەكرد لە پێغەمبەرایەتی و پەیامبەرایەتی خوایی سەرباری ئەوەی باوەڕیشیان هەبووە بە بوونی خوای گەورە و بە هەموو ئەو سیفەتە تەواو و كامڵانەی كە عەقڵ پەیی پێدەبات، تەنانەت پابەندیش بوونە بە هەموو ئەو هەڵسوكەوت و چاكانەی كە عەقڵی مرۆیی بۆی چووەو خۆشیان دوور گرتووە لە هەموو خراپە و ڕەفتارێكی نزم. و ئاماژەشم كرد بۆ هەندێ گومان كە ماددەگەراكانیش دەیخەنەڕوو وەك بێ نیازی و پێویست نەبوون بە هیدایەتی پێغەمبەرایەتی بەهۆی بوونی زانست و یاسا.

بۆت ڕوون بووەوە كە عەقڵی مرۆڤەكان وەك یەك نین لە ناسینی خوای گەورەو ناسینی ژیانی دوای ئەم ژیانە.

بەهەمان شێوە یەكسان و وەك یەك نین لە دیاری كردنی كاری چاك و خراپ لە ژیانی دونیادا، تەنانەت عەقڵ لە توانای دانیە كە مرۆڤ بگەیەنێتە ئەو شتە و پلە بەرزانەی كە بەختەوەری دەستەبەر دەكەن لە ژیانی ئەم دونیایە، ناشتوانێت زانیاری پێویست لەبارەی ژیانی دواڕۆژ پێشكەش بە مرۆڤ بكات، سەرباری ئەوەی عەقڵ باوەڕیشی هەیە بەبوونی دواڕۆژ. زانست و یاسا كە هەردووكیان شوێنەوارێكن

لە شوێنەوارەکانی عەقڵی مرۆیی ئەوا ناتوانن دەستەبەری بەختەوەری بکەن بۆ مرۆڤایەتی ئەگەر نووری سروش و نیگا و یاسا و ڕێسا ئاسمانیەکانی لە پشت نەبێت. هەر لەبەر ئەمەش بوو وتمان: مرۆڤ ناتوانێت تەنها پشت بە عەقڵ و دەروونی خۆی ببەستێت لە ناسینی ئەو شتانەی کە پێویستە بیانناسێت، بەڵکو پێویستی بە یارمەتیدەرێك هەیە لە دیاری کردنی جۆری ئەو کارانەی کە بەختەوەرییەکەی پێیەوە بەندە. و پێویستیشە ئەو یارمەتیدەرە لە ڕەگەزی خۆی بێت (واتە مرۆڤێکی وەك خۆی بێت) تا لەو شتانە بگات کە یارمەتیدەرەکە دەیکات یان لەبارەیەوە دەیکەن، کە ئەو یارمەتیدەرەش پێغەمبەرە.

بەپوختی پێغەمبەر لە ناو ئومەتەکەیدا نمونەیەکی بەرزە، کە خەڵکی شوێنی ئەکەون و لاسایی ئەکەنەوە لە هەموو گوفتارو کردارێکی. ناوبراو خەڵکی ڕزگار دەکات لە تاریکیەکانی نەزانی بۆ نوورو ڕووناکی زانست و زانیاری، بەمەش ئەو پەیامە چاکسازی و هیدایەت ئامێزەی تەواو ئەبێت کە هێناویەتی.

پێشەوا (محمد عبده) لە کتێبەکەیدا (رسالة في التوحيد)[1] بەڵگەی هێناوەتەوە لەسەر دروستی پێغەمبەرایەتی و پەیامبەرایەتی خوایی و مرۆیی بەگشتی و تەنانەت بەڵگەی هێناوەتەوە لەسەر ئەوەی بە کرداری پێغەمبەرایەتی و پەیامبەرایەتی هەبووەو شتێکی زۆر پێویستیشە بۆ ڕێنمایی و هیدایەتی مرۆڤایەتی و ڕاستە ڕێ کردنی. ئەمەش دەقی وتەکەی:

ئایا لە دانایی و کار لەجێی خوای بەدیهێنەر نییە کە کاروباری مرۆڤی ڕاگرتووەو فێری گوفتارو ئاخاوتنی کردووە بۆ لێك تێگەیشتن و ڕەوانە کردنی کتێب، تا لە ناو پلەی دەروونی مرۆڤەکاندا پلەیەك دابنێت بە بەخشندەیی و میهری خۆی بۆ هەندێ لەو کەسانەی هەڵیان دەبژێرێت لە بەدیهێنراوانی، هەر خوا خۆیشی زاناترە پەیامەکەی خۆی چۆن و بەکێ ڕەوانەی ئەکات؟

خوای گەورە ئەو کەسە هەڵبژێردراوانە جیایان دەکاتەوە بە فیترەتی پاك و

(١) چاپی چواردەهەم ٨٨-١٠٠.

ڕۆحەکانیان بەرز دەکاتەوە بۆ ئەو پلانەی کە بەرزو کامڵن تا لەوێ تیشکی زانستی خوایان بەربکەوێت و ببنە ئەمیندار بەسەر نهێنیە شاراوەکەی، بەشێوەیەك کە ئەگەر ئەو دەرکەوتنەی بۆ جگەلە پێغەمبەران بۆ کەسانی تر هاتبایە کایە، ئەوا دەروون و عەقڵی مرۆڤەکە پرش و بڵاو دەبوو نەدەما، بەهۆی گەورەیی و شکۆداری خوای تاك و پاك.

جا ئەوانە (مەبەستی پێغەمبەرەکانە[1]) بە ڕەزامەندی خوا ئاگادار دەبن لە بەشێك لە نهێنیەکانی خودا، دەزانن لە ئایندەدا چ ڕوودەدات لە کاروباری خەڵك، ئەوانە لە پلەو پایەکانیاندا لە ئاست جیهانیان هەر لە بەرز بوونەوەدان، کۆتایی ئامادەبووان و سەرەتای نەهاتووەکانن، لە دونیا دان کەچی لە دانیشتوانەکەی ناچن و نوێنەری دواڕۆژن بەجلێکی جیا کە لە جلی دانیشتوانەکەی ناچێت.

پاشان فەرمانیان لە خوای گەورە پێدەگات یان دەدوێن لەبارەی شکۆی خوای گەورە و ئەو شتانەی کە تایبەتن بەخوای گەورە، لەهەمان کاتدا شاراوەن لە عەقڵەکان و ئەو شتانەی دیاریکراوە کە وەك دەروازەیەکن بۆ بەختەوەری ژیانی دواڕۆژیان و ئەو شتانە بۆ خەڵکی ڕوون بکەنەوە کە پێویستە بزانرێن سەبارەت بە ڕۆژی قیامەت، بەشێوەیەك کە بەپێی ئاستی عەقڵ خەڵکەکە بێت و بتوانن تێیبگەن.

بەرنامەو یاسای گشتی خوای گەورە بە خەڵکی ڕابگەیەنن، کە ڕێڕەوەکەیان دیار بکەن لە ڕاستکردنەوەی دەروونیاندا و کپ کردنی هەواو ئارەزووەکانیان و ئەو کردەوانەیان پیشان بدەن کە هۆکاری خۆشگوزەرانی و بەختەوەری ئەوانە لەم بوونەوەرەدا کە بەگشتی لێیان شاراوەیە و بە پوختی بە قوڵایی دەروونیان وابەستەیە، نەوەك هەر ئەمەش هەموو حوکمە گشتیەکانیش دەچنە ناو ئەو بازنەیەوە کە پەیوەستن بە کردەوە سەرەکیەکانی دیار و شاراوە.

پاشان خوای گەورە پشتگیری ئەوانە دەکات بە شتانێك کە تواناکانی مرۆڤ پێی

---

(١) وەرگێڕ.

ناگەن، ئەمەش بۆ ئەوەیە بەڵگەیان لەسەر بەرپا ببێت و قەناعەتیان بە ڕاستی پەیامەکە بۆ درویست ببێت، کە بەمانەش دەبنە پەیامبەری خوا کە ڕەوانەکراوان بۆ بەدیهێنراوەکانی خوا بە مژدەدەرو ترسێنەر.

گومانیش لەوەدا نییە ئەو زاتەی کە هەموو شتێکی بەوپەڕی جوانی و ڕێك و پێکی دروست کردووەو لە هەر بوونەوەرێکدا توانای بەدیهێنانەکەی بەوپەڕی جوانی دەرخستووەو پێداویستی هەر زیندەوەرێك و گیانلەبەرێکی دابین کردووە، هیچ بوونەوەرو بەدیهێنراوێکی بچوك یان گەورەی بێ بەشی نەکردووە لە ڕەحمەتی خۆی، بێگومان ئەمەش لە میهرو بەزەیی خۆیەتی بە دروستکراوەکانی کاتێ ڕێگایان بۆ ڕۆشن ئەکاتەوە بۆ ڕزگار بوون لە وێڵی و سەرگەردانی و گومڕایی. جا لەناو مرۆڤەکان، چەند تاکێکی ڕێنماکەرو هیدایەت دەری دەستنیشان کرد، بەچەند تایبەتمەندیەك جیایی کردنەوە کە کەسانی تر نیانە و بۆ زیاتر پشتیوانیان، چەند موعجیزەو دەراسایەکی پێبەخشین کە دەروونەکان ملکەچ دەکات و ڕێگە بۆ عەقڵە پێشکەوتووەکان خۆش ئەکات، جا ئەوەی ڕاستیخوازە ملکەچی هیدایەتەکە دەبێت و کەسی دۆڕاو سەرکەشیش ڕەتی دەکاتەوە، بۆیە ڕێنمایی عەقڵ دەکات و دیدی نەزان ڕۆشن ئەکاتەوەو ڕزگاری ئەکات لە سەرکەشیەکەی.

ئینجا دڵەکان ڕادەچڵەکێنن بە یارمەتی خوا و عەقڵەکان سەرسام ئەکان بەهۆی موعجیزەکانیان، لەم کاتەشدا چینە جیاوازەکان وەك یەك ملکەچ دەبن بۆی:

بە (پاشا و بەندە) و (دەسەڵاتدار و هەژاری بێ دەسەڵات) و (عەقڵمەند و نەزان) (چاکەکار و چاکەکارتر)، جا ملکەچ بوونیان بۆ پێغەمبەر وەك نیمچە ناچاری دەردەکەوێت نەوەك سەرپشك بن.

جا ئەو شتانە فێری خەڵکی دەکەن کە خوای گەورە ویستویەتی بەمە کاروباری دونیاو دواڕۆژیان چاك دەکات و ئەو شتانەشیان فێر دەکەن کە پەیوەستن بەزاتی خوای گەورەو سیفەتە تەواوەکانی، ئا ئەمانە پێغەمبەران و پەیامبەرانن.

ڕەوانەکردنی پێغەمبەران(ﷺ) بریتیە لە تەواوکردنی کۆشکی مرۆڤایەتی و تەنانەت لە گرنگترین پێداویستیەکانی مرۆڤە بۆ مانەوەی، بەڵکو پێگەی پێغەبەران

لە لاشەی مرۆڤایەتیدا وەك پێگەی عەقڵە لە جەستەی مرۆڤدا، بەڕاستی ناردنی پێغەمبەران بەخشش و نیعمەتێك بوو خوای گەورە بەتەواوی ڕەوانەی كردن ﴿لِئَلَّا يَكُونَ لِلنَّاسِ عَلَى ٱللَّهِ حُجَّةُۢ بَعۡدَ ٱلرُّسُلِ﴾ النساء: ١٦٥. واتە: (تا خەڵكی هیچ بەڵگەیەكیان بەدەستەوە نەمێنێت دوای ئەوەی خوا پێغەمبەرانی بۆ ڕەوانە كردوون).

## كۆتایی:

عەقڵ گەورەترین بەخششی خوایە كە بەئێمەی داوەو بەنرخترین و بەسوودترین شتە كە ئێمەش هەمان بێت، خوای گەورە ئێمەی بە عەقڵ جیا كردۆتەوەو ئەركی تایبەتی خستۆتە سەرشانمان. بەهۆی عەقڵ خراپ لە چاك، خێر لە شەڕ، بەرزی لە نزمی، جیا دەكەینەوە، لە چوارچێوەی ئەو توانایەی خوای گەورە بەئێمەی بەخشیوەو ئەو تایبەتمەندیانەی ئێمەی پێ تایبەت كردووە، كە بەپێی ئەم تایبەتمەندیانەش ئێمە ئەركمان بۆ دیاریكراوە.

خوای گەورە ئەركداری (تكلیف) و خولگەی پاداشت و سزای وابەستە كردووە بە عەقڵەوە. لەسەرووی ئەمەشەوە خوای گەورە لە بەخششی خۆیەوە پێغەمبەرانی ڕەوانەكردووە بۆ بەندەكانی لە هەمان ڕەگەزیان وەك بانگەوازكارێك و پاڵنەرێكی بەهێز بۆیان تا باوەڕ بێنن بەو دەرەنجامانەی عەقڵەكانیان پێی گەیشتوون و پێغەمبەرانیش پشت ڕاستیان كردۆتەوەو تا ئەو ڕاستیانە بزانن كە عەقڵی مرۆڤ بەتەنها توانای زانینی نییە.

كەواتە پێغەمبەر كە نێردراوە وەك پاڵپشت و تەواوكەری پەیامی عەقڵی مرۆڤ بووە. و خوای گەورە لەو كەسە خۆش بێت كە وتویەتی[(١)]:

(إن لله على الناس حجتين: حجّة ظاهرة، و حجّة باطنة. فأما الظاهرة فالرسل. و أما الباطنة فالعقول) واتە: (خوای گەورە دوو بەڵگەی بەرپاكردووە لەسەر خەڵكی:

(١) ئەمە وتەی ئیمام موسای كازمە.

**یەکەمیان دیارە و ئەوەی تریان شاراوەیە. جا بەڵگەی دیارە پێغەمبەرانن. بەڵگەی شاراوەش عەقڵەکانن).**

**جا پەیامەکان بەخشش و میهری خوای گەورەن بۆ گشت مرۆڤایەتی و ئەگەر ئەو پەیامانە نەبوونایە، ئەوا خەڵکی هەر لەناو زەلکاو گومڕاییدا گوزەریان دەکرد. مەگەر ئەوەی خوا خۆی پاراستبێتی و بەم پەیامانە بەڵگەی خوا بەتەواوی لەسەر بەندەکانی بەرپا دەبێت.**

**خوای گەورە فەرموویەتی:**﴿إِنَّآ أَوۡحَيۡنَآ إِلَيۡكَ كَمَآ أَوۡحَيۡنَآ إِلَىٰ نُوحٖ وَٱلنَّبِيِّـۧنَ مِنۢ بَعۡدِهِۦۚ وَأَوۡحَيۡنَآ إِلَىٰٓ إِبۡرَٰهِيمَ وَإِسۡمَٰعِيلَ وَإِسۡحَٰقَ وَيَعۡقُوبَ وَٱلۡأَسۡبَاطِ وَعِيسَىٰ وَأَيُّوبَ وَيُونُسَ وَهَٰرُونَ وَسُلَيۡمَٰنَۚ وَءَاتَيۡنَا دَاوُۥدَ زَبُورٗا ﴿١٦٣﴾ وَرُسُلٗا قَدۡ قَصَصۡنَٰهُمۡ عَلَيۡكَ مِن قَبۡلُ وَرُسُلٗا لَّمۡ نَقۡصُصۡهُمۡ عَلَيۡكَۚ وَكَلَّمَ ٱللَّهُ مُوسَىٰ تَكۡلِيمٗا ﴿١٦٤﴾ رُّسُلٗا مُّبَشِّرِينَ وَمُنذِرِينَ لِئَلَّا يَكُونَ لِلنَّاسِ عَلَى ٱللَّهِ حُجَّةُۢ بَعۡدَ ٱلرُّسُلِۚ وَكَانَ ٱللَّهُ عَزِيزًا حَكِيمٗا ﴿١٦٥﴾﴾ النساء: ١٦٣ - ١٦٥. **واتە: (بەڕاستی ئێمە "وحی" و نیگامان بۆ تۆ ناردووە هەر وەك چۆن نیگامان بۆ نوح و پێغەمبەرانی دوای ئەو ناردووە، هەروەها نیگامان ناردووە بۆ ئیبڕاهیم و ئیسماعیل و ئیسحاق و یەعقوب و "هەندێك" لە کوڕانی یەعقوب و عیسا و ئەیوب و یونس و هاڕوون و سولەیمان، زەبوریشمان بە داود بەخشیووە. بێگومان بەسەرهاتی هەندێ لە پێغەمبەرانمان بۆ گێڕاویتەوە، بەسەرهاتی هەندێکی تریشمان بۆ نەگێڕایتەوە، بەڕاستی خوای گەورە خۆی لەگەڵ موسادا گفتوگۆی یەکسەری و ڕاستەوخۆی ئەنجامداوە. پێغەمبەرانمان "ڕەوانەکردووە" کە مژدەدەرن (بە ئیمانداران) و ترسێنەرن بۆ "یاخیەکان"، تا خەڵکی هیچ بەڵگەیەکیان بەدەستەوە نەمێنێت دوای ئەوەی خوا پێغەمبەرانی بۆ ڕەوانە کردوون، بێگومان هەمیشە و بەردەوام خوا باڵادەست و دانایە).**

***

# دەروازەی سێیەم

# پێغەمبەرایەتی بەشێوەیەكی گشتی

## باسی یەكەم

## پێغەمبەرایەتی و ئەركەكەی

**وشەی پێغەمبەر و پەیامبەر لە زمانەوانیدا:**

وشەی (النبي)لە ئەصڵی زمانەوانیدا:

وشەی (النبي) بە هەمزە و بەبێ هەمزە هاتووە:

١- جا ئەگەر وشەكە بە هەمزە بوو (النَّبِيء) ئەوە یان ئەوەتا:

أ- لە (النَّبَأ) هاتووە، كە بریتیە لە هەواڵ، جا پێغەمبەر هەواڵدەرە (الْمُنْبِيء) و هەواڵ لە خوای گەورە بە بەندەكانی دەدات.

ب- لە (النَّبِيء) هاتووە، كە بریتیە لە ڕێگەی ڕوون و ڕۆشن، چونكە پێغەمبەران ئەو ڕێگایەن كە بەندە دەتوانێ بەهۆیانەوە بە خوای گەورە بگات.

٢- ئەگەر وشەكە بەبێ هەمزە بوو (النبي)یان ئەوە ئەوەتا:

أ- هەمزەكەی سووك كراوە.

ب- داتاشراوە لە (النبْوَة) و (النَّباوة)، واتە: بەرزایی. چونكە پێغەمبەر پلەی بەرزترە لە كەسانی تر[1].

**وشەی پەیامبەر (الرسول) لە زمانەوانیدا:**

---

(١) لسان العرب ماده (النبأ)، و كتاب سیبویه ٢/١٧٠ و اشتقاق الأسماء الله الحسنى - الزجاجى ٥٠٤ و البیان فى غریب إعراب القرآن ١/ ٨٧-٨٨ و المسامرة ٢٣٢.

زۆربەی كتێبەكانی زانسی كەلام دەدوێن لەبارەی پێكهاتەی و چۆنیەتی داتاشرانی وشەی (النبی) لەو شوێنەی كە لە مانای زاراوەیی ئەو وشەیە دەدوێت.

وشەی (الرسول) وەرگيراوە لەوەی:

أ- كە دەوترێت: (جاءت الابل رَسَلاً) واتە: وشترەكان بە ڕیز هاتن بەدوای یەكدا، جا پەیامبەر ئەو كەسەیە كە شوێن هەواڵی ئەو زاتە دەكەوێت كە ڕەوانەی كردووە[1].

ب- لە بەدوای یەكدا هاتنی شیر، كە بەبێ پچڕان هات، چونكە پەیامبەر ئەو زاتەیە كە سروش و نیگای بۆ سەر دادەبەزێت بە دوای یەكدا[2].

**وشەی پێغەمبەر و پەیامبەر لە زاراوەدا:**

قورئانی پیرۆز ئەو دوو وشەی بەیەكەوە لە یەك فەرمایشتدا هێناویەتی: ﴿ وَمَآ أَرۡسَلۡنَا مِن قَبۡلِكَ مِن رَّسُولٖ وَلَا نَبِيٍّ ﴾ الحج: ٥٢. واتە: ("ئەی محمد (ﷺ)" پێش تۆ هیچ پێغەمبەرێكی پەیامدارو بێ پەیامان ڕەوانە نەكردووە).

زانایان ڕاجیان لەبارەی ڕوونكردنەوەی ئەم دوو چەمكە و چەندین بۆچوونیان لەم بارەوە هەیە گرنگترین ئەو ڕاو بۆچوونانە:

**بۆچوونی یەكەم:**

پێغەمبەر: خوای گەورە شەریعەت و بەرنامە (واتە: یاسا و ئەحكامی)ی بۆ ڕەوانە كردووە جا چ فەرمانی پێ كردبێت بانگەوازی بۆ بكات و بەخەڵكی ڕایبگەیەنێت یان نا، جا ئەگەر فەرمانی پێكرا بە ڕاگەیاندن و بانگەواز كردن، ئەوا ئەو كاتە پێغەمبەرە و پەیامبەریشە.

جیاوازی نێوانیان بریتیە لە فەرمان پێكران بە ڕاگەیاندن و ڕانەگەیاندنی[3].

پێغەمبەر گشتگیرترە لە پەیامبەر، واتە: پێویستە هەموو پەیامبەرێك

---

(١) لسان العرب مادە (رسل).

(٢) أصول الدين - البغدادی ١٥٤.

(٣) المسامرة ٢٣١ و الدَّردير على الخريدة ١٨.

پێغەمبەر بێت و بەپێچەوانە پێویست نیە هەموو پێغەمبەرێك پەیامبەر بێت[1].

ئـــەم بۆچـــوونە بەناوبانگـــە و ئەمـــە بۆچـــوونی زۆربـــەی زانایـــان[2] و ئەشعەرییەكانە[3] و (المهدوی) و (قاضی عِیاض)یش لە كتێبەكەی (الشفا) ئەم ڕایەی بە ڕاست داناوە، لەم بارەشەوە وتویەتی: (ئەو بۆچوونەی كە ڕاستە و چەندین زانای زۆرو زەبەندی لەسەرن ئەوەیە، كە هەر پەیامبەرێك پێغەمبەر و هەر پێغەمبەرێكیش پەیامبەر نییە)[4].

**بۆچوونی دووەم:**

پێغەمبەر بریتیە لەو مرۆڤەی خوای گەورە ڕەوانەی كردووە، بۆ ئەوەی ئەو پەیامە ڕابگەیەنێت و بانگەوازی بۆ بكات، كە لەلایەن خواوە بۆی دابەزیوەو پەیامبەریش هەمان مانای هەیە، كەواتە هیچ جیاوازییەك نیە لەنێوانیان، بەڵكو هەردووكیان بەیەك واتان[5]. و (ابن همام) ئەم بۆچوونەی داوەتە پاڵ هەندێ زانای

---

(١) الصاوي على الدردير ١٨ و شرح الطحاوية - ابن أبي العز ١٠٥ و لوامع الأنوار ٤٩/١ و ٢٥٨/٢ و بەهەمان شێوە لە (شرح الطحاوية ١٠٥) دا باسی كردووە: (بەڵام وەك خودی پەیام ئەوا فراوانترە، چونكە پێغەمبەرایەتی بەشێكە لە پەیام، لەبەر ئەوەی پەیام و پێغەمبەرایەتی و شتی تریش لە خۆ دەگرێت، بە پێچەوانەی پەیامبەران كە پێغەمبەران شتی تر لەخۆ ناگرن، بەڵكو بەپێچەوانەوە پەیامبەران بەشێكن لە پێغەمبەران، جا پەیام وەك خودی خۆی زۆر فراوان گشتگیرترە و وەك پەیامبەر تایبەت و دیاریكراوە).

(٢)المسامرة و لوامع الأنوار و الصاوي ئەم سەرچاوانەی پێشوو، و لە (شرح الطحاوية) كە (باشترینیەتی).

(٣) حاشية المَرْجاني ١٢/١ و الكلنبوي ٩/١.

(٤) الشفا ١/ ٢٥١ و تفسير القرطبي ٤٤٧٢/٧.

(٥) المسايرة و المسامرة عليها ٢٣١ و الصاوي على الدردير ١٨ و إعلام النبوة - الماوردي ٣٨ و المقاصد ١٧٣/٢.

لێکۆڵەر (محقق)[١]. و ئەم بۆچوونە مەزهەبی زۆربەی موعتەزیلەکانە[٢].

ئەم بۆچوونە بەم بەڵگانە بەرپەرچ دراوەتەوە:

١- بە فەرمایشتی خوای گەورە: ﴿ وَمَآ أَرۡسَلۡنَا مِن قَبۡلِكَ مِن رَّسُولٍ وَلَا نَبِيٍّ ﴾الحج: ٥٢. واتە: ("ئەی محمد (ﷺ)" پێش تۆ هیچ پێغەمبەرێکی پەیامدارو بێ پەیاممان ڕەوانە نەکردووە). ئەگەر پێغەمبەر وەك پەیامبەر بووبایە ئەوا لەم ئایەتەدا خوای گەورە پێغەمبەری نەدەخستە پاڵ پەیامبەر، چونکە نەفی کردن و لابردنی شتێك پێویست دەکات هاوشێوەکەیشی لابرێت[٣].

٢- فەرمایشتی (أبي ذر)، کە دواتر دەخرێتەڕوو، لەبارەی ژمارەو ڕێژەی پێغەمبەران و پەیامبەران ئەوە ڕوون دەکاتەوە کە پەیامبەران جیاوازن لە پێغەمبەران، و بۆچوونی دووەم بەپێویستی دەزانێت پێغەمبەر و پەیامبەر یەك بن، ئەمەش پێچەوانەی فەرمایشتەکەیە[٤].

لەمبارەیەوە چەند بۆچوونێکی تریش هەن ماوە نییە بۆ باس کردنیان[٥].

***

# سەلماندنی پێغەمبەرایەتی

سەلماندنی پێغەمبەرایەتی تەنها کاتێك ئەبێت کە دوو شت بەیەکەوە کۆ

---

(١) المسامرة،سەرچاوەی پێشوو.

(٢) حاشية المرجاني ١٢/١ و الكلنبوي ٩/١.

(٣) الكلنبوي على الدَّوَّاني ٩/١.

(٤) المسامرة ٢٣٢ و الكلنبوي، سەرچاوەی پێشوو و فەرموودەکەی (أبي ذر) لەبارەی: (باوەڕ بە پێغەمبەران و پەیامبەران) دەخرێتەڕوو.

(٥) سەیری ئەمانە بکە:الكلنبوي على الدواني ب ١ لا ٩ و المرجاني على الدواني ١/١١-١٣ و إعلام النبوة ٣٨ و شرح المقاصد ١٧٣/٢ و تفسير القرطبي ٤٤٧٢ و تفسير البيضاوي ٣٣٠ و المسامرة ٢٣١.

ببنەوە:

**يەكەم:** بانگەشە كردنی پێغەمبەرايەتی.

**دووەم:** دەرخستنی موعجيزە.

جا هەر كەسێ بانگەشەی پێغەمبەرايەتی كرد و موعجيزەی دەرخست وەك بەڵگەی ڕاستێتی بانگەشەكەی، ئەوا ئەو كەسە پێغەمبەرە[1].

و ئەمە دواتر بە تێروتەسەلی دەخرێتەڕوو.

***

## پێغەمبەرايەتی بە هەڵبژاردن و دەستنيشان كردن دەبێت لەلايەن خوای گەورە

پێغەمبەرايەتی فەزڵ و بەخششێكی خوايە بەهەر بەندەيەك كە خوای گەورە ويستی لەسەر بێت پێی دەبەخشێت، جا كەواتە ئەو پلەيە بە دەست نايەت بەڵكو دەبەخشرێت، هەر چەندە بەندە پەرستشی زۆرو سەخت بكات و پاكسازی بۆ دەروون و ڕۆح بكات و جەستەش دووربگرێت لە شتی نزم و خراپ، ئەوا هەر ئەو پلەيەی دەست ناكەوێت، بەهەمان شێوە بە ميرات و زيرەكی بەدەست ناكەوێت و كۆمەڵگەش هيچ كاريگەريی و ڕۆڵێكی نييە لەمەدا.

خوای پاك و بەرز فەرموويەتی: ﴿ ٱللَّهُ يَصۡطَفِي مِنَ ٱلۡمَلَٰٓئِكَةِ رُسُلٗا وَمِنَ ٱلنَّاسِ ﴾ الحج: ٧٥. واتە: (هەر خوا بەويستی خۆی لە فريشتەكان و لە خەڵكيش فرستادە هەڵدەبژێرێت).

خوای مەزن فەرموويەتی: ﴿ قُلۡ مَا يَكُونُ لِيٓ أَنۡ أُبَدِّلَهُۥ مِن تِلۡقَآيِٕ نَفۡسِيٓۖ إِنۡ أَتَّبِعُ إِلَّا مَا يُوحَىٰٓ إِلَيَّۖ ﴾ يونس: ١٥. واتە (ئەی محمد (ﷺ) پێيان بڵێ: من بۆم نييە لەخۆمەوە بيگۆڕم، من شوێنی هيچ شتێك ناكەوم، جگەلەوە نەبێت كە بە وەحی پێم دەگات).

(١) شرح المواقف ٥٥٧ و شرح المقاصد ١٨٢/٢ و المسامرة ٢٤٠ و الدواني على العقائد العضدية ٢٧٧/٢.

**هەروەها فەرمووویەتی:** ﴿ يُنَزِّلُ ٱلْمَلَٰٓئِكَةَ بِٱلرُّوحِ مِنْ أَمْرِهِۦ عَلَىٰ مَن يَشَآءُ مِنْ عِبَادِهِۦٓ أَنْ أَنذِرُوٓا۟ أَنَّهُۥ لَآ إِلَٰهَ إِلَّآ أَنَا۠ فَٱتَّقُونِ ﴿٢﴾ ﴾ النحل: ٢. **واتە: (پەروەردگار، خوای فریشتەکان بە ڕەحمەت و ژیانەوە "کە وەحی ئاسمانە" دەنێرێت بۆ هەر کەسێك کە بیەوێت لە بەندەکانی "کە پێغەمبەرانن"، فەرمانیان پێدەدات کە: خەڵکی بێدار بکەنەوە لەوەی کە بەڕاستی جگەلە من هیچ خوایەکی تر نییە، لەبەر ئەوە لە خەشم و قینم خۆتان بپارێزن).**

***

## پەیامبەران و پێغەمبەران مرۆڤن

**پێغەمبەران و پەیامبەران مرۆڤن، دەخۆن و دەخۆنەوە، دەخەون و نەخۆش دەکەون، خەمبار دەبن و شتیشیان لەبیر دەچێتەوە، برسیی و تێنوو دەبن، ژن دەهێنن و تووڕەش دەبن، ماندوو دەبن و ڕاوێژیش دەکەن.... هاوێنەی ئەو سیفەتە مرۆییانەی کە نابنە هۆی کرچ و کاڵی و کەموکورتی بۆیان.**

**بۆیە خوای گەورە هەڵیبژاردوون، لە هەمان ڕەگەزی ئەوانەی کە بۆیان ڕەوانە دەکرێت، تا پەیوەندییەکی پتەوی لەگەڵیان هەبێت و هەست بە شتەکانی ئەوان بکات و ئاگاداری ئێش و ئازاریان ببێت و بەڵگەی گومان بڕیان لەسەر بەرپا بکات و ڕێگەی ڕاستیان بۆ ڕوون بکاتەوە. و بەڵگەش لەسەر ئەمە:**

**یەکەم: لە قورئانی پیرۆز:**

**أ- ئەم فەرمایشتەی خوای گەورە:** ﴿ لَقَدْ جَآءَكُمْ رَسُولٌ مِّنْ أَنفُسِكُمْ عَزِيزٌ عَلَيْهِ مَا عَنِتُّمْ حَرِيصٌ عَلَيْكُم بِٱلْمُؤْمِنِينَ رَءُوفٌ رَّحِيمٌ ﴿١٢٨﴾ ﴾ التوبة: ١٢٨. **واتە: ("ئەی خەڵکینە" سوێند بەخوا بەڕاستی پێغەمبەرێکتان بۆ ڕەوانەکراوە کە هەر یەکێکە لە خۆتان، زۆر سەختە بەلایەوە تووش بوونتان بەبەڵاو ناخۆشی، زۆر بە تەنگیشتانەوەیە و پەرۆشە لەسەرتان، زۆر دڵسۆزی ئیماندارانە و میهرەبان و دلۆڤانە بۆیان).**

ب- ئــەم فەرمایشــتەه: ﴿ قُلْ إِنَّمَآ أَنَا۠ بَشَرٌ مِّثْلُكُمْ يُوحَىٰٓ إِلَىَّ أَنَّمَآ إِلَٰهُكُمْ إِلَٰهٌ وَٰحِدٌ ﴾ الكهـف: ١١٠، و فصلت: ٦. واتــە: ("ئــەی پێغەمبــەر (ﷺ)" پێیــان بلــێ: بەڕاســتی مــن تــەنها ئادەمیزادێكم وەك ئێوە، بەڵام ئەوەندە هەیە وەحی و نیگام بۆ دێت).

پ- ئـــەم فەرمایشـــتە: ﴿ قُل لَّآ أَمْلِكُ لِنَفْسِى نَفْعًا وَلَا ضَرًّا إِلَّا مَا شَآءَ ٱللَّهُ ۚ وَلَوْ كُنتُ أَعْلَمُ ٱلْغَيْبَ لَٱسْتَكْثَرْتُ مِنَ ٱلْخَيْرِ وَمَا مَسَّنِىَ ٱلسُّوٓءُ ﴾ الأعراف: ١٨٨. واتە: ("ئەی محمد (ﷺ)" پێیان بلێ: كە من ناتوانم، هیچ قازانج یان زیانێك بـەخۆم بگەیـەنم، مەگـەر ویستی خـوای لەسـەر بێـت، خـۆ ئەگـەر غـەیب و شـاراوەكانم بزانیایـە، ئـەوە چاكەی زۆرم كۆدەكردەوە بۆ خۆم و هیچ ناخۆشیەكیشم تووش نەدەبوو).

ت- ئـــەم فەرمایشـــتە: ﴿ وَلَقَدْ أَرْسَلْنَا رُسُلًا مِّن قَبْلِكَ وَجَعَلْنَا لَهُمْ أَزْوَٰجًا وَذُرِّيَّةً ﴾ الرعد: ٣٨. واتە: (سوێند بەخوا بێگومان پـێش تـۆ پێغەمبـەرانی تـرمـان ڕەوانـەكردووە و هاوسەرو نەوەشمان پێداون).

ج- ئــەم فەرمایشــتە: ﴿ قُل لَّآ أَقُولُ لَكُمْ عِندِى خَزَآئِنُ ٱللَّهِ وَلَآ أَعْلَمُ ٱلْغَيْبَ وَلَآ أَقُولُ لَكُمْ إِنِّى مَلَكٌ ۖ إِنْ أَتَّبِعُ إِلَّا مَا يُوحَىٰٓ إِلَىَّ ﴾ الأنعام: ٥٠. واتە: (ئـەی محمـد (ﷺ) پێیـان بلـێ: من پێتان ناڵێم گەنجینەكانی خوا لای منە، هـەروەها لـە نهێنـی و شاراوەكانیش هـیچ نـازانم و ئاگـادار نـیم و پێتـان نـاڵێم بەڕاسـتی فریشـتەم، بـەڵكو تـەنها شـوێنی ئـەوە دەكەوم كە بەوەحی و نیگا پێم دەگات).

**دووەم: لە سوننەتی پێزداری پێغەمبەر(ﷺ):**

أ- فەرمایشــتی (أبــی مســعود) كــە وتــی: كەسـێك هاتــە لای پێغەمبــەر (ﷺ) و لەگەڵی دوا، جا كەسەكە دەلەرزی، ئەویش پێـی فـەرموو: ((هـوِّن علیـك، فـاني لسـت بِمَلِك، انما أنا ابن امرأة تأكل القَدید))[1] واتە: ئاسایی بـە و مەشـڵەژێ، مـن پادشـا نـیم، بەڵكو من كوڕی ئافرەتێكم نانە ڕەقەی ئەخوارد.

---

(١) سنن ابن ماجە - كتاب الأطعمة - باب القدید ١١٠١/٢.

ب- ئەم فەرمایشتەی پێغەمبەر (ﷺ): ((انما أنا بشرٌ أنسى كما تنسون، فاذا نسيتُ فذكِّروني)) بوخاری و موسلم[1] و جگەلەوانیش دەریان هێناوە (تخريج)یان كردووە. واتە: من مرۆڤم شت لەبیر ئەكەم، هەروەكو چۆن ئێوەش شت لەبیر ئەكەن، ئەگەر شتێكم لەبیر كرد ئێوە بیرم بخەنەوە.

پ- خاكی و خۆبەكەم زانینی پێغەمبەر (ﷺ) و ژیاننامەكەی بەلگەن لەسەر ئەوەی كە پێغەمبەر (ﷺ) مرۆڤە و هیچ ماوەیەكیش نییە یەكێك نكۆڵی لەمە بكات.

ت- بەندایەتی پێغەمبەر (ﷺ) بۆ خوای گەورە لە فەرمایشت و نزاكانیدا دیارە، هەروەك لەم فەرمایشتەدا هاتووە: (اللهم اني عبدك وابن عبدك، ابن أمَتِك، ناصيتي بيدك، ماضٍ فيَّ حكمُك، عَدْلٌ فيَّ قضاؤك)[2] واتە: خوایە من بەندەتم كوڕی بەندەتم كوڕی كەنیزەك و كۆیلەتم. نسیب و ناوچەوان و چارەنوسم بەدەست تۆیە و حوكم و بڕیارت بەسەرمدا ڕابوردووە.

و هاوێنەكانی ئەم نزایە زۆرن.

***

## سوودەكانی تووش بوونی پێغەمبەران بە دیاردە (أعراض) مرۆییەكان

پێشتر ئەوە خرایەڕوو كە پێغەمبەران مرۆڤن، تووشی هەموو ئەو دیاردە مرییانە دەبنەوە، وەك: چەرمەسی، نەخۆشی، لەبیرچوونەوە، هەژاری... تاد، كە سەرجەم خەڵكی تر تووشی دەبن، بەڵام تووش بوونی پێغەمبەران بەم دیاردانە چەند سوودێكی هەیە كە پوختی دەكەینەوە لەم خاڵانەی خوارەوە:

١- گەورە كردنی پاداشتەكانیان:

لەبەرئەوەی چەرمەسەری و نەخۆشی چەندین پاداشتی گەورەی لەسەر كەڵكە

---

(١) ئەمانە دەریان هێناوە: البخاري في كتاب الصلاة - باب التوجه نحو القبلة ١١١/١ و مسلم في كتاب المساجد - باب السهو في الصلاة ٤٠٠/١ و بێژەكە هی هەردووكیانە.

(٢) أحمد لە (مسند)ەكەیدا گێڕاویەتیەوە ٤٥٢/١.

دەبن، لەبەرئەمە پێغەمبەر فەرموویەتی (ﷺ): ((أشد الناس بلاءً الأنبياء، ثم الأمثل فالأمثل))[1] واتە: پێغەمبەران لە هەموو خەڵكی ناخۆشی و چەرمەسەری زیاتر دەبینن پاشان ئەوانەی دوای ئەوان و دواتر ئەوانی تر.

و ئیمامی (قشیری) وتویەتی: هەموو كەسێك شایەنی تاقیكردنەوەی قورس و چەرمەسەری سەخت نییە، چونكە چەرمەسەری بۆ ئەولیاكانە، بەڵام كەسانی بێگانە فەرامۆش دەكات و تێپەڕیان دەكات.

٢- یاسادانان:

جا لەبیرچوونەوەی پێغەمبەر (ﷺ) لە نوێژدا بۆ یاسادانانە بۆ خەڵكی و فێریان دەكات چۆن كرنووشی لەبیرچوونە (سهو) ببەن، چونكە ئاماژەو مانای كردەوە بەهێزترە لە ئاماژەی وتە.

٣- دڵدانەوەی كەسانی تر كاتێك تووشی كارەساتێك دەبن كە تووشی پێغەمبەران هاتووە:

ئەگەر كەسی ژیر سەیری بارودۆخی پێغەمبەران بكات، لە تووش بوونیان بە نەخۆشی و دەرد و كەمی سەروەت و سامان و ئازاردرانیان لەلایەن خەڵكیەوە، سەرباری پلە بەرزی و شكۆداریان، ئەوا كەسەكە بەمە دڵی ئەدرێتەوەو ئارامگر دەبێت لەسەر ئەو ناخۆشیەی بەسەریدا دابەزیوە.

٤- بۆ ئەوەی خەڵكی تر بە ئاگا بێننەوە لەمەڕ بێ نرخی دونیا لەلایەن خوای گەورە، كاتێك دەبینن پێغەمبەران كە پشتیان لە دونیا كردووەو خۆیان دوور گرتووە لە چێژو خۆشیەكانی.

سەرزەنشتی دونیا لە هەندێك دەقدا هاتووە، بەڵام مەبەستی لەو دونیایەیە كە بێ ئاگایە لە خوای گەورە، و پێویستە ئەم فەرمایشتەی پێغەمبەریش (ﷺ) هەر بە هەمان مەبەست لێكبدرێتەوە: ((ألا ان الدنيا ملعونة، ملعون ما فيها، الا ذكر الله

---

(١) أحمد و بخاري ترمذي و ابن ماجه، له (سعد)يان گێڕاوەتەوەو صەحیحە، سەیری: صحيح الجامع ٤٢/١ بكە.

وما والاه و عالم أو متعلم))[1] واتە: بێگومان دونیا نەفرەتیە، ئەوەی تیایدایە بەهەمان شێوە نەفرەتیە، تەنها یادی خواو ئەوەی هاوشێوەی ئەو چاكن و زانا و زانستخواز نەبن. و یادی خوا واتە: (سبحان الله) و (الحمد لله) و (لا اله الا الله) كردن.

بەڵام دونیایەك كە مرۆڤ بێ ئاگا نەكات لە خوای گەورە ئەوا سەرزەنشتی ناكرێت بەڵكو ستایشی ئەكرێت، و پێویستە ئەم فەرمایشتەی پێغەمبەر (ﷺ) بەم پێیە لێك بدرێتەوە: ((نِعْمَ الدنيا مطيّةُ المؤمن، بها يصل الى الخير، و بها ينجو من الشر)) واتە: دونیا چاكترین وڵاخی سوارییە بۆ باوەڕدار، كە بەهۆیەوە چاكە ئەنجام دەدات و خۆی دوور دەگرێت لە خراپە. و بەمەش دەزانرێ: دونیا بەخودی خۆی نە سەرزەنشت كراوەو نە ستایش كراوە[2].

***

## باوەڕ بوون بە پێغەمبەران و پەیامبەران

باوەڕهێنان بە پێغەمبەران و پەیامبەران پێویست و فەرزە، هەروەها باوەڕهێنان[3] بە هەموو ئەو هەواڵانەی كە پێغەمبەران دەیدەن بەڕاست بزانێت و گوێڕایەڵ بێت بۆیان لەو شتانەی فەرمانیان پێ ئەكات بە كردن یان نەكردنی:

أ- خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿ قُولُوٓاْ ءَامَنَّا بِٱللَّهِ وَمَآ أُنزِلَ إِلَيۡنَا وَمَآ أُنزِلَ إِلَىٰٓ إِبۡرَٰهِـۧمَ وَإِسۡمَٰعِيلَ وَإِسۡحَٰقَ وَيَعۡقُوبَ وَٱلۡأَسۡبَاطِ وَمَآ أُوتِيَ مُوسَىٰ وَعِيسَىٰ وَمَآ أُوتِيَ ٱلنَّبِيُّونَ مِن رَّبِّهِمۡ لَا نُفَرِّقُ بَيۡنَ أَحَدٖ مِّنۡهُمۡ وَنَحۡنُ لَهُۥ مُسۡلِمُونَ ﴿١٣٦﴾ ﴾ البقرة: ١٣٦. واتە: ("ئەی پەیڕەوانی محمد (ﷺ) ئێوە" بڵێن: ئێمە باوەڕمان بەخوا هێناوەو بەو قورئانەش كە دابەزیوە

---

(١) ترمذی گێڕاویەتیەوە لە - كتاب الزهد - باب الدنيا ملعون ما فيها الا ذكر الله أو عالم متعلم. ٨٠/٧.

(٢) الدردير على الخريدة ١٠٩-١١٠ و الصاوي عليه و البيجوري على السنوسية ٤٤-٤٥.

(٣) لوامع الأنوار ٣٦٣/٢.

بۆمـان و بـەوەش كـە دابزیـوە بـۆ ئیـبڕاهیم و ئیسـماعیل و ئیسـحاق و یـەعقوب و نەوەكانی یەعقوب، هەروەها بەو پەیامەی كە موسا و عیسا هاتووەو بەو پەیامانـەی كە بۆ پێغەمبەران بەگشتی ڕەوانە كراوە لەلایەن پەروەردگاریانـەوە و ئێمـە جیـاوازی ناكـەین لـە نێـوان هـیچ كـام لـەو پێغەمبەرانـەدا، ئێمـە هـەمووومان تـەنها تەسـلیمی فەرمانی پەروەردگارین).

ب- فەرموویـــــــەتی: ﴿كُلٌّ ءَامَنَ بِٱللَّهِ وَمَلَٰٓئِكَتِهِۦ وَكُتُبِهِۦ وَرُسُلِهِۦ لَا نُفَرِّقُ بَيۡنَ أَحَدٖ مِّن رُّسُلِهِۦ﴾ البقـرة: ٢٨٥. واتــە: (هـەموویان باوەڕیـان هەیـە بـە خـواو فریشـتەكانی و كتێبـەكانی و پێغەمبـەرەكانی (دەڵـێن) هـیچ جیاوازیـەك ناكـەین لـە نێـوان هـیچ پێغەمبەرێك لە پێغەمبەرەكانی خوادا "لەباوەڕدا").

جـ- خـوای گـەورە پاداشـتێكی مـەزنی ئامـادە كـردووە بـۆ ئەوانـەی باوەڕیـان بـە سـەرجەم پێغەمبـەران هێنـاوە، لـەمبارەوە فەرموویـەتی: ﴿وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ بِٱللَّهِ وَرُسُلِهِۦ وَلَمۡ يُفَرِّقُواْ بَيۡنَ أَحَدٖ مِّنۡهُمۡ أُوْلَٰٓئِكَ سَوۡفَ يُؤۡتِيهِمۡ أُجُورَهُمۡۚ وَكَانَ ٱللَّهُ غَفُورٗا رَّحِيمٗا ١٥٢﴾ النسـاء: ١٥٢. واتـە: (ئەوانـەی باوەڕیـان بـەخواو پێغەمبـەرەكانی هێنـاوەو هـیچ جـۆرە جیاوازیەكیان نەكردووە لـە نێـوان هـیچ كامیانـداو باوەڕیـان بـە هـەموویان هەیـە، ئـا ئەوانە لە ئایندەدا خوای گەورە پاداشـتی خۆیـان دەداتـێ، خـوای گـەورەش هەمیشـە و بەردەوام لێخۆش بوو میهرەبانە).

## ژمارەو ڕێژەی پێغەمبەران

خوای گەورە ئەنـدازەی بـۆ سـەرجەم ئـەو شـتانەی کـە خـەڵکی پێویستیان پێـی هەیـە کێشاوە، لـە لێهـاتووی و زیرەکـی و توانـا جیـا جیاکـان، تـا ژیـان و گـوزەرانێکی خۆش و بەختەوەریان بۆ فەراهەم بکات، جا ئەم شـتانەی بـە تاکـەکان بەخشیوە بـەو ئەندازەیەی کە پێویستیان پێ هەیـە، بـۆ نمونـە تاکـەکانی هێـزی سـەربازی - خـاوەنی تواناو جەستەی تۆکمەو بەهێزن - و دارتاش و ئاسنگەر و جوتیـار و خـاوەن پیشـەکان زۆر زۆرن، بـەڵام کەسـانی ڕابـەر و کەسـایەتی سـەرکردایەتی و زانسـتی زۆر کـەمن، تەنانە ئەوانەی خـاوەنی شـێوەیەك توانـاو لێهـاتوون لەیـەك بـواردا زۆر کـەمن، لەبـەر ئەمە ڕێژەی ئەوانەی پێشەڕەوایەتی هزریی جیهان دەکەن و ڕێنموونی کـارن بـۆ سـەر ڕێگەی ڕاست، کـە پێغەمبـەران و پەیامبـەرانن کـەمن، چـونکە کاریـان دەبێتـە مایـەی سـوود بـۆ مرۆڤایـەتی و پێویسـتیەکانی دابـین دەکـات بـۆ چـەندین نـەوەی داهـاتوو و دوور.

جـا ئەگـەر ئـەو فەرموودەیـە وەربگـرین، کـە ڕێـژەی پێغەمبـەران کـە (١٢٤٠٠٠) پێغەمبـەرن و (٣١٣) پەیامبـەرن. ئـەوا دەبیـنین کە ئـەو ڕێژەیـە بـە نیسـبەت گـەلانی جیهان زۆر کەمە، هەر لە سەرەتای بـەدیهێنانی مـرۆڤ تـا سـەردەمی پێغەمبـەر محمـد (ﷺ)، هەر ناپێورێت لەگەڵ ئەو نەوە یەك لە دوای یەكانەدا[1].

بەڵام پێویستە لـە بـاوەڕ هێنـان بـە پێغەمبـەران ئـەوا ڕێـژەیان دیـاری نـەکرێت و یەكلایی نەكرێتەوە[2]، چونكە:

---

(١) مبادء الاسلام ٣٣.

(٢) دەقی عەرەبیەکەی ئەم ڕستەیە بەم شێوەیەیە: (لكن ينبغي في الإيمان بالأنبياء القطع في عدد معين)، پێم وایە (لا) لەم ڕستەیەدا پەڕیوەو هەڵەکەش دەکرێت هەڵەی چاپ بێت، لە ڕاستیدا ڕستەکە ئاوابووە: (لكن لا ينبغي في الإيمان بالأنبياء القطع بحصرهم في عدد معين)، هەر کەسێك لە دوو خاڵەکەی دوای ئەم ڕستەیە وردببێتەوە ئەو ڕاستیەی بۆ دەردەکەوێت. (وەرگێڕ).

١- بەڵگەیەكی سەلمێنراو و بڕاوە (قطعي) لە قورئانەوە نەهاتووە، ئەو فەرموودەیەی لەوبارەوەش هاتووە[1] لە بارەی ڕێژەی پێغەمبەران فەرموودەیەكی لاوازە، چونكە: هەواڵی یەك كەسە، یەك كەس گێڕاویەتیەوەو ئاماژە (قرینة)یەكی لەگەڵدا نەهاتووە كە بیگەیەنێتە پلەی بڕەڕی (قطعي) بوو، چونكە هەواڵی یەك كەس گومان هەڵئەگرێت، و لە بواری بیروباوەڕدا هیچ بایەخێك بۆ هەواڵی گوماندار دانانێت.

٢- لەوانەیە ئەگەر ژمارەی پێغەمبەران و پەیامبەران لەو ڕێژە دیاری بكرێت، ئەوا ببێتە هۆی بە پێغەمبەر دانانی كەسێك كە هەو نییە یاخود كەسێك بە

(١) لە (مسند)ی (أحمد)دا لە فەرموودەی (أبي ذر) - ڕەزای خوای لێبێت - هاتووە، كە ئەڵێت، وتم: ئەی پێغەمبەری خوا ژمارەی پێغەمبەران چەندنە؟ فەرمووی: ((مئة ألف و أربعة و عشرون، الرسل من ذلك ثلاثة و خمسة عشر جما غفيرا)) واتە: سەدو بیست و چوار هەزار، سێ سەدو پازدەیان لەناو ئەو ڕێژە زۆرەدا پەیامبەرن.

(طبراني) لە (المعجم الكبير)دا بە دەربڕینی ((أربعة و عشرون ألفاً)) گێڕاویەتیەوە، كە ئەوەی لە گێڕانەوەكەی ئیمامی ئەحمەددا دیار نەبوو دەریخست.

خولگەی ئەم فەرموودەیە لەسەر (على بن يزيد) كە لاوازە. المسامرة ٢٢٦.

ئەم فەرموودەیە دەربڕینێكی تری هەیە كە (صحيح)ی (ابن حبان)دا هاتووە، كە ژمارەی پەیامبەران لەوێدا: ((سێ سەدو سێزەدەیە))/ لوامع الأنوار ٢٥٨/٢.

ولي الدين العراقى دواوە لەسەر ئەم فەرموودەیە، كۆمەڵێك لەوانەی فەرموودە لەبەركار (حفاظ)ن بەرپەرچی (ابن حبان)یان داوەتەوەو ڕەخنەیان لێ گرتووە لەوەی ئەو فەرموودەیەی بە ڕاست و صحيح داناوە/ لوامع الأنوار ٢٦٤/٢ ئەو فەرموودەیە چەند دەربڕین و سەنەدێكی تر هەن لە (مسند)ی (أحمد) و (بزار) و (الأوسط)ی (طبراني)دا كە لە (مجمع الزوائد)دا باسی كردووە،/ المسامرة ٢٢٦ و (ابن قطلوبغا) هەواڵەكەی لە گێڕەرەوكانیەوە هێناوە كە (اسحاق بن راهويه) و (ابن أبى شيبة) و (محمدبن أبى عمر) و (أبى يعلى)/ ابن قطلوبغا على المسايرة ٢٢٥.

پێغەمبەر دانەنرێ كە پێغەمبەره[1].

بەڵام قورئانی پیرۆز ناوی بیست و پێنجی لەوان هێناوه، كە بریتین لە: (ئادەم، ئیدریس، نوح، هود، صالح، ئیبراهیم، لوط، ئیسماعیل، ئیسحاق، یەعقوب، یوسف، شوعەیب، ئەیوب، ذو الكِفل، موسا، هارون، سولەیمان، داود، ئیلیاس، الیسع، یونس، زەكریا، یەحیا، عیسا و محمد (ﷺ)).

***

## بە درۆخستنەوەی پێغەمبەران یاخود بەوەی كەم و كوریان هەیە بێ باوەڕی و كوفره

پێغەمبەران هەموویان لەیەك شتدا كۆدەبنەوه، ئەویش: پێغەمبەرایەتی و پەیامدارییە.

بۆیە سەرجەم زانایانی ئیسلام كۆكن لەسەر ئەوەی كەسێك بێ باوەڕه ئەگەر پێغەمبەرێك بە درۆ بخاتەوه كە پێغەمبەرایەتیەكەی دیاربێت، بەهەمان شێوه هەر كەسێ توانج و تانەوتەشەر لە پێغەمبەرێك بدات یان وابزانێت كەموكری هەیە ئەوا ئەو كەسە بێ باوەڕه و پێویستە بە بكوژرێت بەدەقی قورئانی پیرۆز: ﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ يَكۡفُرُونَ بِٱللَّهِ وَرُسُلِهِۦ وَيُرِيدُونَ أَن يُفَرِّقُواْ بَيۡنَ ٱللَّهِ وَرُسُلِهِۦ وَيَقُولُونَ نُؤۡمِنُ بِبَعۡضٍ وَنَكۡفُرُ بِبَعۡضٍ وَيُرِيدُونَ أَن يَتَّخِذُواْ بَيۡنَ ذَٰلِكَ سَبِيلًا ﴿١٥٠﴾ أُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡكَٰفِرُونَ حَقًّاۚ وَأَعۡتَدۡنَا لِلۡكَٰفِرِينَ عَذَابًا مُّهِينًا ﴿١٥١﴾ ﴾ النساء: ١٥٠- ١٥١. واته: (بێگومان ئەوانەی باوەڕ بەخواو پێغەمبەران ناهێنن و دەیانەوێت جیاوازی بكەن لە نێوان خواو پێغەمبەرەكانیدا"گوایە باوەڕیان بەخوا هەیە، بەڵام باوەڕیان بە پێغەمبەر نییە"، (یاخود) دەڵێن: باوەڕ دەهێنین بەهەندێك لە پێغەمبەران و باوەڕ بەهەندێكیان ناهێنین و دەیانەوێت لەو نێوانەدا ڕێگە و بەرنامەیەك بۆ خۆیان بەدەست بێنن. ئا

(١) شرح المقاصد ٢/١٩٨ و شرح العقائد النّسفية ١٣٥-١٣٦ و المسايرة و المسامرة عليها ٢٢٥ و الدردير على الخريدة ١١٩ و لوامع الأنوار ٢/٢٥٨.

ئەو جۆر كەسانە بەڕاستی هەر بێ باوەڕن و بۆ بێ باوەڕان سزایەكی سەر شۆڕكەرمان ئامادە كردووە).

***

## كاری پێغەمبەران و ڕەوانە كرانیان بۆ هەموو گەلانی جیهان بەتێكڕایی

پێغەمبەران و پەیامبەران ڕێنمایی مرۆڤ دەكەن بۆ سەر ڕێگای ڕاست، خاوەنی ئەو یاساو ڕێسایانەن كە پاكسازی دەكەن و چارەی كێشە ماددی و ڕۆحیەكان ئەكەن و مژدەی بەهەشت ئەدەن بە كەسی پارێزگارو تەقوادار و هەڕەشەی ئاگری دۆزەخ لە كەسانی گەندەڵ و بێ باوەڕ دەكەن، ئەو پێداویستیە دونیایانە بۆ خەڵكی دابین دەكەن كە پێویستیان پێ دەبێ لە كاروباری دین و دونیادا.

خوای گەورە پێغەمبەرانی بۆ گشت ئوممەتەكانی جیهانی ڕەوانە كردووە، جا هەر ئوممەتێك پەیامبەری خۆیان هەبووە، ئەگەر خوای گەورە بەئێمەیشی ڕانەگەیاند بێت، بە بەڵگەی ئەم فەرمایشتەی خوای گەورە:

أ- ﴿ وَإِن مِّنْ أُمَّةٍ إِلَّا خَلَا فِيهَا نَذِيرٌ ﴾ فاطر: ٢٤. واتە: (بێگومان هیچ گەل و نەتەوەیەكیش نەبووە فرستادە و بێداركەرەوەیەكی بۆ ڕەوانە نەكرابێت).

ب- ﴿ وَلَقَدْ بَعَثْنَا فِي كُلِّ أُمَّةٍ رَّسُولًا أَنِ اعْبُدُوا اللَّهَ وَاجْتَنِبُوا الطَّاغُوتَ ﴾ النحل: ٣٦. واتە: (سوێند بەخوا بێگومان ئێمە لەناو هەر گەل و نەتەوەیەكدا پێغەمبەرێكمان ڕەوانە كردووەو پێمان ڕاگەیاندووە كە پێیان بڵێیت: تەنها خوا بپەرستن، خۆتان دوورە پەرێز بگرن لە هەموو جۆرە پەرستراوێكی تر).

پ- ﴿ وَمَا كَانَ رَبُّكَ مُهْلِكَ الْقُرَىٰ حَتَّىٰ يَبْعَثَ فِي أُمِّهَا رَسُولًا يَتْلُو عَلَيْهِمْ آيَاتِنَا ۚ وَمَا كُنَّا مُهْلِكِي الْقُرَىٰ إِلَّا وَأَهْلُهَا ظَالِمُونَ ﴿٥٩﴾ ﴾ القصص: ٥٩. واتە: (پەروەردگاری تۆ هیچ وڵات و شارێكی كاوڵ نەكردووە، تا لە پایتەختەكەیدا پێغەمبەرێكی نەناردبێت كە ئایەتەكانی ئێمەی بەسەردا بخوێنێتەوە، وەنەبێت ئێمە شارو وڵاتانمان كاول كردبێت بەبێ هۆ، مەگەر كاتێك نەبێت كە دانیشتووانی ستەمكار بوون).

تێکڕای ئـەم دەقانـە بەڵگـەن لەسـەر ئـەوەی ڕەوانـە کردنـی پێغەمبـەران، کـورت نەبۆتەوە لە ئوممـەتێکی دیـاریکراودا یـان لـە شـوێنێکی دیـاریکراودا، وەك: دوورگـەی عەرەبی.

***

## قورئانی پیرۆزو کتێبە ئاسمانیەکانی تر

بنچـینە و ڕەگ و ڕیشـە سـەرەکیەکانی پەیامـە ئاسمانیـەکان و بیروبـاوەڕو ئامانجەکانیان یەك شـتن، کـە بریتیـە لـە: ڕێنمـایی و ئاراسـتەکردنی مـرۆڤ بـۆ ڕێگـای چاکەکاری و سەرکەوتن.

خوای پایەبەرز فەرموویەتی: ﴿ شَرَعَ لَكُم مِّنَ ٱلدِّينِ مَا وَصَّىٰ بِهِۦ نُوحًا وَٱلَّذِيٓ أَوۡحَيۡنَآ إِلَيۡكَ وَمَا وَصَّيۡنَا بِهِۦٓ إِبۡرَٰهِيمَ وَمُوسَىٰ وَعِيسَىٰٓۖ أَنۡ أَقِيمُواْ ٱلدِّينَ وَلَا تَتَفَرَّقُواْ فِيهِۚ ﴾ الشورى: ١٣. واتە: (ڕێبازی ئایین و بەرنامەی ژیانی بۆ داناون، ئەوەی کە فەرمانی پێکردووە بە - نوح -، هەر بەو شێوەیە قورئانیشی بۆ تۆ ئەی محمد (ﷺ) وەحی و نیگای کردووەو بە ئیبراهیم و موسا و عیساشمان ڕاگەیاندووە کە ڕێبازی ئاین و یەکخواناسی بەرنەدەن و لەسەری پایەدار بن).

هـەروەها فەرموویـەتی: ﴿ فَإِن تَنَٰزَعۡتُمۡ فِي شَيۡءٖ فَرُدُّوهُ إِلَى ٱللَّهِ وَٱلرَّسُولِ ﴾ النسـاء: ٥٩. واتـە: (خۆ ئەگەر لە شتێکدا بوو بەکێشەتان دەربـارەی حـوکمی خـوایی، ئـەوە ئـەو کێشـەیە بگێڕنەوە بۆ لای خواو پێغەمبەرەکەی (ﷺ)).

بۆیە قورئانی پیرۆز داوای کردووە کە باوەڕ بەهـەموو پێغەمبـەران و پەیامبـەران بێنین ﴿ وَٱلَّذِينَ يُؤۡمِنُونَ بِمَآ أُنزِلَ إِلَيۡكَ وَمَآ أُنزِلَ مِن قَبۡلِكَ ﴾ البقـرة: ٤. واتـە: (ئەوانـەی بـاوەڕ دەهێـنن بـەو "پەیامـەی" کـە بـۆ تـۆ "ئـەی محمـد (ﷺ)" دابـەزێنراوە و بـەو پەیامانەش کە بۆ "پێغەمبەران"ی پێش تۆ دابەزێنراوە).

بەڵام ئەو باوەڕەی کە بەپێی شەرع لە ئێمە داواکراوە، کە هـەمان بێـت بـە کتێبـە ئاسمانیـەکان (بـە ئینجیـل و تـەوڕات و زەبـورەوە) ئـەوا مەبەسـت لێـی ئەوەیـە کـە

بڕوامان وابێت كە ئەم كتێبانە لەلایەن خواوە هاتوون و ڕاست بوونە و تەنها بۆ ئەو مەبەستە هاتوون، كە قورئانیش بەهەمان شێوە بۆ تەواو كردنی هاتووە. جا هەرچی لەو كتێبانە هات و پێچەوانەی قورئانی پیرۆز بوو، ئەوا بێ هیچ گومانێك دەستكاری كراوەو بایەخی بۆ دانانرێت.

ئا لێرەوە پێویستە گرنگترین ئەو جیاوازیانە ڕوون بكەینەوە كە قورئان لەگەڵ كتێبە ئاسمانیەكانی تر هەیەتی، ئەمەش لەم خاڵانەی خوارەوە دەیخەینەڕوو:

١- ئەو كتێبانەی كە پێش قورئان دابەزیون ئەوا وێنەو دانە (نسخە) ئەصڵیەكەی نەماوە، بەڵكو تەنها وەرگێردراوەكەی ماوە.

بەڵام قورئان بەو دەربڕین و وشانەی پارێزراوە كە خوای گەورە بۆ پێغەمبەری (ﷺ) ڕەوانە كردووەو بە شێوەیەكی موتەواتر[1] پێمان گەیشتووە.

٢- وتەی هەندێ خەڵكی وەك شەرعزانان و توێژەرەوان (مفسرین) یاخود مێژووناسان ئاوێتە بووە بەم كتێبانە. بەڵام قورئانی پیرۆز هیچ وتەیەكی تێكەڵ نەكردووە و تەنانەت فەرمایشتی پێغەمبەریشی تێكەڵ نەبووە. بۆیە پێغەمبەر (ﷺ) لە سەرەتای دابەزینی قورئان ڕێگری كرد لە نووسینی فەرمووده، تا تێكەڵ نەبێت بە فەرمایشتەكانی قورئانی پیرۆز. هەروەك زانراوە كتێبەكانی (تەفسیر) و (فەرموودە) و (فیقھ)تەواو سەربەخۆن و جیاوازن لە قورئانی پیرۆز.

---

(١) التواتر، لە زمانەوانیدا بریتیە لە: بەدوای یەكدا هاتن، دەڵێیت: (تواتر المطر) واتە: بارانەكە بەدوای یەكدا دەهاتە خوارەوە، موتەواتر: ناوی كارایە(اسم فاعل) كە لە تەواترەوە هاتووە، بریتیە لەو كەسەی كە بەدواداچوون دەكات.

فەرموودەی موتەواتر لە زاراوەی فەرموودەناسان دا: بریتیە لەوەی كە ژمارەیەكی زۆر كەس فەرمایشتێك بگێڕنەوە بەجۆرێك كە بەهەموو شێوەیەك دوورە لە نەریت و عادەت كە ئەمانە لەسەر درۆ كۆببنەوەو هەر لەسەرەتای سەنەدەكە تا كۆتاییەكەیشی پشتی بەستبێت بەشتێكی بەرهەست (بەرهەست وەكو بیستن و هاوشێوەكانی). (بۆ ئەم پێناسەیە كەم و زۆر سوودم بینیوە لە: مباحث في علوم الحدیث: مناع القطان. وەرگێڕ).

٣- هیچ کەسێك نەیتوانیوە، کە بە بەڵگەیەکی مێژووی هیچ یەکێك لەو کتێبانەی کە هەن بسەلمێنێت کە دابەزیوە بۆ ئەو پێغەمبەرەی کە کتێبەکەی دەدرێتە پاڵی. هەروەك ئەو کاتەی کە کتێبەکەش دابەزیوە دیاری نەکراوە.

سەبارەت بە قورئان، ئەوا مێژوو بە بەڵگە گومان هەڵنەگرەکانی ئەوەی سەلماندووە کە دابەزیوە بۆ سەر محمد (ﷺ) و هەندێ لە ئایەتەکانیشی شوێنی دابەزینیان دیاریکراوە.

٤- ئەو زمانە کۆنانەی کتێبە ئاسمانیە کۆنەکان، بۆ ماوەیەکی دوورە کە لە ناوچوون و کەسێك نابینین کە پێی بدوێت و تەنانەت ئەوەی تێشی ئەگات زۆر کەمە.

٥- بەڵام زمانی قورئانی پیرۆز، زمانێکی زیندووەو تا ئێستا سەدان ملیۆن موسڵمان لە گشت شوێنە جیا جیاکانی جیهان پێی دەدوێن.

٥- یاسا و ڕێساکانی سەرجەم کتێبە کۆنەکان - هەروەك لە کاتی خوێندنەوەیدا بەدەردەکەوێت - تایبەت بوونە بەو کات و ئوممەتەی کە کتێبەکەی تیایدا دابەزیوەو بۆ دابین کردنی پێداویستیەکانی و بەپێی بارودۆخەکە دابەزیوە.

لەکاتێکدا یاساو حوکمەکانی قورئان گشتین بۆ سەرجەم خەڵکی و بۆ هەموو سەردەمێك.

٦- هەموو کتێبە کۆنەکان ئەگەرچی بانگەوازی تێدایە بۆ چاکە و خێرو چاکسازی و ڕەوشت بەرزی، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا چاکەکاری هەرە پلەبەرزی لەخۆ نەگرتووە.

بەڵام قورئانی پیرۆز هەموو لایەنەکانی چاکەی لەخۆ گرتووە بە کاملی، جا لە کتێبەکانی پێشوودا هاتبێت یان نا.

٧- دەستکاری کتێبە کۆنەکان کراوەو[١] شتانێك لەو کتێبانەدا هەن کە یەکناگرێت

---

(١) سەیری ئەو بەشە بکە کە زانای گەورە (رحمة الله الهندي) لە کتێبەکەیدا (اظهار الحق)دا نووسیویەتی کە لە میانەیدا دەستکاریکرانی کتێبە ئاسمانیەکانی پێش قورئانی سەلماندووە.

یەكناگرێت لەگەڵ عەقڵ و بەڵكو لەسەر ستەمەوە وەستاوەو شتی پڕوپوچ لەخۆی دەگرێت.

بەڵام قورئان، هەر هەمووی چاكەیە و پاك و دوورە لە هەموو شتێكی خراپ و ناشیاو نابەجێ و شتێكی نییە كە لەگەڵ عەقڵ تێك بگیرێت[1].

٨- شەریعەتە كۆنەكان زیاتر تایبەتمەند بوون بە چارەسەری ڕۆحی، بەڵام شەریعەتی ئیسلامی بنەمای وای دارِشت كە دەسەتەبەركەرە لەوەی چارەسەری كێشەكانی مرۆڤ دەكات و پێداویستیە ماددی و ڕۆحیەكانی لە هەموو كات و شوێنێكا دابین دەكات.

ئا ئەمە ئەو تایبەتمەندیانە بوون كە لەبەر ئەمانە فەرمان بەخەڵكی كراوە كە تەنها شوێنی قورئان بكەون و بەس.

***

(١) بڕوانە: مبادء الاسلام - سید أبي الأعلى المودودي ٨٠ - ٨٣.

# باسی دووەم
# تایبەتمەندییەكانی پێغەمبەرێتی

## سیفەتەكانی پەیامبەران و پێغەمبەران

خوای گەورە هەندێ لێهاتووی تایبەتی، بەشێوازێكی فیترەتی، لە سروشتی هەندێ خەڵكیدا داناوە وەك هێزو هۆنراوەو هونەر.... كە بەهۆیەوە لە خەڵكی تر بەهێزترە. و لێهاتووی و كارامەیی بەرزی داوەتە پێغەمبەران و پەیامبەران بۆ ڕابەرایەتی و سەركردایەتی كردنی خەڵكی و ڕێنمایی كردنیان بۆ سەر ڕێگای ڕاست، بۆیە ناوبراوان خاوەنی هەموو سیفەتێكی چاكن و دوورن لە هەموو ئەو كەمووكوری و كرچ و كاڵیانەی كە لەوان ناوەشێتەوە.

سیفەتەكانی پێغەمبەران و پەیامبەران بریتین لەمانە:

## سیفەتی یەكەم
## پارێزراوی ( العصمة )

پارێزراوی (العصمة) لە زمانەوانیدا: بریتیە لە پاراستن و پارێزراو بوون.

لە زاراوەشدا:میهرەبانی و بە بەزەیی و بەخششێكی خواییە. كە مرۆڤ بەرەو چاكە كێش دەكات و دووری ئەخاتەوە لە خراپە، لەگەڵ ئەوەی كەسەكە هەر سەرپشك و خاوەن ویستە، تا پرۆسەی تاقیكردنەوەكە هەر بێتەجێ[1].

یاخود بە پێناسەیەكی تر:

بریتیە لەوەی خوای گەورە تاوان و گوناه لە كەسەكان دروست نەكات[2].

جا گوناهەكە چ گەورە یان بچوك بێت.

---

(١) المسامرة ٢٢٩.

(٢) الدواني على العقيدة العضُدية ٢٧٩/٢ و المواقف ٥٧٥.

# جۆری یەكەم
# پارێزراوی لە گوناهی گەورە

گوناهە گەورەكان چەند پێناسەیەكی جیا جیایان هەیە، ڕاسترینیان:

گوناهی گەورە بریتیە لە: هەموو ئەو تاوانانەی كە بەهۆی ئەنجامدانی سزا (حەدی) لێ دەرئەكرێ یاخود هەڕەشەی ئاگری دۆزەخ لە ئەنجامدەرانی كرابوو یان باسی نەفرەت یاخود توڕەیی كرابوو لە مەڕ ئەنجامدەرانی.

بەڵام گوناهە بچوكەكان بریتیە لەو: تاوانانەی كە سزای دونیایی لەسەر نەبێت و هەڕەشەشی لێنەكرابێ لە دوارۆژدا[1].

**یەكەم: پارێزراو بوون لە كوفرو بێ باوەڕی:**

زۆربەی موسڵمانان كۆكن، لەسەر ئەوەی كە پێغەمبەران (سەلامیان لێبێت) پارێزراون لە كوفرو بێ باوەڕی، بەر لەوەی سروش و نیگایان بۆ بێت و پاش سروش بۆ هاتنیشیان، تەنانەت لە تەمەنی منداڵیشدا پارێزراون لە كوفرو بێ باوەڕی، چونكە لەم تەمەنەدا شوێنكەوتەی دایك و باوكیانن، ئەوانیش باوەڕیان بەخوا هەبووەو حەقیقەت و ڕاستیان ناسیوە، بۆیە لە تەمەنی منداڵیشدا هەر دوور بوونە لە كوفر[2].

**دووەم: پارێزراو بوون لە درۆ كردن:**

ڕاستگۆیی (الصدق): بریتیە لەوەی حوكمی هەواڵەكە یەكگر و یەك شت بێت لەگەڵ بارودۆخ و واقیعدا.

ڕاستگۆیی، سێ جۆری هەیە:

---

(١) شرح العقيدة الطحاوية - ابن أبي العز ٣٥٦ و الشورى بين النظرية و التطبيق - قحطان الدوري ١١٤-١١٥.

(٢) ابن قطلوبغا على المسايرة ٢٢٧-٢٢٨ سەیری ئەمانەش بكە: الدوانی: سەرچاوەی پێشوو، و شرح العقائد النسفية - التفتازاني ١٣٦ و شرح المقاصد ١٩٣/٢، و المواقف ٥٦٧ و لوامع الأنوار ٣٠٤/٢.

١- ڕاستگۆیی له بانگەشەی پەیامبەرایەتی دا.
٢- ڕاستگۆیی لەو حوكم و یاسا و ڕێسایانەی كە لەلایەن خواوە هێناویانە و بە خەڵكەكەی ڕادەگەیەنن.
٤- ڕاستگۆیی له هەموو ئەو فەرمایشتانەی دەیكەن لەبارەی كاروباری دونیاوە[١].

پێچەوانەكەیشی: درۆیە.

هەرگیز پێغەمبەران درۆ ناكەن بە ئەنقەست، هەروەك چۆن گشت تاقمە خاوەن بانگەوازەكان لەسەر ئەمە كۆكن، و زۆربەی زانایان پێیان وایە كە هەرگیز پێغەمبەران درۆ ناكەن بە هۆی لەبیر چوونەوەو هەڵەوە. ئەم ڕایە كۆڵەگە و ڕاست و ڕێكە هەروەك زانا لێكۆڵەرەكان ئەمەیان سەلماندووە[٢].

## بەڵگەی عەقڵی لەسەر ڕاستگۆیی پێغەمبەران:

أ- ئەگەر دروست بووبایە بۆ پێغەمبەران درۆ بكەن، ئەوا ئەو كاتە هەواڵی خوای گەورە درۆی تێئەكەوت، ئەمەش هەرگیز نابێت، چونكە خوای گەورە ڕاستگۆیی ئەوانی بە چەندین موعجیزەو دەراسا سەلماندووە[٣].

ب- درۆ تاوان و گوناهە، پێغەمبەرانیش له تاوان پارێزراون.

پ- ئەگەر درۆیان بكردایە، خەڵكیش ئەوەی بزانیایە كە درۆزنن، ئەوا سوودی پەیامبەرایەتی و پەیامداری نەدەما[٤].

بەڵگەی نەقڵی لەسەر ڕاستگۆییان:

أ- خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿وَٱلنَّجۡمِ إِذَا هَوَىٰ ١ إِنۡ هُوَ إِلَّا وَحۡيٞ يُوحَىٰ ٤﴾ النجم: ٣ - ٤. واتە: (قسەو گوفتاریشی "ئەوەی كە قورئانە" لە ئارەزوو بازی و هەواو

---

(١) رسالة في التوحيد - الطائي ٦٧ و الدردير ١٠٥.

(٢) المواقف ٥٦٧ و الدواني ٢٧٩/٢ و شرح العقائد النسفية ١٣٦ و لوامع الأنوار ٣٠٧/٢ و الوسيلة ٦٩٥.

(٣) المواقف و الدردير و الطائي و لوامع الأنوار سەرچاوەكانی پێشوو، و الباجوري في شرح الجوهرة ٢٤/٢.

(٤) رسالة في التوحيد، سەرچاوەی پێشوو.

هەوەسەوە نییە. ئەمەی كە ڕای دەگەیەنێت تەنها نیگاو وەحی خواییە).

ب- خــوای گــەورە دەفــەرموویێت: ﴿ وَصَدَقَ ٱلْمُرْسَلُونَ ﴾ یــس: ٥٢. واتــە: (پێغەمبەرانیش لە هەواڵدانیان ڕاستیان كردووە).

پ- خــوای گــەورە دەفــەرموویێت: ﴿ وَلَوْ تَقَوَّلَ عَلَيْنَا بَعْضَ ٱلْأَقَاوِيلِ ﴿٤٤﴾ لَأَخَذْنَا مِنْهُ بِٱلْيَمِينِ ﴿٤٥﴾ ثُمَّ لَقَطَعْنَا مِنْهُ ٱلْوَتِينَ ﴿٤٦﴾ فَمَا مِنكُم مِّنْ أَحَدٍ عَنْهُ حَاجِزِينَ ﴿٤٧﴾ ﴾ الحاقـة: ٤٤ - ٤٧. واتـە: (خـۆ ئەگەر محمد (ﷺ) هەندێك قسەو گوفتار بەدەم ئێمـەوە هەڵبەستایە. ئـەوە بـەهێزو دەسـەڵاتی خۆمـان دەمـانگرت. لـەوەدوا ڕەگـی دڵـی دەپچـڕێنین و دەیمـرێنین. ئەوسـا هیچ كەسێك نییە لە ئێوە بەرەبەست و بەرگری بكات لە ئێمە).

ت- لە فەرموودەدا هاتووە، وتیان: ئەی پێغەمبـەری خـوا ((انـك تـداعبنا)) واتـە: تۆ گاڵتـەمان لەگـەڵ دەكـەی، ئـەویش فـەرمووی: ((إنـي لا أقـول الا حقـا)) واتـە: مـن تەنها قسەی ڕاست و حەق ئەڵێم.

ئینجا ئەو شتەی لـە ڕووكەشـدا وائەگەیـەنێت كـە پێغەمبـەران جـار جـار درۆیـان كردووە، هەروەك لەبارەی بەسەرهاتی پێغەمبەر ئیبراهیم (سەلامی لێ بێـت) هـاتووە، كاتێـك بتــەكانی شـكاند و تــەنها بتــە گەورەكـەی هێشـتەوە، جـا كــە پرسـیاری لـێ كــــــرا﴿ قَالُوٓاْ ءَأَنتَ فَعَلْتَ هَٰذَا بِـَٔالِهَتِنَا يَٰٓإِبْرَٰهِيمُ ﴿٦٢﴾ قَالَ بَلْ فَعَلَهُۥ كَبِيرُهُمْ هَٰذَا فَسْـَٔلُوهُمْ إِن كَانُواْ يَنطِقُونَ ﴿٦٣﴾ ﴾ الأنبيــاء: ٦٢ - ٦٣. واتــە: (وتیــان: باشــە، ئــەی ئیبڕاهیم ئایا تۆ ئەمەت كردووە بە خواكانمان؟!. ئیـبڕاهیم وتـی: نـەخێر؛ هـەر كـاری ئەو بتە زلەیە، دە لێیان بپرسن ئەگەر قسە دەكـەن و تـێ دەگـەن). جـا ئەمـە كـە بـە ڕووكـەش بــە درۆ دەرئەكـەوێت ئــەوا تــەئویل ئــەكرێت و لێـك ئەدرێتــەوە كــە مەبەسـتی پێغەمبــەر ئیــبراهیم (ســەلامی لــێ بێــت) سەرزەنشــت كــردن و گاڵتــە پێكردنیان بووە، چونكە تەنها و تـەنها پێغەمبـەر ئیـبراهیم لـەلای بتـەكان بـوو جـا چ سوودێكی هەیە بپرسن كێ بتەكانی ئێمەی شكاندووە[1]؟

---

(١) الصاوي على الدردير ١٠٥ و تفسير البيضاوي ٣٢١.

وتراوە واتای فەرمایشتەكەی ئیبراهیم ئەوەیە: كە لە بتەكان بپرسن، چونكە ئەگەر بدوێن درۆ ناكەن، جا ئەگەر نەدوێن ئەوا ئیبراهیم ئەنجامدەری كارەكە نەبووە. لە ناوەرۆكی ئەو قسەیەشدا پێغەمبەر ئیبراهیم دان دەنێت بەوەی كە خۆی بكەرەكە بووە. ئەم وتەیەی لەبواری توانج و پەلارە (معاریض)ە و لە پەلار تێگرتنیشدا هیچ نرخێك بۆ درۆ دانانرێت، و هەر ئەمەشە كە (قرطبي[1])بەڕاستی داناوەو قسەی تریش لەم بارەوە گوتراوە[2].

**سێیەم: پارێزراو بوون لە گوناهە گەورەكانی تر:**

لێرەدا بارودۆخی ئەنجامدانی گوناهی گەورە، لەلایەن پێغەمبەران و پەیامبەران، چ پێش یاخود پاش نیگا و سروش بۆ هاتنیان ڕوون دەكەینەوە.

**قۆناغی پێش پێغەمبەرایەتی:**

پێغەمبەران بەر لە قۆناغی پێغەمبەرایەتی پارێزراون لە گوناهی گەورە، كە دەبێتە هۆی دووركەوتنەوەی خەڵكی لێیان، ئەمەش وەك خراپەكاری دایكان و باوكان[3].

**قۆناغی دوای پێغەمبەرایەتی:**

پارێزراون لە ئەنجامدانی تاوانی گەورە بە ئەنقەست، ئەمە بۆچوونی زۆربەی پێشەواو گەورە زانا لێكۆڵەرەكانە. و بەهەمان شێوەش پارێزراون كە بەهۆی لەبیر چوونەوە یان بە تەئویلی هەڵەوە گوناهی گەورە ئەنجام بدەن، ئەمە بۆچوونی ڕاست

---

و فەرموودەی (المداعبة) لە (سنن الترمذي) هاتووە، لە: كتاب البر - ما جاء في المزاح ٢٠٦/٦ و ئەمە فەرموودەیەكی (حسن الصحیح)ە.

(١) تفسیر القرطبي ٤٣٤٠/٦.

(٢) تفسیر البیضاوي و سەرچاوەیپێشوو و تەفسیرەكانی تر.

(٣) شرح العقائد النسفیة - التفتازاني ١٣٦ و الدواني ٢٧٩/٢ كة وەریگرتووە لە شرح العقائد. و سەیری چەند بۆچوونێكی تر بكە لە: المواقف ٥٦٨ و الدوانی علی الوسیلة ٦٩٥.

و دروستە لەم بارەیەوە[1].

***

# جۆری دووەم
# پارێزراوی لە گوناهی بچوك

گوناهی بچوك دوو جۆرن:

أ- ئەو گوناهە بچوكانەی كە بێ نـرخن و زۆر خـراپن كـە ئەنجامدەرەكـەی دەباتـە ڕێزی كەسانی بێ نـرخ و كـەم، وەك دزی دەنكێـك یـاخود پاروێـك یـاخود تـەرازوبازی كردن بە خورمایەك.

جا پێغەمبـەران لـەم جـۆرە گوناهانـە پـارێزراون. پـێش پێغەمبەرایـەتی[2] و دوای ڕەوانـە كرانیشـیان و لـەكاتی پێغەمبەرایـەتی دا لێـی پـارێزراون، ئـەم جـۆرە كـارە بـێ نـرخانـە نـە بـە ئەنقەسـت و نـە بـەهۆی لەبیرچـوونەوە ئـەم تاوانـە بچـوكانە ئـەنجام نادەن، بۆچوونەكان كۆكن لەسەر ئەمە[3].

ب- گوناهە بچوكەكانی تر:

پێغەمبەران پێش ڕەوانەكرانیان پـارێزراو نـین لێـی چ بـە ئەنقەسـت و چ بـەهۆی لەبیر كردنەوە.

بـەڵام دوای ڕەوانـەكرانیان و لـە قۆنـاغی پێغەمبەرایـەتی پـارێزراون، لـەوەی بـە ئەنقەسـت ئـەم جـۆرە تاوانـە بكـەن، بـەڵام ئـەكرێ بـەهۆی لەبیرچـوونەوە گونـاهی لەوجۆرە ئەنجام بدەن، بەڵام بەردەوام نابن لەسەر گوناهەكە و خـوای گـەورەش ڕایـان ناگرێت لەسەر ئەم حاڵەتـە، بـەڵكو ئاگـادار دەكرێنـەوەو ئـەوانیش بـە ئاگـا دێنـەوە. و ئەمـە بۆچـوونی زانـا لێكۆڵـەرەكان و فەرموودەناسـان و پێشـینە چـاكەكانە (السـلف

(١) المواقف ٥٦٧ و الوسيلة سەرچاوەی پێشوو و بەراوردی بكە بە شرح العقائد - التفتازاني ١٣٦.

(٢) شرح العقائد - التفتازاني و شرح الدواني ،سەرچاوەكانی پێشوو.

(٣) المواقف و شرح العقائد و الوسيلة سەرچاوەكانی پێشوو، و المسامرة ٢٣٣.

**الصالح)[1] لەبەر ئەم فەرمایشتەی پێغەمبەر (ﷺ): ((انما أنا بشرٌ أنسي كما تنسَون، فاذا نسيت فذّكروني)) بخاری و مسلم[2] و جگەلەوانیش دەریانهێناوە. واتە: (منیش مرۆڤم شت لەبیر ئەكەم چۆن ئێوە شت لەبیر ئەكەن، جا ئەگەر شتێكم لەبیر كرد بەبیرم بێننەوە).**

***

# بەڵگەی پارێزراوی پێغەمبەران

**زانایان بەڵگەی زۆریان هێناوەتەوە لەسەر پارێزراوی پێغەمبەران:**

**١- ئەگەر پێغەمبەران گوناهیان بكردبووبا، ئەوا دروست نەدەبوو خەڵكی شوێنیان بكەون لەبەر گوناهەكانیان، سەرباری ئەوەی شوێنكەوتنیان پێویست و فەرزە، بە بەڵگەی یەكدەنگی و لەبەر ئەم فەرمایشتەی خوای گەورە ﴿ قُلۡ إِن كُنتُمۡ تُحِبُّونَ ٱللَّهَ فَٱتَّبِعُونِي يُحۡبِبۡكُمُ ٱللَّهُ ﴾ آل عمران: ٣١. واتە: ("ئەی پێغەمبەر (ﷺ) بە ئیمانداران" بڵێ: ئەگەر ئێوە خواتان خۆش دەوێت دە شوێنی من بكەون و لە فەرمانی من دەرمەچن).**

**٢- ئەگەر گوناهیان كربا، ئەوا شایەتی و گەواهییەكەیان وەرنەدەگیرا، چونكە بە یەكدەنگی زانایان كەسی لاسارو تاوانكار شایەتی لێ وەرناگیرێت، و بە بەڵگەی ئەم فەرمایشتەی خوای بەرز:﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِن جَآءَكُمۡ فَاسِقُۢ بِنَبَإٖ فَتَبَيَّنُوٓاْ ﴾ الحجرات: ٦. واتە: (ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە ئەگەر كەسێكی متمانە پێ نەكراو هەواڵێكی گرنگی بۆ هێنان؛ خێرا بڕوای پێ مەكەن، بەڵكو سەرنج بدەن، لێی بكۆڵنەوە تا**

---

(١) الدواني ٢٧٩/٢ و شرح المقاصد ١٩٣/٢ و المواقف و شرحه ٥٦٨ و لوامع الأنوار ٣٠٤/٢ و المسايرة و المسامرة عليها ٢٣٢ و چەند ڕاو بۆچوونێكی تر هەن لەم سەرچاوانەدا و لە: شرح العقائد ١٣٦ و الوسيلة ٦٩٥.

(٢) المسايرة و المسامرة عليها ٢٣٤. كەمێك بەرلەمە چۆنیەتی دەرهێنان و تەخریجی فەرموودەكەمان خستەڕوو.

**بۆتان ڕوون دەبێتەوە). چونکە ئەو کەسەی شایەتی لێ وەرنەگیرێت لەسەر شتێکی بێ بایەخی لەناوچووی دونیا، ئەوا چۆن گوێ بۆشایەتیەکەی دەگیرێت لە ئایینی تۆکمە و پیرۆزدا؟**

**٣- ئەگەر گوناهیان بکردایە، ئەوا پێویست دەبوو ڕێگریان لێ بکرێت و بەتووندی قەدەغە بکرێن، لەبەر ئەوەی بەشێوەیەکی گشتی پێویست و فەرزە فەرمان بە چاکە و ڕێگری لە خراپە بکرێت. بێگومان ڕێگری کردن لە پێغەمبەران ئازاردانیانە، ئازار دانیشیان بە یەکدەنگی زانیایان حەڕامە، هەروەك خوای گەورە لەم بارەوە دەفەرموویێت:** ﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ يُؤۡذُونَ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ لَعَنَهُمُ ٱللَّهُ فِي ٱلدُّنۡيَا وَٱلۡأٓخِرَةِ وَأَعَدَّ لَهُمۡ عَذَابٗا مُّهِينٗا ﴿٥٧﴾ ﴾ الأحزاب: ٥٧. **واتە (بێگومان ئەوانەی ئازاری خواو پێغەمبەرەکەی دەدەن خوا نەفرینی لێ کردوون لە دونیا و قیامەتدا سزایەکی زۆر خەجاڵەت ئاوەرو سەرشۆڕکەریشی بۆ ئامادە کردوون).**

**٤- ئەگەر گوناهیان کردبووبا، ئەوا شیاوی سزاو لۆمەو سەرزەنشت دەبوون، چونکە بەشێوەیەکی گشتی دەچوونە ژێر ئەم فەرمایشتەی خوای گەورە:** ﴿ وَمَن يَعۡصِ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ فَإِنَّ لَهُۥ نَارَ جَهَنَّمَ خَٰلِدِينَ فِيهَآ أَبَدًا ﴾ الجن: ٢٣. **واتە: (ئەوەی لە خواو پێغەمبەرەکەی یاخی ببێت ،ئەوە با دڵنیا بێت کە دۆزەخی بۆ ئامادە کراوە بۆ هەمیشە و هەتا هەتایی). ئەم فەرمایشتە:** ﴿ أَتَأۡمُرُونَ ٱلنَّاسَ بِٱلۡبِرِّ وَتَنسَوۡنَ أَنفُسَكُمۡ وَأَنتُمۡ تَتۡلُونَ ٱلۡكِتَٰبَ ﴾ البقرة: ٤٤. **("کەی ئەوە ڕاستە" فەرمانی چاکە بە خەڵکی بدەن و خۆتان فەرامۆش بکەن؟! لە کاتێکدا خۆ ئێوە کتێبی خوا - تەورات - دەخوێننەوە). بەڵام پێغەمبەران بە یەکدەنگی زانایان لەم جۆرە شتانە زۆر دوورن، چونکە شتی زۆر قێزەونن.**

**٥- فەرمایشتەکەی خوای گەورە لەبارەی ئیبراهیم و ئیسحاق و یەعقوب:** ﴿ إِنَّهُمۡ كَانُواْ يُسَٰرِعُونَ فِي ٱلۡخَيۡرَٰتِ ﴾ الأنبياء: ٩٠. **واتە: (بەڕاستی ئەوانە چالاك و گورج و گۆڵ بوون لە ئەنجامدانی هەموو خێرو چاکەیەکدا). هەموو**

جۆرێکی چاکە دەگرێتەوە چ بە کردنی چاکە چ بە خۆ دوور گرتن لە خراپە، و ئەم فەرمایشتە: ﴿ وَإِنَّهُمْ عِندَنَا لَمِنَ ٱلْمُصْطَفَيْنَ ٱلْأَخْيَارِ ﴿٤٧﴾ ﴾ ص: ٤٧. واتە: (بەڕاستی ئەوانە لای ئێمە لەو کەسانەن کە هەڵمان بژاردوون و پەسەندمان کردوون). مەبەستی ئەوەیە: کە لە هەموو بوارو کاروبارێکدا هەڵبژێراو و کارپەسەند بوونە و بۆیە نابێت گوناهیان لێ بپشکوێتەوە[1].

٦- ئەگەر دروست بووبایە بۆ پێغەمبەران کە ناپاکی بکەن لەگەڵ خوای گەورە، بەهۆی ئەنجامدانی کارێکی حەڕام یاخود ناپەسەن (مکروه)، ئەوا ئەو کارە حەڕامە یاخو ناپەسەندە دەبووە پەرستش و گوێڕایەڵی، چونکە خوای گەورە فەرمانی بەئێمە کردووە، گوێڕایەڵیان ببین و شوێن کردارو گوفتاری ئەوان بکەوین بەشێوەیەکی گشتی. جا هەر شتێك ئەوان ئەنجامیان داوە، ئێمەش فەرمانمان پێکراوە کە ئەنجامی بدەین، و هەر شتێکیش فەرمانمان پێکرا بێت ئەوا گوێڕایەڵییە، چونکە خوای گەورە فەرمان بە خراپە ناکات[2].

## ئەوەی لەبارەی پێغەمبەران هاتووەو لە ڕووکەشدا بە گوناه دەردەکەوێت:

جا ئەوەی بە ڕێگەی تاکە کەسی (ئاحاد) هاتووە ئەوا ڕەت ئەکرێتەوە، چونکە هەڵە خستنە پاڵی گێڕەڕەوەکان ئاسانترە لەوەی ئەنجامدانی تاوان بخرێتە پاڵ پێغەمبەران.

ئەوەش کە بەڕێگەی (تەواتر) هاتووە، ئەوا پێویستە تەفسیر بکرێت بەوەی:

بەهۆی لەبیر چوونەوەیە یان هەڵەیەکە پێش پێغەمبەرایەتی بووە، یان گوناهێکی بچوکە یان ئەمە تاوان نییە بەڵکو وەلانانی چاکترین و ئەنجامدانی ئەوەی

---

(١) المواقف و شرحه ٥٦٨-٥٦٩ و شرح العقائد ١٩٣-١٩٤ و چەند بەڵگەیەکی تریان تێدایە لەترسی درێژبوونەوە نەمان هێناوە.

(٢) الدردير على الخريدة ١٠٥ و الباجوري على السنوسية ٤٢ و٤٣.

کە تەنها چاکەکەی کەمترە[1].

کاتێك پێغەمبەر کاری چاکتر فرامۆش ئەکات کە دەقێکی ڕاشکاوی لەبارەوە نەهاتبێت. جا ئا لەو کاتەدا بە تێڕوانین و هزری خۆی بەکار ئەخات تیایدا و سەرەتا کۆششی خۆی ئەکات، لەگەڵ ئەمەشدا هەڵە دەکات و سەرزەنشتی دەکرێت لەسەر ئەوەی شتە چاکترەکەی فەرامۆش کردووە.

نمونەی ئەو دەقانەی کە لە ڕووکەشدا تاوان و سەرلێشێواوی دەگەیەنن:

**یەکەم:** ئەوەی لەبارەی سەرگوزەشتەی ئادەم (سەلامی لێ بێت) لە قورئانی پیرۆزدا هاتووە:

﴿ وَعَصَىٰٓ ءَادَمُ رَبَّهُۥ فَغَوَىٰ ﴾ طـه: ١٢١. واتە: (ئا بەم شێوەیە ئادەم یاخی بوو لە پەروەردگاری و فریوی خوارد و ڕێگای لێ تێکچوو).

جا یاخی بوون و فەرمان شکاندن لە گوناهە گەورەکانە، بە بەڵگەی ئەم فەرمایشتەی خوای گەورە: ﴿ وَمَن يَعْصِ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ فَإِنَّ لَهُۥ نَارَ جَهَنَّمَ خَـٰلِدِينَ فِيهَآ أَبَدًا ﴿٢٣﴾ ﴾ الجن: ٢٣ . واتە: (ئەوەی لە خواو پێغەمبەرەکەی یاخی ببێت ئەوە با دڵنیا بێت کە دۆزەخی بۆ ئامادە کراوە).

سەر لێشێواوی و فریخواردن (غواية) شوێنکەوتنی شەیتانە، بە بەڵگەی ئەم فەرمایشتەی خوای گەورە: ﴿ إِلَّا مَنِ ٱتَّبَعَكَ مِنَ ٱلْغَـٰوِينَ ﴾ الحجر: ٤٢. واتە: (جگە لەوانەی کە شوێنت کەوتوون لە سەرکەش و یاخی و سەرگەردانەکان). و ئەم فەرمایشتە: ﴿ فَأَزَلَّهُمَا ٱلشَّيْطَـٰنُ عَنْهَا فَأَخْرَجَهُمَا مِمَّا كَانَا فِيهِ ﴾ البقرة: ٣٦. واتە: (شەیتان لە خشتەی بردن و لەو شوێنە بەدەر کردنی دان). و دەرکرانیان لە بەهەشت بەهۆی ئەوەی شەیتان لە خشتەی بردن، بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە ئەو کارەی ئەنجامیان داوە گەلێك گەورە بووە.

(١) شرح المقاصد ٢/١٩٤ و سەیری ئەمانەش بکە: شرح العقائد - التفتازاني و العصام عليه ١٣٦-١٣٧ و الدواني ٢/٢٧٩ وەریگرتووە لە: شرح العقائد و المولقف و شرحه ٥٦٩.

ئادەم ئەو فەرمانەی شكاند كە قەدەغـەی كردبـوو لـە دارەكـە بخـۆن، ئەنجامـدانی شتی قەدەغەش گوناهو تاوانە.

**وەڵامی ئەدەمەوە بەوەی:**

ئەمە بەر لە پێغەمبەرایەتی بـوو، چـونكە ئـادەم لـە بەهەشـتدا هـیچ ئوممـەتێكی نەبووە.

ئەنجامدانی ئەم تاوانە بەهۆی لەبیرچوونەوە بـوو، بـە بەڵگـەی ئـەم فەرمایشـتەی خـوای گـەورە:﴿ فَنَسِيَ وَلَمْ نَجِدْ لَهُۥ عَزْمًا ﴾ طـه: ١١٥. واتـه: (كەچـی بـیری چـوو، لـە حاڵێكدا نەمانبینی پێشتر بڕیاری كردنی ئەو سەرپێچیە بدات).

یاخود هەڵەیەك بووە، بەوەی ئادەم (سەلامی خوای لێبێت) واگومانی بردووە كـە خـودی دارێك قەدەغە كراوە دواتر لێی تێكەڵ بووە لەگەڵ دارێكی هاوشێوەی دەرەكە[1].

**دووەم:** ئەوەی هاتووە لە سەرگوزەشتەكەی موسادا (سەلامی لێ بێـت) كـە كەسـە میسرییەكەی كوشت ﴿ فَوَكَزَهُۥ مُوسَىٰ فَقَضَىٰ عَلَيْهِ ﴾ القصص: ١٥. واتـە: (موسـاش بـۆكزێكی لە كابرادا و كوشتی).

كوشتنی كابرا میسرییەكە دەستدرێژی بوو، بە بەڵگـەی ئـەم فەرمایشـتەی خـوای گـەورە:﴿ قَالَ هَٰذَا مِنْ عَمَلِ ٱلشَّيْطَٰنِ ﴾ القصص: ١٥. واتـە: (موسـا پەشـیمان بـۆوە لەبـەر خۆیەوە وتی: ئـەم كـارە شـەیتان پێـی كـردم). و ئـەم فەرمایشـتە:﴿ قَالَ رَبِّ إِنِّي ظَلَمْتُ نَفْسِي فَٱغْفِرْ لِي ﴾ القصص: ١٦. واتە: (وتی: پەروەردگارا من بەڕاستی ستەمم لـەخۆم كـرد كاتێك لە دەستم دەرچوو، ئەو كابرایەم كوشت، لێم ببورەو بمبەخشە).

و ئـــەم فەرمایشـــتەی خـــوای پـــاك و تـــاك: ﴿ قَالَ فَعَلْتُهَآ إِذًا وَأَنَا۠ مِنَ ٱلضَّآلِّينَ ٢٠ ﴾ الشـعراء: ٢٠. واتـە: (ئـەو كاتـە ئـەوەمكرد، لـە نەزانـەكان بـووم "نـەم دەزانـی بـەوە دەمرێت").

---

(١) شرح الدواني و المواقف و شرحه سەرچاوەكانی پێشوو.

**وەڵامی ئەدەمەوە:**

کاتێك میسرییەکەی کوشت پێش پێغەمبەرایەتی بوو و دروستە کە کوشتنەکەی بە هەڵە بووبێت و ئەو وتانەی کە پێغەمبەر موسا (سەلامی لێبێت) کردوویەتی دەکرێت لێکی بدەینەوە بەوەی لەبەر خاکی بوون و خۆبەکەم زانی و بۆ دەروون پەروەردە کردن بووە[1].

**سێیەم:** ئەو دەقانەی لەبارەی پێغەمبەرمان (ﷺ) هاتووە، بۆ نمونە:

١- ئەم فەرمایشتەی خوای گەورە: ﴿ وَٱسۡتَغۡفِرۡ لِذَنۢبِكَ ﴾ غافر: ٥٥، و محمد: ١٩.واتە: (داوای لێ خۆش بوونیش بکە بۆ گوناهەکانت). و ئەم فەرمایشتە: ﴿ لَّقَد تَّابَ ٱللَّهُ عَلَى ٱلنَّبِيِّ ﴾ التوبة: ١١٧. واتە: (سوێند بەخوا بەڕاستی خوا تەوبەی قبوڵ کر لە پێغەمبەر..).

ئەم فەرمایشتە: ﴿ لِّيَغۡفِرَ لَكَ ٱللَّهُ مَا تَقَدَّمَ مِن ذَنۢبِكَ وَمَا تَأَخَّرَ ﴾ الفتح: ٢.واتە: (تا خوا لە هەموو گوناهی ڕابردوو و ئایندەشت خۆش ببێت). خوای گەورە لەو فەرمایشتانەدا تاوانی خستۆتە پاڵ پێغەمبەر و لێشی خۆش بووە، جا کاتێك تەوبە دێتە گۆڕێ کە تاوان هەبێت.

**وەڵامی ئەدەمەوە:**

بەوەی ئەو گوناهانە پێش پێغەمبەرایەتی بوونە یان مەبەست لێی ئەوە دەگرێتەوە کە هەڵەی کردووە یان کردەوەی چاك و چاکتر هەبووەو چاکەکەی ئەنجامداوەو هەوڵی ئەنجامدانی چاکترەکەی نەداوە یاخود گوناهی هۆزەکەی دراوەتە پاڵ ئەو، چونکە سەرۆکی هۆزەکە لەوانەیە کردەوەی ئەندامان و شوێنکەوتووانی هۆزەکەی بدرێتە پاڵی. واتە: ئەی پێغەمبەر داوای لێ خۆشبوون بکە بۆ تاوانی گەلەکەت. یان خوای گەورە خۆشبووە لە گوناهەکانی ئومەتی پێغەمبەر. و تا لە

---

(١) شرح المواقف ٥٧١ و بڕوانە: شرح المقاصد ١٩٦/٢.

پێناو و لەبەر خاتری تۆ لە تاوانی ڕابردوو و داهاتووی ئوممەتەكەت خۆش ببێت[1].

٢- و ئـەم فەرمایشـتەی خـوای گـەورە: ﴿ عَبَسَ وَتَوَلَّىٰٓ ۝١ أَن جَآءَهُ ٱلۡأَعۡمَىٰ ۝٢ ﴾ عبس: ١- ٢. واتە: (ڕووی گرژ كرد و ڕووی وەرگێڕا. لەبەر ئەوەی نابینایەك هات بۆ لای).

**وەڵامی ئەدەینەوە:**

بـەوەی سەرزەنشـتی كـراوە لـەوەی ئـەو شـتەی نـەكردووە كـە زیـاتر و چـاكتر گونجـاوترە لەگـەڵ ڕەوشـتە مەزنەكـەی پێغەمبـەر (ﷺ)، بەهـەمان شـێوە كەسـێك هاوشـێوەو هاوڕەوشـتی پێغەمبـەر (ﷺ) بێـت لەسـەر هـەمان شـت كـە باسـكرا سەرزەنشت دەكرێت[2]، جا پێغەمبەر لە كۆشش (اجتهاد)ەكەیدا هەڵەی كـرد، بـەوەی ڕووی گرژ كرد لە بەرامبەر (ابن أم مكتوم)ی نابینا، كاتێك هات پرسیاری لێكـرد، لـە بارەی ئایین، چونكە پێغەمبەر پێی وابوو كە سـەركردەكانی قـوڕەیش لەوانەیـە ڕووی دڵیان بۆ لای ئـەو بچـێت و موسـڵمان بـبن و لەوانەیـە ئەگـەر ڕوویـان لـێ وەربگێڕێـت ببێتە هۆی زیاتر دوور كەوتنەوەیان لە ئیسلام.

بۆیە پێغەمبەر (ﷺ) زیاتر سـەرقاڵ بـوو بـەوان نـەوەك بـە (ابـن أم مكتـوم) كـە نابینا و موسڵمانیش بـوو لەهـەمان كاتیشـدا بـۆ ئـەوە هـاتبوو، زانیـاری زیـاتر دەسـت بخات لەسەر ئیسلام. جا بۆیە چاكتر وابـوو كـە پێغەمبـەر (ﷺ) ڕووی گـرژ نـەكردبا و ڕووی وەرنـەگێڕابا لـە نابیناكـە بـەڵكو پێویسـت بـوو زیـاتر نـەرم و نیـان بووبایـە لەگەڵیان لەبەر ئەو پلەوپایەی كە هەیەتی كە موسڵمانێتیە.

٣- ئـەم فەرمایشـتەی خـوای گـەورە:﴿ عَفَا ٱللَّهُ عَنكَ لِمَ أَذِنتَ لَهُمۡ ﴾ التوبـة: ٤٣. واتە: (خوا لێت خۆش بێت "ئەی پێغەمبەر (ﷺ)" بۆ مۆڵەتت پێدان).

**وەڵامی دەدەینەوە:**

ئەمە نەرموو نیانیە لە دوواندنـدا و سـەرزەنشـت كردنـە لـە ئـەنجام نـەدانی شـتی

(١) شرح المواقف ٥٧٤-٥٧٥، و شرح المقاصد ٢/١٩٧.

(٢) شرح المقاصد ٢/١٩٧، و المواقف و شرحه ٥٧٥.

چاكتر له پێناو ئەنجامدانی شتی لەو نزمتر، تەنانەت ئەمە ڕێنمایی كردنە بۆ ئەوەی دوور بین تر بێت و تێشووی زیاتری چاكە ئامادە بكات[1]. جا پێغەمبەر (ﷺ) مۆڵەتی دا بە هەندێ كەس كە بیانو و پاساوی درۆیینیان هێنایەوە (كە واباشتر بوو ئەو پاساوانەی لەوان قبوڵ نەكردبایە) بەمەش دواكەوتن لە جەنگی (تەبوك) و ئەو كەسەی شتی چاكتر بۆ شتی ئاسایی لە بارودۆخی جەنگدا فەرامۆش بكات ئەوا سەرزەنشت دەكرێت.

٤- ئەم فەرمایشتەی خوای پایەبەرز:﴿ مَا كَانَ لِنَبِيٍّ أَن يَكُونَ لَهُۥٓ أَسْرَىٰ حَتَّىٰ يُثْخِنَ فِي ٱلْأَرْضِ ۚ تُرِيدُونَ عَرَضَ ٱلدُّنْيَا وَٱللَّهُ يُرِيدُ ٱلْـَٔاخِرَةَ ۗ وَٱللَّهُ عَزِيزٌ حَكِيمٌ ﴿٦٧﴾ لَّوْلَا كِتَٰبٌ مِّنَ ٱللَّهِ سَبَقَ لَمَسَّكُمْ فِيمَآ أَخَذْتُمْ عَذَابٌ عَظِيمٌ ﴿٦٨﴾ ﴾ الأنفال: ٦٧ - ٦٨. واتە: (بۆ هیچ پێغەمبەرێك نەبووە كە دیلی هەبێت، هەتا كاتێك چاك پایەدار و جێگیر دەبێت لە زەویدا، "مەگەر" كەل و پەل و شتومەكی دونیاتان دەوێت؟! لە كاتێكدا خوا "سەرفرازی" ئەو جیهانی دەوێت و قیامەتی مەبەستە و خوا باڵادەست و دانایە. خۆ ئەگەر بڕیارێك لەلایەن خوای گەورە پێش نەكەوتایە "كە مرۆڤ هەتا پەیامی خوایی پێ نەگات، خوا سزای نادات" لەسەر ئەو شتانەی كە وەرتان گرت "لە بەرامبەر ئازاد كردنی دیلەكانەوە" ئەوە سزایەكی زۆر گەورەتان تووش دەبوو).

**وەڵامی دەدەمەوە:**

ئەمەش بەهەمان شێوە بەوە لێك دەدرێتەوە كە شتی چاكتر بۆ شتی ئاسایی فەرامۆش كردووە.

لەبەر ئەوەی پێغەمبەر (ﷺ) كاتێك ڕاوێژی كرد لەسەر ئەوەی كە پارە وەربگرێت (فدیە) لە بەرامبەر ئازاد كردنی گیراوەكانی جەنگی بەدر، كە حەفتا كەسی خانەدانی هۆزی قوڕەیشی لەناودا بوو، ئەوا زۆربەی ڕاوێژ پێكراوان، ڕایان لەگەڵ وەرگرتنی پارە بوو، لەبەرامبەر ئازاد كردنیا،ن نەوەك گیراوەكان بكوژن، جا

(١) شرح المقاصد، سەرچاوەی پێشوو.

پێغەمبەریش (ﷺ) كۆششی كرد و پشتی ڕای ئەوانی گرت، چونكە بەزەیی هاتنەوەیە بە حاڵی گیراوەكان، بەو هیوایەی كە موسڵمان ببن یاخود لە ڕەچەڵەكیان كەسانی موسڵمان بەدەر بكەون و تا موسڵمانانیش لەو پارەو سامانەی لەبەرامبەر ئازاد كردنیان وەردەگرن سوود وەربگرن لە كاروبارەكانیاندا، جا پێغەمبەر (ﷺ) هەڵەی كرد لە كۆششەكەیدا، وا باشتر بوو زیاتر ئیسلام سەر بخرێ و جێگیر بكرێ، نەوەك ئازادكردنی گیراوەكان، لە بەرانبەر سامانێكی دیاریكراودا[1].

دوای هەموو ئەمانە: ئەوا خوای گەورە پێغەمبەرەكەی لە سەر هەڵە نەهێشتۆتەوە، چونكە ئەگەر لەسەر هەڵەی هێشتبایەوە، ئەوا ڕاست و هەڵە لە شەڕعیدا وەك یەك ئەبوو، ئەمەش دەبووە هۆی گومڕایی و گومان نانەوە لەمەڕ شەریعەت و بەرنامەی خوایی.

پێغەمبەر (ﷺ) دەگەڕایەوە بۆ ڕای ڕاست كە خوای گەورە بۆی ڕوون دەكردەوە، جا سروش و نیگاش هیچ شتێك لە هەڵەی پێغەمبەر یاخود سەرزەنشتی كە كراوە هیچی ناشارێتەوە بەڵكو هەمووی تۆمار دەكات[2].

## حیكمەتی تۆمار كردنی هەڵەی پێغەمبەران:

ئەگەر وترا: حیكمەت چییە لە تۆمار كردنی هەڵەی پێغەمبەران لە قورئاندا، كە بە درێژایی ڕۆژگار دەخوێنرێتەوە، لەگەڵ ئەوەی كە خوای گەورە لێخۆش بووەو گوناهو تاوان ئەپۆشێت، تەنانەت خوای گەورە فەرمانیشی بە ئێمە كردووە تاوانی تاوانكار بپۆشین؟

**وەڵامی ئەدەمەوە:**

بەوەی تۆمار كردنی هەڵەكانیان بەڵگە و ئاماژەیە لەسەر:

١- ڕاستگۆیی پێغەمبەران، ئەو پەیامەش كە ڕای ئەگەیەنن بە فەرمانی خوای

---

(١) شرح المواقف ٥٧٤ و سەیری نمونەی تر بكە لە شرحی ناوبراو و شرح المقاصد و شرح قاسم بن قطلوبغا على المسايرة ٢٣٢-٢٣٣.

(٢) مناهل العرفان ٢٨٨/٢.

پاك و بەرزە بەبێ ئەوەی هیچ شتێکی لێ بشارنەوە.

٢- پێغەمبەران سەرباری ئەو نرخ و سەنگینی و شکۆیی و زۆری گوێڕایەڵییەکەیان، ئەوا بەردەوام پەنا دەبەنە بەر دەرگانەی خوای گەورە بە داوای لێخۆش بوون و کوروزانەوەو پاڕانەوە لە بەرامبەر کەمترین هەڵە، جا بۆیە پێویستە لەسەر خەڵکی (کە پلەو پایەیان زۆر زۆر نزمترە لە پێغەمبەران) لە هەموو کات و ساتێکدا پەنا بەرنە بەر دەرگانەی خوای پاك و تاك و داوای لێخۆش بوونی لێ بکەن.

٣- گوناهە بچوکەکان نابنە هۆی توانج دان لە ئیمان و باوەڕ، چونکە مرۆڤ پێی بێ باوەڕو کافر نابێت[١].

## سیفەتی دووەم

## ڕاگەیاندنی بەرنامەی خوا (التبليغ)

بریتیە لە گەیاندن و ڕاگەیاندنی یاسا و حوکمەکان بەو خەڵکانەی کە پێغەمبەریان بۆ ڕەوانەکراوە[٢]، تا ڕێنماییان بکەن بۆ بەختەوەری دونیاو دواڕۆژ، هەر یەکێك لەم پێغەمبەرانەش هیچ شتێکیان لەو خەڵکە نەشاردۆتەوە نە بە ئەنقەست و نەبە هەڵە[٣].

ئەو شتەی ڕەوانە کراوە سێ جۆرە:

١- لە بەشێکدا کە فەرمان بە پێغەمبەران کراوە، بڵاوی نەکەنەوەو بە نهێنی بیهێڵنەوە، چونکە تایبەت بە خۆیان پەروەردگاریان.

٢- لە بەشێکدا پێغەمبەران سەرپشکن، لە ڕاگەیاندن و ڕانەگەیاندنی.

---

(١) شرح المقاصد ٢/١٩٨.

(٢) الدردير على الخريدة ١٠٨.

(٣) رسالة في التوحيد - الطائي ٦٨.

**٣- لە بەشێكدا فەرمانیان پێكراوە بە ڕاگەیاندنی.**

**ئەم بەشەی كۆتایی بوو كە بە وانەیان ڕاگەیاندووە كە بۆ لایان ڕەوانەكرابوون، چونكە فەرمانیان پێكرابوو و پێویستیش بوو لەسەریان كە ڕایبگەیەنن[١].**

## بەڵگە لەسەر ئەوەی كە ڕاگەیاندنی بەشی سێیەم پێویستە:

### بەڵگەی عەقڵی:

**١- ئەگەر پێغەمبەران شتێكیان شاردبایەوە كە فەرمانیان پێكراوە ڕایبگەیەنن، ئەوا لەسەر ئێمەش پێویست دەبوو كە زانست بشارینەوە، چونكە خوای گەورە فەرمانی بە ئێمە كردووە شوێنیان بكەوین، لەگەڵ ئەوەی كە فەرموودەی ڕاست و ڕاشكاو هاتووە، دەربارەی ئەو كەسەی زانست دەشارێتەوە نەفرەت لێ كراوە[٢].**

**٢- ئەگەر شتێكیان شاردبایەوە كە فەرمانیان پێكراوە ڕایبگەیەنن، ئەوا بەمە دەبوونە ناپاك و خیانەتكار، كەچی پارێزراون لەوەی ناپاكی بكەن[٣].**

**٣- پێغەمبەران مژدەدەرو ترسێنەرن، بە بەڵگەی ئەم فەرمایشتەی خوای گەورە:﴿ رُّسُلًا مُّبَشِّرِينَ وَمُنذِرِينَ ﴾ النساء: ١٦٥. واتە: (پێغەمبەرانمان "ڕەوانە كردووە" كە مژدەدەرن "بە ئیمانداران" و ترسێنەرن بۆ "یاخیەكان"). و مژدەدان و ترساندن و هەڕەشە، تەنها بە ڕاگەیاندنی پەیامی خوای گەورە تەواو دەبێت.**

**٤- ئەگەر ئەو شتەیان شاردبایەوە كە فەرمانیان پێ كراوە ڕایبگەیەنن، ئەوا نەفرەت لێكراو دەبوون بەدەقی ئایەتی قورئانی پیرۆز:**

﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ يَكْتُمُونَ مَآ أَنزَلْنَا مِنَ ٱلْبَيِّنَٰتِ وَٱلْهُدَىٰ مِنۢ بَعْدِ مَا بَيَّنَّٰهُ لِلنَّاسِ فِى ٱلْكِتَٰبِ

---

(١) الصاوي على الدردير ١٠٩ و رسالة في التوحيد سەرچاوەی پێشوو.

(٢) الباجوري على الجوهرة ٢٥/٢.

(٣) الدردير ١٠٨ و رسالة في التوحيد ٦٩ و لوامع الأنوار ٣٠٨/٢.

أُوْلَٰٓئِكَ يَلۡعَنُهُمُ ٱللَّهُ ﴾ البقرة: ١٥٩.[1] واتە: (بەڕاستی ئەوانەی بەرنامە و ڕێنموونییەکانی ڕێنموونییەکانی ئاشکرای ڕەوانە کراوی ئێمە دەشارنەوە کە ناردوومانە، دوای ئەوەی لە کتێبەکاندا بۆ خەڵکیمان ڕوون کردۆتەوە، ئا ئەوانە خوا نەفرینیان لێدەکات).

(١) الدردير ١٠٨-١٠٩.

## بەڵگەی نەقڵی:

ئـەم فەرمایشـتەی خـوای گـەورە:﴿ مَّا عَلَى ٱلرَّسُولِ إِلَّا ٱلْبَلَٰغُ ﴾ المائـدة: ٩٩. واتــە: (پێغەمبەر هیچی لەسەر نیە جگە لە ڕاگەیاندنی پەیامی خوا).

هـەروەها ئـەم فەرمایشـتە:﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلرَّسُولُ بَلِّغْ مَآ أُنزِلَ إِلَيْكَ مِن رَّبِّكَ ۖ وَإِن لَّمْ تَفْعَلْ فَمَا بَلَّغْتَ رِسَالَتَهُۥ ﴾[1] المائدة: ٦٧. واتە: (ئەی پێغەمبەرو فرسـتادە(ﷺ)، هەرچـی فـەرمان و پەیامێکت بۆ دابەزیووە لەلایەن پەروەردگارتەوە رای بگەیەنە، خـۆ ئەگـەر بـەوکارە هەڵنەستایت، ئەوە مانای وایە پەیامەکەت "بەتەواوی" نەگەیاندووە).

# سیفەتی سێیەم

# زیرەکی و ژیری (الفَطَانة)

الفطانة: بریتیە لە وریایی و تێگەیشـتن و زیرەکـی و ڕاسـت پێکـان لـە ڕاو بۆچـوون و عەقڵ و بیرتیژیدا.

هەر پێغەمبەرو پەیامبەرێك پێویستە ئەو سیفەتەی تێـدا بێـت، چـونکە دروسـت نیە گێل یاخود خەڵەفاو گەوج بێت[2].

## بەڵگەی عەقڵی لەسەر ئەمە:

١- لەبەرئەوەی پێغەمبەران ڕەوانەکراون، بـۆ بـەرپاکردنی بەڵگـە لەسـەر خـەڵکی و پوچـەڵ کردنـەوەی گومـانی ئەوانـەی دەمەتـەقێ و گفتوگـۆ و موجادەلـە دەکـەن، و ئەمەش بەکەسێکی گەوج و گێل ناکرێت[3].

٢- لەبــەر ئــەوەی پێغەمبــەران بەرێوەبــەرو پێشــەوای خــەڵکین و سەرچــاوەی

---

(١) الدردير و رسالة في التوحيد هەردوو سەرچاوەی پێشوو.

(٢) الدردير على الخريدة ١٠٨ و الباجوري على الجوهرة ٢/٢٥ و لوامع الأنوار ٢٦٧.

(٣) شرح المقاصد ٢/١٩٨ و المسامرة ٢٢٦.

چارەسەری كێشەكانی خەڵكن[1].

٣- لەبەر ئەوەی ئێمە فەرمانمان پێكراوە كە شوێنیان بكەوین لە كردارو گوفتاردا، بۆیە ناكرێت ئەو كەسەی خەڵكی تر شوێنكەوتووی ئەون گێل بێت.

٤- گەوجێتی و گێلی سیفەتی ناتەواوی و كەموكورین كە دەبێتە هۆی كەلێن و ناڕێكی بە پلەو پایەی پێغەمبەران دەگەیەنێت[2].

## بەڵگەی نەقڵی:

١- خوای گەورە دەفەرموویێت:﴿ فَفَهَّمْنَاهَا سُلَيْمَانَ ۚ وَكُلًّا آتَيْنَا حُكْمًا وَعِلْمًا ﴾ الأنبياء: ٧٩. واتە: (جا ئێمە لە سولەیمانمان گەیاند، بەڵام هەر یەكە"لەم باوك و كوڕە" بەهرەوەرەمان كردبوو لە حیكمەت و دانایی و عیلم و زانست).

٢- خوای بێ وێنە دەفەرموویێت:﴿ وَشَدَدْنَا مُلْكَهُ وَآتَيْنَاهُ الْحِكْمَةَ وَفَصْلَ الْخِطَابِ ﴿٢٠﴾ ﴾ ص: ٢٠. واتە: (ئێمە پاشایەتیەكەمان بەهێز كردو حیكمەت و دانایی و قسەو فەرمانی بەجێمان پێ بەخشی).

٣- خوای باڵادەست دەفەرموویێت:﴿ وَجَادِلْهُم بِالَّتِي هِيَ أَحْسَنُ ﴾ النحل: ١٢٥. واتە: (گفتوگۆو موجادەلەیان بە جوانترین شێوە لەگەڵ بكە). واتە بەو ڕێگەیەی كە نەرمونیانترە بۆیان و گفتوگۆ تەنها بە كەسێكی ژیر دەكرێت.

***

---

(١) الدردير و رسالة في التوحيد هەردوو سەرچاوەی پێشوو.

(٢) الباجوري ٢/٢٥ و رسالة في التوحيد هەردوو سەرچاوەی پێشوو.

# سیفەتی چوارەم

# نێرینە بوون (الذكورة)

زانایـان كـۆكن لەسـەر ئـەوەی كـە سـیفەتی نێرینـە بـوون مەرجـە كـە دەبێـت لـە پێغەمبەردا هەبێت، بەم پێیە دروست نییە ئافرەت ببێتە پێغەمبەر، بـەڵكو هەنـدێ لـە زانایـان(1) یەكـدەنگی (اجماع)یـان هێنـاوە لەسـەر ئەمـە. لـە بەڵگـەكانی مـەرجی ناوبراو:

أ- خـوای مـەزن دەفـەرمووێت: ﴿ وَمَآ أَرۡسَلۡنَا مِن قَبۡلِكَ إِلَّا رِجَالٗا نُّوحِيٓ إِلَيۡهِم ﴾ یوسف: ١٠٩. واتە: (ئێمە كەسمان نەناردووە لە پێش تۆدا جگە لە پیاوانێك كە هـەڵمان بژاردوون لە خەڵكی شارو شوێنەكان و نیگایان بۆ دەنێرین).

ب- خوای زانا و خاوەن توانـا دەفەرمووێت:﴿ وَلَوۡ جَعَلۡنَٰهُ مَلَكٗا لَّجَعَلۡنَٰهُ رَجُلٗا ﴾ الأنعام: ٩. واتە: (خۆ ئەگەر فریشتەمان بكردایە بە فرستادە، ئەوە لە شێوەی پیاوێكدا دەماننارد).

پ- پێغەمبەرایـەتی و پەیامبەرایـەتی پێویسـتی هەیـە بـە: دەركـەوتن و دیـار كـەوتن و چـوونە شـوێنە قەرەباڵغـەكانی خـەڵك و ئـەو شـوێنانەی لێـی كۆدەبنـەوەو دەرخستنی موعجیزە، بەڵام مێینەیی پێویستی بە خۆ داپۆشـین هەیـە و دیاریشـە كـە ئافرەت و پیاو لەڕووی پێكهاتەوە جیاوازن.

ت- لەبەرئـەوەی دروسـت نییـە، ئافرەتـان بكرێنـە ئـەمیر و حـوكمڕان و دادوەرو پێش نوێژخوێن بە یەكدەنگی زانایان.

بـەڵام (ئەشـعەری) و (قـرطبي) و هەنـدێ لـە (أهـل الظـاهر) نێرینـە بوونیـان بـە

---

(١) الكرمانی لە: شرح البخاری/ حاشیە المرجانی ٩/١، یەكدەنگی نەقڵ كردووە لەسەر ئەوەی نابێت ئافرەت ببێتە پێغەمبەر.

(البیضاوی) و جگە لەویش یەكدەنگیشی هێناوە لەسەر ئەوەی (مریم) پێغەمبەر نەبووە./ المسامرة ٢٣١. و تفسیر البیضاوي ٦٨.

مەرج دانەناوە بۆ کەسی پێغەمبەر، بۆیە ڕایان وابوو (مریم) پێغەمبەرە، بەپشت بەستن بەم بەڵگانە:

بەوەی خوای گەورە هەڵیبژارد، بە بەڵگەی ئەم فەرمایشتە: ﴿ وَإِذۡ قَالَتِ ٱلۡمَلَـٰٓئِكَةُ يَـٰمَرۡيَمُ إِنَّ ٱللَّهَ ٱصۡطَفَىٰكِ ﴾ آل عمران: ٤٢.واتە: ("یادیان بهێنەوە کاتێك" جبریلی فریشتە وتی: ئەی مەریەم بەڕاستی خوا تۆی هەڵبژاردووە).

بەوەی خوای گەورە (جبریل)ی ڕەوانە کرد بۆ لای:﴿ فَأَرۡسَلۡنَآ إِلَيۡهَا رُوحَنَا ﴾ مريم: ١٧. واتە: (ئێمەش جوبرەئیلی فریشتەمان نارد بۆ لای).

هەندێ ڕایان وابووە کە دایکی موسا پێغەمبەر بووە بە بەڵگەی ئەوەی:

خوای گەورە سروش و نیگای بۆ ناردووە، بە بەڵگەی ئەم فەرمایشتە: ﴿ وَأَوۡحَيۡنَآ إِلَىٰٓ أُمِّ مُوسَىٰٓ أَنۡ أَرۡضِعِيهِ ﴾ القصص: ٧. واتە: (ئێمە دایکی موسامان ئاگادار کرد، کە شیری بداتێ).

بەڵام زۆربەی زانایان بەرپەرچی ئەم گومانەیان داوەتەوە بەوەی:

خوای گەورە کە (مریم)ی هەڵبژارد و (جبریل)ی ڕەوانەکردە لای ئەوا سروش و نیگای وەك شەریعەتی بۆ نەهێنا، چونکە لە ئایەتی ناوبراودا هیچ ئاماژەیەکی بۆ نەکراوە. و ئەو سروش و وەحیەی بۆ دایکی موسا هاتووە، تەنها بە مانای خورپەی دڵ (ئیلهام) دێت، وەك ئەم فەرمایشتەی خوای گەورە: ﴿ وَأَوۡحَىٰ رَبُّكَ إِلَى ٱلنَّحۡلِ ﴾ النحل: ٦٨. واتە: (پەروەردگاری تۆ "ئەی ئینسان" نیگاو ئیلهامی کردووە بۆ هەنگ).

# سیفەتی پێنجەم
# پاك و سەلامەت بوون لە ناتەواوی و كەموكوریەكان

مەبەست لەو مەرجە، ئەمانەی خوارەوەیە:

أ- پێویستە پاك و سەلامەت بێت لە هەموو كەمووكورییەكی جەستەیی:

مەرجەكەشی ئەوەیە كە دەبێت تەواوترین و كاملترین كەسی سەردەمی خۆی بێت، لە كاتی ڕەوانەكرانی (واتە لەو كاتەی كە وەك پێغەمبەر لەلایەن خواوە بۆ خەلكی دەنێردرێت).

لەوانەیە كەسێ بەرهەلستی بكات بەو گرێ و تێكگران لەنگ بوونەی كە لە زمانی پێغەمبەر موسادا (سەلامی لێبێت) هەبووە، بەلام پێویستە بەو شێوەیە: ئەو گرێ و تێكگیرانەی كە لە زمانی پێغەمبەر موسادا هەبوو ئەوا بەر لە ڕەوانەكرانی بوو، جا بەهۆی پاڕانەوەو نزاكەی لەم بارەوە خوای گەورە لەكاتی ناردنی وەك پێغەمبەر ئەو گرێییەی زمانی ئەوی كردەوە، بە بەلگەی ئەوەی:

كاتێ خوای گەورە سروش و نیگای ڕەوانەكرد بۆ پێغەمبەر موسا (سەلامی لێ بێت) و فەرمانی پێكرد بانگەواز بكات بۆ لای خوا، ئەوا پێغەمبەر موسا پاڕایەوە: ﴿ وَٱحۡلُلۡ عُقۡدَةٗ مِّن لِّسَانِي ٢٧ يَفۡقَهُواْ قَوۡلِي ٢٨ ﴾ طـه: ٢٧ - ٢٨. واتە: (گرێی زمانم بكەرەوەو زمانم گۆیا و پاراو بكەتا لە قسەو گوفتارو مەرامم تێبگەن). جا خوای گەورە وەلامی دایەوە: ﴿ قَالَ قَدۡ أُوتِيتَ سُؤۡلَكَ يَٰمُوسَىٰ ٣٦ ﴾ طـه: ٣٦. (ئەی موسا هەموو داخوازیەكانت بەجێیە و پەسەندە و هەموویانت پێدرا).

ب- پێویستە پاك و سەلامەت بێت لەو:

كەموكورتیانەی كە قێزەونن لەلایەن سروشتی مرۆڤ، وەك: دەردو نەخۆشیەكان، وەك بەلەكی و گەڕی (جذام). دەكرێ هەندێ كەس بەرهەلستی لەمە بكات، بەوەی نموونە دێنێتەوە بە تاقیكردنەوەی ئەیوب (سەلامی خوای لێ بێت) كە تووشی نەخۆشیەكی پێستی بوو كە خەلكی لەبەری هەلڈاتن، جا وەلامەكەی ئەوەیە:

كە ئەو نەخۆشیەی پێش پێغەمبەرایەتی ئەیوب (سەلامی لێ بێت) بووەو پاش ئەوەی بوو بە پێغەمبەر نەخۆشیەكەی نەما، خوای پاك و تاك فەرموویەتی:﴿ فَٱسۡتَجَبۡنَا لَهُۥ فَكَشَفۡنَا مَا بِهِۦ مِن ضُرٍّ ﴾ الأنبیاء: ٨٤.[1] واتە: (جا ئێمەش نزامان گیرا كرد و بەهاوارییەوە چووین و هەموو ناخۆشی و نەخۆشیەكمان لە كۆڵ كردەوە)،

پ- پێویستە پیشەو كاری نزم نەكات وەك پیشەی كەڵەشاخ (حجامة[2]) كردن.

دوور بێت لە كاری نەشیاو و كەم نرخ وەك خواردن لەسەر ڕێگە[3].

ئەمەش لەسەر نەریت بنیات دەنرێ: بەوەی نەریت پێی شتێكی نەشیاو بێت[4].

ت- پێویستە كەسێكی ڕووگرژو دڵ ڕەق نەبێت[5].

لەبەر ئەوەی دڵ ڕەقی هۆكاری دووركەوتنەوەیە لە خوای گەورەو سەرچاوەی

---

(١) المسایرة و المسامرة ٢٢٦.

(٢) كەڵەشاخ (حجامة) كردن: بریتیە لە هەڵمژینی خوێن لە جەستەی مرۆڤ بەهۆی ئامێری تایبەت، بە عەرەبی پێی دەگوترێت (حجامة) و بە كوردی پێی دەگوترێت (كەڵەشاخ) بەهۆی ئەوەی كە لە كۆنەوە لە كوردەواری شاخی ئاژەڵ واتە (قۆچیان) بۆ ئەم مەبەستە بەكارهێناوە، بەڵام ئەمڕۆ كەرستەی پزیشكی تایبەت پەیدابووە بۆ ئەم مەبەستە. حیجامە: لە ڕووی پزیشكی بریتیە لە كرداری هەڵمژینی خوێن لە چەندان شوێنی تایبەت لە جەستە بەهۆی بەتاڵ كردنەوەی هەوا لەو شوێنە بە بەكارهێنانی (كاسە)یان پەرداخی تایبەت، بەهۆی ئاگركردنەوە لەناو پەرداخەكەدا یان بەهۆی ڕاكێشان و بەتاڵ كردنی هەوا بەهۆی ئامێری تایبەت (پەمپ). (بە دەستكارییەكی زۆر كەمەوە وەرم گرتووە لە: كەڵەشاخ (حجامة) ٨، ئامادەكردنی: حاجی عبدالجلیل، چ ٢٠٠٨، چاپخانەی ڕۆژهەڵات/ هەولێر). (وەرگێڕ).

(٣) المسایرة و المسامرة سەرچاوەی پێشوو، و شرح المقاصد ١٩٨/٢ و لوامع الأنوار ٢٦٧/٢ و الوسیلة ٦٩٣.

(٤) المسایرة و المسامرة ٢٣٢.

(٥) شرح المقاصد ١٩٨/٢ و لوامع الأنوار ٢٦٧/٢.

گوناهو تاوانەكانە، چونكە دڵ پارچە گۆشتێكە ئەگەر چاك بوو لاشە هەموو چاك ئەبێت و ئەگەر خراپ بوو ئەوا لاشە هەموو خراپ ئەبێت، هەروەك لە فەرموودەی ڕاستدا هاتووە. و لەو فەرموودەیەی كە (البیهقی) گێڕاویەتیەوەو (ترمذي) بە چاك (حسن)ی داناوە، هاتووە: ((اِن أبعد الناس من الله القلبُ القاسي))[1] واتە: (بەڕاستی دوورترین كەس لە خوای گەورە كەسی دڵ ڕەقە).

لەبەرئەوەی دڵ ڕەقی و توندی و نەرم و نیان نەبوون دەبێتە هۆی دووركەوتنەوەی خەڵكی لە پێغەمبەر، لەم بارەیەوەی خوای گەورە دەفەرمووێت:﴿ وَلَوۡ كُنتَ فَظًّا غَلِيظَ ٱلۡقَلۡبِ لَٱنفَضُّواْ مِنۡ حَوۡلِكَ ﴾ آل عمران: ١٥٩. واتە: (خۆ ئەگەر تووڕەو قسە ڕەق و بێ بەزەیی بویتایە، ئەوە هەمووان لە دەورت بڵاوەیان دەكرد).

ئەو سیفەتانەی كە خستمانەڕوو، پێویستن بۆ پێغەمبەران، مەبەست لەم سیفەتانەش ئەوەیە كە پێغەمبەران دەبێت گەیشتبنە پلەی تەواو كامڵی مرۆیی و سەلامەت و دووریش بن لە هەموو ناتەواویەكی ئینسانی.

چونكە پێغەمبەرایەتی بەڕێزترین پلەو پایەیە لەناو بەدیهێنراواندا، بۆیە هەموو ئەو سیفەتانەی پێویستە تیایدا بن كە شایەنی شكۆی ئەو پلەیە بن.

بۆیە:

شتێكی ئەستە كە پێغەمبەران دژەكانی ئەو سیفەتانەیان هەبێت وەك درۆ كردن و كوفرو گوناه كردن و شاردنەوەی زانیاری پێویست و گێلی و سەلامەت نەبوون لە كەموكورتی و جگە لەمانەش لەو شتانەی كە كەسایەتی مرۆڤ لەكەدار دەكات، تەنانەت ئەو دانایی و حیكەتەش لەكەدار دەكات كە ئەوانی ڕەوانە كردووە وەك موژدەدەرو ترسێنەر.

***

---

(١) المسامرة ٢٢٦. و ئەو فەرموودەیە هاتووە لە: سنن الترمذي - كتاب الزهد - باب أبعد الناس من الله القلب القاسي ٧/١٣٠.

# سروش ( الوحي )

**لە ئەصڵی زمانەوانیدا وشەی سروش (وحی) بۆ چەند مانایەك بەكار هاتووە:**

**١- ئامـاژە (الاشـارة): لـە فەرمایشـتی پـەروەردگاردا هـاتووە:** ﴿ فَأَوْحَىٰٓ إِلَيْهِمْ أَن سَبِّحُواْ بُكْرَةً وَعَشِيًّا ﴾ **مـریم: ١١. واتـە: (ئامـاژەی بـۆ كـردن بـەیانیان و ئێـواران تەسـبیحات و ستایش بكەن).**

**٢- پـەیام و نامـە (الرسـالـة): (ابـن أعرابـی) وتـی: (أوحـی الرجـل) واتـە: ئەگـەر پەیامبەرێكی ئەمیندار بنێرێت بۆ بەندەیەك لە بەندە ئەمیندارەكانی.**

**٣- خورپـەی دڵ و نیگـا (الالهـام): (زجـاج) وتویـەتی لـەبارەی ئـەم فەرمایشـتەی خـوای گـەورە:** ﴿ وَإِذْ أَوْحَيْتُ إِلَى ٱلْحَوَارِيِّـۧنَ أَنْ ءَامِنُواْ بِى وَبِرَسُولِى ﴾ **المائـدة: ١١١. واتـە: (هەروەها كاتێك نیگام نارد بۆ هاوەڵە دڵسۆزە تایبەتیەكانی عیسا "حەواریـەكان" كە ئیمان و باوەڕ بهێنن بە من و پێغەمبەرەكەم).**

**هەنـدێ وتوویانـە: واتاكـەی بریتیـە لـەوەی وەك خورپـە خسـتمە دڵـی ئەوانـەوە، هـەروەك خـوای پـاك و بـەرز فەرموویـەتی:** ﴿ وَأَوْحَىٰ رَبُّكَ إِلَى ٱلنَّحْلِ ﴾ **النحـل: ٦٨. واتـە: (پەروەردگاری تۆ "ئەی ئینسان" نیگاو ئیلهامی كـردووە بـۆ هـەنگ). و فەرموویـەتی:** ﴿ وَأَوْحَيْنَآ إِلَىٰٓ أُمِّ مُوسَىٰٓ أَنْ أَرْضِعِيهِ ﴾ **القصص: ٧. واتـە: (ئێمـە دایكـی موسـامان ئاگـادار كـرد، كـە شـیری بـداتێ). ئـەو فەرمایشـتە:** ﴿ إِذْ أَوْحَيْنَآ إِلَىٰٓ أُمِّكَ مَا يُوحَىٰٓ ﴿٣٨﴾ ﴾ **طـه: ٣٨. واتە: (كاتێك ئێمە ئەوەی پێویست بوو بەدایكت ڕابگەیەنرێت، پێمانگەیاند).**

**٤- وتەی نهێنی و شاراوە (الكلام الخفی): (كسائی) وتویـەتی: (أوحیـت الیـە بلكلام أحي بـە، و أوحیتـە الیـە) مەبەسـتی ئەوەیـە كـە بـدوێیت و قسـە بكـەیت لەگـەڵی بـە شـێوەیەكی شـاراوەو نهێنـی، و (ابـن الأنبـاري) لـەبارەی ئـەو وتەیـە كـە دەڵێـت: مـن بـاوەڕدارم بـەهۆی نیگـای خـواوە، دەڵێـت بۆیـە نـاوی نـاوە سـروش و نیگـا چـونكە فریشتەكە ئەمەی لـە دەوروبـەر شـاردۆتەوە، و تـەنها تایبـەتی كـردووە بـە پێغەمبـەر (ﷺ) كە فریشتەكە بۆ لای نێـردراوە، خـوای گـەورە فەرموویـەتی:** ﴿ يُوحِى بَعْضُهُمْ إِلَىٰ

بَعۡضٍ زُخۡرُفَ ٱلۡقَوۡلِ غُرُورًا ﴾ الأنعام: ١٢٢. واتە: (كە بەردەوام قسەی زل و ڕازاوە دەدەن بە گوێی یەكدا " كە خۆیان و خەڵكی" پێ سەرگەردان و گومڕا دەكەن). مەبەستی ئەوەیە كە بەنهێنی قسە بۆ یەكتری دەكەن، ئەمەش بنچینەی پیتەكەیە بەڵام دواتر وشەی (وحی)یان تەنها كورت هەڵهێناوە لە نیگا و خورپەی دڵ (ئیلهام) دا.

ئەم فەرمایشتە: ﴿ وَإِنَّ ٱلشَّيَٰطِينَ لَيُوحُونَ إِلَىٰٓ أَوۡلِيَآئِهِمۡ لِيُجَٰدِلُوكُمۡ ﴾ الأنعام: ١٢١. واتە: (دڵنیابن كە شەیتانەكان شت دەخەنە دڵی لایەنگرەكانیانەوە تا موجادەلەتان لەگەڵ بكەن).

٥- فەرمان (أمر): وەك ئەم فەرمایشتەی خوای گەورە: ﴿ أَوۡحَيۡتُ إِلَى ٱلۡحَوَارِيِّـۧنَ ﴾ المائدة: ١١١. واتە: (نیگام نارد بۆ هاوەڵە دڵسۆزە تایبەتیەكانی عیسا "حەواریەكان"). هەروەك زۆرێك لە توێژەرەوە (مفسر)ەكان ئەم بۆ چوونەیەیان هەیە، وەك ئەم فەرمایشتەی پەروەردگار: ﴿ بِأَنَّ رَبَّكَ أَوۡحَىٰ لَهَا ۝٥ ﴾ الزلزلة: ٥. واتە: (بەهۆی ئەوەی پەروەردگارت "ئەی ئینسان" ڕایگەیاندووە و فەرمانی بۆ دەركردووە).

٦- نووسین و نووسراو و كتێب (الكتابة و المكتوب و الكتاب):

(أبو اسحاق) وتویەتی: چاوگی وشەی (وحی) لە زمانەوانیدا بریتیە لە ئاگاداركردنەوە بە نهێنی. لەبەر ئەمە بە (وحی) دەوترێت خورپەی دڵ (ئیلهام). و (أزهری) وتویەتی: ئاماژە بۆ كردنیش بە مانای (وحی) دێت. و نووسینیش بە مانای (وحی) دێت... هەموو ئەو شتانە بریتین لە ڕاگەیاندن، ئەگەرچی هۆكارەكانی ڕاگەیاندنیش جیاواز بن[1].

---

(١) لسان العرب مادة (وحي) و القاموس المحيط مادة (وحي).

سەیری: (تفسير الرازي و القُرْطبي و البَيْضاوي) و (مفردات الراغب مادة وحي) بكە لەبارەی ئەو ئایەتانە ناوبراوەكان و (قاضي عياض) لە (الشفاء ٢٥٢/١) دوو ڕای هێناوەتەوە لەبارەی ئەصڵی وشەی (وحی): یەكەمیان: خێرابوون وەك پەیام وەرگرتنەكەی پێغەمبەر، چونكە زۆر بەپەلە بوو و خورپەی دڵ (ئیلهام) و هێڵ بەهۆی خێرایی جوڵەی دەست، ئەمەش لەم جۆرەیە... دووەمیان: نهێنی و شاردنەوەیە، وەك: (نیگای نهێنی و قسە خستنە دڵ و وەسوەسەی شەیتانەكان).

**سروش (وحی) لە زاراوەدا:**

بریتیـە لـەوەی خـوای گـەورە هـەموو ئـەو جـۆر و شـێواز و وێنانـەی ڕێنمـایی و هیدایـەت فێـری ئـەو کەسـە بکـات و پیشـانی بـدات کـە لـە نـاو بەنـدەکانی دا هـەڵی بژاردووە، بەڵام بە ڕێگەیەکی نهێنی و بەدەرو دوور لە نەریتی مرۆیی[1].

(ابن أبی حاتم) لە ڕێگەی (عقیل) لە (زهری)ەوە گێڕاویەتیـەوە: پرسـیار کـرا لـە سروش (وحی)، ئەویش وتی: بریتیە لەوەی خوای گەورە بۆ پێغەمبـەران دەنێرێـت و لـە دڵیانـدا جـێگیری دەکـات و ئـەویش دەری دەبڕێـت و دەینووسـێت و بریتیـە لـە فەرمایشـتی خـوا. و جـۆرێکی هەیـە کـە پێغەمبـەر دەری نابڕێـت و هـیچ کەسـێکیش نایـنوسێت و فەرمانیش ناکـات بـە نووسـینی، بـەڵکو بـۆ خـەڵکی دەیخاتـەڕوو، و بۆیـان ڕوون دەکاتەوە کـە خـوای گـەورە فـەرمانی پێکـردووە کـە بـۆ خـەڵکی ڕوون بکاتـەوەو پێیان ڕابگەیەنێت[2].

***

## جۆرەکانی سروش (وحي)

ئەم فەرمایشتەی خوای گەورە هەموو جۆرەکانی سرش (وحي) لە خۆ گرتووە:

﴿ وَمَا كَانَ لِبَشَرٍ أَن يُكَلِّمَهُ ٱللَّهُ إِلَّا وَحۡيًا أَوۡ مِن وَرَآيِٕ حِجَابٍ أَوۡ يُرۡسِلَ رَسُولٗا فَيُوحِيَ بِإِذۡنِهِۦ مَا يَشَآءُۚ إِنَّهُۥ عَلِيٌّ حَكِيمٞ ٥١ ﴾ الشوری: ٥١. واتە: (کەس بۆی نیە هیچ کات "لە دونیادا" خوای گەورە وتو وێژی ڕاستەوخۆی لەگەڵدا بکات مەگەر لە ڕێگەی وەحی و نیگاوە، یان لە پشتی پەردەوە، "وەك موسا" یان نێردراوێکی وەك فریشتە "جبرەئیل" دەنێرێت کە بەگوێرەی فەرمان و مۆڵەتی خوا چی پێ سپێردراوە دەیگەیەنێت، بەڕاستی ئەو زاتە خوایەکی بڵند و داناو کاربەجێیە).

---

(١) مناهل العرفان ٥٦/١.

(٢) الاتقان ٤٤/١.

ئەم ئایەتە ئەوە دەگەیەنێت کە هیچ کەسێك بەدەر لە سێ جۆر[1] نەیتوانیوە لەگەڵ خوای گەورە بدوێت:

### جۆری یەکەم: بە سروش و نیگا.

واتە: یان بەرێگەی سروشەوە بووە، کە بریتیە لە:

أ- خورپەی دڵ (ئیلهام) و خستنە دڵ: هەروەك خوای گەورە نیگای کرد بۆ دایکی موسا کە شیری پێبدات، و فەرمایشتی پێغەمبەریش (ﷺ) دەچێتە ئەم بارەوە: ((ان روح القدس نفثَ في روعي[2]: ان نفساً لن تموت حتى تستكمل أجَلَها و تستوعب رزقها...)) واتە: (جبریل شتێکی خستە دڵمەوە: کە هیچ کەسێك نامرێت تا ماوەکەی تەواو نەبێت و ڕۆزیەکەشی تەواو بەدەست نەخات...).

ب- خەون بینین لەکاتی خەوتندا: هەروەك خوای گەورە سروش و نیگای نارد بۆ ئیبڕاهیم، لەکاتی خەوتندا کە کوڕەکەی ئیسماعیل سەر ببڕێت. و هەروەك دەستپێکی سروش هاتن بۆ پێغەمبەر محمد (ﷺ) کە بینینی خەونی چاك بوو لە کاتی خەوتندا، هەروەك ئەمە هاتووە لە فەرموودەی ڕاست (صحیح)دا کە (بخاری) و (مسلم) گێڕاویانەتەوە لە باسی: چۆنیەتی دەسپێکردنی و هاتنی سروش بۆ پێغەمبەری خوا (ﷺ).

### جۆری دووەم: یان لە پشتی پەردەوە (أو من وراء حجاب):

واتە: گوێبیستی فەرمایشتی خوای گەورە ببێت بەبێ هۆکارێکی گەیەنەر.

---

(١) امام الرازی لە تەفسیرو لێکدانەوەی ئەو ئایەتەدا ١٨٧/٢٧ فەرموویەتی: (بزانە هەر یەکێك لەم سێ جۆرە بریتیە لە سروش، بەڵام ئەوەندە هەیە کە خوای گەورە جۆری یەکەمی تایبەت کردووە بەناوی سروش (وحی)، چونکە ئەوەی ڕاستەوخۆ بەشێوەی خورپەی دڵ (ئیلهام) دەکەوێتە دڵەوە بەیەك تەوژم ئەوا شایەنتر بوو کە بە تایبەت ناوی سروشی لێ بنرێت. ئەمە ئەو قسەیەیە لە بارەی لێك جیاکردنەوەی ئەو سێ جۆرە لەیەك تری).

(٢) الرُوع: عەقڵ و دڵ. و فەرموودەکە (أبو نعیم) لە کتێبی (الحلیة) لە (أبی أمامة) گێڕاویەتیەوە، لاوازە/ الجامع الصغیر ٩٠/١.

هەروەك خوای گەورە وایكرد موسا گوێبیستی فەرمایشتەكەی بێت بەبێ هۆكار. بەهەمان شێوە ئەو فریشتانەش كە خوای گەورە لەگەڵیان دوا لەبارەی دروست كردنی ئادەم (سەلامی لێ بێت).

## جۆری سێیەم: یان نێردراوێك دەنێرێت (یرسل رسولاً).

واتە یان نێردراوێك لە فریشتەكان دەنێرێتە لای، ئەو كاتە فریشتەكە سروش و نیگاكە ئەگەیەنێت بە پەیامبەرە مرۆڤەكە. و نێردراو و پەیامبەری فریشتەكانیش (جبریل)ە (سەلامی لێ بێت)[1].

دابەزینی جبریل بۆ لای پێغەمبەر محمد (ﷺ) بە چەندین شێوازی جیا جیا:

أ- بەشێوەو وێنەی حەقیقی و ڕاستەقینەی فریشتەیی خۆی بێتە لای پێغەمبەر (ﷺ).

ب- بێتە لای پێغەمبەر (ﷺ) لەسەر شێوەی پیاوێك و لەگەڵی بدوێت، هەروەك لە (صحیح البخاری)دا هاتووە: ((وأحياناً يتمثَّل لي الملك رجلاً فيكلمني، فأعي ما يقول))[2] واتە: (هەندێ جار فریشتە لەشێوەی پیاوێك لەگەڵم دەدوێت و لێی تێدەگەم)، (أبو عوانة) لە (صحیح)ەكەیدا ئەم زیادەیەی هێناوە:((وهو أهون عليّ)) واتە: (ئەم جۆرە ئاسانترو سوكترینیانە لەسەر شانم).

جا بەوشێوەیە ئامادەبووان دەیبینن، هەروەك لەو فەموودە ڕاست (صحیح)ەدا هاتووە كە (مسلم)[3] گێڕاویەتیەوە لە عومەری كوڕی خەتتاب، ئیمامی عومەر ئەفەرمووێ: جارێك لە خزمەت پێغەمبەردا دانیشتبووین، ڕۆژێك لە ڕۆژان، لە ناكاو پیاوێكمان هاتە بەرچاو، جل و بەرگی زۆر سپی بوو، مووی ڕیشی زۆر ڕەش بوو،

---

(١) سەیری ئەمانە بكە: تفسير الرازي ١٨٦/٢٧ و تفسير القرطبي ٥٨٧٣/٨ و روح المعاني للآلوسي ٥٤/٢٥ و زاد المعاد ١٨/١ و الاتقان ٤٤/١.

(٢) صحيح البخاري - كتاب بدء الوحي ٢/١.

(٣) صحيح مسلم - أول كتاب الايمان ٣٦/١.

نیشانەی ڕێبواری لێ نەدەبینرا و هیچ کەس لە ئێمە نەیدەناسی، تا لە خزمەت پێغەمبەر (ﷺ) دانیشت و هەردوو ئەژنۆی خۆی بە هەردوو ئەژنۆی پێغەمبەر (ﷺ) نووساند هەر دوو دەستەکانی دانا سەر هەردوو ڕانەکانی خۆی و ئەو پیاوە نەناسراوە گوتی: (( ئەی محمد پێم بڵێ ئایینی ئیسلام لە چەند شت پێك هاتووە....)) تاد. پرسیاری لە پێغەمبەر (ﷺ) کرد لەبارەی ئیسلام و ئیمان و نیشانەکانی دواڕۆژ پێغەمبەری خوا (ﷺ) وەڵامی دەدایەوە، تا کابرا نەناسراوەکە تەواو بوو لە پرسیارەکانی و ڕۆیشت، جا پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی ئەوە (جبریل) بوو هاتبوو فێری ئایینی پیرۆزی ئیسلامتان بکات.

پ- بەنهێنی بێتە لای پێغەمبەر (ﷺ) بەبێ ئەوەی هیچ کەسێ بیبینێت، شوێنەواری کاریگەر و کارتێکران لەسەر ڕووخساری پێغەمبەر (ﷺ) بەدەر بکەوێت.

پێغەمبەر وەسفی بارودۆخی خۆی دەکات، لە کاتی دابەزینی سروش و نیگا: هەروەك لە (صحيح البخاری) دا هاتووە: ((أحياناً يأتيني مثل صلصلة الجرَس، و هو أشَدُّه عليّ، فيفصم عني، و قد وعيت عنه ما قال)) واتە: (هەندێ جار سروشم بۆ دێت وەك زرنگ و هوڕی زەنگ، دواتر ئەم دەنگە زرنگە کۆتایی دێت و منیش دوای کۆتایی هاتنی لە قسەکانی تێگەیشتم).

(خطابي) وتویەتی:

مەبەست لێی دەنگێکی بەدوای یەکدا هاتوو دەبیسێت، ئەو دەنگە لەگەڵ یەکەم بیستندا جێگیر نابێت لە دەروونی دا، تا بە باشی لێی تێنەگات و ئینجا جێگیر دەبێت.

حیکمەت لەوەی زرنگی زەنگەکە پێش سروش هاتنەکە دێت، ئەوەیە کە گوێچکەکان ئامادەبکات بۆ سروش و نیگا و هیچ شتێکی تر سەرقاڵی نەکات.

لە فەرموودەی (صحيح)دا هاتووە هەروەك کەمێك پێشتریش خستمانەڕوو، کە ئەو جۆرو شێوازەی هاتنی سروش سەخترین و گرانترین جۆرەکانی سروش و نیگایە

كە بۆی هاتووە.

وتـراوە: تـەنها ئـەو كاتـە بـەو شـێوەیە سـروش بـۆ پێغەمبـەر دەهـات كـە ئایـەتی هەڕەشە و پەیماندان بە سزا دادەبەزین[1].

بەتایبەتی لەبارەی باردۆخی پێغەمبەر (ﷺ) لـەكاتی سـروش و وەحـی دەدوێـین پاش كەمێكی تر، بەڵام لە ژێر ناونیشانی (سروش شتێكە لە دەرەوەی دەروونە).

## چونیەتی سروش و دابەزینی بۆ سەر پێغەمبەر

زانینـی چـۆنیەتی سـروش و نیـگا، نهێنیەكـە لـەو نهێنیانـەی كـە عـەقڵ نـاتوانێ پەیی پێببات، فریشتەش كە لە خوای گەورەوە دەبیسێت، ئـەوا بـە پیـت و دەنـگ لێـی نابیستێت، بەڵكو خوای گـەورە زانیارییـەكی پێویسـت بـۆ بیسـەر دروسـت دەكـات، جـا هەروەك چۆن فەرمایشتی خوای گەورە لە تـوخمی وتـەی مـرۆڤ نییـە، ئـەوا بەهـەمان شێوە ئەو بیستنەش كە بۆ مرۆڤ دروستی دەكات ئـەوا لـە تـوخمی بیسـتنی دەنگـەكان نییە[2].

بە دوو ڕێگە سروش (وحی) دادەبەزێت بۆ سەر پێغەمبەر:

یەكـەمیان: پێغەمبـەر لـە وێنـەی مرۆیـی خـۆی چـۆتەدەر و چـووتە سـەر وێنـەی فریشتە، بەو شێوەیە سروشەكەی لە جبریل وەرگرتووە.

دووەمیان: فریشتەكە هاتۆتە سەر وێنەی مرۆڤ تا پێغەمبەر لێی وەربگرێت[3].

لە هەردوو حاڵەتـدا سـەختی و قورسـییەكی زۆر هەیـە بـۆ سـەر سروشـتی مرۆیـی، بۆیـە لـە كـاتی سـروش دابەزینـدا، ئـەوا پێغەمبـەر دەچـووە حاڵـەتی ئامـادە نـەبوون (غیبــة) و بــەڕۆح و هــۆش و دەروون ســەرقاڵی ســروش وەرگــرتن دەبــوو و ئاگــای

(١) الاتقان في علوم القرآن و زاد المعاد هەردوو سەرچاوەكەی پێشوو، و اشارد الساري شرح صحيح البخاري ٥٨/١ و النوَوي على صحيح مسلم بهامش ارشاد الساري ١٨٣/٩.

(٢) ارشاد الساري ٥٩/١.

(٣) الاتقان ٤٣/١ و الوحي المحمدي ٨٣ و وتەی (ابن خلدون)یشی تێدایە، و ارشاد الساري ٥٩/١.

لەلاشەكەی نەدەما و هەروەك ناڵەو پڕخە (غطیط)ی لێ بەرز دەبووەوە.

دەكرێ هۆش تەصەوری تێكەڵ بوون و ئەو پەیوەندییەی پێغەمبەر لەگەڵ فریشتە بكات، هەروەك چۆن هۆش تەصەوری بوونی نواندنی موگناتیسی (تنویم المغناطیسي) دەكات، كە (د. مسمر)ی ئەڵمانی ئاشكرای كرد لە سەدەی هەژدەم، تەنانەت بەڵگەی وای لەسەر هێنایەوە كە زانایان بەشێوەیەكی زانستی دانیان پێداناوە، ئەمەش دوای ئەوەی هەزاران كەسیان تاقی كردەوەو ئێستا لە خۆرئاوا پشتیوانی زۆری هەن، و خول و كتێب و نەخۆشخانەی هەن كە خەڵكی بۆ چارەسەر رووی تێدەكەن.

لە نواندنی موگناتیسی دا ئەوا مامۆستا خەوێنەرەكە بە ڕێنماییەكانی بەسەر ڕوولێنەر (وسیط) زاڵ ئەبێت، جا ڕوولێنەر (وسیط)ەكە دەچێتە خەوێكی قوڵەوە، چی بیەوێت ئەو پرساری لێ ئەكات و وەڵامی ڕاستەوخۆی دەست دەكەوێت و دەكرێ فەرمانی پێبكات. بەكردن یان نەكردنی شتێ، جا ڕوولێنەر (وسیط)ەكە جێبەجێ ئەكات ئەگەر دوای بەهۆش هاتنەوەش بێت. و پێویستە لە نێوان هەردوو كەسەكە (واتە مامۆستاكە و ڕوولێنەر (وسیط)ەكە)[1] كە سروشتیان جیاوازە یەكێكیان بەهێزتر بێت لەوەی تر، مرۆڤ ناتوانێت ئەو ئەزموونە بەخۆی لەسەر خودی خۆی جێبەجێ بكات.

جا نواندنی موگناتیسی وا دەكات كە ئەندێشە كردنی سروش ئاسان تر بێت، لەبەر ئەوەی پەیوەندی كردنی فریشتە بە پێغەمبەر، كاریگەری خۆی هەیە، لەبەر بوونی ئامادەباشی تایبەت تیایاندا، جا فریشتە هێزی پێدان و كارتێكردنی هەیە، چونكە ڕۆحانی رووتە، و پێغەمبەریش ئامادەباشی وەرگرتنی هەیە لەو فریشتەیە، لەبەر پاك و پوخت بوونی لایەنی ڕۆحی و دەروونیەكەی و لەبەر ئەوەی پاكیەكەی هاوتایە لەگەڵ پاكی فریشتەكە و كاتێ فریشتەكە زاڵ ئەبێت بەسەر دەروون و هۆشی پێغەمبەردا، ئەوا پێغەمبەر لە حاڵەتی سروشتی خۆی دەرئەچێت و

---

(١) وەرگێڕ.

نیشانەكانی لەسەر ڕووی دەر ئەكەون و سروش و نیگاكە لە فریشتەكە وەرئەگرێت و ئەوەی وەریگرتووە لە دڵیدا جێگیر ئەبێت و كاتێ حاڵەتەكە كۆتایی هات، ئەوا دەبینێت كە بەتەواوی سروشەكە لەسەر ڕووی دڵی نەقشاوەو لەبیری ناكات[(١)].

سەرباری هەموو ئەو شتانە هیچ شتێكمان نەبینی كە ببێتە هۆی نەبوونی پەیوەندی نێوان فریشتەكە و پێغەمبەر (ﷺ)، بە بەڵگەی:

زانستی سەردەم هەندێ ئامێری بۆ ئێمە فەراهەم كردووە كە بەهۆیانەوە ئەو شتانە پەیی پێدەبەین، كەچی پێشتر پەیی پێنەبراو و نەناسراو بوون. هەروەك لەو ئامێرانە هەیە كە پێكدادانی تیشكەكانی بوونەوەری لە بوشایی ئاسماندا تۆمار كردووە، هەندێ ئامێریش هەن كە دەنگی مێشی فڕیو تۆمار دەكات، لە دووری چەند میلێك هەروەك ئەوەی لەلای گوێچكەی تۆ دەفڕێت، ئینجا بەهۆی ئەو ئامێرە پێشكەوتووە سەردەمیانە، دەتوانرێت درك و پەیی ببرێت بەوەی كە ئێمە ناتوانین بە ڕێگە ئاساییەكان و (تقليد)ی خۆمان بیبیستین.

ئەم هێزە نا ئاساییە، تەنها تایبەت نیە بە ئامێرە زانستیە هاوچەرخەكان، بەڵكو خوای گەورە بە هەندێ لە گیانلەبەر بەخشیوە.

بۆ نمونە سەگ دەتوانێت، بۆنی ئەو گیانلەبەرە بكات. كە بەڕێگادا چووە، ئەو هەستەی سەگ ئەقۆزرێتەوە بۆ دۆزینەوەی تاوانباران، بۆ نمونە: ئەو قوفڵەی كە تاوانبار شكاندوویەتی، ئەوا ئەو سەگەی ڕاهێنانی پێكراوە بۆنی دەكات و دواتر شوێنەوارەكانی ئەپشكێنێت و تاوانبارەكە لە نێوان هەزاران كەسدا دەدۆزێتەوە.

ئەگەر جانەوەری مۆرانە (العُثة)ی باڵدارت لەسەر پەنجەرە دانا ئەوا دەنگێك ئەنێرێت كە خێزانەكەی لە ئەندازەیەكی دوورەوە گوێبیستی ئەبێت و ئەویش بە ڕێگەیەكی تایبەت وەڵامی ئەداتەوە.

كولله مەشكە (جندب) باڵ و پێیەكانی لێ دەخشێنێت و بە ڕێگەیەكی نا ئاسایی

---

(١) مناهل العرفان ٥٩/١-٦٠، و چەندین نمونەی تێدایە لەسەر ئەزموونی نواندنی موگناتیسی، و النبأ العظيم ٧٥-٧٦.

دەنگ دەردەكات و ئەو دەنگە دەبیسترێت لە دووری نیو میل.

هەروەها كوللەی سەوز (أبي النطيط) توانایەكی نائاسایی هەیە، دەتوانێت شت ببیستێت و هەست بەو جوڵەیە بكات كە لە نیو گەردیلەی هایدرۆجین ڕوودەدات...

چەندین نمونەی زۆر هەن، بەلگەن لەسەر ئەوەی چەند ڕێگە و هۆكاری تری نابینراو هەن كە خاوەن هەستە تایبەتەكان هەیانە، جا ئەگەر ئەمە وابێت، ئەوا هیچ نامۆیی لەوەدا نییە كە پێغەمبەر بانگەشەی ئەوە بكات، كە دەنگێك لە خوای گەورەوە دەبیستێت خەڵكی نایبیستن، مادەم چەندین دەنگ و جوڵە هەبن لەو بوونەوەرەدا كە مرۆڤ نایبیستێت، كەچی ئامێرەكان تۆماری ئەكەن و مادەم چەند گیانلەبەرێك دەبیستن و هەندێكی تر نایبیستن[١].

***

## سروش ( وحي ) شتێكە لە دەرەوەی دەروونە

باوەڕ بوون بە سروش (وحی) بناغەی باوەڕ بوونە بە پێغەمبەرایەتی و تاكە ڕێگایە كە بیروباوەڕ و حوكمە شەرعیەكان و جگەلەوانیشی پێدا هاتووە.

بۆیە زۆرێك لە دوژمنانی ئیسلام زۆر گرنگیان بە وروژاندنی گومان دەدا دەربارەی سروش (وحی) وەك شوێنكەوتووانی بێ باوەڕە نەزان و نەفامەكانی قورەیش و گێل و گەلحۆكانی هاوبەشدانەران كە چەندین قسەو قسەلۆكی هەڵبەستراویان ئەوروژاند بەمەبەستی لەكەدار كردنی پێغەمبەری مەزن (ﷺ)، ئەمەش بەوەی وتیان: جادوگەرە یان شێتە یاخود شاعیرە.

تەنانەت هەندێ لە ڕۆژهەڵاتناسەكان[٢] و جگەلەوانیش وتیان: سروش (وحی) تەنها بریتیە لە گوفتارو خورپەو ئیلهاماتی دەروون.

بەڵام ئێمە بڕوامان وایە: سروش (وحی) بەرهەمی پەیی پێبردنی دەروونی و ویژدانی شاراوە و ئاماژەكانی نەفس و سیماناسی (فراسة)ی خێرا نییە، كە زۆربەی

---

(١) الاسلام يتحدى ٩٦ - ٩٧.

(٢) بڕوانە: تأريخ الأدب العربي - بروكلمان چ ٣، ١٣٤/١.

جارەكـان كاریگـەری ئـەبێت بـەهۆی مەشـق و ڕاهێنـانی ڕۆحـی و بیركردنـەوەی بەردەوام، واتە بەشێك نیە لە نیگای دەروونی كە بریتیە لەو ئیلهامانەی كە بەسەر خـودی خاوەنەكەیـدا دادەڕژێتـەوە، لـەكاتی ئامادەباشـی بـۆ بەرزكردنـەوەی ئاسـتی دەروون و ئاماژەو نهێنیە دەركەوتووەكانی[1].

لەبەرئـەوەی بـە نیگـای دەروونـی زانیـاری تـەواو و یـەقینی كامـڵ ناهێتـە كایـە، گومـانیش لـەوەدا نیـە كـە مـرۆڤ بـەو چـەندحاڵەتە دەروونیانـەی ناگاتـە پلـەی پێغەمبەرایەتی.

بـەڵكو سـروش (وحـی) بریتیـە لـە (شـتێكی لـەناكاو و بـەدەر لـە سروشـتی مرۆیـی)[2]، بـەدەرە لـە نـەفس و دەروون و ملكەچـی هـیچ كاریگەریـەك نابێـت كـە بەسەریدا دێت و پێغەمبـەر (ﷺ) لەلایـەن زاتـی خـوای گـەورەوە وەری ئـەگرێت، لە ڕێگەی ئەو فریشتەیەی كە بەوكارە ڕاسپێردراوە.

هەر كەسێكیش وردبینـی بكـات، لـە چۆنیەتی سروش و دیـاردە و نیشـانەكانی و ئـەو دیاردانـەی كـە بەسـەر پێغەمبـەر (ﷺ) دا دێـن، بـەهۆی سروشـەوە، پـەیی بەوەدەبات كە سروش پەیوەست نییە بەهەواو ئارەزووی دەروون و نەفس.

ئەمەش لەو شتانەی خوارەوە دەر دەكەوێت[3]:

١- كاتێك (جبریل) هاتـە لای پێغەمبـەر (ﷺ) لـە ئەشـكەوتی (حِـرَاء) و فـەرمانی پێكـرد كـە بخوێنێتـەوە - كەچـی ئـەو نەخوێنـدەوار بـوو - هـەروەك لـە (صـحیح

---

(١) الكلام عن الوحي النفسي في الوحي المحمدي ٦٦.

(٢) ارشاد الساري ٦٠/١.

(٣) بڕوانە: الوحي المحمدي ٨٩ و لاپەڕەكانی دواتری، و مناهل العرفان ٥٦/١ و لاپەڕەكانی دواتری، و ٢٨٥/٢ و لاپەڕەكانی دواتری، و النبأ العظيم ٢٠ و لاپەڕەكانی دواتر، و الظاهرة القرآنية - مالك بن نبي ١٦٥ و لاپەڕەكانی دواتر، و مباحث في علوم القرآن - د.صبحي صالح ٢٢ و لاپەڕەكانی دواتر، و كبرى اليقينيات الكونية ١٩٨ و لاپەڕەكانی دواتر، و الرسول - سعيد حوى ١٣/٢ و لاپەڕەكانی دواتری.

البخاری) له (باب: كیف كان بدء الوحي الى رسول الله (ﷺ)) هاتووه، كـه جبریـل پێـی وتووه: بخوێنه[1]، فەرمووی: من خوێندەوار نـیم، پێغەمبـەر دەفـەرمووێ (جبریـل[2]) مـنی گـرت و تونـد بەخۆیـەوە گوشـیم هـەتا ئـازارم پێگەیشـت و لەدواییـدا بەریـدام، دووبـارە وتـی: بخوێنـە، منـیش دووبـارە وتم: خوێنـدەوار نـیم، بـۆ جـاری دووەم بەخۆیـەوە گوشـیم تـا ئـازارم پێگەیشـت ئینجـا بەریـدام، سـێبارە پێـی وتم: بخوێنـە، منیش وتم خوێندەوار نیم، بـۆ جـاری سـێیەم بەخۆیـەوە گوشـیم، ئینجـا وتـی: ﴿ اقْرَأْ بِاسْمِ رَبِّكَ الَّذِي خَلَقَ ① خَلَقَ الْإِنسَانَ مِنْ عَلَقٍ ② اقْرَأْ وَرَبُّكَ الْأَكْرَمُ ③ ﴾ واتـە: ("ئـەی محمـد (ﷺ) " بخوێنە بـەناوی ئـەو پەروەردگارەتـەوە كـە هـەموو شـتێكی دروسـت كـردووە. ئـادەمیزادی لـە چـەند خانەیـەكی هەڵواسـراو - لـەناو منداڵدانـدا - دروسـت كـردوە. بخوێنە، لەكاتێكدا هەر پەروەردگاری تۆ بەخشندەیە).

پێغەمبەر ئەو چەند ئایەتانەی لەگەڵ خۆ بردنـەوە، دڵیشی زۆر بـە خێرایـی لـێ دەدا و دەچـێتەوە بـۆ لای (خدیجـە)ی كچـی (خولیـد) - ڕەزای خـوای لـێ بێـت - و دەفەرمووێ: دامپۆشن، دامپۆشن، دایدەپۆشن، تا ئـەو ترسـەی لـێ دەڕەوێتـەوە، دوایـی هەواڵەكە بۆ خەدیجە باس دەكات، دەفـەرمووێ ((لقد خشیت علـی نفسـي)) واتـە: لـە خۆم ترسام.

پێغەمبـەر (ﷺ) باسـی لـەو ترسـەی كـردووە كـە لـە كـاتی بینینـی (جبریـل)

---

(١) ئەو فەرمانە فەرمانی پێكهێنانە (تكوین)یە نەوەك فەرمان و پێ سپاردن (تكلیف)ی بێت - واتاكەی بریتیە لەوەی: ببە بە خوێنەر -، بۆیە لە كەڕەتی سێیەمدا وتی: ﴿ اقْرَأْ ﴾ واتە: ببە بەخوێنەر بەناوی خوا و بەویستی خوا و بەوەی خوای گەورە یارمەتیت ئەدات، نەوەك بەخۆت و تواناكەت، چونكە دەزانێت كە نەخوێندەواریت، بەڵام خوای گەورە ویستی مرۆڤ لە پارچە گۆشتێك بەدیبێنێت و ئامرازی بینین و بیستنی پێ ببەخشێت، بەهەمان شێوە خوای گەورە ویستویەتی ببیتە خوێنەری ئەو پەیامەی لەڕێگەی سروش بۆت دەنێرێت تا بەسەر خەڵكیدا بخوێنیتەوە، بەم جۆرە ئەبیتە خوێنەر./ الوحي المحمدي، پەڕاوێزی ٨٥.

(٢) وەرگێڕ.

دایگرتووە، لەو گێڕانەوە (روایة)ێکی تر (بخاری)دا کە لە بارەی تەفسیری سوڕەتی (المدثر) هێناویەتی: ((فَجُثِثْتُ منه رُعْباً)) واتە: (زۆر لێی ترسام). و لە گێڕانەوەیەکی تردا: ((فَجُثِثْتُ منه هويت الى الأرض)). واتە: (زۆر لێی ترسام و بە زەویدا کەوتم).

بۆیە خەدیجەی خێزانی هیچ هۆکارێکی دەست نەکەوت تا پێغەمبەر دڵنیا بکاتەوەو خۆیشی لێی دڵنیا بێت، تەنها ئەوە نەبێت کە بیباتە لای شارەزاترین کەس لەوبارەدا لەناو عەرەبەکان و ڕاوێژی پێ پێبکات، ئەویش ئامۆزای بوو، ناوی (ورقە)ی کوری (نوفل) بوو، کە کتێبەکانی جولەکە و نەصرانیەکانی خوێندۆتەوەو تێگەیشتووەو لەبەری کردووە، جا وتی: (هذا الناموس الذي نزّل الله على موسى) واتە: ئەوە ئەو فریشتەیە کە خوا ناردوویەتی بۆ سەر موسا (سەلامی لێ بێت).

دوای ئەمە ئەوە ڕوون دەبێتەوە کە: کاتێك (جبریل) پێغەمبەری لە باوەش گرتووەو بەتووندی گوشیویەتی و سێ جار فەرمانی پێکردووە بخوێنێت، ئەمە جەخت لەسەر ئەوە دەکاتەوە سروش وەرگرتنەکە شتێکی دەرەکی بووە نەوەك دەروونی یاخود خەیاڵی، بۆیە پێغەمبەر وای ڕوانی کە (جبریل) ئازاری پێ گەیاندووە، لەبەر ئەمە خێرا چووە لای خەدیجە تا ڕووداو و ترس و لەرزەکەی پێ ڕابگەیەنێت، جا لە ترسان دڵی ئەلەرزی و لەخۆی ئەترسا کە بمرێت. لەبەر ئەو شتە مەترسیدارەی بینیویەتی، بۆیە وتی: ((زملوني زملوني)) واتە: داپۆشن و بم پێچن. پەنای بۆ خۆ پێچان و خۆپۆشین برد تا لەپەنایدا ئارام و ئاسوودە بێت، بۆیە دایان پۆشی تا ترس و لەرزەکەی لێ نەما.

ئینجا دوای تێپەڕ بوونی ماوەیەك دووبارە سروش (وحی) بۆ پێغەمبەر (ﷺ) دادەبزێت و فەرمانی پێ دەکات: ﴿ يَا أَيُّهَا الْمُدَّثِّرُ ① قُمْ فَأَنذِرْ ② ﴾ واتە: (ئەی ئەو کەسەی خۆت پێچاوەتەوە، ئەی محمد (ﷺ)، هەستە و خەڵکی بێدار بکەرەوە). پێغەمبەری خوا لەو فەرمانەی کە پێیکراوە ورد دەبێتەوەو بەسەر سوڕمانیەوە بە خەدیجە دەڵێت: ((لقد أمرني جبريل أن أُنذر الناس، فمَن ذا أدعو، ومَن ذا يستجيب؟))

واتە: (جبریل فەرمانی پێكردووم كە خەڵكی ئاگادار بكەوە، جا بانگی كێ بكە و كێ ئاگادار بكەمەوە، دەبێ كێ وەڵامم بداتەوە).

هەرموو ئەمانە بەڵگەن لەسەر ئەوەی كە سروش (وحی) شتێكی خودی نییە و گەواهی دەدەن كە سروش سەرچاوەی نەگرتووە لە قسەوباسی دەروون، وەك:

أ- پێغەمبەر (ﷺ) زرنگ و دەنگێكی توندی بەگوێدا دێت، وەك دەنگی زەنگی یەك لەدوای یەك توونـدو تیـژ. جا لە (صحیح البخاري - كتاب بدء الوحي -)[1] هاتووە:

((أحياناً يأتيني مثل صلصلة الجرَس، و هو أشَدُّه عليّ، فيفصم عني، و قد وعيت عنه ما قال)) واتە: (هەندێ جار سروشم بۆ دێت وەك زرنگ و هوڕی زەنگ، دواتر ئەم دەنگە زرنگە كۆتایی دێت و منیش دوای كۆتایی هاتنی لە قسەكانی تێگەیشتم).

(مسلم - كتاب الفضائل: باب عرق النبي في البرد حين يأتيه الوحي) گێڕاویەتیەوە.

لە (مسند أحمد)[2]دا لە (عبدالله)ی كوڕی (عمرو) (ڕەزای خوای لێبێت) هاتووە، دەڵێت: پرسیارم لە پێغەمبەر (ﷺ)كرد كە: ئایا هەست بە سروش (وحی) دەكەیت؟ فەرمووی: ((نعم أسمع صلاصل، ثم أسكت عن ذلك، فما من مرة يُوحى اليّ، اِلا ظننت أن نفسي تفيض)) واتە: (بەڵێ گوێم لە زرینگ و هۆڕەو دەنگی بەهێز دەبێت، منیش لەم حاڵەتە بێ دەنگ ئەبم، هەر جارێكیش كە سروشم بۆ دێت ئەوا هەست دەكەم كە ڕۆحەكەم پارچە پارچە دەبێت).

ب- پێغەمبەر (ﷺ) لەكاتێك كە سروشی بۆ دەهات لە ڕۆژی زۆر ساردو سوڕدا هەموو جەستەی دەبووە ئارەقە.

لەو فەرموودەیەی كە (بخاری - كتاب الفضائل: باب عرق النبي في البرد حين

---

(١) صحيح البخاري ٢/١.

(٢) مسند الامام أحمد ٢٢٢/٢.

يأتيه الوحي) لە عائیشە (خوا لێی ڕازی بێت) گێڕاویەتیەوە، دەڵێت: (ئەگەر سروش دابەزیبوایە بۆ پێغەمبەر (ﷺ) لە بەرە بەیانیەکی ساردا ئەوا نێوچەوانی پێغەمبەر ئارەقەی پێدا دەهات). لە (صحیح مسلم)دا لە عائیشەوە هاتووە کە وتویەتی: (تاوەکو خوا وەحی ناردە سەر پێغەمبەر(ﷺ) ئەو ترس و لەرزەی کە لە کاتی دابەزینی سروش "وەحی" دا دایدەگرت لەوێشدا دایگرت، بەرئەندازەیەك وەك وردە مرواری ئارەقەی لێدەچۆڕا، لە ڕۆژی سەرماو سۆڵەی زستانە، لە قوڕسایی و سەختی ئەو وشەیەی دادەبەزیە سەری)[1] بەشێکە لە فەرموودەی (الإفك). و بەهەمان شێوە لە (صحیح البخاری) لە فەرموودەی (الإفك) دا هاتووە.

پ- پێغەمبەر سەری دادەکەوت و ڕووخساری ڕەش هەڵدەگەڕا (يغط في رأسه و يتربّد وجهه):

لە (صحیح مسلم - کتاب الفضائل: باب عرق النبي في البرد حين يأتيه الوحي) لە (عبادة)ی کوڕی (صامت)ەوە هاتووە: دەڵێ: (ئەگەر سروش بهاتایە بۆ پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئەوا بەمە ئازار دایدەگرت و ڕووخساریشی سورێکی ڕەش هەڵئەگەڕا).

لە گێڕانەوەیەکی تردا هاتووە:

(کە سروش دەهات بۆ پێغەمبەر (ﷺ) ئەوا سەری دائەگرت (نكس رأسه) و هاوەڵانیش سەریان دائەگرت، جا کە سروش کۆتایی دەهات سەری بەرز ئەکردەوە).

بۆیە بەهۆی ئەو ئازارەی کە پێغەمبەر (ﷺ) دووچاری دەبووەوە لەکاتی سروش دا، ئەوا ڕووخساری بە جلێك دائەپۆشی و سەرئێشەی ئەگرت.

لە (صحیح البخاري - باب يفعل في العُمْرة ما يفعل في الحج) لە (يعلی)ی کوڕی (أميّة) هاتووە: پیاوێك هاتە لای پێغەمبەر (ﷺ) کاتێك لە (جعْرانة) بوو و کەوا (حبة)یەکی لەسەر شان بوو بۆنێکی خۆشی لێ دەهات یان وتی: مەیلەو زەرد بوو،

(١) دەقی کوردی ئەم فەرموودەیەم لە ١٠٩٤/٢ (پوختەی صەحیح موسلیم دانانی: زکی الدين عبدالعظيم عبدالتوی المنذري، وەرگێڕانی: لیژنەیەك) وەرگرتووە. (وەرگێڕ).

جا وتی: ئەی پێغەمبەری خوا فەرمانم پێدەگەی چی بکەم لە عومرەکەمدا؟ جا سروش دابەزی بۆ پێغەمبەر (ﷺ) و بە جلێك پێغەمبەر داپۆشرا، منیش زۆرم پێ خۆش بوو کە پێغەمبەرم (ﷺ) بینیبوایە لەو حاڵەتەی سروشی بۆ دەهات، عومەر وتی: ئایا پێت خۆشە سەیری پێغەمبەر بکەیت لەو حاڵەتەی سروشی بۆ دێت؟ وتم: بەڵێ. جا عومەر لایەکی جلەکەی هەڵدایەوەو منیش تەماشام کرد، پێغەمبەر دەنگێگی لێدەهات جا پێم وابوو وتی: وەك (پرخەی وشتری لاو). جا کاتێك سروشەکە تەواو بوو و حاڵەتەکە کۆتایی هات، فەرمووی: ((أين سائل العمرة؟ اخلع عنك الجبة، واغسل أثر الخَلوق عنك، وأنقِ الصفرة، واصنع في عمرتك كما تصنع في حجك)) واتە: (ئەوەی پرسیاری کرد لەبارەی عومرە لە کوێیە؟ ئەو کەوا (جبە)یە داکەنە و بۆن و ڕەنگەکە لابەرە و چیت کرد لە کاتی حەج کردنتدا، هەمان شتیش بکە لە عومرەکەتدا).

ت- هاوەڵان دەنگێکی توونـدیان لە ڕووخساری پێغەمبەرەوە ئەبیست، لەکاتی سروش دابەزیندا، وەك: دەنگی هەنگ کاتێ لەلانەکەی دەردەچێت. هەروەك ئەمە هاتووە لە (صحيح الترمذي) باب التفسير (من سورة المؤمنون) - عومەری کوری خەتتاب (خوا لێی ڕازی بێت) وتویەتی: (کاتێك سروش دەهات بۆ پێغەمبەر (ﷺ)، دەنگێکی وەك دەنگی هەنگی بیستووە لەلای ڕووخساری پێغەمبەر).

ج- جەستەی پێغەمبەر لەکاتی سروش هاتن قورستر دەبێت:

لە (صحيح البخاری)دا لە (ابن عباس)ەوە - خوا لێی ڕازی بێت - هاتووە: (پێغەمبەر (ﷺ) جەستەی قورس ئەبوو بەهۆی ئەو سروشەی بەسەریدا دادەبەزی) و ئەم فەرموودەیە بە تەواوی پاش کەمێکی تر دەخرێتەڕوو.

لە (زاد المعاد) دا هاتووە: کە باس لە حاڵەتی دابەزینی سروش بۆ سەر پێغەمبەر (ﷺ)دەکات: (هەتا ئەگەر پێغەمبەر (ﷺ) لەسەر پشتی وڵاخی سواریەکەی بوبایە، لەکاتێك کە سروشی بۆ دەهات، ئەوا وڵاخەکە بەچۆکدا دەکەوت، بەهۆی ئەو سروشە موبارەکەی کە دادەبەزی بۆ پێغەمبەر، تەنانەت جارێك سروش بۆ پێغەمبەر (ﷺ)

هات و ڕانی موبارەكی لەسەر ڕانی زەیدی كوڕی ثابت بوو جا ڕانی پێغەمبەر قورسایی زیاد كرد بەهۆی سروش هاتن، تەنانەت زۆر نەمابوو ڕانی زەید بهاڕێت)[1].

ئەمەش ڕاستێتی ئەو فەرمایشتەی خوای گەورە پشت ڕاست دەكاتەوە: ﴿ إِنَّا سَنُلۡقِي عَلَيۡكَ قَوۡلٗا ثَقِيلًا ﴿٥﴾ ﴾ المزمل: ٥. واتە: (ئێمە فەرمووده و گوفتارێكی سەنگین دادەبەزێنینە سەرت).

تەنها پێغەمبەر (ﷺ) توانای بەرگە گرتنی ئەو قورساییەی هەیە، تا جەستەكەی لێڕابێت و ئامادە ببێت بۆ هەڵگرتنی ئەركی پێغەمبەرایەتی.

هەموو ئەو دیاردانە بەڵگەن لەسەر ئەوەی كە سروش شتێكی سەربەخۆو و جیایە و بەشێك نییە لە دەروونی پێغەمبەر (ﷺ)، چونكە قسەی دەروون و ئیلهام و خورپە و تێڕوانین پێویست بەو هەموو دیاردانە ناكات لەوەی كەسەكە تووشی: ئێش و ناڵە ناڵ و ڕەش هەڵگەڕانی ڕووخسارو ئارەقە جەستەی دابپۆشێت لە ڕۆژێكی زۆر سارد دا...

٣- هۆشیاری تەواو و لە بەركردنێكی ڕێك و پێك و تۆكمە، بۆ ئەو شتانەی كە بۆ پێغەمبەر (ﷺ) دادەبەزین، چ لە كاتی دابەزینی سروش و چ لە دوای دابەزین.

جبریل ساڵێ جارێك قورئانی بەسەر پێغەمبەردا (ﷺ) ئەخوێندەوە، ئەمە ناچێتە ناو چوارچێوەی ئارەزووەوە و بەهیچ شێوەیەك بە بەشێك لە ئیلهاماتی دەروون دانانرێت.

لە (صحیح البخاری)دا هاتووە، كە پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێت: ((أحياناً يأتيني مثل صلصلة الجرَس، و هو أشَدُّه عليّ، فيفصم عني، و قد وعيت عنه ما قال، وأحياناً يتمثل لي الملك رجلاً، فيكلمني، فأعي ما يقول)) واتە: (هەندێ جار سروشم بۆ دێت وەك زرنگ و هوڕی زەنگ، دواتر ئەم دەنگە زرنگە كۆتایی دێت و منیش

(١) زاد المعاد ١٨/١، و (حديث الرض) (البخاري) گێڕاویەتیەوە لە: (كتاب الجهاد باب قوله تعالى: ﴿ لَّا يَسۡتَوِي ٱلۡقَٰعِدُونَ مِنَ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ غَيۡرُ أُوْلِي ٱلضَّرَرِ ﴾) بڕوانە: ارشاد الساري ٦١/٥.

دوای كۆتایی هاتنی لە قسەكانی تێ ئەگەیشتم، هەندێ جاریش فریشتەكە لـە شێوەی پیاوێك دێتە لام و قسەم لەگەڵ دەكات و منیش لێی تێدەگەم).

جا لە هەر دوو ئەو حاڵەتانەی لە فەرموودەكـەدا خرانـەڕوو، ئـەوە پێغەمبـەر بـە تەواوی هۆشیاریەوە تێئەگەیشت لەو پەیامەی كە بە سروش بۆی دەهات.

پێغەمبەر (ﷺ) لە سەرەتادا كە سروشی بـۆ دەهـات جوڵەی بـە زمـانی دەكـرد و لاسـایی جبریلـی ئـەكردەوە لـە كـاتی سـروش خوێندنـەوەدا، جـا پێغەمبـەر (ﷺ) لەترسـی ئـەوەی نـەوەك لـەبیری بچـێتەوە ئـەوەی دەكـرد، بـەڵام خـوای گـەورە پێغەمبەرەكەی دڵنیا كـردەوە بـەوەی خـەمی لـە بەركردنەكـەی نـەبێت بـەڵكو خـوای گەورە سروشەكە لە دڵیـدا جێگیرو پـارێزاو دەكـات و هـیچ پێویسـت بـە زمـان جوڵـان ناكات.

خـوای پـاك و بـەرز دەفـەرموێت:﴿ لَا تُحَرِّكْ بِهِۦ لِسَانَكَ لِتَعْجَلَ بِهِۦٓ ﴿١٦﴾ إِنَّ عَلَيْنَا جَمْعَهُۥ وَقُرْءَانَهُۥ ﴿١٧﴾ فَإِذَا قَرَأْنَٰهُ فَٱتَّبِعْ قُرْءَانَهُۥ ﴿١٨﴾ ثُمَّ إِنَّ عَلَيْنَا بَيَانَهُۥ ﴿١٩﴾ ﴾ القیامـة: ١٦ - ١٩. واتـە: (پەلـە مەكە و زمانت مەجوڵێنە، بـۆ ئـەوەی پەلـە بكـەیت لـە وەرگرتنیـدا. بەڕاستی لەسـەر ئێمەیـە كۆكردنـەوەو خوێندنـەوەی. جـا كاتێـك ئێمـە دەیخوێنینـەوە تـۆش شـوێنمان بكەوە لە خوێندنەوەیدا. پاشان بەڕاستی ڕوون كردنەوەشی لەسەر ئێمەیە).

هـــەروەها دەفـــەرموێت: ﴿ وَلَا تَعْجَلْ بِٱلْقُرْءَانِ مِن قَبْلِ أَن يُقْضَىٰٓ إِلَيْكَ وَحْيُهُۥ ۖ وَقُل رَّبِّ زِدْنِى عِلْمًا ﴾ طـە: ١١٤. واتــە: ("ئــەی محمـد (ﷺ)" نەكـەیت لــە خوێندنــەوەی قورئاندا پەلە بكەیت؛ لە پێش ئـەوەی وەحـی و نیگـای ئـەو قورئانـە تـەواو ببێـت بـۆ لای تـۆ "چـونكە ئێمـە نایـەڵین فەرامۆشـی بكـەیت" نـزا بكـە و بشـڵێ: پـەروەردگارا، بەردەوام زانست و زانیاری زۆرترو زیاترم پێ ببەخشە).

لە (صحیح البخاري - باب: بدء الوحي) هاتووە:

لـە (سـعید)ی كـوڕی (جـبیر)ەوە لـە (ابـن عبـاس)ەوە هـاتووە لـەبارەی ئـەم

فەرمایشتەی خوای گەورە: ﴿ لَا تُحَرِّكْ بِهِۦ لِسَانَكَ لِتَعْجَلَ بِهِۦٓ ﴿١٦﴾ ﴾[1] پێغەمبەر (ﷺ) تووشی گرانی و سەختی دەبوو، بەهۆی قورسی قورئان كە بۆی دادەبەزی و لێوە موبارەكەكانی بەم هۆیەوە دەجوڵاند، (ابن عباس) وتی: منیش لێوەكانم ئەجوڵێنم وەك چۆن پێغەمبەر (ﷺ) ئەیجوڵاندن. (سیعد) وتی: منیش لێوەكانم ئەجوڵێنم وەك چۆن (ابن عباس) لێوەكانی ئەجوڵاند، دەڵێت جا پێغەمبەر (ﷺ) لێوەكانی دەجوڵاند بەم هۆیە خوای گەورە ئەم ئایەتانەی دابەزاند: ﴿ لَا تُحَرِّكْ بِهِۦ لِسَانَكَ لِتَعْجَلَ بِهِۦٓ ﴿١٦﴾ إِنَّ عَلَيْنَا جَمْعَهُۥ وَقُرْءَانَهُۥ ﴿١٧﴾ ﴾ وتی - واتە: (ابن عباس) -: واتە لە سینەی تۆدا كۆ دەكرێتەوە، ئینجا بیخوێنەوە. ﴿ فَإِذَا قَرَأْنَٰهُ فَٱتَّبِعْ قُرْءَانَهُۥ ﴿١٨﴾ ﴾ واتە: بێ دەنگ بە و گوێی بۆ بگرە. ﴿ ثُمَّ إِنَّ عَلَيْنَا بَيَانَهُۥ ﴿١٩﴾ ﴾ دواتر لەسەر ئێمەیە كە بیخوێنینەوە. جا دوای ئەوە ئەگەر جبریلی هاتبوبا لای پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئەوا پێغەمبەر تەنها گوێی ئەگرت، جا كە جبریل دەردەچوو، ئەوا پێغەمبەر (ﷺ) دەیخوێندەوە وەك چۆن جبریل بۆی خوێندبوویەوە.

لەبەر ئەمە جبریل (سەلامی خوای لێبێت) لە هەموو شەوێك لە مانگی ڕەمەزاندا، دەهاتە لای پێغەمبەر و قورئانی پێ ئەوت. لە (صحیح البخاري - كتاب الفضائل القرآن - باب: كان الجبریل یعرض القرآن علی النبيّ (ﷺ)) هاتووە لە عائیشەوە ئەویش لە (فاتیمە) (سەلامی لێبێت): (پێغەمبەر (ﷺ) بەنهێنی پێی وتم كە جبریل ساڵێ یەكجار قورئانی بەسەر مندا دەخوێندەوە، بەڵام ئەم ساڵ دوو جار قورئانی بەسەر منیدا خوێندۆتەوە، تەنها بۆ ئەوە ئەچم كە سەرمەرگم نزیك بۆتەوە).

(ابن كثیر) وتویەتی: (بخاری) بەو شێوەیە بە هەڵواسراوی (معلق) گێڕاویەتیەوە، و لە شوێنێكی تردا لە فەرموودەی (ابن عباس) و (أبو هریرة)دا

---

(١) هەر لەم لاپەڕەدا مانای ئەم ئایەتەمان كردووە بۆیە دووبارەی ناكەینەوە. (وەرگێڕ).

سەندەكەی هێناوە، و (أبو داود) و (النسائی) و (ابن ماجە) گێڕاویانەتەوە.

مەبەستی لەوەدا كە هەموو ساڵێ جارێك قورئانی بەسەردا ئەخوێندەوە: بریتیە لە بەرامبەر كردنی لەگەڵ ئەوەی خوای گەورە بۆی ناردووە، تا ببێتە هۆكاری جێگیرو چەسپاوتر بوون و تا لەبیری نەكات[١].

٤- پچڕان و دابڕانی سروش لە پێغەمبەر (ﷺ)، كەچی زۆر زۆر حەزی ئەكرد كە سروشی بۆ بێت، ئەمەش بەڵگەیە كە سروش شتێكی جیاوازو بەدەرە لە دەروون و فیكر، و لە زاتی موبارەكی پێغەمبەر (ﷺ) سەرچاوە ناگرێت و شتێك نییە ملكەچی ویستی ئەو بێت، بەڵكو تەنها كاتێك سروش دادەبزێت كە خوای گەورە ویستی لەسەر بێت بەبێ ئەوەی پێغەمبەر (ﷺ) هیچ ڕۆڵێكی هەبێت، نمونەش لەسەر پچڕانی سروش:

أ- دوای ئەوە (جبریل) ئەم چەند ئایەتانەی دابەزاند: ﴿ٱقۡرَأۡ بِٱسۡمِ رَبِّكَ ٱلَّذِی خَلَقَ ۝١ ...﴾[٢] "سورەتی: العلق" بۆ ماوەی سێ ساڵ سروش (وحی) پچڕا، و لە هەندێ فەرمایشتدا هاتووە كە بۆ ماوەی دوو ساڵ و نیو پچڕاوە[٣]. بەم هۆیە پێغەمبەر (ﷺ) زۆر خەمبار و دڵگران بوو، تەنانەت چەند جارێك هەوڵی دا خۆی لە لوتكەی كێوی بەرزدا فرێبداتە خوارەوە، هەروەك (البخاري: باب: أول ما بدء به رسول الله (ﷺ)من الوحي، كتاب الوحي)[٤]: ( ڕۆژێك پێغەمبەر (ﷺ) بەڕێگادا ئەڕۆیشت،

---

(١) سەیری: (جبریل قورئانی بەسەر پێغەمبەردا (ﷺ) ئەخوێندەوە) بكە، لە: فضائل القرآن - ابن كثیر ٢٦-٢٧. كە پاشكۆی تەفسیرەكەیەتی.

(٢) پێشتر مانای ئەم ئایەتانەمان كردووە بۆیە دووبارەی ناكەینەوە. (وەرگێڕ).

(٣) ارشاد الساري ٦٧/١.

(٤) دەربڕینی فەرموودەكە بەم شێوەیە: (بەشێوەیەك سروش و نیگا پچڕا - بەو شێوەیەی پێمان گەیشتووە - پێغەمبەر زۆر پێی دڵ گران بوو، بەشێوەیەك كە پێغەمبەر چەندین جار هەوڵی دا خۆی لە لوتكەی كێوە بەرزەكان فرێبدایە خوارەوە، جا كە هەر لە لوتكەی كێوەكە نزیك =

دەنگێكی بيست لە ئاسمانەوە جا سەيری كرد بينی ئەو فريشتەيە كە لە ئەشكەوتی - حِراء - هاتبووە لای، پێغەمبەر (ﷺ) لێی ترسا، خێرا گەڕايەوە ماڵەوە بۆ لای خەديجەی خێزانی و پێی وت: (داميۆشن داميۆشن) جا خوای گەورە ئەمەی دابەزاند: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلۡمُدَّثِّرُ ١ قُمۡ فَأَنذِرۡ ٢ .... ﴾ لەمەو دوا سروش بەگەرمی و بەبێ پچڕان دەهات).

ب- سروش بۆ ماوەی يەك مانگ پچڕاوە، هەروەك لە (البخاري - باب حديث الافك من كتاب الغازي) هاتووە، پێغەمبەر (ﷺ) زۆر پێی خۆشبوو سروشی بۆ بێتەوە، تا ئەو قەيرانە چارەسەر بكات، لە ڕووداوی (افك)دا بەرپا بوو كە دووڕووەكان دايكی باوەڕداران عائيشەيان (خوا لێی ڕازی بێت) تۆمەتبار كرد بە كاری خراپە، هەتا وای لێهات پێغەمبەر (ﷺ) پێی فەرموو: ((يا عائشة أما انه بلغني عنك كذا و كذا، فاِن كنتِ بريئة فسيبرئك الله، وان كنتِ ألمتِ بذنبٍ فاستغفري الله)) واتە: (ئەی عائيشە هەواڵی ئاواو ئاوام پێگەيشتووە، جا ئەگەر تۆ بێ تاوان بيت، ئەوا خوای گەورە ئەوە دەسەلمێنێت و ڕای دەگەيەنێت و ئەگەر تاوانێكيش ئەنجامداوە ئەوا داوای لێخۆش بوون بكە بۆ خوای گەورە). ئينجا دوای يەك مانگ پاش قسەو باسێكی زۆری خەڵكی ئەوا چەند ئايەتێك لە سوڕەتی (النور) دابەزی و پاكانە و بێ تاوانی ئەويان سەلماند.

جا كەسێك كە ورد بووبێتەوە وای نابينێت؟: ئەو مانگە زۆر درێژترە لە چەندين ساڵ كە پێغەمبەر (ﷺ) چاوەڕوانی هاتنی سروشی كردووە لەگەڵ دوو دڵی و گومانێكی زۆرەوە، جا ئەگەر سروش شتێكی دەرەكی نەبوايە ئەوا هەر زوو

---

= ئەكەوتەوە بۆ ئەوەی خۆ تێ فڕێبدات ئەوا جبيرل ڕێگەی لێ ئەگرت، دەيوت: ئەی محمد تۆ بەڕاستی پێغەمبەری خوای، جا بەمە دەروونی ئارامی ئەگرت و دەگەڕايەوە ماڵەوە، بەڵام هەر كە ماوەی پچڕانی سروش زياتر درێژ ئەبووەوە ئەوا هەمان هەوڵی پێشووی ئەدايەوە، جا كە ئەگەيشتە لوتكەی كێوەكە ئەوا جبريل بۆی دەرئەكەوت و ڕێگری لێ ئەكرد و هەمان شتی پێ دەوت)/ ارشاد الساري ١٢١/١٠.

پێغەمبەر (ﷺ) بانگەشەی هاتنی دەكرد، هەر لەوكاتەی كە هەواڵی ڕووداوەكە بڵاو ئەبووەو مەسەلەكەی یەكلایی دەكردەوە.

پ- سەرباری ئەوەی پێغەمبەر (ﷺ) پێی خۆش بوو كە ڕووگە (قبلة) بگۆڕێت، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا سروش شازدە یاخود حەڤدە مانگ دانەبەزی. سەبارەت بە گۆڕانی ڕووگە لە (بیت المقدس) بۆ (كەعبە)، پاش ماوەی ناوبراو، سروش دابەزی بەم ئایەتەوە: ﴿ قَدۡ نَرَىٰ تَقَلُّبَ وَجۡهِكَ فِي ٱلسَّمَآءِۖ فَلَنُوَلِّيَنَّكَ قِبۡلَةٗ تَرۡضَىٰهَاۚ فَوَلِّ وَجۡهَكَ شَطۡرَ ٱلۡمَسۡجِدِ ٱلۡحَرَامِ ﴾ البقرة: ١٤٤. واتە: ("ئەی پێغەمبەر (ﷺ)" بەڕاستی چاوگێڕان و هەڵسوڕانی ڕووخسارت ڕوو بە ئاسمان دەبینین، سوێند بەخوا ئێمەش رووت وەردەچەرخێنین بۆ ڕووگەیەك پێی ڕازی خۆشنوود بیت، دە ڕووت وەربچەرخێنە بەرەو لای كەعبە "المسجد الحرام"). هەروەك لە (صحیح الترمذي)[1] دا هاتووە: ئەم پچڕانەی سروش بەڵگەیە لەسەر ئەوەی كە پێغەمبەر (ﷺ) هیچ قسەیەكی لەخۆیەوە بۆ خەڵكی هەڵ نەدەبەست،لەو ماوەیەی كە سروش پچڕاوە پێغەمبەر (ﷺ) نەدواوە لەبارەی ئایین و قورئانی پیرۆز و سەرزنشتی هاوبەشدانان و هاوبەش دانەران، چونكە ئەگەر دوابووبا لەو بارەیەوە، ئەوا نزیكترین كەسەكانی بۆ ئێمەیان دەگێڕایەوە وەك (خەدیجە) و (عەلی) و (زید)ی كوڕی (حارثة) كە لەماڵێدابوو و (أبوبكر) هاودەمی و هاوەڵی دەكرد بە درێژایی ژیانی.

---

(١) لە (صحیح الترمذي بشرح عارضة الأحوذي ٨٥/١١ باب التفسیر) لە (البراء)ی كوڕی (عازب)ەوە هاتووە، (كە وتویەتی: كاتێ پێغەمبەر (ﷺ) كۆچی كرد بۆ شاری مەدینە ئەوا بۆ ماوەی شازدە یاخود حەڤدە مانگ ڕووەو (بیت المقدس) نوێژیان كردووە، پێغەمبەر (ﷺ) پێی خۆش بوو كە ڕووگە بگۆڕێت بۆ (كەعبە)، جا خوای گەورە ئەم ئایەتەی دابەزاند ﴿ قَدۡ نَرَىٰ تَقَلُّبَ وَجۡهِكَ ... ﴾ تا ﴿ ٱلۡمَسۡجِدِ ٱلۡحَرَامِ ﴾ جا پێغەمبەر (ﷺ) ڕووی كردە كەعبە، ئەمەشی زۆر پێ خۆش بوو) و بەهەمان شێوە (البخاري في كتاب التفسیر من صحیحه عند الآیة المذكورة عن البراء بن عازب) هێناویەتی.

**ئەو بێدەنگ بوونەی پێغەمبەر و نەدوانی لەبارەی سروش، لەو ماوەیەدا کە سروش پچڕابوو، بەڵگەیەکی گومان بڕە لەسەر پوچەڵی ئەندێشەی ئەو کەسانەی وای بۆ ئەچوون، سروش شتێکی خودیە لە پێغەمبەردا (ﷺ).**

**٥- یەکێك لە هۆکارەکانی دابەزینی قورئانی پیرۆز، ئەوەبوو کە پێغەمبەر (ﷺ) لە هەندێ کاتدا پرسیاری لێ ئەکرا، کەچی هیچ وەڵامێکی پێ نەبوو، بۆیە بێ دەنگ دەبوو، جاری واهەبوو بێ دەنگیەکەی ماوەیەکی زۆری دەکێشا.**

**جا ئەگەر ئایەت لەو بارەیەوە دابەزیبووبا، ئەوا بانگی ئەو کەسەی دەکرد کە پرسیاری کردبوو، ئەو ئایەتەی بەسەردا دەخوێندەوە کە لە قورئاندا دابەزیوەو پەیوەندی بە پرسیارەکەیەوە هەیە.**

**هەندێ کات وابووە کە پێغەمبەر (ﷺ) وەڵامی پرسیارەکەی ئەدایەوە، کەچی سروش بە پێچەوانەی وەڵامەکەی ئەو وەڵامی ئەدایەوە، تەنانەت کەمێك ڕەخنە و گلەییشی لێ دەکرد.**

**ئەمە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە سروش شتێکی دەرەکییە و پەیوەندی بە دەروونەوە نییە، چونکە ئەگەر سروش شتێکی دەروونی بوایە، ئەوا کە پرسیاری لێئەکرا پێویست نەدەبوو چاوەڕێی وەڵام بکات یاخود وەڵامی یەکەمی ڕاست بکاتەوە.**

**٦- ڕێگری کردنی پێغەمبەر (ﷺ) لە نووسینی فەرمایشتەکانی لە سەرەتای سروش دابەزین، نەوەك تێکەڵ بێت بە قورئانی پیرۆز، چونکە بە تەواوی دەیزانی: قورئان فەرمایشتێکە خوای گەورە بە دەربڕین و ماناکەیەوە بە سروش بۆی ناردووە، ئەو ناتوانێت یەك پیتیش بگۆڕێت.**

**هەر کە ئایەتێك دادەبەزی، ئەوا پێغەمبەر (ﷺ) فەرمانی بە نووسەرانی سروش دەکرد کە بینووسن، جا ئەوەی فێری خەڵکی کرد کە قورئان فەرمایشتێکی خواییە، لەلایەن زاتی خوای فەرماندەرەوە لە ڕێگەی سروشەوە هاتووە، پێغەمبەر (ﷺ) ئەمەی دووپات ئەکردەوە تا لە گوێچکەی موسڵماناندا جێگیر بوو، ئینجا**

ڕێگەی دا بە نووسینی فەرموودە.

ئەمە ئەوە دەگەیەنێت کە پێغەمبەر (ﷺ) جیاوازی ئەکرد لە نێوان قورئانی پیرۆز و فەرموودە، ئەگەر چی فەرموودە چ قودسی یان جگەلەو هەر بەشێکە لە سروش، بەڵام ئەوەندە هەیە کە فەرموودە مرۆڤ دای ئەڕێژێت.

جیاوازییەکی زۆر هەیە لە نێوان شێوازی قورئان، چونکە قورئان فەرمایشتی پەروەردگاری مرۆڤە، لەگەڵ شێوازی فەرموودە، ئەگەر فەرموودەکە هی ڕەوانترین و جوانبێژترین کەسیش بێت لە خەڵکی، بێ گومان ئەمە شتێکی ڕوونە بۆ کەسێ کە وردبێتەوە.

٧- بابەتی سروش:

پێغەمبەر (ﷺ) نەخوێندەوارە، نووسین و خوێندەواری نازانێت، لە ژینگەیەکی دەشتەکیانەی بت پەرستی ژیاوە، زانیاری و زانستی دانیشتوانەکەی سادەو سەرەتایین کە هیچ نرخ و قیمەتێکی نیە و هەر بەراورد ناکرێت بەوەی (ڕۆم) و (فارس)ەکان هەیان بووە.

پێغەمبەر (ﷺ) دەچووە ئەشکەوتی (حِراء) بە گۆشەگیری و کەنارگرتن لە خەڵکی بەندایەتی ئەکرد، هیچ زانیاریەکیشی نەبووە، تەنها ئەوە نەبێت کە فێری بووە لە کۆمەڵگە سەرەتاییەکەی.

ئا لەو بارودۆخ و حاڵەدا پێغەمبەر (ﷺ) لە ڕێگەی سروشەوە قورئانی پیرۆزی بۆ دادەبەزێت، قورئان چەندین ڕاستی مێژووی و گەردوونی و تیۆری کۆمەڵایەتی و ئابوری و سیاسی و جگە لەمانەش کە چارەسەری لایەنە جیا جیاکانی ژیان دەکات لە خۆ ئەگرێت، کە پێشتر هزرو فیکر بۆی نەچووەو بە خەیاڵی دا نەهاتووە، یاخود یەکێك گرنگی پێدا بێت یان هەر یەکێك لە هەر ژینگەیەك و لە هەر چەرخێكدا گرنگی بەو لایەنانە دابێت.

ئەم ڕاستیانەش وردو دیارن - لەبارەی دەدوێین لە کاتی دوان لە ئیعجازی قورئان - کە هیچ کەس بۆی نیە نکۆڵی لێ بکات، تەنانەت حیبرکانی جولەکەش ئەوانەی کە دەمەتەقێ و گفتوگۆیان لەگەڵ پێغەمبەر (ﷺ) دەکرد ئەوا سەریان سوڕئەما، کە

**دەیان بینی قورئان هەواڵی نەوەکانی ئیسرائیل و پێغەمبەرەکانیان ئەخاتە بەرباس.**

**هەموو ئەمانە بەڵگەن لەسەر ئەوەی کە ئەو پێغەمبەرە نەخوێندەوارە لە ناوەندە سەرەتاییەکەدا ناتوانێت ئەو یاساو ڕاستیە زانستی و غەیبی و شاراوانە لە خودی دەروون و فیکری خۆیەوە بهێنێت. بەڵکو پێویستە سەرچاوەیەکی هەبێت لە دەرەوەی دەروونی پێغەمبەر (ﷺ) کە بریتیە لەو سروشەی لەلایەن خواوە بۆی دێت.**

**٨- ئەو پەیامەی پێغەمبەر (ﷺ) هێناویەتی، سروشێك بووە کە لە پەروەردگارەوە بۆی هاتووە نەوەك لە خودی خۆی سەرچاوەی گرتبێت، لەبەر ئەوەی کاتێك داوا لە پێغەمبەر کرا، کە هەندێ شت لە قورئان بگۆڕێت، ئەوا وەڵامی دەدایەوە بەو سروشەی کە خوای گەورە بۆی ناردووە و هیچ شتێکی لێ نەشاردەوەو بە پێچەوانەیشی نەجوڵایەوە.**

**خوای پاك و بەرز فەرموویەتی:**

﴿وَإِذَا تُتْلَىٰ عَلَيْهِمْ ءَايَاتُنَا بَيِّنَٰتٍ قَالَ ٱلَّذِينَ لَا يَرْجُونَ لِقَآءَنَا ٱئْتِ بِقُرْءَانٍ غَيْرِ هَٰذَآ أَوْ بَدِّلْهُ ۚ قُلْ مَا يَكُونُ لِىٓ أَنْ أُبَدِّلَهُۥ مِن تِلْقَآئِ نَفْسِىٓ ۖ إِنْ أَتَّبِعُ إِلَّا مَا يُوحَىٰٓ إِلَىَّ ۖ إِنِّىٓ أَخَافُ إِنْ عَصَيْتُ رَبِّى عَذَابَ يَوْمٍ عَظِيمٍ ﴿١٥﴾ قُل لَّوْ شَآءَ ٱللَّهُ مَا تَلَوْتُهُۥ عَلَيْكُمْ وَلَآ أَدْرَىٰكُم بِهِۦ ۖ فَقَدْ لَبِثْتُ فِيكُمْ عُمُرًا مِّن قَبْلِهِۦٓ ۚ أَفَلَا تَعْقِلُونَ ﴿١٦﴾﴾ **یونس: ١٥ - ١٦. واتە: (کاتێکیش ئایەتەکانی ئێمە کە ڕوون و ئاشکرایە بەسەریاندا بخوێنرێتەوە، ئەوە ئەوانەی کە بە تەما نین ئامادەی بەردەم بارەگای ئێمە ببن دەڵێن: قورئانێکی جگە لەمە بێنە و بیخوێنەرەوە یان بیگۆڕە، تۆیش ئەی محمد (ﷺ) پێیان بڵێ: من بۆم نیە لە خۆمەوە بیگۆڕم، من شوێنی هیچ شتێك ناکەوم، جگەلەوە نەبێت کە بە وەحی پێم دەگات، بەڕاستی من دەترسم، ئەگەر یاخی بم لە پەروەردگارم و نافەرمانی بکەم، گیرۆدەی سزایەکی سەختی ڕۆژێکی زۆر گەورە ببم. پێیان بڵێ "ئەی محمد (ﷺ)" ئەگەر خوا بیویستایە ئەوە قورئانم بەسەردا**

نەدەخوێندنەوە، خوایش ئاگاداری نەدەکردن پێی، چونکە بەڕاستی ئاشکرایە کە من تەمەنێکی دوورو درێژم لە ناوتاندا بەسەر بردووە پێش هاتنی قورئان، کەواتە بۆچی عەقڵ و بیرو هۆشتان ناخەنە کار).

٩- پێغەمبەر (ﷺ) مرۆڤە و چەندین ئایەت پێشتر خرانەڕوو لەسەر ئەوەی پێغەمبەران و پەیامبەران مرۆڤن، بەڵام ئەوەندە هەیە سروشیان بۆ دێت، خوای گەورە دەفەرموویت:﴿ قُلْ إِنَّمَآ أَنَا۠ بَشَرٌ مِّثْلُكُمْ يُوحَىٰٓ إِلَيَّ ﴾ الكهف: ١١٠، و فصلت: ٦. واتە: ("ئەی پێغەمبەر (ﷺ) پێیان" بڵێ: بەڕاستی من تەنها ئادەمیزادێکم وەك ئێوە، بەڵام ئەوەندە هەیە وەحی و نیگام بۆ دێت).

دەسپێکردنی چەندین ئایەت بە وشەی (قُلْ) کە زیاتر لە سێ سەد جار لە قورئاندا دووبارە بۆتەوە.

فەرمایشتی خوای گەورە: ﴿ اقْرَأْ ﴾ العلق: ١. واتە: (بخوێنە).

﴿ اتْلُ ﴾ الكهف: ٢٧. واتە: (دەوری بکەرەوە).

﴿ وَرَتِّلِ ﴾ المزمل: ٤. واتە: (دەوری بکەرەوە بە وردی).

بەڵگەن لەسەر ئەوەی کە یەکێك هەیە ڕێنووێنی پێغەمبەر (ﷺ) دەکات، تا ئاواو ئاوا بڵێت، بەڵگەشە لەسەر ئەوەی کە قورئانی پیرۆز بە دەربڕین و ماناکانیەوە لەلایەن خوای گەورەوە هاتووەو محمد (ﷺ) هیچ دەستێکی تێدا نەبووە، بەڵکو تەنها ئەرکی لەئاست قورئان بریتی بوو:

أ- وەرگرتن و لەبەرکردن (الوعي والحفظ).

ب- گێڕانەوەو ڕاگەیاندن (الحكاية والتبليغ).

پ- ڕوون کردنەوەو شرۆڤە کردن (البيان والتفسير).

ت- جێبەجێ کردن و بەکردار کردنی (التطبيق و التنفيذ).

١٠- پێغەمبەر (ﷺ) جیاوازی کردووە لە نێوان ئەزموونی مرۆیی خۆی کە ئەکرێ لە هەندێ شتدا پێکابێتی و لە هەندێ شتدا بە هەڵە چووبێت، لەگەڵ ئەو

یەقینەی کە سەرچاوە ئەگرێت لە سروش و نیگا، کە ئاماژەیە بۆ ئەوەی سروش لەلایەنی دەرەکی پێی ئەگات، بە شێوەیەکی گومان هەڵنەگر و یەقینی، بۆیە تەنها لەسەر خەڵکی ئەوە پێویستە کە شوێنی بکەون. و ڕووداوی موتوربەکردن (تأبیر)ی دار خورماکان گەواهیدەرن لەسەر ئەمە، (مسلم) لە (صحیح)ەکەیدا هێنیاویەتی لە (موسا)ی کوڕی (طلحة) ئەویش لە باوکیەوە، دەڵێت:

(لەگەڵ پێغەمبەری خوا (ﷺ) بەلای کۆمەڵێك داچووین کە لەسەر دار خورماکانەوە بوون، فەرمووی: ((ما یصنع هؤلاء؟)) واتە: ئەوانە خەریکی چین. وتیان: دار خورما موتوربە دەکەن، تۆی نێر لەگەڵ مێ تێکەڵ دەکەن جا موتوبەر دەبێت، پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: ((ما أظن یغني ذلك شیئاً)) واتە: پێم وانیە ئەمە هیچ سوودێکی ببێت. دەڵێت: ئەم قسەیەی پێغەمبەریان بەوان گەیاند ئەوانیش وازیان لە موتوربە کردنەکە هێنا. ئەم هەواڵەیان بە پێغەمبەر (ﷺ) گەیاند سەبارەت بەمە فەرمووی: ((اِن كان ینفعهم ذلك فلیصنعوه فاِني انما ظننتُ ظنّاً فلا تؤاخذوني بالظن، ولكن اِذا حدثتكم عن الله شیئاً فخذوا به، فاِني لن أكذبَ على الله عزوجل)) واتە: ئەگەر ئەو کارەی سوودی بۆ ئەوان هەیە با بیکەن چونکە ئەوە تەنها بۆچوونێکی کەسی بوو با بەهیچی لەسەر من حیساب نەکەن، بەڵام گەر شتێکم لە خواوە پێ وتن ئەوا دەستی پێوە بگرن، چونکە بێگومان درۆ بەناوی خوای باڵادەست و خاوەن شکۆوە ناکەم).

لە گێڕانەوەیەکی تردا هاتووە: ((أنتم أعلم بأمر دنیاكم)) واتە: ئێوە شارەزاترن بە کاروباری ژیانی دونیاتان. و لە گێڕانەوەی (ابن ماجة)دا هاتووە کە پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: ((اِن كان شیئاً من أمر دنیاكم فشأنكم به، و اِن كان من أُمور دینكم فاِليّ)) واتە: ئەگەر کاروباری دونیاکەتان بوو ئەوە خۆتان ڕایپەڕێنن، ئەگەر لە کاروباری ئاینتان بوو ئەوە بۆمن بگەڕێنەوە.

١١- سەرزەنشت و گلەیی چ توونو بێت چ نەرم، کە لە قورئانی پیرۆزدا لە پێغەمبەردا (ﷺ) کراوە، وەك ئەو فەرمایشتەی خوای گەورە: ﴿ عَبَسَ وَتَوَلَّىٰٓ ١ ﴾ عبس: ١. واتە: (ڕووی گرژ کرد و ڕووی وەرگێڕا). و دەفەرمووێت:﴿ عَفَا ٱللَّهُ عَنكَ

﴿ لِمَ أَذِنتَ لَهُمۡ ﴾ التوبة: ٤٣. واتە: (خوا لێت خۆش بێت "ئەی پێغەمبەر (ﷺ)" بۆ مۆڵەتت پێدان). و ئەم فەرمایشتەی خوای پایەبەرز: ﴿ مَا كَانَ لِنَبِيٍّ أَن يَكُونَ لَهُۥٓ أَسۡرَىٰ حَتَّىٰ يُثۡخِنَ فِي ٱلۡأَرۡضِ ﴾ الأنفال: ٦٧ ... تاد. واتە: (بۆ هیچ پێغەمبەرێك نەبووە کە دیلی هەبێت، هەتا کاتێك چاك پایەدار و جێگیر دەبێت لە زەویدا).

ئەو شتانەی کە خستمانەڕوو (لەکاتی دوان لەسەر: پارێزراوی پێغەمبەران)، بەڵگەبوو لەسەر ئەوەی کە پێغەمبەر (ﷺ) ڕاگەیەنەری بەرنامەی خوایە و ئەو پەیامەش کە لەڕێی سروشەوە بۆی هاتووە شتێکی دەرەکی بووە، چونکە ئەگەر دەروونی بوایە یاخود دەستکردی پێغەمبەر (ﷺ) بوایە. ئەوا شتێکی لەوانە باس نەدەکرد کە سەرزەنشتی خۆی تیادایە.

١٢- هەڕەشەی توونـد و ئاگادار کردنەوەی ترسێنەر کە لەلایەن خواوە ئاراستەی پێغەمبەرەکەی (ﷺ) کراوە، بەڵگەیە کە خوای گەورە سەرچاوەو کانگای سروشەو دەروونی پێغەمبەر (ﷺ) پەیوەندی پێیەوە نییە، تەنانەت بەڵگەشە لەسەر ئەوەی کە پێغەمبەر (ﷺ) کەسێکی فەرمان پێکراوە بەڕاگەیاندنی ئەو شتەی پێی سپێردراوە، لەلایەن هێزێکی بەرزی فەرماندەر، کە پێغەمبەر لە بەرامبەریدا ناتوانێت هیچ هەڵسوکەوتێکی پێچەوانە بکات.

خوای پاك و بەرز دەفەرمووێ: ﴿ وَلَوۡلَآ أَن ثَبَّتۡنَٰكَ لَقَدۡ كِدتَّ تَرۡكَنُ إِلَيۡهِمۡ شَيۡـٔٗا قَلِيلًا ﴿٧٤﴾ إِذٗا لَّأَذَقۡنَٰكَ ضِعۡفَ ٱلۡحَيَوٰةِ وَضِعۡفَ ٱلۡمَمَاتِ ثُمَّ لَا تَجِدُ لَكَ عَلَيۡنَا نَصِيرٗا ﴿٧٥﴾ ﴾ الاسراء: ٧٤ - ٧٥. واتە: (خۆ ئەگەر ئێمە تۆمان پایەدارو دامەزراو نەکردایە، ئەوە بەڕاستی نزیك بوویت کەمێك بەلایاندا مەیل بکەیت و بەدڵی ئەوان بکەیت؟!. ئەو کاتە ئیتر دوو بەرامبەری "هاوەڵگەران" لە دونیاداو بەدوو بەرامبەری ئەوان لە دوای مردن سزاو ئازارمان پێ دەچەشتیت، پاشان کەسیشت دەست نەدەکەوت فریات بکەوێت و لەدەستی ئێمە ڕزگارت بکات).

هەروەها خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿ وَلَوۡ تَقَوَّلَ عَلَيۡنَا بَعۡضَ ٱلۡأَقَاوِيلِ ﴿٤٤﴾ لَأَخَذۡنَا مِنۡهُ

بِٱلْيَمِينِ ﴿٤٥﴾ ثُمَّ لَقَطَعْنَا مِنْهُ ٱلْوَتِينَ ﴿٤٦﴾ فَمَا مِنكُم مِّنْ أَحَدٍ عَنْهُ حَٰجِزِينَ ﴿٤٧﴾ وَإِنَّهُۥ لَتَذْكِرَةٌ لِّلْمُتَّقِينَ
﴿٤٨﴾ ﴾ الحاقة: ٤٤ - ٤٨.

**ئینجا (زمخشری)[1] لەبارەی لێکدانەوەو تەفسیری ئەم چەند ئایەتەی سورەتی (الحاقة) دەڵێت:**

**(خۆ ئەگەر پێغەمبەر (ﷺ) شتێکی بەدەم ئێمە هەڵبەستایە لەخۆیەوە کە ئێمەش نەمان فەرمووبێ، ئەوا زۆر بەهێواشی دەمانکوشت، هەروەك چۆن پاشاکان ئەمە دەکەن بەرامبەر ئەوەی کە درۆ بەدەمیانەوە دەکەن، زۆر بەپەلەو بەتووندی تۆڵەی لێ ئەستێننەوە تا ئەو دیاردەیە بنبڕ بکەن، خوای گەورەش ئەم نموونەیەی وێنا کردووە تاکو سەخت و ناڕەحەتتر بێتە بەرچاو، کە بریتیە لەوەی دەیگرێت پاشان لە ملی دەدات، خوای گەورە بەتایبەت باسی دەستی ڕاستی کردووە نەوەك چەپە[2]، چونکە ئەگەر بکوژەکان ویستیان لە پشتە ملی کەسێك بدەن ئەوا بەدەستی چەپ دەیگرن، بەڵام ئەگەر ویستیان لە پێشەوەی گەردەنی و سەری بپەڕێنێت ئەوا ئەو حاڵەتە ناخۆش و ناڕەحەتترە لەسەر ئەوەی کە دەکوژرێ، چونکە لەکاتی کوشتنەکەیدا شمێشرەکە دەبینێت کە بەدەستی ڕاستی بکوژەوەیە و سەری ئەوی پێ پەلدەدرێت).**

**١٣- ئەگەر قورئانی مەزن لە خودی پێغەمبەر (ﷺ) و زیرەکی و بلیمەتیەکەی سەرچاوەی گرتبێت، ئەوا شانازی بوو کە بیداتە پاڵەخۆی، چونکە هیچ کەسێك نیە کە دەگمەنترین بەرهەمی عەقڵ و بەهرەو توانای خۆی بداتە پاڵ کەسێکی تر یاخود بانگەشەی خوایەتی دەکرد نەوەك پێغەمبەرایەتی، جیاوازییەکی زۆریش هەیە لە نێوان ئەو دوو پلەیە، پێغەمبەر (ﷺ)لە نزاکەیدا دەفەرمووێت: ((اللهم**

---

(١) تفسیر الکشاف - زمخشري ٣/٢٦٦.

(٢) ئەوە وێچواندن (تشبیه) بەو واتایەی ناکرێت ئەندامی ماددی یاخود هەر شتێك بچێتە چوارچێوەی کات و شوێن و بدرێنە پاڵ خوای گەورە، ئەمەش لە سەلمێنراوەکانی عەقڵییە. (وەرگێڕ).

اغفر لي خطيئتي و جهلي، و اسرافي في أمري، وما أنت أعلم به مني، اللهم اغفر لي جدَّي وهزلي، وخَطئي وعَمدي، وكلّ ذلك عندي، أنت المقدِّم وأنت المؤخر، وأنت على كل شيئ قدير))[1] واتە: خوایەگیان؛ لە تاوانەکان و نەزانیم خۆش ببە، هەروەها لە زیادەڕەویشم لە کارەکانمدا و ئەوەش کە تۆ پێی زانا تریت لەمن... خوایەگیان؛ لە ڕاست و گاڵتەکانم خۆش ببە، لە هەڵەو ئەنقەستەکانم و لەوەش کە لای منە، خوایەگیان؛ لەوەی کە لەمەوپێش کردوومەو لەوەی لەوەو دواش خۆش ببە، لەوەی کە بە نهێنی و ئاشکرا کردوومن و لەوەی کە لەمن زاناتری پێی، تۆ پێشخەرو دواخەری و تۆ بەسەر هەموو شتێکدا دەسەڵاتت هەیە[2].

هەروەها دەفەرموویت: ((اللهم آتِنا في الدنيا حسنة وفي الآخرة حسنة، وقِنا عذاب النار))[3] واتە: خوایەگیان لە دونیادا خێرو چاکە و نازو نیعمەتمان پێ ببەخشە و لە دواڕۆژیشدا لە نازو نیعمەتەکانی بەهەش بەهرەمەندمان بکە و لە سزای ئاگری دۆزەخ بمانپارێزە.

لەم نزایەیدا داوای نووری خوایی دەکات دەڵێت: ((اللهم اجعل لي في قلبي نوراً، وفي لساني نوراً، و في سمعي نوراً، و في بصري نوراً، و من تحتي نوراً، و عن يميني نوراً، و عن شمالي نوراً ومن بين يدي نوراً، و من خلفي نوراً، وجعل في نفسي نوراً واعظم لي نوراً)) مسلم گێڕاویەتیەوە[4] واتە: خوایە لە دڵمدا نوور بەرپابکەی و لە زمان و بیستن و بینین و سەرەوەو خوارەوەوم و ڕاست و چەپم و پێشەوەو پاشەوەم و لە دەروونیشمدا نور بەرپا بکە و نورم بۆ گەورە بکە.

١٤- کاتێك سروش بۆ پێغەمبەر (ﷺ) هات فەرمانی کرد بخوێنێتەوەو خەڵکی

---

(١) صحيح مسلم - كتاب الذكر و الدعاء - باب التعوذ من شر ما عمل ومن شر ما لم يعلم ٢٠٨٧/٤.

(٢) دەقی کوردی ئەم فەرموودەیەم لە ٩٢٤/٢ (پوختەی صەحیح موسلیم دانانی: زکی الدين عبدالعظيم عبدالتوی المنذري، وەرگێڕانی: لیژنەیەك) وەرگرتووە. (وەرگێڕ).

(٣) صحيح مسلم - كتاب الذكر و الدعاء - باب فضل الدعاء باللهم آتنا في الدنيا حسنة ٢٠٧٠/٤.

(٤) صحيح مسلم ٥٣٠/١ كتاب صلاة المسافرين و قصرها - باب الدعاء في صلاة الليل و قيامه.

**ئاگادار بکاتەوە، جا پێغەمبەر (ﷺ) سەری سوڕما لەو کارە لەناکاوە و گومان گرتی و پرسیاری لەخۆی ئەکرد، دەبێت ئەمە چی بێت؟ ئەمە دەروونە یان شتێکی ترە؟ کەچی سروش لە دوای ئەمە حەقیقەتی بەرزی خوای بەسەر پێغەمبەر (ﷺ) ئەسەپێنێت، پێغەمبەریش (ﷺ) ئەو شتانەی کە لە دەروونیدا هەبوو لەو کاتەدا لە خوای گەورەوە دەگێڕێتەوە بەڕاشکاوی:**

﴿ فَإِن كُنتَ فِى شَكٍّ مِّمَّآ أَنزَلْنَآ إِلَيْكَ فَسْـَٔلِ ٱلَّذِينَ يَقْرَءُونَ ٱلْكِتَٰبَ مِن قَبْلِكَ ۚ لَقَدْ جَآءَكَ ٱلْحَقُّ مِن رَّبِّكَ فَلَا تَكُونَنَّ مِنَ ٱلْمُمْتَرِينَ ﴾ **یونس: ٩٤. واتە: (جا ئەگەر تۆ "ئەی محمد (ﷺ)" دەربارەی ئەو شتانەی کە بۆمان دابەزاندوویت لە شك و گومان دایت، ئەوە پرسیار بکە لەو کەسانەی کەس پێش تۆ لە تەوڕات شارەزان و دەیخوێننەوە، سوێند بەخوا بەڕاستی حەق و ڕاستیت لەلایەن پەروەردگارتەوە بۆ هاتووە، کەوابوو بەهیچ شێوەیەك گومانت نەبێت و مەچۆرە ڕیزی گوماندارانەوە).**

**جا کە خوای گەورە بەرپەرچی ئەو گومانەی پێغەمبەر (ﷺ) دەداتەوە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی سروش (وحی) شتێکی سەربەخۆو دەرەکییە و بەهیچ شێوەیەك پێغەمبەر (ﷺ) دەستی تیادا نەبووە، بۆیە لەدوای هاتنی ئەو ئایەتە فەرمووی: ((لا أشكّ و لا أسأل))عبدالرزاق و ابن جریر لە (قتادة) گێڕاویانەتەوە.[1] واتە: گومان نابەم و پرسیاریش ناکەم.**

**هەموو ئەو شتانە وایان کرد پێغەمبەر بڕواو یەقینێکی تۆکمەی وای هەبێت بە سروش (وحی) کە گومان جێگای بۆ نەبێت، لەبەر ئەمە پێغەمبەر (ﷺ) هەرگیز لێی پاشگەز نەبووەوە، تەنانەت دوای ئەوەش کە هۆزی قوڕەیش ڕووبەڕووشی بوونەوەو داوایان لە (أبا طالب)ی مامی کرد تا پێغەمبەر (ﷺ) ڕازی بکات و واز لە**

---

**(١) الظاهرية القرآن ١٨٨ فەرموودەکەی وەرگرتووە لە (تفسیر السیوطي) و (ابن کثیر) لە (تفسیر)ەکەیدا لە: ٤٣٢/٢ هێناویەتی لە (قتادة)ەوەو لەوبارەیەوە وتویەتی: ابن عباس و سعیدی کوڕی جبیر و حسنی بصری هەمان قسەیان وتوە.**

بانگەوازەكەی بێنێت و چیتر گاڵتە بە خواكانیان نەكات، بەڵام پێغەمبەر (ﷺ) وەڵامی دایەوە: ((والله يا عم لو وضعوا الشمس في يميني و القمر في يساري على أن أترك هذ الأمر أو أهلك دونه)) واتە: سوێند بەخوا؛ ئەی مامە ئەگەر خۆر بخەنە لای ڕاستم و مانگ بخەنە لای چەپم تا واز لەو كارەم بهێنم یاخود لە پێناویدا تیا ئەچم.

ئەم دڵنیایی و یەقینەی پێغەمبەر (ﷺ) بووە پاڵنەرێك تا بەرگەی ناخۆشیەكان بگرێت، سەرباری ئەوەی هاوبەش دانەران هەوڵیان دەدا بە سەروەت و سامان و دەسەڵات فریوی بدەن ئەگەر وازیهێنابا لە بانگەوازەكەی، بەڵام پێغەمبەر (ﷺ) ئەو هەوڵە فریوخوازانەی ئەوانی ڕەت كردەوە، خۆیی و هاوەڵانی ئەو ئێش و ئازارەیان چەشت، لە پێناو بانگەوازەكەی كە چیاو شاخەكانی دادەنواند، دژایەتی خزم و هۆزو عەرەب و جگەلەوانەشی كرد و جەنگێكی گەرمی دژ بە بیروباوەڕی ئەوان ڕاگەیاند، خوای گەورەش سەریخست بەسەر دوژمنەكانیدا و پەیامی ئیسلامی لەسەر زەوی بەرپاكرد بەم هۆیەش هیچ كۆسپێك هەرچەند گەورەبێت لە بەردەمیدا نەما و هیچ ستەمكارێك لە بەرامبەریدا خۆی نەگرت هەرچەند یاخی و زۆریش بەدەسەڵات بێت.

***

## چەند گومانێكی لاوازو بێ بنەما[1]

ئەگەر وترا؟ سروش (وحی) بریتیە لە: جۆرێك لە خەون بینینی نووستوو یان چەند هەڵبەستراوێكی كەسی درۆزن یاخود چەند خەیاڵێكی شاعیرانە یان وتەی كەسێكی شێت.

بەرپەرچی ئەدرێتەوە:

(١) بڕوانە ئەو سەرچاوانە: الوحي المحمدي ٩٠ و لاپەڕەكانی دواتریشی، مناهل العرفان ٣١٧/٢ و لاپەڕەكانی دواتریشی. و الظاهرة القرآنية ١٨٢، و مباحث في علوم القرآن ٣٨ و لاپەڕەكانی دواتریشی، والرسول سعيد حوى ١٤/٢.

بەوەی قورئانی پیرۆز سەرگەردانی و ونبونی ئەوانی لە گومڕاییدا وێنە کێشاوە بەشێوەیەکی سوتێنەرو گاڵتەی پێکردوون، سێ جار پیتی (اضراب: واتە ئەوەنا بەڵکو ئەوە[1]) کە (بل)ی دووبارە کردۆتەوە لەم ئایەتە:

خوای گەورە دەفەرموویێت: ﴿ بَلْ قَالُوٓاْ أَضْغَٰثُ أَحْلَٰمٍۭ بَلِ ٱفْتَرَىٰهُ بَلْ هُوَ شَاعِرٌ ﴾ الأنبياء: ٥. واتە: (بەڵکو دەیان وت: خەون و خەیاڵی بێ سەرو بنە یاخود هەڵی بەستووە، بەڵکو کەسێکی شاعیرە).

ئەو وتەیەی ئەوانیشی لە قورئاندا باسکردووە: ﴿ مُعَلَّمٌ مَّجْنُونٌ ﴾ الدخان: ١٤. واتە: (فێرکراوێکی شێتە!!). و ﴿ قَالَ إِنَّ رَسُولَكُمُ ٱلَّذِىٓ أُرْسِلَ إِلَيْكُمْ لَمَجْنُونٌ ﴿٢٧﴾ ﴾ الشعراء: ٢٧. واتە: ("وتیان" بەڕاستی ئەو پێغەمبەرەی بۆ ئێوە ڕەوانەکراوە شێتە).

هەروەها خوای گەورە بەرپەرچی قسە هەڵبەستراوەکانی ئەوانی داوەتەوەو وتویەتی: ﴿ نٓ ۚ وَٱلْقَلَمِ وَمَا يَسْطُرُونَ ﴿١﴾ مَآ أَنتَ بِنِعْمَةِ رَبِّكَ بِمَجْنُونٍ ﴿٢﴾ ﴾ القلم: ١ - ٢. واتە: (نون، سوێند بە پێنوس و ئەوەی کە دەینوسن. ئەی پێغەمبەر (ﷺ) تۆ بەهۆی نازو نیعمەتی پەروەردگارتەوە دووریت لە شێتیەوە).

١- ئەو وتەیەی کە دەڵێت سروش (وحی) تەنها جۆرێکە لە خەون بینین، ئەم

---

(١) هەر پیتێك لە پیتەکانی خستنەپاڵ (عطف) مانایەکی هەیە، پیتی (بل)یش کە یەکێکە لە پیتە ناوبراوەکان و مانایەکی تایبەتی خۆی هەیە، جا پیتی (بل) ماناکەی بریتیە لە (ئەوەنا بەڵکو ئەوە)، واتە: ئەوەی پێشەخۆی ڕەت دەکاتەوە (نەفی) ئەکات و ئەوەی پاشەخۆی دەچەسپێنێت (اثبات)ی دەکات. لەم ئایەتە بەرزو پیرۆزەدا خوای گەورە دوودلی و گومانی بێ باوەڕان ئەخاتەڕوو: بەوەی بێ باوەڕان هەر جارەو ناوناتۆرەیەك ئەدەنە پاڵ پێغەمبەر (ﷺ)و دواتر لەو ناوناتۆرەیەش بەگومان دەکەون، بۆیە هەر بەخۆیان ڕەت دەکەنەوەو ناوێکی تری بۆ هەڵئەبەستن و دواتر لەمەش پەشیمان ئەبنەوەو پەنا ئەبەنە بەر هەڵبەستنی ناو و ناتۆرەیەکی تر.... تاد، بۆیە لەم ئایەتەدا خوای گەورە زۆر بەجوانی لە میانەی بەکارهێنانی پیتی (بل: واتە: ئەوەنا بەڵکو ئەوە) بارودۆخە گوماناویی و دودڵییەکەی ئەوان دەخاتەڕوو. (وەرگێڕ).

وتەیە بەرپەرچ دراوە بەوەی:

پێغەمبەر (ﷺ) هەر لە كاتی دابەزینی سروش (وحی)ەوە وشیار بووە بە بەردەوامی.

گێڕانەوەیەكیش لە (الصحیحین)- بخاری[1] و مسلم-دا هاتووە كە ئەوەیان سەلماندووە سروش لە پڕێكدا بۆ پێغەمبەر (ﷺ) هاتووە لەو كاتەی كە وشیار بووەو ورد بوەتەوە لە بوونەوەردا، لەو كاتە (جبریل) پێی وت: ﴿ٱقۡرَأۡ﴾ واتە: (بخوێنە) سێ جار پێغەمبەری (ﷺ) گوشی تا ئازاری پێگەیشت ئینجا بەریدا، دواتریش چووەتە لای خەدیجە  بە ترس و لەرزو دڵە ڕاوكێوە، دەیوت:((زمِّلوني زمِّلوني)) واتە: داپۆشن، داپۆشن. دواتر هەواڵەكەی بە خەدیجە ڕاگەیاند....

ئەمەش بەڵگەیە لەسەر ئەوەی كە ئەگەر سروش (وحی) تەنها جۆرێك بووبا لە خەون بینین ئەوا ئەو ترس و لەرزەی لێ نەدەما لە دوای وشیار بوونەوەی لە خەودا.

ئەو دیاردە و حاڵەتانەی كە بەسەر پێغەمبەردا (ﷺ) دەهاتن لەو كاتەی سروش و نیگای بۆ دەهات، وەك پێشتر خستمانەڕوو، ئەو گومانە پوچەڵ دەكاتەوە، تەنانەت ئەو سەرزەنشت و هەڕەشەیە و جگەلەوانەش كە ئاراستەی پێغەمبەر (ﷺ) دەكران بەڵگەن لەسەر ئەوەی سروش تەنها جۆرێك نەبووە لە خەون بینین، بەڵكو سروش بریتیە لەو ڕاستیەی ناكرێ فەرامۆش بكرێت.

٢- ئەو وتەیەش كە دەڵێت سروش تەنها بریتیە لە چەند هەڵبەستراوێكی كەسی درۆزن، بەرپەرچی دراوەتەوە:

بەو گەواهی و شایەتیەی كە عەرەب داویانە بۆ پێغەمبەر (ﷺ)، بەر لە پێغەمبەرایەتی كە ناویان نابوو ڕاستگۆی ئەمیندار (صاق الأمین)، تەنانەت پارەو سامانە بەهادارەكانیان دادەنا لای پێغەمبەر (ﷺ).

---

(١) صحیح البخاري - كتاب بدء الوحي. و صحیح مسلم - كتاب الایمان.

بەهەمان شێوە لە دوای ڕەوانەکرانی وەك پێغەمبەر (ﷺ) لەلایەن گشت عەرەبەکان بە دۆست و دوژمنەکانیەوە گەواهی ڕاستگۆیی بۆ دراوە.

ئەو پرسیارەی (هرقل)ی پاشای ڕۆم کە لە (أبی سفیان)ی کرد، لەبارەی پێغەمبەر (ﷺ) بەلگەیە لەسەر ئەوەی وتمان، هەروەك لە (صحیح البخاری)داهاتووە:

(وتی - واتە هرقل -: بەر لەوەی دەست بە بانگەوازەکەی بکات، تۆمەتبارتان ئەکرد بە درۆ کردن؟

وتم - واتە: أبو سفیان -: نا تۆمەتبارمان نەدەکرد....).

کاتێك (هرقل) پرسیارەکانی تەواو کرد کە ئاراستەی (أبو سفیان)ی کرد، ئەوا بەخۆی وەڵامی پرسیارێکی خۆی دایەوە: (پرسیارم لێ کردی کە ئایا تۆمەتبارتان دەکرد بەر لەوەی دەست بەو بانگەوازەی بکات، تۆش وتت نا، کەواتە بێگومان دەزانم ئەو کابرایە مادام درۆ بۆ خەڵکی هەڵنەبەستێت ئەوا هەرگیز درۆ بۆ خوای گەورە هەڵنابەستێت).

ئەو شتانەی کە لە قورئانی پیرۆزدا هاتووە، وەك: هەواڵی ڕابردوو و داهاتوو و چەندین یاسای ڕۆشن کە شیاون بۆ هەموو کات و شوێنێك بە گەواهی دانی هەموو خاوەن عاقڵەکان.

هەموو ئەو شتانە بەڵگەن لەسەر ئەوەی کە ئەم شتانە هی کەسێك نین کە درۆزن بێت.

ئەوەشمان سەلماند لەکاتی قسە کردن لەسەر پارێزراوی پێغەمبەران و ئیعجازی قورئان هەر لەم کتێبەدا، هەر کەسێ دەیەوێت با بۆی بگەڕێتەوە.

٣- ئەو وتەیەی کە پێی وایە سروش (وحی) تەنها جۆرێکە لە خەیاڵی شاعیران، ئەوا بەرپەرچی دراوەتەوە:

بەو سوربوونەوەو ترسەی کە پێغەمبەری (ﷺ) دائەگرت، لەکاتی دابەزینی سروش و نیگا، جا ئەم حاڵەتە بەڕووخساری شاعیر دەرناکەوێت ئەگەر ویستی هۆنراوەیەك بهۆنێتەوە. و لەبەر ئەوەی موعجیزەی هەرە مەزن کە پێغەمبەری خوا

(ﷺ) هێناویەتی بریتیە لە قورئانی پیرۆز لە شێوازەکەی و بواری یاسادانان و هەواڵدانەکەی... عەرەب لە سەردەمی دابەزینی قورئاندا سوارچاکی مەیدانی ڕەوانبێژی و جوانبێژی بوون کەچی کاتێك گوێبیستی ئایەتەکانی بوون کە ئەخوێندرایەوە ئەوا تێکشکان و سەریان سوڕما، تەنانەت قورئان تەحەدای ئەوانی کرد کە بتوانن وێنەیەکی بهێنن، بەڵام نەیانتوانی هەروەك لە بارەی ئیعجازی قورئان دەیانخەینەڕوو.

٤- ئەو وتەیەش کە دەڵێت ئەو کەسەی بانگەشەی ئەوە دەکات سروش (وحی) بۆ هاتووە شێتە:

هەر ئەو بارودۆخ و حاڵەتەی پێغەمبەر (ﷺ) کاتێ کە سروش (وحی)ی بۆ دەهات بەچاکترین شێوە بەرپەرچی ئەم گومانە ئەداتەوە، بەوەی هۆشی تەواو و چوست و چاڵاك و بەگوڕو تین و کۆ ئەندامی دەمارەکانی زۆر بەهێز بوون. و کە پێغەمبەر (ﷺ) بە خەدیجەی فەرمووو: ((زملوني)) واتە: دامپۆشن. ئەمە تەنها ئەوە دەگەیەنێت کە پێغەمبەر (ﷺ) چووەتە ناو خەوگە و پێخەڤ، تەنها بۆ ئەوەی بحەسێتەوە دوای ئەو ڕووانگە بەترسەی کە بینیبوویەتی.

هەر لەبەر ئەمە خوای گەورە فەرمانی پێ دەکات، کە هەڵسێت بە ئاگادار کردنەوەی خەڵك:﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلۡمُدَّثِّرُ ١ قُمۡ فَأَنذِرۡ ٢ ﴾ واتە: (ئەی ئەو کەسەی خۆت پێچاوەتەوە، ئەی محمد (ﷺ)، هەستە و خەڵکی بێدار بکەرەوە).

شتێکی بێ گومانە کە کەسی شێت ناتوانێت ئەو شەریعەتە کامڵ و هەمە لایەنە بهێنێت کە هەموو بوارەکانی ژیان لەخۆی دەگرێت، چونکە تەنها بە عەقڵێکی تەواو ڕۆشن و دید فراوان دەکرێت.

٥- ئەگەر وترا:

ڕووخسار سور هەڵگەڕان و ڕەنگ پەڕین، دەکرێ بەوە لێك بدرێتەوە کە بریتیە لە دیاردەی گرژ بوون (أعراض التشنج).

بەرپەرچی دەدرێتەوە:

دیاردەی گرژ بوون (أعراض التشنج) دەبێتە هۆی ئەوەی كە تاك ئیفلیج ببێت و لەرز بیگرێت بۆ ماوەیەكی كاتی بێ بەش ئەبێت لە هێزی عەقڵی و جەستەیی. بەڵام حالەتەكانی پێغەمبەر (ﷺ) لە كاتێك كە سروش (وحی)ی بۆ دادەبەزێت گەواهیدەرن لەسەر: ئەوەی تەنها ڕووخساری پێغەمبەر (ﷺ) گۆڕانی بەسەردا دێت و لەهەمان حاڵەتدا لە بارودۆخێكی ئاسایی و ئازادی عەقڵی دایە، بەشێوەیەك كە یاد (ذاكرة)ەكەی بەتەواوی بەكار ئەهێنێت لەو كاتەی سروشی بۆ دێت، بەڵام كەسی توشبوو بە نەخۆشی گرژ بوون (تشنج) هۆش و یادی نامێنێت لەو كاتەی كە نەخۆشیەكە ئەیگرێت.

پاشان ئەو دیاردە جەستەییانە كە بەدیار دەكەون لەسەر ڕووخساری پێغەمبەر (ﷺ) لەو كاتەی (سروش)ی بۆ دادەبەزێت، تەنها لەیەك كاتدا بەدەردەكەون ئەویش لەو ساتەیە كە سروش (وحی) بۆ دێت.

بارودۆخی نەخۆشی هاوشان نابێت لەگەڵ ئاڕەقە كردن و نابێتە هۆی دەركەوتنی دەقێكی قورئانی كە بەخودی خۆی موعجزەیە. دەكرێت ئەو دەقە قورئانیە سوڕەتێكی درێژ بێت وەك سوڕەتی (الأنعام) یاخود دەقێك بێت كە ڕێسای زۆر وردی تێدان وەك دەقی میرات، كە بە وردترین دەقە یاساییەكان لە جیهاندادادەنرێت.

٦- هەندێكیش بۆ ئەوەچوون:

بوحەیرای ڕاهیب - كە یەكێكە لە شوێنكەوتووانی (آریوس) لە یەكتاناسی دا و نكوڵی دەكرد لە خوایەتی عیسای مەسیح و بیروباوەڕی سێكوچكەیی (تثلیث) - كاتێك لە (بُصری) كە دەكەوێتە (شام) بە پێغەمبەر (ﷺ) گەیشتووە، ئەوا پێغەمبەر (ﷺ) ئەو سروشە لەویەوە فێربووە.

هەندێكیش بۆ ئەوە چوون كە: (ورقة)ی كوڕی (نوفل) ئەو شتانەی فێری پێغەمبەر (ﷺ) كردووە.

بەم شێوەیەی خوارەوە بەرپەرچی ئەم گومانانە دەدرێتەوە:

أ- بوحەیڕای ڕاهیب تەنها یەك جار بە پێغەمبەر (ﷺ) گەیشتووە، ئەوکاتیش پێغەمبەر (ﷺ) لەگەڵ (أبو طالب)ی مامی دابوو کە لەگەڵ کۆمەڵێك لە پیاوەکانی قوڕەیش دا سەفەری شامیان کرد. ئەوکاتە پێغەمبەر (ﷺ) تەمەنی نۆ ساڵ بوو، وتراوە کە تەمەنی دوازدە ساڵ بووە. بوحەیڕای ڕاهیب کاتێك لە خەڵوەتگە و پەرستگەکەیدا خەوتبوو، لە خەونیدا بینی کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) لەگەڵ کاروانێکدا دێت و هەندێ هەوریش سێبەری لێ ئەکەن، بەم هۆیەوە خواردنی ئامادەکرد بۆ ئەو کەسانەی قوڕەیشی بوون، کەچی پێشتر بەلای ڕاهیبی ناوبراویشدا ئەڕۆیشتن، گرنگی بەوان نە دەدا و تەنانەت تەماشای ئەوانیشی نەدەکرد، بەڵام ئەوجارە گۆڕاوە، ڕاهیب بانگی ئەوانی کرد بۆ خوانەکە، پێغەمبەری خوا (ﷺ) بەهۆی تەمەن بچووکیەکەی لەلای کاروانەکە مایەوە، جا ڕاهیبەکە وتی: هیچ کەسێك لە ئێوە با بەجێ نەمێنێت و هەمووتان وەرن بۆ خوانەکە، پێیان ڕاگەیاند کە گەنجەکە واتە پێغەمبەر (ﷺ) بەجێ ماوە، ئینجا پێغەمبەریان (ﷺ) هێنا، ڕاهیبەکە زۆر بە خەستی و تیژی سەرنجی ئەدا و سەیری هەندێ شتی جەستەی پێغەمبەری (ﷺ) ئەکرد، دوای نان خواردن ڕاهیبەکە بانگی پێغەمبەری (ﷺ) کرد و سوێندی دا بە (لات) و (عوزا)، چونکە گوێی لێبووبوو کە هۆزەکەی پێغەمبەر (ﷺ) سوێند بەم دوانە ئەخۆن، پێی وت: ((لا تسألني باللات و العزى، فوالله ما أبغضت شيئاً قط بغضهما)) واتە: سوێندم مەدە بە (لات) و (عوزا)، سوێند بەخوا ڕقم لەهیچ شتێك نییە بەو ئەندازەیەی ڕقم لەوانە. بوحەیڕا پێی وت: جا سوێندت ئەدەم بەخوا، ئەوەی لێت ئەپرسم وەڵامم بدەرەوە، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: ((سلني ما بدا لك)) واتە: چیت ئەوێت لێم بپرسە. ناوبراو پرسیاری لە پێغەمبەر (ﷺ) کرد لەبارەی حاڵ و بارودۆخی لەکاتی خەوتن و چۆنیەتی هەڵسوکەوتی و کاروبارەکانی، پێغەمبەریش (ﷺ) وەڵامی ئەدایەوە، وەڵامەکەی کۆك بوو لەگەڵ ئەو سیفەتانەی بوحەیڕا دەیزانی، دواتر بوحەیڕا سەیری پشتی پێغەمبەری کرد، بینی مۆری پێغەمبەرایەتی لە نیوان هەر دوو شانەکانی دایە. بوحەیڕا پرسیاری لە

**مامی كرد لەبارەی باوكی پێغەمبەر (ﷺ)، ئەویش وەڵامی دایەوە: ئەوە كوڕی منە، بوحەیرا وتی: نابێت باوكی ئەو كوڕە زیندوو بێت. ئینجا وتی: ئەوە برازامە. بوحەیرا لە كۆتاییدا پێی وت: بیگەڕێنەوە بۆ شارەكەی خۆی و لە جولەكەكانی بپارێزە، ئەو برازایەت پلەو پایەیەكی گەورەی دەبێت. جا خێرا (أبي طالب) گەڕاندیەوە بۆ مەككە[1].**

**ئەو بەسەرهاتە گێڕانەوەی تریشی هەیە[2]، لە سەرجەم گێڕانەوەكاندا (ﷺ) هیچ ئاماژەیەك نەهاتووە لەبارەی ئەوەی پێغەمبەر (ﷺ) شتێك لەبارەی بیروباوەڕ و ئاینەكەی شتێكی لە بوحەیرا بیستبێت.**

**هەروەك ئەو سەفەرەی كورت بوو - سەرباری ئەوەی كە بچوك بوو، مامیشی لەگەڵدابوو، تا بە بوحەیرا گەیشت - و هەموو ئەو شتانە یاسا و شەریعەت فێری**

---

(١) سيرة ابن هشام - قصة بحيرا الراهب.

(٢) حاكمیش ئەمەی گێڕاوەتەوە لە (مستدرك ٢/٦١٥-٦١٦)ەكەیدا، لەو بارەوە وتویەتی: ئەم فەرموودەیە ڕاست (صحيح)ە بەپێی مەرجەكانی (بخاری و مسلم) بەڵام دەریان نەهێناوە، (ذهبي) بەم فەرمایشتەی ڕوون كردنەوەی لەسەر داوە: دەڵێت:پێم وابێت هەڵبەستراوە لەبەرئەوەی بەشێكی پوچەڵە/ سەیری: هامش المستدرك. بكە.

(الترمذي) لە (صحيح)ەكەیدا گێڕاویەتیەوە/ سەیری بكە: بشرح عارضة الأحوذي ١٣/١٠٦ و دەڵێت: گێڕانەوەیەكی باش و نامۆیە تەنها بەو شێوەیەمان بینیوە (حسن غريب لا نعرفه الا من هذا الوجه).

(حافظ ابن كثير) لە (السيرة النبويّة ١/٢٤٣ و لاپەڕەكانی دواتری) هەموو ڕێگە و گێڕانەوەكانی هێناوە، دوای ئەمە وتویەتی: بەهەموو ئەندازەیەك (مرسل- كەسی یەكەمی سەنەدەكە پەڕی بێت - وەرگێڕ -)ە، هەروەك هەندێ كەس باسیان كردووە كە ئەو بەرسەرهاتە ڕوویداوە لەو كاتەی تەمەنی پێغەمبەر (ﷺ) دوازدە ساڵ بووە و دەكرێ (أبا موسى) ئەمەی لە پێغەمبەر (ﷺ) وەرگرتبێت، بەمەش زیاتر بەهێز دەبێت یاخود لە گەورە هاوەڵان وەریگرتووە یان ئەو بەسەر هاتە ناودار و بەناوبانگە و بڵاو بووە، بۆیە بەو شێوەیەی كە بڵاو بووە ئەویش وەریگرتووە (أخذه من طريق الاستفاضة).

پێغەمبەر (ﷺ) ناکات و کلیلی نهێنیە شاراوەکانی پێ نادات، بەڵکو وتەکەی بوحەیرا جەخت دەکاتەوە لە پێغەمبەرایەتی محمد (ﷺ) بەتایبەتی کاتێك پرسیاری لە حاڵ و بارودۆخی پێغەمبەری (ﷺ) دەکرد، دەیبینی کە وەڵامەکانی کۆکن لەگەڵ ئەو زانیاریانەی لەلای بوون، کە عیسا و موسا موژدەیان لەبارەوە دابوو سەبارەت بە خەسڵەتەکانی پێغەمبەر، بۆیە پێشبینی کرد کە پلەو پایەیێکی گەورەی دەبێت لە داهاتوو دا.

ب- سەبارەت بە (ورقة)ی کوڕی (نوفل):

ئەوەی چەسپاوە لە گێڕانەوە ڕاست (صحیح)ەکاندا کە: خەدیجە (خوا لێی ڕازی بێت) پێغەمبەری (ﷺ) برد (دوای ئەوەی جبریل "سەلامی لێبێت" هاتە لای لە ئەشکەوتی "حِرَاء"). بۆ لای (ورقة)ی کوڕی (نوفل)ی کوڕی (أسد)ی کوڕە مامی خۆیەتی و لە سەردەمی نەفامییدا بووە بە نەصرانی و کابرایەکی خوێندەوار بووەو بە عیبری لەبارەی ئینجیل نووسیویەتی و پیرەمێردێك بووەو کوێریش بووە. خەدیجە پێ وت: ئەی ئامۆزام گوێ بگرە بزانە برازایەکەت (محمد)[1] چی دەڵێ؟!. (ورقة) لێی پرسی ئەی برازام چ دەبینی؟ پێغەمبەری خوا (ﷺ) چی بینیبوو و چی بیستبوو بۆی گێڕایەوە، ئینجا (ورقة) پێی وت: ئەوە ئەو فریشتە (ناموس)ەیە - واتە ئەمینداری سروشە جبریل - کە خوا ناردوویەتیە خوار بۆ سەر موسا (سەلامی لێبێت)، خۆزگە لەم ڕۆژگارەدا گەنج بام! خۆزگەی زیندوو بام ئەو کاتەی کە گەلەکەت دەرت ئەکەن!. پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرمووێ: (أو مُخرجيّ هم؟!) واتە: یانی دەریشم دەکەن؟! (ورقة) دەڵێت: بەڵێ دەرت دەکەن، چونکە هەر پیاوێك لە پێش تۆدا هاوشێوەی ئەو پەیامەی تۆی هێنابێت ئەوا دژایەتی کراوە، ئەگەر من بەم ڕۆژە بگەم (کە تۆ بانگەوازی خۆتی تێدا ڕادەگەیەنی[2]) کە هۆزەکەت دژایەتیت دەکەن،

---

(١) خۆم زیادم کردووە بۆ بەرچاو ڕوونی زیاتری خوێنەر. (وەرگێڕ).

(٢) وەرگێڕ.

زۆر چاك پشتگیریت لێ دەکەم. دوایی زۆری پێ نەچوو (ورقە) کۆچی دوایی کرد.

ئینجا (ورقة) بە تەنیا بە پێغەمبەر (ﷺ) نەگەیشتووە - هەروەك لە گێڕانەوە ڕاست و دروستەکان دا هاتووە - بەڵکو خەدیجەی لەگەڵ دابووە، پاشان (ورقة) بە بەراورد کردنی ئەو شتەی بەسەر پێغەمبەردا (ﷺ) هاتووە لەگەڵ بارودۆخی موسا و عیسادا هاتووە زانیویەتی شتەکە چیە، بۆیە بە پێغەمبەری (ﷺ) وت: ئەوە فریشتەی (ناموس)ە، واتە: ئەمینداری سروش جبریلە، چونکە سروش (وحی) بۆ هەموو پێغەمبەران هەر یەکە، تەنانەت پێشبینی شاربەدەری پێغەمبەریشی (ﷺ) کرد کاتێك بانگی هۆزەکەی دەکات، خۆزگەی خواست لەوکاتەدا پشتی پێغەمبەری (ﷺ) بگرتایە.

هەموو ئەمانە بەڵگەن لەسەر ئەوەی کە ئەو سروشەی بۆ پێغەمبەر (ﷺ) و پێغەمبەرانی پێشوو هاتووە لەلایەن خواوە بووەو هەر خوای گەورەشە کە پێغەمبەری فێرکردووەو نیگای پێ بەخشیوەو ڕێنمایی کردووە، (ورقة)ی کوڕی (نوفل) هیچ ڕۆڵێکی نەبووە لەمەدا تەنها ئەوە نەبێت کە بڕوای هێناوە بەوەی پێغەمبەر (ﷺ) دەبێتە پەیامبەر بۆ گشت خەڵکی، ئینجا چۆن؟ ئەکرێ (ورقە) ببێتە سەرچاوەی زانستی پێغەمبەر (ﷺ).

پ- شتێکی چەسپاوە کاتێك پێغەمبەر (ﷺ) بە بوحەیرا گەیشتووە (أبي طالب)ی مامی لەگەڵیدا بووەو کاتێکیش گەیشتووە بە (ورقة) خەدیجەی لەگەڵ دابووە، ئەم بەیەك گەیشتنەش نهێنیەك نەبووە کە پارێزراو بێت، ئینجا بۆچی مێژوو نوسان باسی زانستی ئەو دوو مامۆستایەیان نەکردووە؟ بۆچی هەر دوو یاوەرەکەی پێغەمبەر (خەدیجە و أبي طالب) هەمان سوودیان بەدەست نەدەهێنا کە پێغەمبەر محمد (ﷺ) لە زانستی ئەو دوو مامۆستایانەی بەدەست هێنا؟ بێگومان بێ دەنگ بوونی مێژوو لەمەڕ ئەمە بەسە بۆ ئەوەی ببێتە بەڵگەی پوچەڵی ئەو بانگەشە بێ بنەمایە، کە هیچ واتایەك هەڵناگرێت.

ت- دواتر ئایا (بوحەیرا) و (ورقة) لەو ئاستە زانستیە دابوون، بۆچی ئەو

**پەیامـەی پێغەمبـەر (ﷺ) هێنـای ئەوانـە نەیانـدەهێنا؟ بـۆ نمونـە قورئـانی پـیرۆز، بۆچـی خۆیـان بانگەشـەی پێغەمبەرایـەتیان نـەكردووە؟ بـەڵكو موژدەیانـدا بـە پێغەمبەرایەتی محمد (ﷺ).**

**ج- گریمان ئەگەر ڕاست بوایە پێغەمبەر (ﷺ) ئەو شتانەی لە (بوحەیرا) یان (ورقة) وەرگرتووە، ئەوا هەر نەبێ قورەیش تۆمەتباریان ئەكرد بەمە، لەكاتێكدا دەیان ناوو ناتۆرەیان بۆ هەڵ ئەبەست. و تۆمەتباریان كرد بەوەی لەلایەن ئاسنگەرێكی نەصرانی ڕۆمی فێر بووە كە لە (مەككە)دا شمشێری دروست دەكرد، پێغەمبەریش هەندێ جار لەلای ڕادەوستا تا كارەكانی ئەو ببینێت، بەڵام خوای گەورە بەرپەرچی ئەو تۆمەتانەی ئەوانی دایەوە بەم فەرمایشتە:﴿ وَلَقَدْ نَعْلَمُ أَنَّهُمْ يَقُولُونَ إِنَّمَا يُعَلِّمُهُۥ بَشَرٌ لِّسَانُ ٱلَّذِى يُلْحِدُونَ إِلَيْهِ أَعْجَمِىٌّ وَهَٰذَا لِسَانٌ عَرَبِىٌّ مُّبِينٌ ﴿١٠٣﴾ ﴾ النحل: ١٠٣. واتە: (سوێند بەخوا ئێمە بەڕاستی دەزانین بێ باوەڕان دەڵێن: ئەم قورئانە تەنها كەسێك فێری دەكات، "بەمەرجێك" زمانی ئەو كەسەی ئەوان دەڵێن قورئان فێری محمد دەكات، عەجەمیە و عەرەبی نییە و ڕەوان نیە، لەگەڵ ئەوەدا ئەم قورئانە بە زمانی عەرەبی پاراو و ڕوون و ئاشكرا دارێژراوە).**

**چ- سروشـتی نەصـرانیەت، كـە بریتیـە لـە ئـایینی (بوحـەیرا) و (ورقـە) و (ئاسنگەری ڕۆمی) كۆك نیە لەگەڵ ئەو پەیامەی پێغەمبـەر (ﷺ) هێناویـەتی ئینجا چۆن دەكرێ ببێتە سەرچاوەیەك بۆ ئایینەكەی و قورئانی پیرۆز؟**

**ح- لە قورئانی پیرۆزدا چـەند هـەواڵێكی غـەیبی و شاراوە هـەن و هەنـدێكیان لـە دوای مردنــی (بوحــەیرا) و (ورقــە) هاتنــەدی، ئینجـا چــۆن ئەندێشــە و تەصــەور ئـەكرێت كـە قورئـان لـە زانیاریـەكانی ئـەوان كـە گوایـە بـە پێغەمبـەریان داوە، سەرچاوەی گرتبێت؟**

**هـەروەك شـتێكی زانراویشـە كـە چـەند ئایـەتێكی قورئـانی پـیرۆز بـۆ پێغەمبـەر (ﷺ) بەپێی ڕووداو بارودۆخی لەناكاو دەهاتن.**

**خ- ئەگەر پێغەمبەر (ﷺ) ئەو شتانە لە بوحەیراو جگەلەویشی وەرگرتبا، ئـەوا**

هــەر خــودی شــوێنكەوتووانی پێغەمبــەر (ﷺ) ئــەو شــتەيان نــەقڵ دەكــرد و دەيانگواستەوە هـيچ شـتێك بچـوك و گـەورە نييـە كـە نـەيان نووسـی بێـت، ئەگـەر چەسپاويش نەبێت لەلايان، چونكە ئەو شتانە بـەجێ ئـەهێڵن بـۆ گێڕەوانـی هـەواڵ و سەنەدەكەی (رواة الخبر واسناده).

د- لــە فــەرمووده ڕاســت (صــحيح)ەكاندا نەچەســپاوە كــە پێغەمبــەر محمــد (ﷺ) چاوەڕوانی ئەوەی كردبێت كە سروش (وحی) بۆ دێت، ئەگەر شـتێكيش لـەوبارەوە لـە پێغەمبەرەوە هاتبێت ئەوا دەيان نووسی.

ر- هــەروەك پێغەمبــەر (ﷺ) نەگەيشــتووە بــە حيبرەكــانی جولەكــە و ڕاهيبــە نەصـرانيەكان، نـەش چەسـپاوە كـە پێغەمبـەر (ﷺ) پەيوەنـدی پێـوە كـردبن، هـەر ئەمەشە كە لێكۆڵەران جەختيان لەسەر كردۆتەوە.

ز- قورئـانی پـيرۆز بـەو حوكمانـەی كـە گومـان لـە ڕاسـتی و دروسـتيان نيـە بـە بەلگەی لێكۆڵينەوە، كە لـە مـاوەی بيسـت سـاڵ دابـەزيوەو فرەلايەنـە و قسـەی لەسـەر هـەموو بوارێـك هەيـە لـە مامەڵـە و حـوكمڕانی و هـەواڵی غـەيبی و شـاراوەو جگـە لەوانەش كـە چارەسـەری هـەموو لايەنـەكانی ژيـان ئەكـەن، ئـەوا بـەبێ گومـان عـەقڵ بڕياری ئەوە دەدات كە لە دانيشتن و چاوپێكەوتنێكی سادەی خێـرا لەگـەڵ ڕاهيبێكدا وەرناگيرێـت، دوای ئەمـەش عـەقڵ چۆن دان دەنێـت بەدروسـتی ئـەو هـەموو حوكمـە زۆر و هەواڵە غەيبيانەی دوای ئـەو دانيشتە؟ چونكە هـەموو ئەوانـە بەلگـەن لەسـەر ئەوەی كە پێغەمبەر (ﷺ)نەيهێناوەو لە خوای گەورەوە وەری گرتووە؟

خوای باڵادەست و خاوەن شكۆ دەفەرمووێت: ﴿ وَمَا كَانَ هَٰذَا ٱلۡقُرۡءَانُ أَن يُفۡتَرَىٰ مِن دُونِ ٱللَّهِ وَلَٰكِن تَصۡدِيقَ ٱلَّذِي بَيۡنَ يَدَيۡهِ وَتَفۡصِيلَ ٱلۡكِتَٰبِ لَا رَيۡبَ فِيهِ مِن رَّبِّ ٱلۡعَٰلَمِينَ ﴿٣٧﴾ ﴾ يونس: ٣٧. واتە: (وەنەبێت ئەو قورئانە لەلايەن كەسێكەوە داڕێژرابێت هەڵبەسترا بێت جگە لەخوا، بەڵكو ڕاستی و ڕەوانی كتێبە ئاسمانيەكانی پێش خۆيشی دووپات دەكاتەوە، هەروەها ڕوون كەرەوەی بيروباوەڕو ئەركەكانە، بەڕاستی هيچ گومان لەوەدا نييە كە ئەم قورئانە لەلايەن پەروەردگاری هەموو جيهانەوە ڕەوانە كراوە).

٧- ئەگـەر وتـرا (سـۆلۆن)ی فەيلەسـوفی يۆنـان بەرنامـەو شـەريعەتێكی داهێنـاوە،

ئـەوا شـتێکی سـەیر نابێـت کـە بڵـێین پێغەمبـەر شـەریعەتەکەی داهێنـاوە بـەڵام هەڵقوڵاوی هزرو و زیرەکیەکەیەتی.

بەرپەرچی ئەم گومانە بەم شێوەیە:

سۆلۆن یەکێکە لە فەیلەسوفەکانی یۆنان کە لە سەدەی حەوتـەمی پـێش زایینـی ژیاوە، دایکیشی لە ڕەچەڵەکی (بستراتوس)ی کۆتا پادشای (أثینا)یە.

یـەکێك بـووە لـە پیاوەکـانی سـەرمایە و جـەنگ، هەنـدێ پلـەی کـارگێڕی و سـەرکردایەتی سـەربازی لـە وڵاتەکـەی وەرگرتـووە، لـە سـاڵی ٥٩٤ پ.ز وەك سـەرۆکی ئوممـەت بەیەکـدەنگی هـەموو حیزبـەکان هەڵبـژێردرا و دەسـڵاتی ڕەهایـان پێـدا لـە سیستەم و یاسای وڵاتـدا، کـە پـێش ئـەو (زراکوت) داینـابوو، جا سۆلۆن سیستەمێکی نـوێی دانـا و حکومـەت جێبـەجێی کـرد. بـەڵام ئـەو سیستەمە نوێیـەی سـۆلۆن تـەنها بریتـی بـوو لـە ڕێـك و پێـك کـردن و بـژارکردنی یاسـاکانی پێشـوو کـە ئوممـەتێك دایڕشتبوو خاوەنی گەورەترین فەلسەفە و ژیارو پێشکەوتن بـووە لـەو کاتـەدا، سۆلۆن ڕۆشنبیرو فەیلەسوف و سەرکردەی گەورەترین هێزی ڕێکخـراو و گـەورەترین دەوڵـەت بوو لە جیهان.

ئینجا کـەی پێغەمبـەر محمـد (ﷺ)ئـەو شـتانەی هـەبووە، بـەڵکو نەخوێنـدەوار بـووەو توانـای نووسـینی نـەبووەو شـارەزای سیاسـەت و سـەرکردایەتی هێزەکـانی سەربازی نەبووە. ئەو یاسا و ڕێسایانەشـی کـە هێنـای ئـەوا پێشـتر یاسـای هاوشـێوەیان نـەبووە لـە دوورگـەی عەرەبیـدا وەك ئـەو یاسـایانەی لـە یۆنـان و ڕۆمـان هـەبوون، چونکە لەناو دوورگەی عەرەبیدا چەندین هۆزی پەرتەوازە بوونیـان هـەبوو کـە یـەك سیستەم کۆیان ناکاتەوە و یەك یاسا حوکم ناکات.

کەواتە ئەوەی پێغەمبەر (ﷺ) هێناویەتی سروش (وحـی) بـووە، لەلایـەن خـوای پاك و بەرزەوە هاتووە، ئەو سروشەش بیروباوەڕو ئـاداب و یاسـا و حوکمـەکان لـە خـۆ ئەگرێت، لە هەموو ئەو بوارانەی خەڵکی پێویستیان پێی هەیـە، هـەر لەبـەر ئەمەشـە قورئان شیاوە بۆ هەموو کات و شوێنێك.

# موعجیزە (المعجزة)

موعجیزە، لە زمانەوانیدا: وەرگیراوە لە دەستەوەسانی و بێ توانایی (االعَجْز) كە پێچەوانەی توانایە (القدرة)[(١)].

لە زاوەشدا: بریتیە لەو شتەی كە ئامانج و مەبەست لێی دەرخستنی ڕاستگۆیی ئەو كەسەیە كە بانگەشە دەكات بۆ ئەوەی كە پێغەمبەری خوایە[(٢)].

زانا لێكۆڵەرەكان ئەو مەرجانەیان داناوە بۆ ئەوەی كارە دەراساكە پێی بوترێت موعجیزە[(٣)]:

١- پێویستە فەرمان (أمر)ێك بێت لەلایەن خوای گەورەوە، تا ڕاستگۆیی ئەو كەسەی بانگەشەی پێغەمبەرایەتی ئەكات بسەلمێنێت.

حا فەرمان ئەم شتانەش ئەگرێتەوە:

أ- فەرمایشت: وەك قورئانی پیرۆز.

ب- كردار: وەك هەڵقوڵانی ئاو لە نێوان پەنجەكانی پێغەمبەر (ﷺ).

پ- فەراموش كردن (ترك): وەك چۆن ئاگر پێغەمبەر ئیبراهیمی (سەلامی لێبێت) نەسوتاند.

٢- پێویستە دەراسا (خارقة للعادة)، شتێكی بەدەر بێت لەوەی خەڵكی خوویان پێوەگرتووەو بۆتە عادەت و نەریتیان و بەردەوام بوونە لەسەری جار دوای جار.

---

(١) شرح المقاصد ١٧٥/٢.

(٢) المواقف وشرحه ٥٤٧. و چەند پێناسەیەكی تریش هەن بەڵام تەنها زیاتر باس لە مەرجەكانی كردووە.

(٣) بۆ ئەم مەرجانە، بڕانە ئەم سەرچاوانە: الباجوري على الجوهرة ٣٥/٢-٣٦ و العلامة عصام على العقائد النسفية ١٣٣-١٣٤ و المواقف و شرحه ٥٤٧-٥٤٨ والمقاصد وشرحه ١٧٥/٢-١٧٧ و الدَّوَاني ٢٧٦/٢ و حاشية الخلخالي عليه. و المسامرة ٢٤٠-٢٤٢ ورسالة في التوحيد ٧٣ - وحجة الله على العالمين في معجزات سيد المرسلين ٨ و لاپەڕەكانی دواتری، واليواقيت و الجواهر - الشعراني ١/ ١٥٦-١٦١.

ئـەم مەرجـە ئـەوە دەگەیـەنێت كـە شـتێك كـە دەراسـا نـەبێت ناكرێـت ببێتـە مـوعجیزە، وەك ئـەوەی یـەكێك بڵێـت: بەڵگـەی ڕاسـتگۆیی مـن هـەڵاتنی خـۆرە لـەو شوێنەی لێی هەڵدێت و ئاوابوونیەتی لەو شوێنەی لێی ئاوا ئەبێت.

٣- پێویسـتە لەسـەر دەسـتی كەسـێك دەربكـەوێت كـە بانگەشـەی پێغەمبەرایـەتی یان پەیامبەرایەتی بكات.

واتە: خاوەنی كارە دەراساكە دەبێت سەرقاڵی بانگەواز بێـت بـۆ ئـایین، كـە مایـەی بەختەوەری دونیاو دواڕۆژە.

ئەم شتانەی خوارەوە ناچنە ناو چوارچێوەی موعجیزە:

أ- ڕیسواكردن (الاهانة): بریتیە لەو شـتە دەراسایەی كـە بـەدەر دەكـەوێت لەسـەر دەستی كەسـی لاسـار (فاسـق) یـاخود بـێ بـاوەڕ، هـەروەك چـۆن ئەمـە لەسـەر دەسـتی موسـەیلەمەی درۆزن بەدەركـەوت كاتێـك تفـی كـردە نـاو چـاوی كـوێری كەسـێك بـۆ ئەوەی ببێتەوە، كەچی نەك چـاك بـووەوە، بـەڵكو ئـەو چاوەشـی كـە كـوێریش نـەبوو ئەوا لە بینین كەوت و كوێر بوو.

ب- پلە، پلە نزیك بوونەوە (استدراج): بریتیە لەو شتە دەراسایەی كە بەدەر دەكەوێت لەسەر دەستی كەسی لاسار (فاسق) یاخود بێ باوەڕ، تا زیاتر بەسەرگەردانی خۆیان سەرسام و گومڕاتر بن تا ئەو كاتەی فەرمانی خوایان بۆ دێت و ئەوانیش لە بێ ئاگایی دان، هەروەك خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿ فَلَمَّا نَسُواْ مَا ذُكِّرُواْ بِهِۦ فَتَحْنَا عَلَيْهِمْ أَبْوَٰبَ كُلِّ شَىْءٍ حَتَّىٰٓ إِذَا فَرِحُواْ بِمَآ أُوتُوٓاْ أَخَذْنَٰهُم بَغْتَةً فَإِذَا هُم مُّبْلِسُونَ ﴿٤٤﴾ فَقُطِعَ دَابِرُ ٱلْقَوْمِ ٱلَّذِينَ ظَلَمُواْ ۚ وَٱلْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿٤٥﴾ ﴾ الأنعام: ٤٤ - ٤٥. واتە: (ئینجا كاتێك ئەو بەرنامە و ڕێبازەی كە یادیان خرابووەوە فەرامۆشیان كرد، ئێمەش دەروازەكانی هەموو شتێكمان بۆ واڵا كردنەوە و "نازو نیعمەتمان بەسەردا ڕژاندن" هەتا كاتێك دڵخۆش و شادومان بوون بەوەی كە پێیان درا، ئیتر لەناكاو گرتمانن و هەموویانمان سەرگەردان و ڕیسواكرد ئینجا ئەوان بێ ئومێد بوون و بەغەم و پەژارەیەكی زۆرەوە تیاچوون. ئینجا ئیتر ئەو گەلەی ستەمیان كرد و بێ

بڕوابوون بنبڕ کران "جا ئەو کاتە بوونەوەر هاوڕێ لەگەڵ ئیمانداران و فریشتەکاندا دەڵێن: سوپاس بۆ پەروەردگاری هەموو جیهان").

پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: (إذا رأيت الله يعطي العبد في الدنيا وهو مقيم على معاصيه ما يحب فإنما هو استدراج) ثم تلا هذه رسول الله (ﷺ): ﴿ فَلَمَّا نَسُوا۟ مَا ذُكِّرُوا۟ بِهِۦ ﴾ الآية، والآية التي بعدها[1]. واتە:ئەگەر بینیت، خوای گەورە نازو نیعمەت بە بەندەیەکی ببەخشێت لە دونیادا، بەندەکەش تا حەز بکات هەر لەسەر تاوان بمێنێتەوە، ئەوە چاك بزانن ئەمە: پلە پلە نزیك بوونە (استدراج)ە، پاشان هەر دوو ئایەتەکەی خوێند.

پ- یارمەتی (المعونة): بریتیە لەو شتە دەراسایەی کە لەسەر دەستی کەسێکی سادە (عوام) دەردەکەوێت کە دەبێتە هۆی ڕزگار بوونیان لە تەنگ و چەڵەمەیەك.

ت- کەرامەت[2]: بریتییە لەو شتە دەراسایەی لەسەر دەستی کەسێکی چاکی

---

(١) ئەمانە دەریان هێناوە:أحمد و ابن جرير و ابن أبي حاتم و ابن المنذر و الطبراني في الكبير و أبو الشيخ و ابنِ مَرْدَوَيْه و البيهقي في الشُعَب عن عقبة بن عامر عن النبي (ﷺ)./ الدر المنثور ١٢/٣.

(٢) کەرامەت: بریتییە لە کارێکی دەرئاسا لەسەر دەستی وەلی و خۆشەویستێکی خوا بەدەر دەکەوێت و پەیوەست نییە بە بانگەشەی پێغەمبەرایەتی.

وەلی: بریتییە لەو خواناسەی کە شارەزاییەکی تەواوی سەبارەت بە خواو سیفەتەکانی هەیە و بەپێی توانای بەردەوامە لەسەر ئەنجامدانی پەرستشەکان و خۆی دوور دەگرێت لە تاوانەکان و خۆیی سەرقاڵ ناکات بە هەواو هەوەس بازی و ئارەزوو تێر کردن.

هۆکاری دەرکەوتنی کەرامەت باوەڕ و پارێزکاری و تەقوایە، خوای گەورە لەم فەرمایشتەیدا وەسفی وەلییەکانی خۆی دەکات: ﴿أَلَآ إِنَّ أَوْلِيَآءَ ٱللَّهِ لَا خَوْفٌ عَلَيْهِمْ وَلَا هُمْ يَحْزَنُونَ ﴿٦٢﴾ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَكَانُوا۟ يَتَّقُونَ ﴿٦٣﴾ لَهُمُ ٱلْبُشْرَىٰ فِى ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا وَفِى ٱلْءَاخِرَةِ ۚ لَا تَبْدِيلَ لِكَلِمَـٰتِ ٱللَّهِ ۚ ذَٰلِكَ هُوَ ٱلْفَوْزُ ٱلْعَظِيمُ ﴿٦٤﴾﴾ يونس: ٦٢_ ٦٤. واتە: (ئاگاداربن کە بەڕاستی چاکان

و خۆشەویستانی خوای میهرەبان نەترس و بیم ڕوویان تێدەکات، نەغەم و پەرژارە و دڵتەنگی دایان دەگرێت. "ئەو بەختەوەرانە" ئەو کەسانەن باوەڕی بەتین و دامەزراوو پڕسۆزیان هێناوە بە پەروەردگاریان و خۆشیان دەپارێزن لە خەشم و قینی خوا. هەر بۆ ئەوانە مژدەی "کامەرانی و بەختەوەری" لە ژیانی دنیادا "کە مژدەی قورئان و فەرموودەیە" لە قیامەتیشدا "مژدەکان دەبنە واقع و هەموو مژدە قورئانیەکان بە زیادەوە دێنەجێ"، بێ گومان ئەو بەڵێنانەی خوا هەر دێنەدی و هیچ گۆڕانێکیان بەسەر نایەت، ئا ئەوەیە سەرفرازی و کامەرانی گەورەو مەزن).

زۆربەی موسڵمانان لە پێشین و پاشینەوە و ئەبو حوسەینی بەصری کە یەکێك بوو لە موعتەزیلەکان، ئەمەیان چەسپاندووەو بڕوایان پێی هەبووە، تەنانەت ئیمامی ئەحمەدی کوڕی حەنبەل سەرزەنشتی ئەو کەسەی کردووە نکۆڵی لێ بکات و بە گومڕای داناوە، هەندێ لە موسڵمانان بۆ چوونیان وایە نکۆڵی کردن لەو شتانە لاساری و بیدەعەچێتییە، ئەماانەی خوارەوە بەڵگەکانیان:

أ_ قورئانی پیرۆز: بۆ نمونە:

مەریەم بێ جووت بوون لەگەڵ پیاو سکپڕبوو.

کەوتنە خوارەوەی خورمای گەییو بۆ مەریەم (سڵاوی خوای لێبێت) لە دارخورمای وشك، خوای گەورە دەفەرموویێت: ﴿وَهُزِّيٓ إِلَيۡكِ بِجِذۡعِ ٱلنَّخۡلَةِ تُسَٰقِطۡ عَلَيۡكِ رُطَبٗا جَنِيّٗا﴾ مريم: ٢٥. واتە: (ئەو دار خورمایەش "کە پاڵت پێوەداوە" کەمێك ڕایوەشێنە خورمای گەییوت بەسەردا دەبارێت).

بوونی ڕزق و ڕۆزی لەلایەن مەریەم بێ هۆکار، خوای بێ وێنە دەفەرموویێت: ﴿كُلَّمَا دَخَلَ عَلَيۡهَا زَكَرِيَّا ٱلۡمِحۡرَابَ وَجَدَ عِندَهَا رِزۡقٗاۖ قَالَ يَٰمَرۡيَمُ أَنَّىٰ لَكِ هَٰذَاۖ قَالَتۡ هُوَ مِنۡ عِندِ ٱللَّهِ﴾ آل عمران: ٣٧. واتە: (هەر کاتێك زەکەریا دەچوو بۆ سەردانی لە شوێنی خواپەرستیەکەیدا دەیبینی ڕزق و ڕۆزی و نازو نیعمەتی جۆراوجۆری لایە، زەکەریا وتی: ئەی مەریەم ئەو هەموو ڕزق و ڕۆزییەت لە کوێ بوو؟! مەریەم لەوەڵامیدا وتی: ئەوە لەلایەن خواوەیە، ئەو بۆم دەنێرێت).

مانەوەی یارانی ئەشکەوت (أصحاب الكهف) سێ سەد و نۆساڵ بێ خواردن و خواردنەوە، خوای پاك و تاك دەفەرموویێت: ﴿وَلَبِثُواْ فِي كَهۡفِهِمۡ ثَلَٰثَ مِاْئَةٖ سِنِينَ وَٱزۡدَادُواْ تِسۡعٗا﴾ الكهف: ٢٥. واتە: (ئەوسا ئیتر یارانی ئەشکەوت سێ سەد ساڵی تەواو "هەتاوی" لە ئەشکەوتەکەیاندا مانەوە "ئەگەر

(ﷺ) هێناویەتی لەکاتێکدا خۆی نەخوێندەوار بووەو لە کەش و هەوایەکی پەڕاوێزخراو و دوور لە گەلانی جیهان ژیاوە، ئەمان گشتیان مەشخەڵی ڕۆشنکەرەوەن بۆ هزری زانستی ئازاد، خەڵکیش پێشتر - لە گشت ناوچە جیا جیاکانی جیهان - ئاگاداری ئەو ڕاستیانە نەبوونە، تا ئەو کاتەی ئامرازەکانی زانستی سەردەم دەرکەوتن وەك ئامێرو تاقیگە و ڕوانگە گەردوونیەکان... هەر لەگەڵ دەرکەوتنی ئەو ئامێرە پێشکەوتوانە دەبینین دان دەنێت بە ڕاستیەکانی درەوشاوەکانی قورئانی پیرۆز کە هیچ لێڵی و ناڕوونی تێدا نییە بەڵکو ڕۆژ لە دوای ڕۆژ ڕوونتر دەردەکەون.

قورئانی پیرۆز هەر لەبەر ئەم چەند بابەتە زانستیەی کە تێیدایە موعجیزە نیە و بەس، بەڵکو ئیعجازی قورئان دەدرەوشێتەوە لەوەی کە دژی ئەو ڕاستیانە نەبووە کە زانست سەلماندوویەتی و نکوڵی نەکردووە لە ڕاستیە زانستیە گومان هەڵنەگرەکان.

## گومانێك و بەرپەرچەکەی:

**ئەگەر وترا:تیۆرە زانستیەکان دەکرێ گۆڕانیان بەسەردا بێت، ئێمە قورئانی پیرۆز ملکەچ ناکەین بۆ ئەو جۆرە لێکدانەوەو تەفسیرانە، چونکە لەوانەیە لە ئەنجامی لێکۆڵینەوە دەربکەوێت کە تیۆرە کۆنەکە هەڵە بووە.**

**وەڵامەکەی:**

لە ڕاستیدا لێکدانەوەو تەفسیری ئایەتەکانی قورئانی پیرۆز بەو شتانەی زانست ئاشکرایان دەکات بەپێی ڕێساکانی تەفسیرو مەرجەکانی لە زماندا و جگەلەوانەش ئەمانە تەنها بریتین لە جۆرێك لە جۆرەکانی تێگەیشتن بۆ ئەو ئایەتانە، ئەگەر دەرکەوت تیۆرەکە هەڵەیە ئەوکات دەردەکەوێت کە تەفسیرەکەش هەڵەیە، بەڵام ئەگەر ئایەتەکە تەفسیری نوێی لەخۆی هەڵنەگرت، ئەوا نابێت بەپێی تیۆرە نوێیەکە تەفسیر بکرێت، بەڵکو دەبێت چاوەڕوانی دەرەنجامی لێکۆڵینەوە بکات، تا

هەڵەی تیۆرە نوێیەكە دەردەكەوێت[1].

## ڕووی پێنجەم: واتاو حوكمەكانی قورئـانی پـیرۆزو نـەبوونی جیـاوازی و تـێكگیران تێیدا:

هەموو ئەو شتانەی لـە دوو تـوێی قورئـانی پـیرۆزدان لـە نزیكـەی شـەش هـەزارو دوو سـەد ئایەتـدا كۆدەبنـەوە، كـە بابەتـەكانی بیروبـاوەڕو ڕەوشـت و دانـانی یاسـا فرەلایەنەكان بۆ هـەموو بوارەكـان لـەخۆ دەگرێـت - هـەروەك كـەمێكی تـر دەیخەینـە بەرچاو - بۆ ئەوەی پێداویستیەكانی مرۆڤ دابین بكات.

دابەزینی قورئانی پـیرۆز بیست و سێ سـاڵی خایەنـد، كـە جیـاوازی و تێكگیرانـی تێدا نەبووەو نییە:

**أ- لە ڕەوانبێژی دەربڕینەكانیدا:** لە قورئاندا ئەوە بەدی ناكەین كە دەربڕینێـك ڕەوانبێژ بێت و یەكێكی تر ناڕەوان، چونكە هـەر دەربڕینێكـی قورئـانی پـیرۆز تـەواو كۆك و تەبایە لەگەڵ ئەو حاڵەی لەبەری هاتووە، هەروەك هەر بێژەیـەك لـە قورئانـدا لەو شوێنەدایە كە پێویستە لێی بەكار بێت.

جا ئەو ئایەتانـەی باسـی حوكمـەكان ئەكـەن وەك ئایەتـەكانی مـیرات كـە شـێوازی وتـاردان و كاریگـەری تێیـدا بەرچـاو نـەگیراوە، بەپێچـەوانەی ئـەو ئایەتانـەی كـە سـووكایەتی دەكـات بـە هاوبەشـدانان و بتـەكان، چـونكە ئـەم جـۆرە ئایەتانـە بەشـێوازێكی زۆر بەرچـاو سروشـتێكی كاریگـەرو ویـژدان بزوێنـی تێـدا ڕەچـاوكراوە، چونكە هەر شوێنێك قسەی خۆی دەوێت.

**ب- لـە حوكمـەكان و بەڵگـە خسـتنەڕووەكانی دا:** هـیچ واتایـەك یـاخود حوكمێـك نیـە لـە قورئانـدا تێكبگیرێـت و دژ بێـت لەگـەڵ واتایـەك و حـوكمێكی تـر، ئەوەش كە لە قورئانی پیرۆزدا هاتووەو لە ڕووكەشدا تێكگیراوە، ئـەوا پـاش تێڕامـان و ورد بوونەوە تێكگیران هەر هیچ پێگەیەكی نیـە، بۆیـە توێـژەر (مفسـر)ەكانی قورئـان ئەمەیان پشت گوێ نەخستووەو بەتێرو تەسەلی باسیان كردووە.

---

(١) علم الأصول الفقه - أستاذ عبدالوهاب خلاف ٣١ و محاضرات في أصول الفقه - بدر المتولي ١٣٢/١.

بۆیــە خــوایی گــەورە دەفــەرموویێت: ﴿ أَفَلَا يَتَدَبَّرُونَ ٱلْقُرْءَانَۚ وَلَوْ كَانَ مِنْ عِندِ غَيْرِ ٱللَّهِ لَوَجَدُوا۟ فِيهِ ٱخْتِلَٰفًا كَثِيرًا ﴿٨٢﴾ ﴾ النساء: ٨٢. واتە: (ئـەوە بـۆ ئەوانـە سـەرنجی قورئـان نادەن و لێكی نادەنەوەو لێی ورد نابنەوە؟ خۆ ئەگەر لەلایـەن كەسێكی تـرەوە بوایـە، جگەلە خوا، بێگومان جیاوازی و دژایەتیەكی زۆریان تێدا دەدۆزیەوە).

**پ- تا ڕۆژگـار بمێنێـت قورئـانی پـیرۆز هـەر دەمێنێـت:** هـیچ زیـادە و كـەمێك ڕووی تێناكـات، چـونكە خـوای گـەورە پـەیمانی پاراسـتنی قورئـانی داوە[1] ، ئـەم فەرمایشـتە: ﴿ إِنَّا نَحْنُ نَزَّلْنَا ٱلذِّكْرَ وَإِنَّا لَهُۥ لَحَٰفِظُونَ ﴿٩﴾ ﴾ الحجر: ٩. واتـە: (ئێمـە قورئانمـان ناردۆتـە خوارەوە، هەرخۆشمان دەیپارێزین و چاودێری دەكەین).

ناشاردرێتەوە كە لەو ئایەتە پیرۆزەدا چەند شێوازی جەخت كردنـەوە هـاتوون، ئاماژەن بۆ ئەوەی كە خوای گەورە قورئـانی پاراسـتووەو دەشـیپارێزێت لـە دەسـتكاری و گۆڕانكاری. هەروەها خوای پاك وتـاك فەرموویـەتی: ﴿ لَّا يَأْتِيهِ ٱلْبَٰطِلُ مِنۢ بَيْنِ يَدَيْهِ وَلَا مِنْ خَلْفِهِۦ ﴾ فصلت: ٤٢. واتە: (هیچ ناحەقی و نادروسـتی و ناتەواویـەك ڕووی تێناكـات لە هیچ كاتێك و لایەكەوە).

من پرسیار ئەكەم: ئایا لـەدوای ئەمـە كەسـی ژیـرو عاقڵ هـەر دەڵێـت كـە محمد

---

(١) الشفا - القاضي عیاض ٢٧٥/١ و الاتقان ١٢٣/٢ كە وەریگرتووە لە: قاضي عیاض.

موعتەزیلە بۆچوونیان وایە كە قورئانی پیرۆز موعجیزەیە بەوەی ورەو توانای دژەكانی خەساندووە، ئەوەش بریتیە لەوەی كە خوای گەورە ورەو توانای ئەوانەی كە یەكگربوونە دژبە= =قورئان ساردكردۆتەوە ئەگەرچی خوای گەورە وای لە دژەكان نەكردبایە ئەوا دەیانتوانی وێنەیەكی قورئان بێنن.

زۆربەی زانایانیش بەرپەرچی ئەو بۆچوونەیان داوەتەوە بە بەڵگەی: ئەگەر مەبەست لە ئیعجازی قورئان ئەوە بێت كە توانای دژەكانی خەسێنراوە و سنوردار كراوە، ئەوا وا باشتر دەبوو كە زیاتر گرنگی نەدرایە بە ڕەوانبێژی و جوانبێژییە بەرزەكەی، تا هەر بە سادەییەكەی خۆی قوڵتر نەریتشكێنی بكردایەو بووبایە دەراسایەكی سەلمێنراوتر.... سەیری ئەم سەرچاوەیە بكە: الكلام عن أدلة بالصرفة وردها في شرح المقاصد ١٨٤/٢-١٨٥.

(ﷺ) ئەم قورئانەی لە بەرهەمی هزرو بلیمەتی خۆی و پشت بەستنی بە (بحیرا) و (ورقە) و جگەلەوانیش دایهێناوەو هۆنیویەتیەوە...؟

ئەگەر عەقڵ بە ئینصافانە وەڵام بداتەوە ئەوا هەر ئەو ڕاستیە مەزنە بڕیار دەدات كە بریتیە لە: قورئانی پیرۆز موعجیزەیە و لەلایەن خوای باڵادەست و داناوە دابەزێنراوە.

# چەند گەواهییەكی تر

## لەسەر پێغەمبەرایەتی پەیامبەری مەزن محمد (ﷺ)

دوای تەواو بوون لە ڕوون كردنەوەی هەر دوو بنچینە سەرەكیەكانی پێغەمبەرایەتی محمد (ﷺ)، كە بریتین لە: بانگەشەی پێغەمبەرایەتی و دەرخستنی موعجیزە، كە ئەمانەش بەسن بۆ ئەوەی پێغەمبەرایەتی ناوبراو بسەلمێنن، لەگەڵ ئەوەشدا ئەوا هەڵدەستین بە بەهێزتر كردنی هەر دوو بنچینەكە بەوەی كامڵتری دەكەین، بەو پێیەی گەواهی بدات لەسەر پێغەمبەرایەتی محمد (ﷺ)، ئەم گەواهیدەرانەش بریتین لەمانە:

### گەواهی یەكەم:

ئەو تایبەتمەندی و سیفەتانەی كە هەبوون لە پێغەمبەردا (ﷺ) چ پێش ئەوەی ببێت بە پێغەمبەر یاخود لەكاتی بوونی بە پێغەمبەر یان دوای ڕەوانەكرانی وەك پێغەمبەر، ئەم ڕێڕەوە لە گەواهیدان (جاحظ) و (غزالی) پێی ڕازی بوون، كە بریتین لەم سیفەتانە:

أ- سیفەتە پیرۆزەكانی و تایبەتمەندییە چاكەكانی و ڕەوشتە بەرزەكەی:

وەك ڕاستگۆیی و دەستپاكی، هەرگیز درۆو فێڵ و ناپاكی نەكردووە، تەنانەت ناوبراوە بە ڕاستگۆی دەستپاك، هەروەها دەیانكرد بە ئەمینداری ماڵ و سەروەتیان، تەنانەت (نضر)ی كوڕی (حارث) بەقوڕەیشی وت: (لە ڕاستیدا محمد گەنجێكی تازە پێگەیشتوو بوو، كەچی لە هەمووتان زیاتر جێگای ڕەزامەندی و ڕاستگۆترینتان بوو،

لە هەمووتان دەستپاك تربوو، تا چووە قۆناغی پیریەوەو ئەو پەیامەی بۆ ئێوە هێنا ئەو كات وتتان جادووگەرە، بەخوا محمد جادووگەر نییە)[1].

پێغەمبەر (ﷺ) زۆر بەسۆزو میهرەبان بووە: هیچ کەسێکی ئازار نەداوە، نە بەدەست نە بە زمان. هەروەها هیچ کەسێکی بەدەستی موبارەکی خۆی نەکوشتووە - سەرباری ئەو مەردایەتی و بوێرییەی کە هەیبووە - تەنها (أبی)ی کوڕی (خلف)ی بەدەستی خۆی کوشتووە. زۆر ئازاری ئەچەشت لەبەرامبەر ئەو شتانەی کە دەیبینی لە ناو هۆزەکەی لە تاڵانکاری و دزین و کوشتن و هەوڵی چاکردنی کێشەی نێوان دوو کەسی دەدا. زۆر میهرەبان و دلۆڤان بوو و هاوبەشی خەمی نەخۆش و بریندار بووان دەبوو و پشتی هەژارانی دەگرت و برسیانی نان ئەدا.

لە (صحیح[2] البخاری)دا هاتووە، لە دوای ئەوەی خەدیجە پێغەمبەری (ﷺ) هێورکردەوە لەو ترس و دڵە ڕاوکێیەی دایگرتبوو کاتی جبریلی (سەلامی لێ بێت) بینی بوو، پێی وت: (تۆ پەیوەندی خزمایەتی دەگەیەنی و یارمەتی کەسانی لێقەوماو دەدەی و ئەوەی خەڵك لە هیچ شوێنێك دەستی ناکەوێت تۆ دەیکەی بە موڵکیان و میوانداری میوانان دەکەی و کەسێك کە بەڵای بەسەردێ تۆ پشتگیری و هاوکاری دەکەی).

بەخشندەو چاوتێر بووە: بەخشندەو دڵفراوان بووەو ڕێزی زۆری دەگرت لە ڕێبواران و هەژاران و بەخشندەو سەخی بووە لەگەڵیاندا.

خۆڕاگرو ئارامگر بووە لەسەر ناخۆشییەکان بەتایبەتی دوای ڕەوانەکرانی وەك پێغەمبەر.

زۆر دونیا نەویست و خۆبەکەمزان و خاکی و تاقانە بووە لە بوێریدا.

کەسێکی خاوەن شەرم و حورمەت بووە: هەرگیز جەستەی خۆی بەڕووتی دەرنەخستووە بۆ کەسی بەرامبەر، سەرباری ئەوەش کە لە سەردەمی نەفامیدا

---

(١) سەیری وتەی (نضر) بکە لە: تهذيب سيرة ابن هشام ٦٩/١ والشفا ١٣٥/١ وإظهار الحق ٢٥٧/٢.

(٢) صحيح البخاري ٣/١ باب كيف كان بدء الوحي الى رسول الله (ﷺ).

نەریتێكی باوبووە لە ناوخەڵكیدا.

قسەو فەرمایشتی شیرین و ڕەوشتی نەرمونیان بووە، هەر كەسێك چاوی پێ كەوتبێت یاخود لەگەڵی دانیشت بێت خۆشی ویستووە.

پێغەمبەر (ﷺ) كەسێكی پاك و خاوێن و كەشخەو جوان بووە.

ب-هەروەها دەروون پاك و پوخت بووە: ڕق و كینە و خۆپەرستی و گومان و هاوبەشدانان بوونی نەبووە لە دەروونیدا. زۆر ڕقی دەبووەوە لە بتپەرستی و پەیكەر پەرستی، سەرباری ئەوەی كە كەش و هەوای كۆمەڵگاكەی لەسەر پەیكەرو بتپەرستی گەشەی كردووە، پێغەمبەر (ﷺ) هەرگیز سوێندی بە بتەكان نەخواردووە، بەڵگەش لەسەر ئەمە ئەوەیە كە (ابن هشام) گێڕاویەتیەوە لە بەسەرهاتی (بحیرا الراهب) كاتێك پێغەمبەری (ﷺ) سوێنددا بە (لات) و (عوزا)، چونكە گوێی لێبووە كە هۆزەكەی پێغەمبەر (ﷺ) سوێند بەم دوانە ئەخۆن، بەڵام پێغەمبەر (ﷺ) پێی فەرموو: ((لا تسألني باللات و العزى، فوالله ما أبغضت شيئاً قط بغضهما)) واتە: سوێندم مەدە بە (لات) و (عوزا)، سوێند بەخوا ڕقم لەهیچ شتێك نیە بەو ئەندازەیەی ڕقم لەوانە.

پ- ڕێكوپێكی جەستەكەی: چ لە ڕووی جوانی ڕووخساری جەستەكەی، لەوەی ئەندامەكانی سەلامەت بوونە لە نەخۆشی قێزەون، چ لەڕووی هێزی جەستەییەوە، (ركانە) ململانێكارێكی بەناوبانگ بوو كەچی پێغەمبەر (ﷺ) بەزاندی.

یاخود ئەگەر یەكێك هەڵیسەنگاندبا بۆی دەردەكەوت كە پێغەمبەر (ﷺ)، خاوەنی دڵێكی ژیرو زیرەكیەكی بەهێزو بیرێكی تیژە، هەر كەسێ چاوی پێكەوتبا ترسی لێدەنیشت، جا پێغەمبەری (ﷺ) ناسیبووبا یان نا.

ت- بەرزو پیرۆزی نەژادو ڕەچەڵەكی: پێغەمبەر (ﷺ) لە بەرزترین و گەورەترینماڵەكانی قوڕەیشە، قوڕەیشیش گەورەترینی هۆزەكانی عەرەبە.

ج- پیرۆزی و ڕێزداری نیشتمانەكەی: پێغەمبەر (ﷺ) لە مەككەی پیرۆزەوە لە پاكترین شوێن لەسەر زەویدا چاوی بەدونیا هەڵهێناوە، كە حەرەم و ماڵی هەرە

بەنرخ و موبارەکی خوای گەورەی لێیە. جا نمونەی ئەم سیفەتانە تەنها لە کەسێکدا کۆدەبنەوە کە پێغەمبەر بێت[1].

لەبەر ئەوەی خوای گەورە ئەو پێداویستانەی مرۆڤ پێویستی پێی هەیە، لە تواناو لێهاتوویيە جیاوازەکان، دابەشی کردووە لەنێوان تاکەکاندا، بۆیە دەبینین هەندێکیان لە هەندێکی تریان بەهێزترن لە ڕووی توانای جەستەیی، هەندێکی تر بەهێزن لەبواری هونەردا، هەشیانە خاوەنی بیرێکی تیژە لە بیرکاری یان ئەندازەیی یاخود وتاردان یان هۆنراوە دانان، هەندێك کەسیش هەن شتی وا دادەهێنن کە خەڵکی سەریان ئەسوڕمێ لە ئاستیدا، بەشێك لە خەڵکیش هەن کە خوای گەورە بەتایبەت هەڵیبژاردوون بۆ ئەوەی بەرنامەی خوا بەخەڵکی ڕابگەیەنن، کە بریتین لە پێغەمبەران و پەیامبەران.

هەر بۆیە دەبینین کە هەندێك لە خەڵکی هەر لە سروشتی خۆیدا توانایەکی تایبەتی هەیە کە پێی جیا دەکرێتەوە لە خەڵك.

پێغەمبەران تایبەتمەندییەکی تایبەتیان پێدراوەو، چەند سیفەتێکیان هەن کە پێیان لە خەڵکی جیا ئەکرێنەوە، کردارو هرزریان دەگمەن و تاکە کە خەڵکی لەناو خۆیاندا ئاشنا نەبوونە پێی، خوای گەورە ئامادەباشی تەواوی لەواندا بەدیهێناوە، بۆ بەرگە گرتن و لە ئەستۆ گرتنی ئەو ئەرکە سەختە، کە بریتیە لە گەیاندنی ڕێساکانی خوایی بە مرۆڤایەتی.

بۆیە شتێکی سەیر نییە کە خوای گەورە لە پەیامبەران و پێغەمبەراندا چەند سیفەت و خوێکی وا بەدی بێنێت کە ئامادەیان بکات بۆ ئەوەی ببن بە پێشڕەو و سەرکردەی جیهان و ڕێنماییکارانی مرۆڤایەتی بەرەو ڕێگەی ڕاست[2].

سیفەتی بەرزو بەهێز و ڕەوشتی چاك و پیرۆز لە پێغەمبەری خوادا (ﷺ)

---

(١) شرح المقاصد ٢/١٨٨ و الدواني ٢/٢٧٨ و المسايرة والمسامرة عليها ٢٤٥-٢٤٩ و تەماشای بابەتی ڕەوشتی پێغەمبەر (ﷺ)بکە لە: سيرة ابن هشام و الشفا.

(٢) مبادء الاسلام - المودودي ٣٢-٣٤.

**کۆببوونەوە بەر لەوەی ببێتە پێغەمبەر (وەك پێشتر خرایەڕوو) و دوای بوونیشی بە پێغەمبەر، تەنانەت قورئانی پیرۆز وەسفی دەکات:﴿ وَإِنَّكَ لَعَلَىٰ خُلُقٍ عَظِيمٍ ﴿٤﴾ ﴾ القلم: ٤، واتە: (بەڕاستی تۆ لەسەر ڕەوشت خوویەکی زۆر جوان و پەسەند و بێ وێنە و مەزنیت). هەروەها لەبارەی ڕەوشتی پێغەمبەر (ﷺ) پرسیار لە عائیشە (ڕەزای خوای لێ بێت) کرا، لە وەڵامدا وتی: (ڕەوشتی پێغەمبەر (ﷺ) قورئان بوو، ڕەزامەندی و توڕەییەکەی بە قورئانەوە پەیوەست بوو)[1].**

**پێغەمبەر (ﷺ) چاکترین نمونەی بەرزو چاکەیە لەگشت بوارێکدا، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ لَّقَدْ كَانَ لَكُمْ فِي رَسُولِ ٱللَّهِ أُسْوَةٌ حَسَنَةٌ ﴾ الأحزاب: ٢١. واتە: (سوێند بەخوا بەڕاستی لە پێغەمبەری خوادا چاکترین نمونەی تەواو و ڕێکوپێك هەیە). تەنها پێغەمبەرە (ﷺ)سەرمەشقی هەرە چاك، موسڵمانان پێیان وایە کە تەقواو لە خواترسان و چاکی و بەدەستهێنانی بەهەشت لەلایەن خوای گەورە بە گرتنەبەری ڕێوشوێن و ڕێبازی پێغەمبەر (ﷺ)دەبێت.**

**کۆبوونەوەی ئەو سیفەت و ڕەوشتانە لە پێغەمبەری خوا (ﷺ) تەنها بریتیە لە گەواهییەکی تەواو لەسەر ئەوەی کە بەڕاستی پێغەمبەرە.**

## گەواهی دووەم:

**ئەو شتانەی کە بەرنامەو شەریعەتی پێغەمبەر (ﷺ) لەخۆی دەگرێت، کە پەیوەستن بە:**

**بیروباوەڕ یان ڕەوشت یاخود حوکمە گشتیەکان، لایەنە وردەکانی تری ڕێساو یاساو حیکمەتەکانی[2]، هەروەها ئەو ڕێك و پێکی و دادپەروەری و نەرم و نیانیەی کە لە شەریعەتی ناوبراودا هەیە، کە هۆکارە بۆ ئەوەی بگونجێت بۆ گشت ڕۆژگارو**

---

**(١) الشيفا - القاضي عِياض ٩٦/١.**

**(٢) شرح المقاصد ١٨٨/٢ والدواني ٢٧٨/٢.**

سەردەمەكان، هەروەك دوژمنەكان گەواهیان لەسەرداوە، (گەورەیی هەر شتێك لەوەدایە كە دوژمنان گەواهی بۆ بدەن).

سەرباری ئەوەی كە پێغەمبەر (ﷺ) نەخوێندەوار بووەو نووسینی نەدەزانی تا كۆچی دوای كرد، لە ناو هۆزێكدا گەشەی كرد كە نەزانی لەناودا زاڵ بوو، هەرگیز پێغەمبەر (ﷺ) كرداری نووسین و فێربوون و پەروەردە وەرگرتنی ئەنجام نەداوە[1]، بەڵكو پێش بوونی بە پێغەمبەر ڕۆژانێكی دوورو درێژی بەسەر دەبرد بە تەنیایی لە ئەشكەوتی (حراء) ورد دەبوەوەو ڕامانی دەكرد لە گەورەیی و شكۆداری خوای گەورە.

ئا لێرەدا ناوەرۆكی قورئانی پیرۆز دەخەینەڕوو، تا خوێنەر دڵنیا بێت كە قورئان گشتگیرەو بەرنامەی هەمەلایەنی هەیە بۆ گشت بوارەكانی ژیان، هیچ كەسێكی بلیمەتیش ناتوانێت تەنها یاساییەكی هاوشێوە بێنێت ئەگەر چی جڵەوی زانست و هزری بەدەست بێت و هۆكارەكانی یاسادانانی بۆ ئامادەكرابێت، چونكە قورئان لەلایەن خوای زانا و كاربەجێوە هاتووەو لەڕێی سروشەوە دایبەزاندۆتە سەر پێغەمبەر (ﷺ) تا بەخەڵكی ڕایبگەیەنێت.

## ناوەڕۆكی بابەتەكانی قورئانی پیرۆز:

ناوەڕۆكی بابەتەكانی قورئان دابەش دەبێت بۆ دوو جۆر:

جۆری یەكەم: حوكمەكانی قورئان: ئەوەش دەبێت بەسێ بەش:

١- **حوكمە بیروباوەڕییەكان** (أحكام اعتقادية): تایبەتە بەوەی هەڵدەستێت بۆ كەسی ئەركدار (مكلف) دەیسەلمێنێت كە پێویستە لەسەری بڕوای هەبێت بە: خواو فریشتەكانی و پێغەمبەران و دواڕۆژ.

٢- **حوكمە ڕەوشتییەكان** (أحكام خلقية): هەڵدەستێت بۆ كەسی ئەركدار (مكلف) دەسەلمێنێت كە پێویستە لەسەری خۆی بڕازێنێتەوە بە سیفەت و ڕەوشتی چاك و

---

(١) الدواني، سەرچاوەی پێشوو، والمسامرة ٢٤٩.

بەرز، هەروەها خۆی دوور بگرێت و دابڕنێت لە سیفەتی ناشرین و نزم و پەست.

**٣- حوكمە كردارییەكان** (أحكام عملية): ئەمەش دوو جۆر حوكم ڕێك دەخات:

**أ- ئەو حوكمانەی تایبەتن بە پەرستشەكان:** ئەمـەش بـۆ ئەوەیـە تـا پەیوەنـدی مـرۆڤ لەگـەڵ بەدیهێنەرەكـەی تۆكمـەو ڕێـك بخـات، وەك: نوێـژ و زەكـات بەخشـین و حەج كردن و ڕۆژوو گرتن ڕوون بكاتـەوە... هتـد، ئـەو ئایەتانـەی كە پەیوەسـتن بـەم لایەنە نزیكەی ١٤٠ ئایەتن.

**ب- ئەو حوكمانەی تایبەتن بە مامەڵەوە:** ئەمەش دابەش دەبێت بۆ ئـەم چـەند جۆرەی خوارەوە:

١- ئـەو حوكمانـەی تایبـەتن بـە بـاری كەسـێتی و خێزانـەوە، وەك ژن مـارەكردن، جیابوونەوەی ژن و مێرد، ئەو ئایەتانەی لەسەر ئەمە دەدوێن نزیكەی ٧٠ ئایەتن.

٢- ئەو حوكمانەی شارستانی و مـەدەنین و پەیوەسـتن بـە فرۆشـتن و بەكرێـدان و بارمتە و زامنكردن (كفالـة) و هاوبەشـی... تـاد، ئـەو ئایەتانـەی تایبـەتن بـەم لایەنـە نزیكەی ٣٠ ئایەتن.

٣- ئـەو حوكمانـەی تایبـەتن بـە تاوانـەكان كـە سـزاو سـنورەكان (العقوبـات و الحدود)، بۆ پاراستنی ژیـان و سـەروەت و سامان و شـەرەف و مافـەكانی خـەڵكی، ئـەم ئایەتانەی لەمبارەوە دەدوێن ٣٠ ئایەتن.

٤- ئـەو حوكمانـەی تایبـەتن بـە چـۆنیەتی ڕێكخسـتن و بەرزكردنـەوەی داواكـاری (مرافعـات)، كـە پەیوەسـتە بـە دادگـا و شـایەتی دان و سـوێند خـواردن، بـۆ پاراسـتنی دادپەروەری، ئایەتەكانی تایبەت بەم لایەنە نزیكەی ٣٠ ئایەتن.

٥- حوكمـە دەسـتورییەكان، كـە پەیوەسـتن بـە سیسـتەمی حـوكم و بنـەماكانی، ئایەتەكانی تایبەت بەم بوارە ١٠ ئایەتن.

٦- حوكمـە نێـو دەوڵەتیـەكان، كـە پەیوەسـتن بـە مامەڵـە و هەڵسوكەوت لەگـەڵ دەوڵەتـە ئیسـلامیەكان و جگـە لـەوانیش، هـەروەها چـۆنیەتی مامەڵـە كـردن لەگـەڵ ناموسڵمانان لە ناو دەوڵەتی ئیسلامیدا، ئایەتەكانی پەیوەست بەم لایەنە ٢٥ ئایەتن.

٧- حوكمـــە ئـــابوری و دارایيـــەكان، كـــە پەیوەســـتن بـــە مـــافی هـــەژاران و

پـەڕاوێزخراوان و داواکـاران کـە بەشـێکیان پەیوەنـدییان بـە مـاڵی دەوڵەمەنـد و ڕێکخستنی داهات و خەرجیەکانەوە هەیە، ئایەتـەکانی تایبـەت بـەم بـوارە نزیکـەی ١٠ ئایەتن[١].

**جۆری دووەم: ئەو بابەتانەی ناچنە ناو چوارچێوەی بابەتی حوکمەکانەوە: ئەم جۆرەش دەبێت بە سێ بەش:**

١- ئاراستە کردنی خەڵك بۆ تێڕامـان و ورد بوونـەوە لـە پێکهاتـەکانی ئاسمانـەکان و زەوی، بـۆ ئـەوەی نهێنـی بوونـەوەران بـزانن، بەمـەش دڵـەکان لێـوان لێـو دەبـن بـە بڕوابـوون بـە خـوای گـەورەو شـکۆدارییەکەی ئەمـەش لـە ڕێگـەی تێڕامـان و بەڵگـە هێناوە، ئەمـە شێوازو ڕێگەیـەکی زۆر بەنرخـە کـە ئاسۆکان بـەڕووی زاناکـان و جگـە لـەوانیش دەکاتـەوە بـۆ پـەیی بـردن بـە بـوونی خـواو تواناکـەی، جـا زۆرێـك لـە ناموسڵمانان سوودیان لەمـە وەرگـرت بـەوەی توێژینـەوەیان کـرد لـە وردەکارییـەکانی بوونەوەر و پەییانبرد بە نهێنیەکانی و بەکاریانهێنا لە لایەنەکانی ژیاندا.

٢-بەسـەرهاتی پێشـینان چ بـە تـاك وەك کـەس چ بـە کۆمـەڵ وەك هـۆز و گـەل، قورئـانی پـیرۆز باسـی ئـەو بەسـەرهاتانەی کـردووە بـۆ پەنـدو ئامۆژگـاری لـێ وەرگرتنیان، بۆ ئەوەی خەڵکی چاك بن و دوورکەونەوە لە خراپە و تاوان.

٣- هۆشـداری دان و ترسـاندن یـاخود پەیمانـدان بـە سـزاو پاداشـت، لـەم لایەنـەدا قورئان دوو شێوازی هەیە:

یەکەمیان: پەیمان دان و هەڕەشە کردن هەر لە دونیادا:

پـەیمان بـە بـاوەڕداران دەدات بـەوەی جێنشـین و پایـەداریان دەکـات لـە زەویـدا و سـەربەرزو سـەربڵندیان دەکـات و دەسـەڵاتیان پـێ دەبەخشـێت، پـەروەردگار دەفـەرمووێت: ﴿ وَعَدَ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ مِنكُمۡ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ لَيَسۡتَخۡلِفَنَّهُمۡ فِي ٱلۡأَرۡضِ ﴾ النور: ٥٥. واتە: (خوا بەڵێنی دڵنیا بەخش و تەواوی داوە بەوانەی باوەڕیـان هێنـاوە لـە

(١) علم أصول الفقه - خلاف ٣٣-٣٥ وأصول الفقه -د.عبدالكريم زيدان ١٣٠ وەریگرتووە لە: خلاف، والاسلام عقيدة و شريعة - الشيخ محمود شلتوت ٥٠٠ و٥٠٢.

ئێــوەو کــارو کــردەوە چــاکەکانیان ئەنجامــداوە بەڕاســتی لــە ئایندەیــەکی نزیکــدا جێنیشین و پایەداریان دەکات لە وڵاتدا).

هەروەها هەڕەشە و پەیمانی سزا دەدات بە بێ باوەڕان بەوەی بیم و ترسیان بەسەردا زاڵ دەکات، خوای گەورە دەفەرموویێت: ﴿ وَضَرَبَ ٱللَّهُ مَثَلًا قَرۡيَةً كَانَتۡ ءَامِنَةً مُّطۡمَئِنَّةً يَأۡتِيهَا رِزۡقُهَا رَغَدًا مِّن كُلِّ مَكَانٍ فَكَفَرَتۡ بِأَنۡعُمِ ٱللَّهِ فَأَذَٰقَهَا ٱللَّهُ لِبَاسَ ٱلۡجُوعِ وَٱلۡخَوۡفِ بِمَا كَانُواْ يَصۡنَعُونَ ﴿١١٢﴾ ﴾ النحل: ١١٢. واتە: (خوا نمونەی هێناوەتەوە "بە دانیشتوانی" بە شارێك کە ژیانیان بە هێمنی و ئاسودەیی دەبردە سەر، لە هەموو لایەکەوە ڕزق و ڕۆزی جۆراو جۆریان بۆ دەهات "بەڵام لە جیاتی سوپاسگوزاری" ناشوکرو قەدرنەزانی نازو نیعمەتەکانی خوا بوون، ئینجا خوای گەورە پۆشاکی برسێتی و ترسی کردە کاڵای باڵایان و تاڵاوی نەداری و ترسی پێ چەشتن لەسەر ئەنجامی ئەو ئیش و کارە "ناپوخت و ناڕێکانەدا" کە دەیانکردە پیشەی خۆیان).

دووەمیان: هاندان و هەڕەشە لێکردن و ترساندنیان، بە پاداشت و سزای دوارۆژ. خوای پایەبەرز دەفەرموویێت:

﴿ وَمَن يُطِعِ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ يُدۡخِلۡهُ جَنَّٰتٍ تَجۡرِي مِن تَحۡتِهَا ٱلۡأَنۡهَٰرُ خَٰلِدِينَ فِيهَاۚ وَذَٰلِكَ ٱلۡفَوۡزُ ٱلۡعَظِيمُ ﴿١٣﴾ وَمَن يَعۡصِ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ وَيَتَعَدَّ حُدُودَهُۥ يُدۡخِلۡهُ نَارًا خَٰلِدًا فِيهَا وَلَهُۥ عَذَابٌ مُّهِينٌ ﴿١٤﴾ ﴾ النساء: ١٣ - ١٤.[(١)] واتە: (ئەوانەی باسکران ئەو سنورانەن خوا دیاری کردوون، جا ئەو کەسەی فەرمانبەری خواو پێغەمبەرەکەی بکات، ئەوە خوا دەیخاتە ناو باخەکانی بەهەشتەوە: کە چەندەها ڕووبار بەژێر درەختەکانیدا دەڕوات، هاوڕێ لەگەڵ ژیانی نەبڕاوە تیایدا، بێگومان هەر ئەوەشە سەرفرازیی گەورە و دەستکەوتی بێ سنوور. "بەڵام" ئەوەی یاخی بێت لە خواو پێغەمبەرەکەی و دەرچێت لە سنورەکانی، ئەوە

(١) الاسلام عقیدة و شریعة - الشیخ شلتوت ٥٠٠ و٥٠١.

خوا دەیخاتە ناو ئاگرێکەوە کە بۆ هەمیشە تیایدا دەمێنێتەوەو سزایەکی سەر شۆڕکەرو ڕیسواکەری بۆ هەیە).

## گەواهی سێیەم:

سەرباری ئەوەی کە پێغەمبەر (ﷺ) هەژار بوو و پشتیوانانی کەم بوون، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا دژایەتی هاوبەشدانان و هاوبەشدانەران و ستەمکارانی جیهانی کرد و گاڵتەی بە بۆچوونەکانی ئەوان وسوکایەتی بە خەونەکانی دەکردن و دەوڵەتەکانی ڕووخاندن و ئایینەکەی بە ئاسۆکاندا بڵاوبووەوە، لە بەرامبەریشدا ئایینەکانی تر کورت هەڵهاتن، دوای ئەمە دەوڵەتی پێغەمبەر (ﷺ) فراوان بوو و خۆرئاواو خۆرهەڵاتی ڕزگار کرد و حوکمی لێکرد، بەمەش دوژمن سەرباری زۆری و بۆرییەکەی چ لە ڕووی ژمارە چ لەڕووی کەرستەکانی جەنگ و بۆسە دانانەوە بۆ پێغەمبەر (ﷺ) و هاوەڵانی و سوربوونیان لەسەر لە ڕیش دەرهێنانی بانگەوازی ئیسلام، کەچی هەر نەیانتوانی ئەم مەرامە گڵاوەی خۆیان بەدی بێنن و بەسەریدا زاڵ بن.

بێگومان ئەمەش یارمەتی و پشتگیرییەکی خواییە بۆ پێغەمبەر (ﷺ) و ئەوانەی لەسەر بانگەوازو ڕێبازی ئەون[1].

خوای گەورە دەفەرموویێت: ﴿ وَكَانَ حَقًّا عَلَيۡنَا نَصۡرُ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ ﴾ الروم: ٤٧. واتە: (ئەوسا ئیتر سەرخستنی ئیماندارانمان بە ئەرکی خۆمان زانی و سەرکەوتنمان پێ بەخشین).

## گەواهی چوارەم:

هاتنی پێغەمبەر (ﷺ) دوای ئەوەی کە ماوەیەکی زۆر بوو هیچ پێغەمبەرێك نەهاتبوو و گومڕایی بەخەستی بڵاو ببوەوە.

عەرەبەکان بتیان ئەپەرست، فارسەکانیش ئاگریان دەپەرست و بەگەورەیان

(١) شرح القاصد ١٨٨/٢.

دەزانی و بەرەڵایی پیشەیان بوو، تورکەکانیش شارەکانیان تێکدەدا و خەڵکیان ئازار دەدا، هیندیەکانیش مانگایان دەپەرست و بەردیان بەخوا ئەزانی، جولەکەکانیش دڵیان پڕبوو لە ڕق و کینە و خۆپەرستی و هاوبەشدانان، هەروەها نەصرانیەکانیش لەنێوان خوابەیەکزانی و هاوبەشداناندا مابوونەوە.

ئەمە بارودۆخی خەڵکی بوو لەسەر زەوی، بۆیە پێویست بوو کەسێك هەبێت کە ئەم بێ دینیە ڕابماڵێت و هەڵگری مەشخەڵ و ئاڵای چاکسازی و لەخواترسان بێت، ئەم کەسەش تەنها دەبێت لەوانە بێت کە خوای گەورە نووری پێغەمبەرایەتی پێ بەخشیبێت[1].

## گەواهی پێنجەم:

ئەو مژدانەی لە کتێبەکانی پێغەمبەرانی پێشوودا هاتوون:

لەبەر ئەوەی کتێبە ئاسمانیەکان یەك سەرچاوەیان هەیە، کە بریتیە لە: خوای پایەبەرز، خاوەنی یەك ئامانجیشن، ئەویش بریتیە لە: چاك کردن و ڕاستەڕێ کردنی خەڵك، بۆ ئەوەی خوای گەورە بپەرستن. بڕوابوون بە پێغەمبەران و کتێبەکانیان بە بنەمایەك لە بنەماکانی ئایینی داناوە. لە کتێبە پێشووەکاندا چەندین مژدە هەن کە هەواڵ دەدەن بە دەرکەوتنی و هاتنی پێغەمبەر (ﷺ)، تەنانەت قورئانی پیرۆز باسی کردووە کە عیسا (سەلامی لێ بێت) مژدەی داوە بە پێغەمبەرێك لە دوای خۆی دێت کە ناوی ئەحمەدە، خوای گەورە لەوبارەوە دەفەرمووێت: ﴿ وَمُبَشِّرًۢا بِرَسُولٖ يَأۡتِي مِنۢ بَعۡدِي ٱسۡمُهُۥٓ أَحۡمَدُۖ ﴾ الصف: ٦. واتە: (هەروەها مژدەدەریشم بە پێغەمبەرێك کە دوای من دێت و ناوی ئەحمەدە).

زانای لێکۆڵەر (عبدالحكيم السيالكوتى) لە (حاشية على البيضاوى)دا وتویەتی:

(پیویستە تەصەوڕ بکرێ کە هەر پێغەمبەرێك دەربڕینێکی خراوەڕو ئاماژەیەکی پلە پلەیی هێناوە کە تەنها زانا ڕۆچووەکان دەیزانن، ئەمەش لەبەر

---

(١) شرح المقاصد ١٨٩/٢ و شرح المواقف ٥٦٥.

حیکمەتێکی خواییە. و زانایان وتویانە: هەر کتێبێك کە لە ئاسمانەوە هاتووە بە ڕاستەوخۆی و بەڕاشکاوی باسی پێغەمبەری (ﷺ) نەکردووە بەڵکو ئاماژەی بۆ کراوە، چونکە ئەگەر بە ڕاستەوخۆ ئاماژەی بۆ کرابووبا و خەڵکی سادە و ساویلکەش بیزانیبایە ئەوا سەرزەنشتی زاناکانیان نەدەکرا لەسەر شاردنەوەی ئەو ڕاستیە، دواتر ئەو ئاماژانە نا ڕۆشنتر بوون بەهۆی گوێزرانەوە لە زمانێکەوە بۆ زمانێکی تر لە "عیبرانی"ەوە بۆ "سریانی"، هەروەها لە "سریانی" بۆ "عەرەبی")[1].

لایەنێك لەو مژدانە دەخەمەڕوو کە لە (زبور) و (تورات) و (ئینجیل)دا هاتووە.

**ئەو مژدانەی لە (زبور)دا هاتوون:**

١- داود وتی: (خوایەگیان؛ داهێنەری سوننەت ڕەوانە بکە، تا خەڵکی بزانن ئەو مرۆڤە) واتە: محمد ڕەوانە بکە، تا خەڵکی بزانن کە لە ڕاستیدا عیسا مرۆڤە.

٢- وتویەتی: (شمشێرەکەت بەدەستەوە بگرە ئەی خاوەن هێزی مەزن، چونکە بەرنامەو شەریعەتی تۆ پەیوەستە بە شکۆداری دەسەڵاتەکەت، تیرەکانت نیشانە ئەپێکن، گەلان لە ژێر دەسەڵات و فەرمانی تۆدا کۆئەبنەوەو ملکەچ دەبن).

تفتازانی[2] (٧٩٢ك کۆچی دوایی کردووە) ئەم دەربڕینانە لە یەکێك لە وەرگێڕدراوە عەڕبیە کۆنەکان وەریگرتووە.

هەروەها (رحمة الله الهندي) لە کتێبە مەزنەکەیدا (اظهار الحق) لە مژدەی شەشەمدا لە (زبور) کە (چل و پێنجەمینە) پارچەیەکی درێژ کە لە هەژدە ئایەت پێکهاتووە هێناویەتی، کە تیایدا باس لە سیفەتەکانی ئەو پێغەمبەرە کراوە کە مژدەی لەبارەوە داوە، بەتەواوی بەسەر پێغەمبەردا (ﷺ) جێبەجێ دەبێت، ئەو پارچەیەشی کە دەڵێت: (شمشێرەکەت بەدەستەوە بگرە ئەی خاوەن هێزی مەزن...) تیایدا هاتووە بە چەند دەربڕینێکی تر. جا ئەو سیفەتانەی کە تیایدا باسیان کراوە ئەمانەن:

---

(١) إظهار الحق ٢/٢٢٠.

(٢) شرح المقاصد ٢/١٩٠.

کەسێکی چاکە و باشترین مرۆڤە، نازو نیعمەت لە لێوەکانی ئەبارێت، پیرۆزو بەفەرو موبارەکە، شمشێر بەدەست و بەهێزە، ڕاستگۆ و لەسەرەخۆ و ڕاستڕەو ڕێنماییکارو هیدایەت دەرە، گەلەکە دەکەوێتە ژێر دەسەڵاتی ئەو، چاکەی خۆش ئەوێت و ڕقی لە گوناهە و کچی پاشاکان خزمەتی دەکەن، نەوەکانی گەل ملکەچ دەبن بۆی، نەوەکانی گەورەی زەوی، دیاری بۆ دێن و پێشکەشی دەکرێن، ناوەکەی نەوە دوای نەوە لە یاد دەمێنێت و باس دەکرێت، گەلان ستایشی دەکەن تا ڕۆژگار مابێت.

جا (رحمة الله بن خليل الهندي) بەتێرو تەسەلی باسی ئەو سیفەتانەی کردووە کە لە پێغەمبەر محمد دا (ﷺ) هاتوونەتە جێ، ئەمەشی پشتڕاست کردۆتەوە بە بەڵگەی تۆکمە و بەهێز.

**ئەو مژدانەی لە (تورات)دا هاتوون:**

١- لە (سیفری[1] پێنجەم)دا هاتووە: (خوا لە کێوی "طور سیناء"یەوە هات و لە "سیعیر" درەوشایەوەو لە چیاکانی "فاران" ڕایگەیاند).

مەبەستی هەواڵدانە لەبارەی هاتنی (تورات) بۆ (موسا) لە کێوی (طور سیناء) دابەزینی (ئینجیل)ە بۆ سەر عیسا لە (سیعیر)، چونکە پێغەمبەر عیسا (سەلامی لێ بێت) لە گوندی (ناصرة) لە شارۆچکەی (سیعیر) نیشتەجێ بوو، هەروەها دابەزینی قورئانە بۆ سەر محمد (ﷺ) لە شاری مەککە، لەبەر ئەوەی (فاران) دەکەوێتە سەر ڕێگەی مەککە پێش شاری (عدن) بە دوو میل و نیو، ئەمە بریتی بوو لە خانوو، کە تا ئەمڕۆش هەر ماوە لەسەر لای چەپی ڕێگەی عێراق بۆ مەککە.

ئەمەیە لە (تورات)دا هاتووە: کە ئیسماعیل لە چۆڵەوانی "فاران" نیشتەجێ

(١) سیفر واتە کتێب یاخود کتێبی گەورە، خوای گەورە دەفەرموویێت: ﴿كَمَثَلِ ٱلۡحِمَارِ يَحۡمِلُ أَسۡفَارَۢا﴾، هەروەها ناوە بۆ بەشێك لە تەورات. سەیری (قاموسی ڕستە "س، ف، ر"، ٣/١١٨٠، مەلا مەحموودی گەڵاڵی) بکە. (وەرگێڕ).

بووە، واتە لە دەشتی عەرەبدا نیشتەجێ بووە[1].

هەر بەهەمان شێوە ئەمە لە (بابی سی و سێ) لە (سەفەری: استثناء) واتە: (سیفری: التثنیة) لە وەرگێڕدراوە عەرەبیەكەدا كە لە ساڵی ١٨٤٤ : ٢ هاتووە: (پەروەردگار لە كێوی سیناوە هات، لە ساعیر خۆری بۆمان هەڵهێنا، بەرنامەی خۆی لە فارانەوە ڕاگەیاند، كە هەزاران پەیڤی پاك و پاككەرەوەی تێدایە و ڕەوشت و ڕێبازێكی ڕۆشن و ڕووناكی تێدایە).

"فاران" چیایەكە لە شاری مەككە، هەروەك لەبارەی بارودۆخی ئیسماعیل (سەلامی لێ بێت) لە بابی بیست و یەك لە سیفری (تكوین)دا هاتووە، بەم شێوەیە:

٢٠ (خوا لەگەڵیدا بوو، گەورە بوو و نەش و نمای كرد لە چۆڵەوانیدا، بووە گەنج، تیری دەهاوێشت) ٢١ (لە چۆڵەوانی "فاران" نیشتەجێ بوو، دایكەكەی ئافرەتێكی لە میسرەوە بۆ هێنا).

گومان لەوەدا نییە كە ئیسماعیل (سەلامی لێ بێت) لە شاری مەككە جێگیر ببوو[2].

٢- لە (سیفری پێنجەم)دا هاتووە:

(خوای پایەبەرز بە موسا "سەلامی لێ بێت" فەرمووە: پێغەمبەرێكی وەك تۆ لە نەوەی براكانیان بۆیان دەنێرم، فەرمایشتی من بەسەر زوبانی ئەودا دێت، ئەوەی من فەرمانی پێ ئەكەم بەوان ڕائەگەیەنێت، ئەو كەسەش كە قسەی پێغەمبەر قبوڵ ناكات ئەو كەسە بەزمانی من قسە دەكات و من تۆڵەی لێ دەستێنم).

مەبەست لە نەوەی براكانی نەوەی ئیسڕائیلە كە نەوەكانی ئیسماعیلن هەروەك زانراوە، ناشكرێت بە كەسێك لێكبدرێتەوە كە دوای موسا هاتووە چونكە موسا خاوەنی شەریعەتێكی تەواوكاری بووە، كە بەرژەوەندی هەردوو دونیای تێدا بووە.

---

(١) شرح المقاصد ٢/١٨٩.

(٢) إظهار الحق ٢/٢٥٠.

بۆیە دەبێت بڵێین ئەو كەسە پێغەمبەر محمده (ﷺ)[1].

٣- و ئەوەی لە ئایەتی (٢١) لە بابی (٣٢) لە (سیفری: استثناء)دا هاتووە:

(ئـەوان بـەبێ خوایـەكی پەرسـتراو هێرشـیان كـردە سـەر مـن، تورەیـان كـردم بـە پەرسـتراوە پوچـەكانیان، منـیش هێرشـیان ئەكەمـە سـەر، بەگـەلێكی نـەزان تورەیـان دەكەم).

مەبەست لەگەلی نەزان: عەرەبە، چونكە لـەو پـەری نـەزانی و گـومڕایی دابـوون، هـیچ جۆرێـك لـە زانسـتی شـەرعی و عـەقڵی لـەلای ئـەوان دەسـت نەدەكـەوت و تـەنها شـتێكیان دەزانـی ئـەویش پەرسـتنی بـت و پیكـەر بـوو، جولەكـەكان زۆر قـین لـە دڵ بـوون بەرامبـەر بـە عەرەبـەكان لەبـەر ئـەوەی لـە نـەوەكانی هاجـەرە بـوون كـە لـە بنچـینەدا كـەنیزەك بـووە، جـا مەبەسـتی ئایەتەكـە: ئەوەیـە كـە نـەوەی ئیسـرائیل هێرشـیان كـردە سـەرم بـە هـۆی پەرسـتنی چـەند پەرسـتراوێكی پـوچ، بۆیـە منـیش هێرشیان دەكەمە سەر بە هەڵبژاردنی ئەوانەی كە پلـە نـزم و نـەزانن، خـوای گـەورە پەیمانەكـەی بـەجێ گەیانـد، لـە نـاو عەرەبەكانـدا پێغەمبـەری (ﷺ) ڕەوانـەكرد، كـە ئەوانی هیدایەت و ڕێنمایی كرد بۆ سەر ڕێگەی ڕاست[2].

٤-هەروەها ئەوەی لە (سیفری یەكەم)دا هاتووە:

(خـوای پایەبـەرز بـە ئیبراهیمـی "سـەلامی لـێ بێـت"فـەرمووی: خـاتوو هاجـەرەی خێزانت كوڕێكی دەبێت، لـە نـەوەی ئـەو كوڕەدا یـەكێك پەیـدا دەبێـت كـە دەسـەڵاتی دەڕوات و هەمووانی بۆ ملكەچ دەبن)[3].

---

(١) شرح المقاصد ٢/١٨٩.

(٢) إظهار الحق ٢/٢٤٩.

(٣) شرح المقاصد ٢/١٨٩.

**ئەو مژدانەی لە (ئینجیل)دا هاتوون:**

**١- لە (صحاحی چوارده)دا هاتووە: (من بۆ ئێوە داوا لە باوکم[1] دەکەم، تا "فارقلیت"ێکتان[2] پێ ببەخشێت، بۆ ئەوەی هەتا هەتایە لەگەڵتاندا بێت، "فارقلیت" ڕۆحی ڕاستی گومان هەڵنەگرە).**

**تەفتازانی[3] ئەمەی لە یەکێك لە وەرگێڕدراوەکانی عەرەبی دا هێناوە.**

**هەروەها (رحمة الله) ئەمەی وەرگرتووە لە وەرگێڕدراوەکانی عەرەبی کە لە چاپ دراون لە ساڵی ١٨٢١ و ١٨٣١ و ١٨٤٤ لە لەندەن، لە (بابی چوارده، لە انجیلی یوحنا)دا هاتووە: (١٥، ئەگەر ئێوە منتان خۆش ئەوێ ئەوا ئامۆژگارییەکانم لە گوێ بگرن، ١٦ منیش داوا دەکەم لە باوکم "فارقلیط"ێکی ترتان پێی ببەخشێت، بۆ ئەوەی بۆ هەتا هەتا لەگەڵتاندا بێت، ١٧ کە ڕۆحی ڕاستیە و جیهان توانای قبوڵ کردنی نییە، چونکە نای بینێت و نایناسێت کەچی ئێوە دەیناسن لەبەر ئەوەی لەلای ئێوە نیشتەجێ وو جێگیر دەبێت)[4].**

**جا ئەو وتەیەی: (بۆ ئەوەی هەتا هەتا لەگەڵتاندا بێت) ئەوە دەگەیەنێت کە پێغەمبەرایەتی کۆتایی دێت و شەریعەتەکەی گشتگیر دەبێت و خەڵکی لەدوای هاتنی ئەو پێویستیان بەپێغەمبەرێکی تر نابێت، خەڵکی فێر دەکات، هەموو پێداویستیەکانیان دابین بکات، ئەو وتەیەی عیسا فەرمووی بۆیان باس دەکات.**

**٢- لە (صحاحی پازده)دا هاتووە: (سەبارەت بە "فارقلیط"ی ڕۆحی پیرۆز کە باوکم ڕەوانەی دەکات بەناوی من ئەو شارەزاتان دەکان، هەموو پێداویستیەکنتان دابین دەکات، ئەو شتانە بیری ئێوە دێنێتەوە کە من پێم وتن.**

**دواتر وتی: من ئەو شتەم پێ ڕاگەیاندن بەر لەوەی ڕووبدات و ئەو ڕۆحی**

---

**(١) مەبەستی ئەوەیە کە عیسا دەڵێت من داوا لە خوای باوکم دەکەم. پەنا بەخوا. (وەرگێڕ).**

**(٢) فارقلیت: مەبەست لێی مژدە پێدراو و سوپسکراوە، ئەویش پێغەمبەر موحەممەدە. (وەرگێڕ).**

**(٣) شرح المقاصد ٢/١٨٩-١٩٠.**

**(٤) اظهار الحق ٢/٢٧٨.**

پیرۆزه بێت، ئەمەش بۆ ئەوەبوو بڕوای پێ بێنن).

بەناوی من: واته به پێغەمبەرایەتی، هەروەها واتای (الفارقلیط): ئاشكراكەری شاراوەكان[1].

بەهەمان شێوه (رحمة الله) ئەمەی له وەرگێڕدراوه ناوبراوەكه هێناوه، بابی ١٥ و ١٦ (٢٦ جا كه فارقلیط هات كه من بۆ ئێوەی ڕەوانه ئەكەم، ئەو فارقلیطه لەلایەن خوای باوكەوه دێت كه ڕۆحی ڕاستییه، كه ناوبراو شایەتی بۆ من ئەدات، ٢٧ ئێوەش شایەتی ئەدەن، چونكه ئێوه هەر له سەرەتاوه لەگەڵم دابوون).

ئەمه ئەوه دەگەیەنێت كه پێغەمبەر محمد (صلى الله عليه وسلم) شایەتی دەدات لەسەر ڕاستگۆیی و مرۆڤ بوونی عیسا (سەلامی لێ بێت) و ئەوەش دەسەلمێنێت كه عیسا (سەلامی لێ بێت) بانگەشەی خوایەتی نەكردووه كه خراپترین جۆری نەزانی و گومڕاییه، هەروەها دایكی عیسا له تۆمەتی زینا بەدوور دەگرێت و پاكایەتی ئەو پاكیزەیه دەسەلمێنێت، ئەمه له قورئاندا بەوپەڕی ڕۆشنی باسی لێوەكراوه[2].

٣- هەروەها له (صحاحی شازده)دا هاتووه: (به ڕاستی و بەدڵنیاییەوه پێتان ئەڵێم: ڕۆیشتنی من لەلای ئێوه خۆی له خۆیدا هەواڵێكه بۆ ئێوه، چونكه ئەگەر ئێوه بەجێ نەهێڵم و نەڕۆم بۆ لای باوكم، ئەوا "فارقلیط"تان بۆ ناهێت، بەڵام ئەگەر من لەلاتان بڕۆم ئەوا بۆ لاتان دەنێرم، جا ئەگەر "فارقلیط" هات ئەوا سوود دەگەیەنێت به دانیشتووانی جیهان و دینداریان لەناودا بڵاو ئەكاتەوەو سەركۆنەیان دەكات و هەڵوێستەیان پێدەكات لەسەر هەڵه و چاكه).

پاشان وتی: (ئەگەر "فارقلیت" ڕۆحی ڕاستی و دڵنیاییتان بۆ هات، ئەوا ڕێنمایی و فێرتان دەكات و مشورتان بۆ ئەخوات، هەموو جۆرەكانی چاكه و ڕاستی بیری ئێوه

---

(١) شرح المقاصد ٢/١٩٠.

(٢) إظهار الحق ٢/٢٨٣.

دەخاتەوە، چونكە ئەو لەخۆیەوە قسەیەك ناكات كە خۆی دایهێنابێت)[1].

جا (رحمة الله الهندي) بەهەمان شێوە باسی ئەو مژدەیەی كردووە بەپشت بەستن بە وەرگێڕدراوە عەرەبیە ناوبراوەكان - كەمێك پێش ئێستا خرانەڕوو - لە دوایین بابی یوحنا (باب شازدە): (٧ من پێتان دەڵێم: بۆ ئێوە چاك و خێرترە كە من بڕۆم، چونكە ئەگەر من نەڕۆم ئەوا "فارقلیط" نایەت بۆ ئێوە، من كە هەر ڕۆیشتم ئەوا بۆتان ڕەوانە دەكەم، ٨ ئینجا كە هات ئەوا سەركۆنەی دانیشتووانی جیهان ئەكات لەسەر هەڵەو چاكە و حوكمیان، ٩ سەركۆنەیان دەكات لەسەر هەڵە، لەبەر ئەوەی باوەڕیان بەمن نەهێناوە، ١٠ و سەركۆنەیان دەكات لەسەر چاكە لەبەر ئەوەی من دەگەڕێمەوە لای باوكم و ئێوە دوای ئەمە من نابینن، ١١ هەروەها سەركۆنەشیان دەكات لەسەر حوكم و هەموو بەشەكان و سەركردەكانی ئەم جیهانە ملكەچ دەكات، ١٢ من قسەیەكی زۆرم هەیە بۆ ئێوە تا پێتان بڵێم، بەڵام ئێوە ئێستا توانای هەڵگرتنی بەرپرسیارێتی ئەو قسانەتان نییە، ١٣ ئەگەر "فارقلیت" ڕۆحی ڕاستی هات ئەوا هەر ئەو هەموو ڕووەكانی ڕاستیتان فێر ئەكات، چونكە لە خۆیەوە قسە ناكات، بەڵكو بەو شتانە قسە دەكات كە دەبیستێت، هەواڵیش دەدات بەوەی چی پێش دێت، ١٤ ئەو ڕۆحی ڕاستیە ڕێزدارو شكۆدارم دەكات، چونكە مافی من دەسەنێتەوەو پێتان ڕادەگەیەنێت، ١٥ هەر شتێك هی باوك بێت هی منیشە، بۆیە لەبەر ئەمە وتم: ئەوەی بەشی منە "فارقلیت" ڕۆحی ڕاستی وەریدەگرێت و پێتان ڕادەگەیەنێت)[2].

هەروەها شێخ (رحمة الهندی) هێناویەتی[3]:

لە ڕاستیدا "فارقلیط" لەلای نەصڕانیەكان بریتیە لە: (پایەدارو یارمەتیدەرو

---

(١) شرح المقاصد ٢/١٩٠.

(٢) إظهار الحق ٢/٢٧٩.

(٣) إظهار الحق ٢/٢٧٩ و لاپەڕەكانی دواتری.

**بریكـارو تكاكـار: المعَـزّي و المُعِـن و الوكيـل و الشـافع)، گشـت ئـەو واتايانـە جـەخت دەكەنەوە لەسەر ڕاسـتێتی پێغەمبەرايـەتی محمـد (ﷺ). چاوگی بێـژەو دەربڕینەكـە بە یۆنانی (بیركلوطوس)ە[(١)] كە مانایەكی نزیك دەدات لە مانای: محمد و أحمد.**

**عیسـاش (سـەلامی لـێ بێـت) بـە (عبیرانـی) دەدوا نـەوەك بـە (یۆنـانی)، دەربڕینەكـەی عیسا (سەلامی لێ بێت) كـە وشـەی پێغەمبـەرە لـە دوای خـۆی نـەماوە، بەڵام تەنها دەربڕینە یۆنانیەكە (بیركلرطوس) ماوە كە لە وەرگێڕدراوەكـەی (یۆحنـا) دا هەیە كە لە (عیبری) بۆ سـەر (یۆنـانی) وەرگێـڕدراوە، كـاتێكیش (ئینجیلـی یۆحنـا) لـە یۆنانیـەوە بـۆ سـەر زمـانی عـەرەبی وەرگێـڕدا ئـەوا بـووە (فـارقلیط). جـا عیسـا (سەلامی لێ بێت) مژدەی دەدا بەهاتنی "فارقلیت" ڕۆحی ڕاستی لەدوای خـۆی، ئەمـەی خوارەوە ئەمە دووپات دەكاتەوە:**

**أ- هەنـدێ لـە نەصـرانیەكان لـە سـەدەكانی سـەرەتادا، هـەر یەكـەیان بانگەشـەی ئـەوەیان كـردووە كـە ئـەو "فارقلیـت" ڕۆحـی ڕاسـتییە، ئـەو ئـەو كەسـەیە پـەیمانی هـاتنی دراوە لەلایـەن عیسـا (سـەلامی لـێ بێـت)،هـەروەك (ولـیم میـور) ئەمـەی بـاس كردووە.**

**هـەر لەبـەر ئەمـە خـاوەنی كتـێبی (لُـبّ التـواريخ) وتويـەتی: ( جولەكـە و مەسیحییەكانی هاوچەرخی محمـد (ﷺ). چاوەڕێی ئـەو پێغەمبـەرەیان ئـەكرد كـە پـەیمانی هـاتنی لـەبارەوە درابـوو، ئـەم پلەوپایـە و سـوودە مەزنـە بەخشـرا بـە محمـد**

---

(١) شێخ (عبدالوهاب النجار) خاوەنی كتێبی (قصص الأنبياء) لە ڕۆژهەڵاتناسی ئیتاڵی (كارلو نلینو) پرسی دەربارەی وشەی (بیركلوطوس) كە لە ئینجیلدا هاتووە، ڕۆژهەڵاتناسی ناوبراو وەڵامی دایەوە: كە لە ڕاستیدا قەشەكان دەڵێن ئەو وشەیە بە واتای (سەربڵندكەر: معَزِي) دێت. عبدالوهاب پێی وت: من پرسیار لە د.كارلو نلینو كە خاوەنی دكتۆرایە لە ئادابی زمانی كۆنی یۆنانی دەكەم پرسیار لە قەشەیەك ناكەم، وتی: واتاكەی بریتیە لەوەی كە زۆر سوپاسی ئەكرێ، عبدالوهاب لێی پرسی: ئایا ئەمە كۆكە لەگەڵ كرداری بەچاكتردانان (تفضيل) كە لە وشەی سوپاس (حمد)ەوە دائەتاشرێ؟ وتی: بەڵێ. / الرسول - سعيد حوى ٢٨٧/٢.

(ﷺ)، چونکە ڕای گەیاند کە ئەو پێغەمبەرە چاوەڕوان کراوەکەیە).

کاتێـك نامـەی پێغەمبـەر (ﷺ) گەیشـتە دەسـتی نەجاشـی (کـە نەصـڕانی بـوو) وتـی: (خـوای گـەورە ئەکـەم بەشـایەتیدەر ئـەوە ئـەو پێغەمبەرەیـە کـە ئـەهلی کتـاب چاوەڕوانیان ئـەکرد) جا نەجاشـی لـە وەڵامـدا بـۆی نووسـی: (شـایەتی ئـەدەم کـە تـۆ پێغەمبەری خوای ڕاستگۆ و سەلمێنەری ڕاستگۆیی ئەوانی پێش خـۆتی، مـن پـەیمان و بەیعـەتم بـە تـۆ و کـوڕە مامەکـەت دەدەم- واتـە: جعفـری کـوڕی أبـو طالـب -، لەسـەر دەسـتی ئـەو "واتـە جعفـری کـوڕی أبـو طالـب[1]" ملکەچـی خـوای جیهـان بـووم و موسڵمان بووم).

بەهـەمان جـۆر لـە نامەکـەی (مقـوقس) پاشـای (قـبط)ەکانـدا ئەمـە بـەڕوونی هاتبوو، کاتێك وەڵامی نامەکەی پێغەمبەری (ﷺ) دایەوە کە بۆی ڕەوانەکرا بوو.

هـەروەها بەهـەمان شـێوە ئـەو وتـەی (جـارود)ی کـوڕی (عـلاء) - کـە یـەکێك لـە زاناکـانی نەصـڕانیەکان بـوو - کاتێـك لەگـەڵ هۆزەکـەی چـووە لای پێغەمبـەری خـوا (ﷺ)[2].

هیرقل گەورەی ڕۆم (هەروەك لە فەرموودەی بوخاریدا هاتووە: بـاب بـدء الـوحي) چاوەڕێی دەرکەوتنی پێغەمبەری دەکرد، بەهەمان شێوە زانـا نەصـڕانیەکان چاوەڕێی دەرکەوتنی پێغەمبەریان ئەکرد، هەروەك ئەمە بـەڕوونی لـە سەرگوزەشـتەی سـەلمانی فارسیدا (خوا لێی ڕازی بێت) هاتووە.

جـا نەجاشـی و مقـوقس و جـارود و هیرقـل لـە زانایـانی نەصـڕانیەکانن و جەختیشیان کردەوە لەسەر ئەوەی کە نەصڕانیەکان چاوەڕێی دەرکـەوتنی پێغەمبـەر دەکـەن، چـونکە وەسـفی لـە کتێبـەکانی ئەوانـدا وەك ئینجیـل و کتێبـەکانی تـر باسـی

---

(١) لێرەدا ڕاناوەکەم بۆ (جعفری کوڕەمامی پێغەمبەر (ﷺ)) گەڕاندەوە، چونکە ئەو لەوکاتدا لە لە وڵاتی حەبەشەدا بوو. ناوی (جعفر - ڕەزای خوای لێبێت -) خۆم زیادمکرد بۆ زیاتر ڕوون بوونەوەی دەقەکە. (وەرگێڕ).

(٢)إظهار الحق ٢٧٩/٢-٢٨١.

لێوەكراوە.

گشت ئەوانەی ناومان بردن هیچ كامیان نەترساون لە پێغەمبەری خوا (ﷺ)، چونكە ئەوان خاوەنی دەوڵەت و لەشكری بەهێز بوون، پێغەمبەریش (ﷺ) لە سەرەتای بانگەوازدابوو و خۆی و هاوەڵانی دەچەوسێنرانەوەو دەترسان لەوەی خەڵكی زەفەریان پێببەن.

ب- ئەم وتەیەی عیسا : (ئەگەر من نەڕۆم ئەوا "فارقلیت" ڕۆحی ڕاستی نایەت بۆتان) ئەمە ئاماژەو بەڵگەیە لەسەر ئەوەی كە هاتنی پێغەمبەر (ﷺ) بەندە بە ڕۆیشتنی عیسا (سەلامی لێ بێت).

پ- ئەو وتەیەی لە ئینجیلدا هاتووە كە: (سەركۆنەی دانیشتووانی جیهان دەكات) ئەمە وەك دەقێكی ڕۆشن وایە كە ئاماژە ئەكات بۆ پێغەمبەر (ﷺ)، چونكە پێغەمبەر (ﷺ) سەركۆنە و سەرزەنشتی جیهانی كرد، بەتایبەت سەركۆنەی جولەكەكانی كرد لەسەر ئەوەی باوەڕیان بە عیسا (ڕەزای خوای لێ بێت) نەهێناوە، (سەركۆنەیان دەكات لەسەر هەڵەكە، ئەو هەڵەیەش ئەوەیە كە باوەڕیان نەهێناوە بە عیسا).

ت- پێغەمبەر (ﷺ) لە خۆیەوە قسەی نەدەكردو هەڵنەدەبەست، بەڵكو قسە و هەواڵەكانی پێغەمبەر (ﷺ) سروش (وحی) بوون.

ج- هەروەك پێغەمبەر (ﷺ) ڕێزو حورمەتێكی زۆری گرتووە لە عیسا (سەلامی لێ بێت)، تەنانەت ئەمە شتێكی چەسپاوە بە دەقی قورئانی پیرۆز بەوەی پێغەمبەر (ﷺ) ڕێزو حورمەتێكی زۆری بۆ عیسا (سەلامی لێ بێت) داناوە بەشێوەیەكی تایبەت و بۆ پێغەمبەران (سەلامیان لێ بێت) بەشێوەیەكی گشتی، ئەمە شتێكی ئاشكراو زانراوە.

مژدەكانی كتێبە ئاسمانیەكان سەبارەت بە دەركەوتنی پێغەمبەر (ﷺ)گەلەك زۆرن.

تەفتازنی:

(لە "تلخيص المحصل"دا وتويەتی: نمونەی ئەم دەق و بەلگانە زۆر زۆرن لە كتێبەكانی پێغەمبەرانی پێشوودا، ئەو نووسەرانەی توێژینەوەو هەڵوەستە دەكەن لە سەر كتێبەكانیان ئەوا ئەمانە دەخەنەڕوو. هیچ دژڕایەك ناتوانێت ئەم جۆرە بەلگەو دەقانە پشتگوێ بخات یاخود بلێت ئاماژەیە بۆ پاشایەك یاخود پێغەمبەرێكی تر، تەنانەت ناشتوانێت بیشارێتەوە.

هەروەها "أبو حسين البصري" لەكتێبی "غرر الأدلة"دا بەلگەی وای كۆكردۆتەوە لە دەقەكانی "تورات"دا لەسەر ڕاستێتی پێغەمبەرایەتی محمد (ﷺ))[1].

**ئینجیلی (برنابا):**

سەبارەت بە ئینجیلی (برنابا)، ئەوا ناوبراو مژدەدات بە محمد (ﷺ)، هەروەك (د. خليل سعادة) كە وەریگێڕاوەتە سەر زمانی عەرەبی ئەمە دەڵێت:

(ئەو پێغەمبەرەی چاوەڕان كراوە "يوسع" نییە بەڵكو "محمد"ە، بێژەو دەربڕینی "محمد"ی بە ڕاشكاوی هێناوەو چەندین جار دووپاتیشی كردۆتەوە لەو بەشانەی كە پاشگری خراوەتە سەر، دەریشی بڕییوە كە محمد پێغەمبەری خوایە، كاتێكیش ئادەم لە بەهەشت دەركرا لەسەر دەرگاكەی بینی كە چەند دێرێك نووسراوە بە نوور: لا اله الا الله محمد رسول الله)[2].

هەروەها لە هەر دوو بەشی چل و سێیەم و چل و چوارەمدا وتەی زۆر هەن لەسەر مژدەدان بە هاتنی پێغەمبەر (ﷺ)، چونكە قوتابیەكانی عیسا (سەلامی لێ بێت) داوایان لێكرد كە بەڕاشكاوی ناوی ئەو پێغەمبەرەیان پێبلێت، بۆیە ئەویش بەڕاشكاوی باسی ئەو شتانەی كرد كە حەقیقەتی محمد و پلەوپایەكەی دەردەخات.

ئەگەرچی زۆربەی نەصرانیەكان ئەم ئینجیلەیان ڕەت كردەوە بەبێ پاساو، لەگەڵ ئەوەشدا بەلگەكان گەواهیدەرن و ڕاستێتی ئەم ئینجیلە پەسەند ئەكەن

(١) شرح المقاصد ٢/١٩٠.

(٢) مقدمة خليل سعادة لإنجيل برنابا ص: م.

هەروەك ئەمە ڕوون دەكەینەوە.

برنابـا لـە قەشـەكانی نەصـڕانیەكانە، نامـە هەڵگرێكـە لـە نامـە هـەڵگرەكانیان، هـەروەها بـە كـۆدەنگی نەصـڕانیەت نـاوبراو بنچـینەیەكە لـە بنچـینەكانی بانگەشـەی مەسـیحیەتی سـەرەتا، ئینجیلـی برنابـا دۆزرایـەوە بـەناوی برنابـا، ئەمـەش بەڵگەیـە لەسـەر ئـەوەی (برنابـا) یـەكێك بـووە لـە هـاودەم و هاوڕێكـانی عیسـا لـە خۆشـی و ناخۆشیدا. كەچی ئینجیلەكانی تـر بـە هـی حەوارییـەكان دانـانرێن، بـەڵكو لـە دەسـت نـووس و دانـانی ئـەو نامەگەیەنـەر و پەیامبەرانەیـە كـە لـە دوای عیسـا لـە جێگـەی حەوارییەكان مەسیحیەت ڕادەگەیەنن[1].

جـا ئینجیلـی برنابـا چـەند خـاڵ و شـتێكی جەوهـەری و پڕبایـەخ دەسـەلمێنێت و دانی پێدا دەنێت كە بەمەش جیـا دەكرێتـەوە لـە چـوار ئینجیلـە بەناوبانگەكانی تـر، ئەم خاڵە جەوهەرییانەش بریتین لە:

أ- ئەم وتەیەی عیسا كە تیایدا هاتووە: یوسـع (واتـە: عیسایە[2]) نكـۆڵی كـردووەو ڕەتی كردۆتەوە كە ئەو خوا و كوڕی خواش بێت، ئەم نكۆڵییەشـی كـردووە بەبەرچـاو و بەبیسـتنی شـەش سـەد هـەزار سـەربازو دانیشـتوانی جولەكـە بـە ئـافرەت و پیـاو منداڵـەوە (واتـە، لـە ئینجیلـی بـەرنابادا ئـەوە هـاتووە كـە عیسـا نكـۆڵی كـردووە لـە بیروباوەڕی سێكوچكەیی "تثلیث").

ب- ئـەو كـوڕەی كـە ئیـبڕاهیم سـور بـوو لەسـەر ئـەوەی بیكاتـە قوربـانی بـۆ خـوا، بریتیە لە ئیسماعیل نەوەك ئیسحاق، لەبـەر ئـەوەی لـە ڕاسـتیدا كـاتی سـەر بڕینەكـە هی ئیسماعیل بوو.

پ- ئەو پێغەمبەرەی چاوەڕان كراوە (یوسع) نییە بـەڵكو (محمـد)ە، نـاوی محمـدی هێناوە بە دەربڕینی ڕاشـكاو و چـەندین جار دووپـاتی كردۆتـەوە ... (كـەمێك پێشـتر ئەم دەقەمان خستەڕوو).

(١) محاضرات في النصرانية - الشيخ محمد أبي زهرة ٥٧.

(٢) وەرگێڕ.

ت- عیسا (سەلامی لێ بێت) لە خاچ نەدراوە بەڵكو بەرز كراوەتەوە بۆ ئاسمان، ئەوەی كە لە خاچ دراوە (یهوذا)ی ناپاك بووە، كە لێیان تێكچووەو هێنراوەتە سەر شێوەی عیسا، ئەم دەقە كۆكە لەگەڵ دەقی قورئان: ﴿ وَمَا قَتَلُوهُ وَمَا صَلَبُوهُ وَلَكِن شُبِّهَ لَهُمْ ﴾[(١)] النساء: ١٥٧. واتە: (نەكوشتوویانە و نە لەقەنارەو خاچیان داوە، بەڵكو لێیان تێكچووەو "كەسێكی تریان كوشتووە لە بڕی ئەو").

## مێژووی ئینجیلی (برنابا):

پاپا (جیلاسیوس) - پلەی پاپایەتی لە ساڵێ ٤٩٢ز وەرگرت - واتە پێش لە دایك بوونی پێغەمبەر محمد (ﷺ) فەرمانێكی دەركرد بەوەی خوێندنەوەی چەند كتێبێكی قەدەغە كرد، یەكێك لەو كتێبانە ناوی (ئینجیلی برنابا) بوو[(٢)].

دوو دانە لەو ئینجیلە دۆزرانەوە، یەكێكیان بە زمانی ئیتاڵی و ئەویتریان بە زمانی ئیسپانی بوو.

دانە ئیسپانیەكە: (د. هلم) وەریگرت لە شارۆچكەی (هدلی) سەربەر (همبشیر)، پاشان ڕۆژهەڵاتناس (سایل) دەستی خست، دوای (سایل) ئەوا (د.منكهوس) ئەندامی كۆلیژی ئۆكسفۆردی پاشایەتی وەریگرت و وەریگێڕا بۆ سەر زمانی ئینگلیزی، پاشان دانە ئەصڵەكە هاوڕێ لە گەڵ وەرگێڕدراوەكە لەساڵی ١٧٨٤ دا دەستی (د. هویت)، لە دوای شوێنەوارەكانی ئەم ئینجیلە وون بوو و نەما.

هەروەها دانە ئیتاڵیەكە:

یەكەم كەس كە دۆزیەوە (كریمر)ی ڕاوێژكاری پاشای بروسیا بوو، كە ئەو كات لە شاری (أمستردام) دائەنیشت، جا ساڵی ١٧٠٩ لە كتێبخانەی یەكێك لە كەسە

---

(١) مقدمة الدكتور خليل سعادة ص : م. و محاضرات في النصرانية ٦٢-٦٤.

(٢) مقدمة الدكتور خليل سعادة لانجيل برنابا ص : ل. و مقدمة محمد رشيد رضا لانجيل برنابا ص : ر.

بەناوبانگ و ناودارەکانی شاری ناوبراو (کریمر طولند) ئەو دانەیەی بە قەرز وەرگرت، دوای چوار ساڵ بە دیاری پێشکەشی (برنس أیوجین سافوی) کرد، پاشان ئەو دانەیەی ناوبراو لە ساڵی ١٧٣٨ لەگەڵ سەرجەم کتێبەکانی (برنس) گوێزرانەوە بۆ کتێبخانەی کۆشکی پادشایەتی لە ڤیەننا، تا ئێستاش هەر لەوێیە.

(سایل) باسی ئەوە دەکات لە دانە ئیسپانییە ونبوەکەدا نووسراوە: کە پیت بەپیت وەرگێڕدراوە لە ئیتاڵیەوە بۆ ئیسپانی، هەروەها پێشکیەکیشی بۆ نووسراوە لەسەر ئەوەی کە ڕاهبەکە چۆن دانە ئیتاڵیەکەی دۆزیوەتەوە، بەسەرهاتەکەشی بەم شێوەیە:

ڕاهیبی لاتینی (فرامرینو) چەند نامەیەکی (ئیرینایوس)ی دۆزییوە، لەناو ئەم نامانەدا چەند نامەیەك هەبوون کە توانجیان لە قەشە (بولسی پەیامبەر) دەدا، جا (ئیرینایوس) ئەم توانج لێدانەی ئەگەڕاندەوە بۆ ئینجیلی قەشە (برنابا)، بەم هۆیە ڕاهیب (فرامرینو) وێڵ بوو بەگەڕان بەدوای دۆزینەوەی ئینجیلی (برنابا)، جا وا ڕێکەوت کە ببێتە کەسێکی نزیك لە (سکتسی پاپای پێنجەم). ڕۆژێك بەیەکەوە چوونە ناو کتێبخانەی پاپا، جا پاپا خەوێکی سوکی بەسەرداهات، بەمەش (فرامرینو) پێی خۆشبوو کاتەکە بە خوێندنەوە بەسەر ببات تا ئەو کاتەی پاپا وشیار ئەبێتەوە لە خەو، یەکەم کتێب کە دەستی لە سەردا (ئینجیلی برنابا) بوو، بەمەش زۆر دڵ خۆش بوو، ئینجیلی ناوبراوی لەبن یەکێك لە باڵەکانی شاردەوەو چاوەڕێی کرد تا پاشا لە خەوەکەی هەڵسا، جا کە خەبەری بووەوە ئەوا (فرامرینو) داوای ڕێگە پێدانی لێ کرد و ڕۆیشت، زۆر بەجوانی ئینجیلەکەی خوێندەوە بە عیشقێکی زۆر زۆر، دوای ئەمە موسڵمان بوو بەهۆی کاریگەری ئەو ئینجیلە[(١)].

ئەو شتانەی دروستی و ڕاستی ئینجیلی برنابا دەسەلمێنن سەرباری ئەوەی کە هەندێ لە زاناکانی ئەوروپا نکوڵی لێ دەکەن، ئەمانەن!:

أ- دانە ئینجیلەکەی برنابا لە کەش و هەوایەکی پوختی مەسیحی دۆزرایەوە،

---

(١) مقدمة الدكتور خليل لانجيل برنابا ص: د، هـ.

تەنانـەت لـە کۆگـای سـەرۆکێکی ترسـناکی ئـایینی (پاپـا) دۆزراوەتـەوە کـە ڕاهیبەکـە ئاشـکرای کـرد، دواتـر گوازراوەتـەوە بـۆ ڕاوێـژکارێکی مەسـیحی لـە ڕاوێـژکارەکانی پاشادی بڕوسیا، دواتر بۆ کۆشکی پادشایەتی لە ڤیەننا، کـە دەسـتی هـیچ موسـڵمانێکی پێنەگەیشتووە.

ب- نـە لـە ڕابـردوو نـە لـە ئێسـتادا، زانایـانی موسـڵمان نەیانخوێندۆتـەوە، چـونکە مێژگەردەکان لە نێوان زانایانی موسڵمان و نـەصرانیەکان، لە ڕۆژهـەڵات و ئەنـدەلوس، لە هەموو سەردەمێکدا هەر هەبووە، ئەمەش بەسـە کـە (ابـن حـزم) و (ابـن تیمیـە)ی دانیشـتوانی ڕۆژهـەڵات و نیشـتەجێی شـام کـە لـەوبارەوە نووسـیویانە لـە بەرپەرچـی نەصرانیەکان کە چەندین کتێب و لێکۆڵینەوە لەخۆ دەگرێت.

هـیچ یـەکێك لـەو زانایانـەمان نـەبینی باسـی ئینجیلـی برنابـا بکـەن، سـەرباری ئەوەی کە بەڵگـەی سـەرکوت کـەری نەصـرانیەکانی تێدایـە، هـەروەك (د. مرجلیـوپ) لێـی کۆڵیوەتـەوە، بـەوەی لـە لێکۆڵینەوەکەیـدا ئـەوەی سـەلماندووە کـە کتێبـەکانی موسڵمانان باسی ئەو ئینجیلەیان نەکردووە[1].

پ- زۆربەی ئەو دەروازانـەی کـە ئینجیلـی برنابـای لـێ پێکهاتووە، شـتێك نـەبووە لــەلای موســڵمانان ناســراو بێــت، شــێوازەکانی ئینجیلــی نــاوبراو زۆر دوورن لــە شــێوازەکانی گشــتی موســڵمانان و عەرەبــەکان بەتایبــەتی - هــەروەك هەنــدێ لــە قەشەکان ئەمەیان لە گۆڤاری ئایینی ڕوون کـردەوە -، بۆیـە نـاکرێ بوترێـت ئینجیلـی ناوبراو دەستکردی موسڵمانانە، هەروەك هەندێ ئەو بانگەشەیەیان کرد.

موسڵمان کە ناوی خوای گەورە دەهێنێت، ئەوا ڕاستەوخۆ ستایشی دەکات، ئەگـەر نـاوی پێغەمبـەرانی هێنـا صـڵاواتیان لەسـەر لـێ ئـەدات، تـەنها بـەو ناوانـە نـاو لـە فریشـتەکان ئـەنێت کـە قورئـانی پـیرۆز یـاخود سـوننەتی بـەڕێز هێناویـەتی، بۆیـە موسـڵمان لـە جیـاتی (میکایـل) ناڵێـت (میخایـل)، تەنانـەت نـاوی "ئیسـڕافیل"لە بـیر ناکات و ناویشی نانێت (أوریل)، ناڵێت (الله سبحان) چونکە هەموو موسـڵمانێك وشـەی

---

(١) مقدمة محمد رشيد رضا ص : ت ومحاضرات في النصرانية ٦١.

(سبحان الله)ی لەبەرە، چونكە لە زیكرەكانی ئایینە. تەنانەت ئەگەر ئینجیلی ناوبراو لە دەستكردی موسڵمانان بوایە ئەوا هەرگیز بەشەكانی ناوی (سور)یان لێ نەدەنرا، چونكە موسڵمان چ عەرەب چ غەیری عەرەب، وشەی (سورة) بۆ غەیری سورەتەكانی قورئانی پیرۆز بەكار ناهێنێت[1].

ت- بەڵگەی زۆر بەهێزی تێدان و ڕێبازی ڕوون و بیركردنەوەیەكی بەرزی تێدا گەڵاڵە بووە، لایەنە شاراوەكانی ژیانی پێغەمبەر عیسای (سەلامی خوای لێ بێت) ڕوون كردۆتەوە، هەروەها وێكچوونێكی زۆر هەیە لە نێوان هەندێ لە پارچە نووسینەكانی ئەم ئینجیلە و ئینجیلەكانی تر[2].

ج- ئەگەر خرانەپاڵ و ڕەچەڵەكی ئەم ئینجیلە ڕاست و دروست نەبوایە ئەوا ڕاهیب (فرامرینو) كە دۆزیەوە قەناعەتی بۆ دروست نەدەبوو، بەم هۆیەوە موسڵمان بوونی خۆی ڕابگەینێت.

**نمونەی ئەو موژدانەی كە ڕاشكاوانە ئاماژە دەدەن بەناوی محمد (ﷺ):**

ئەوەی هەندێ لە لێكۆڵەران نكۆڵیان لێكردووە،ئەوەیە كە ئینجیلی (برنابا) بەڕاشكاوانە ناوی پێغەمبەر (محمد (ﷺ))ی هێناوە، بۆیە هەندێ لەو لێكۆڵەرانە وتیان: نابێت ئەم كتێبانە پێش دەركەوتنی ئیسلام هەبووبن.

لەبەر ئەوەی وا باوبووە كە مژدە دەدرا ئەوا بەشێوەی ئاماژەو نیشانە و نازناو دەبوو.

بەڵام لە ڕاستیدا وانیە، چونكە دەكرێت مژدە بە نیشانەو ئاماژە و نازناو بێت هەروەك لایەنێكمان لەوبارەوە خستەڕوو كە وەرمان گرتبوو لە كتێبەكانی (زبور) و (تورات) و (انجیل).

هەروەها دەشكرێت كە مژدەكە ڕاشكاو بێت، هەروەك لە ئینجیلی (برنابا) و لە دانەی لەبەرگیراوی ئینجیل بە پێنووسی (حمیری)دا هاتووە، شێخ (محمد بیرم) لە

---

(١) مقدمة السيد محمد رشيد رضا لانجيل برنابا ص : ش ، ت.

(٢) الرسول - سعيد حوى ٢/٢٨٠.

كەسێكی ئینگلیزی گەڕۆكەوە وەریگرتووە، كە لە كتێبخانەی پاپاوە (بابویة)دا لە (ڤاتیكان) دانەیەكی لە ئینجیلی نووسراو پێش هاتنی پێغەمبەر (ﷺ)بە پێنووسی (حمیری) بینیویەتی، كە عیسا (سەلامی لێ بێت) فەرموویەتی: ﴿ وَمُبَشِّرًا بِرَسُولٍ يَأْتِي مِنْ بَعْدِي اسْمُهُ أَحْمَدُ ﴾ الصف: ٦. واتە: (هەروەها مژدەدەریشم بە پێغەمبەرێك كە دوای من دێت و ناوی ئەحمەدە). ئەمەش پیت بە پیت كۆكە لەگەڵ دەقی قورئانی پیرۆز.

بەڵام لە هیچ موسڵمانێكەوە نەهاتووە كە شتێكی لەو شێوەیەی بینیبێت لەو ئینجیلانەدا بەوەی مژدەی ڕاشكاوانەی تێدا هاتبێت، بەمەش ئەوە بەدەر دەكەوێت كە لە كتێبخانەی (ڤاتیكان)دا پاشماوەی ئەو ئینجیل و كتێبانە ماون كە قەدەغە كرابوون لە سەدەكانی سەرەتا، چونكە ئەگەر ئەو ئینجیلانە دەربكەوتنایە ئەوا هەموو ئەو گومانانە ئەڕەوینەوە كە لە دەوری ئینجیلی (برنابا) و ئینجیلەكانی تردا هەیە[1].

هەروەها زۆر مژدەی تر هەن لە (زبور) و (تورات) و (انجیل) كە باس لە دەركەوتن و هاتنی پێغەمبەرێك دەكات دوای عیسا (سەلامی خوای لێ بێت) ئەویش محمدە (ﷺ)، ئێستاش نایانخەینەڕوو لەبەر درێژبوونەوەی بابەتەكە.

ئەو كەسەش دەیەوێت زیاتر بەدواداچوون بكات ئەوا حەواڵەی دەكەین بۆ كتێبی بەهێز (اظهار الحق) دانراوی (رحمة الله بن خليل الرحمن الهندي) كە لەو كتێبەدا باسی مشتومڕی نەصرانیەكان كراوە لەبارەی پێنج بابەت، كە خولگەی مشتومڕن لەنێوان موسڵمانان و نەصرانیەكان، بریتین لەمانە:

١- سەلماندنی ئەوەی كە تورات و ئینجیل دەستكاری كراون.

٢- هەڵوەشاندنەوە (النسخ).

٣- پوچەڵی بیروباوەڕی سێكوچكەیی (تثليث).

٤- قورئانی پیرۆز فەرمایشتی خوایە، بەشێوەی موتەواترو گومان هەڵنەگر

---

(١) مقدمة محمد رشيد رضا لإنجيل برنابا ص: ت.

پێمان گەیشتووە.

٥- پێغەمبەرایەتی محمد (ﷺ) و سەلماندنی ئەوەی کە دوایین و کۆتا پێغەمبەرە.

لە کاتی خوێندنەوەی کتێبی ناوبراودا دەردەکەوێت، کە دانەر گشت دەقەکانی تورات و ئینجیل (عهد القديم و الجديد)ی لەبەردەست بووەو زانیاری لەسەر هەبووەو بەشێوەیەکی تۆکمەو ڕێك و پێك توێژینەوەی لەسەر هەر دووکیان کردووە بە لێکدانەوەو ڕوونکردنەکانیانەوە، ئەمەش وای کردووە کە هەڵوەستە بکات لەسەر زۆرێك لە شتە لاوەکی و بچوکەکان.

هەروەها هۆکاری نووسینی ئەم کتێبەش: ئەوەبووە کە کاتێك بەریتانیا هیندی داگیر کرد، ئەوا بانگخوازەکانی نەصرانی (مبشری النصاری) زۆر بەتووندی هێرشیان کردە سەر ئیسلام و کتێب و پەیامیان دانا و جەختیشیان دەکردەوە لەسەر ئەو پێنج خاڵانەی سەرەوە، بەمەش زانا پایەبەرزەکانی موسڵمانان ڕووبەڕووی ئەو هێرشانە بوونەوەو دژی وەستان. و لە کۆتاییدا مێزگەردێك بەسترا لە نێوان (فندو)ی قەشە کە بەتواناترین و بەهێزترین بانگخوازی نەصرانیەت بوو و توانای قسەکردنی بە عەرەبی و فارسیشی هەبوو و دانەری (رحمة الله بن خليل)، لەم مێزگەردەدا گەورە پیاوانی هیند لە دادوەرو موفتی و گەورە پیاوە ئایینیە ئینگلیزییەکان ئامادەیبوون، ئەم مێزگەردە بەسترا لە شارۆچکەی (أكبر آباد) لە مانگی ڕەجەب ساڵی ١٢٧٠ك.

جا قەشەیەکی تر بەناوی (فرنج) یارمەتی قەشە (فندو)ی دەدا.

هەروەها بەڕێز محمد وزیرخان یارمەتی شێخ (رحمة الله)ی دەدا.

مێزگەردەکە لە بابەتی دەستکاری و هەڵوەشانەوە (النسخ والتحريف) دەستی پێکرد، شێخ (رحمة الله) سەرکەوت، قەشە (فندو) و هاوەڵەکەی سەرشۆڕ بوون و پاشەکشەیان کرد، هەروەها بەڵگەکانی هەر دوولا نووسرانەوە بەڵام مێزگەردەکە تەواو نەبوو.

دواتر شێخ (رحمة الله) بەڕێکەوت بۆ مەککە بەمەبەستی حەج کردن، لەوێ چاوی بە بەڕێز (أحمد زيني دحلان) کەوت و هەواڵی مێزگەردەکەی پێدا، بەمەش

بەڕێز (أحمد زینی) داوای لێكرد كه كتێبەكەی بە هەر پێنج بەشیەوە وەربگێڕێتە سەرزمانی عەرەبی.

ئینجا لەو كاتەدا شێخ (رحمةالله) ئەم كتێبە (إظهار الحق)ی نووسی، بەشی شەشەمیشی بۆ زیادكرد كه تورات و ئینجیلیش (عهد القدیم و عهد الجدید) لەخۆ دەگرێت.

لێرەدا چەندین كتێبی بەڕێزو بەهێزی تر هەن كە باس لەو مژدانە و جگە لەوانەش گفتوگۆ و دەمەتەقێ دەكەن لەگەڵ نەصرانیەكان لەبارەی بیروباوەڕەكانیان، گرنگترین ئەم كتێبانە:

١- الجواب الصحیح لمن بدل دین المسیح، ابن تیمیة.

٢- هدایة الحیارى من الیهود و النصارى، ابن قیم الجوزیة.

٣- الأجوبة الفاخرة عن الأسئلة الفاجرة، القرافي.

٤- الفارق بین المخلوق و الخالق، عبدالرحمن بك باچه چی زاده.

٥- أعلام النبوة، الماوردي.

٦- حجة الله على العالمین في معجزات سید، النبهاني.

# باسی دووەم
# پەیامەكەی پێغەمبەر (ﷺ)و بنەماكانی بانگەوازەكەی تەواوكەرو كۆتایی شەریعەتەكانە

## كۆتایی هاتنی پێغەمبەرایەتی

**كۆتا پێغەمبەر محمده (ﷺ)، كە دوایین پێغەمبەرو پەیامبەرە، بە بەڵگەی:**

**أ- ئەم فەرمایشتەی خوای گەورە:** ﴿ مَّا كَانَ مُحَمَّدٌ أَبَآ أَحَدٍ مِّن رِّجَالِكُمْ وَلَٰكِن رَّسُولَ ٱللَّهِ وَخَاتَمَ ٱلنَّبِيِّـۧنَ ﴾ الأحزاب: ٤٠. **واتە: (محمد باوكی هیچ یەكێك لە پیاوانی ئێوە نەبووە، بەڵام نێردراو و دوا پێغەمبەری خوایە).**

**ب- ئەو فەرمایشتەی پێغەمبەر (ﷺ) كە لە (بخاری)[1] و (مسلم)دا هاتووە، بێژەكەی هی (مسلم)ە:**

**((مَثَلي و مَثَلُ الأنبياء من قبلي، كمَثَل رجل بنى بنياناً فأحسنه وأجمله، اِلا موضع لبنة من زاوية من زواياه، فجعل الناس يطوفون به، ويعجبون له، ويقولون: هلا وضعت هذه اللِبنة؟ قال: فأنا اللِبنة، وأنا خاتم النبيين)) واتە: (نموونەی من و پێغەمبەرانی پێش من وەك نموونەی پیاوێك وەهایە كە بینایەكی دروست كردووەو زۆر چاك و جوانی كردووە، تەنها جێگای یەك خشت نەبێت، لە سوچێك لە سوچەكانیدا، خەڵك بەدەوریدا دەگەڕێن و سەرسام دەبن و دەڵێن: ئەی ئەم خشتە بۆچی دانەنراوە؟**

---

(١) البخاري - كتاب المناقب - باب خاتم النبيين ٤/٢٢٥.
ومسلم كتاب الفضائل - باب ذكر كونه (ﷺ) خاتم النبيين ٤/١٧٩١.

﴿ وَذُوقُواْ عَذَابَ ٱلْخُلْدِ بِمَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ ﴾ السجدة: ١٤. واتە: (بچێژن ئێش و سزای نەبڕاوە، لە سەرئەنجامی کارو کردەوەیەك کە دەتانکرد).

﴿ ٱلنَّارُ مَثْوَىٰكُمْ خَٰلِدِينَ فِيهَآ إِلَّا مَا شَآءَ ٱللَّهُ ﴾ الأنعام: ١٢٨. واتە: (ئەم ئاگرە جێگەتانە نەمرن تیادا، مەگەر خوا ویستی لەسەر بێت).

﴿ لَّٰبِثِينَ فِيهَآ أَحْقَابًا ﴿٢٣﴾ ﴾ النبأ: ٢٣.[1] واتە: (هەزارەها ساڵی دوورو درێژو نەبڕاوەی تێدا دەبەنەسەر).

ڕاڤەکارانی قورئان وتویانە، مەبەست لە مانەوەی هەتا هەتایی لە ئاگری دۆزەخدا: بە نیسبەت موسڵمانان و بڕواداران بریتیە لە مانەوە لە ئاگری دۆزەخدا بۆ ماوەیەکی درێژ. هەروەها بەنیسبەت بێ باوەڕان و دووڕوان بریتیە لە مانەوەی هەتا هەتایی. وتەی تریش لەمبارەوە کراوە.

## ٤٢- هەندێك لە دۆزەخیەکان نەفرەت لە هەندێکی تریان دەکەن و تۆمەتباریان دەکەن بەوەی هۆکاری چوونە دۆزەخی ئەوان بوونە، بۆیە لە خوای گەورە دەپاڕێنەوە کە دوو بەرامبەر سزای گومڕاکەرانیان بدات:

خوای پایەبەرز دەفەرموویت: ﴿كُلَّمَا دَخَلَتْ أُمَّةٌ لَّعَنَتْ أُخْتَهَا ۖ حَتَّىٰٓ إِذَا ٱدَّارَكُواْ فِيهَا جَمِيعًا قَالَتْ أُخْرَىٰهُمْ لِأُولَىٰهُمْ رَبَّنَا هَٰٓؤُلَآءِ أَضَلُّونَا فَـَٔاتِهِمْ عَذَابًا ضِعْفًا مِّنَ ٱلنَّارِ ۖ قَالَ لِكُلٍّ ضِعْفٌ وَلَٰكِن لَّا تَعْلَمُونَ ﴿٣٨﴾ وَقَالَتْ أُولَىٰهُمْ لِأُخْرَىٰهُمْ فَمَا كَانَ لَكُمْ عَلَيْنَا مِن فَضْلٍ فَذُوقُواْ ٱلْعَذَابَ بِمَا كُنتُمْ تَكْسِبُونَ ﴿٣٩﴾ ﴾ الأعراف: ٣٨ - ٣٩. واتە: (هەر کاتێك هەر کۆمەڵ و دەستەیەك دەچنە ناوی نەفرین دەکەن لە هاوئاین و هاوبیرانیان، هەتا ئەو کاتەی هەموویان کۆ دەکرێنەوەو بەسەریەکدا دەدرێن لە ناویدا، شوێنکەوتەکان ڕوو بەگەورەکانیان دەڵێن: پەروەردگارا ئا ئەوانە ئێمەیان گومڕا کرد، دە تۆش لە ناو دۆزەخدا سزای

(١) سەیری ئەم ئایەتانەش بکە کە هەمان ئەو واتایەیە: التوبة ٦٣، النساء ١٤ و ٩٣، فصلت ٢٨، الأنبياء ٩٩.

دوو بەرامبەریان بدە!! "خوای گەورەش دەفەرموویت": بۆ هەموو لایەك "سزاو تۆڵە" دوو بەرامبەرە بەڵام ئێوە پێی نازانن. "پاشان" دەستە پێشوەكان بە دواییینەكان دەڵێن: وەنەبێت ئێوە هیچ ڕێزو فەزڵێكتان هەبێت بەسەر ئێمەدا، دە ئێوەش بچێژن سزاو ئازار بەهۆی ئەو كارو كردەوە نالەبارانەوە كە ئەنجامتان دەدا).

﴿ وَإِذْ يَتَحَآجُّونَ فِى ٱلنَّارِ فَيَقُولُ ٱلضُّعَفَـٰٓؤُاْ لِلَّذِينَ ٱسْتَكْبَرُوٓاْ إِنَّا كُنَّا لَكُمْ تَبَعًا فَهَلْ أَنتُم مُّغْنُونَ عَنَّا نَصِيبًا مِّنَ ٱلنَّارِ ﴿٤٧﴾ ﴾ غافر: ٤٧. واتە: (ئەوكاتە ئیتر شەڕو كێشە دەست پێدەكەن لەناو ئاگری دۆزەخدا، لاوازو چەوساوەكان بە دەسەڵاتدارو لووت بەرزەكان دەڵێن: خۆ بەڕاستی ئێمە شوێنكەوتەی ئێوە بووین، ئایا ئێوە ناتوانن تۆزێك سزای ئاگرمان لەسەر كەم بكەنەوە؟).

﴿ إِذْ تَبَرَّأَ ٱلَّذِينَ ٱتُّبِعُواْ مِنَ ٱلَّذِينَ ٱتَّبَعُواْ وَرَأَوُاْ ٱلْعَذَابَ وَتَقَطَّعَتْ بِهِمُ ٱلْأَسْبَابُ ﴿١٦٦﴾ ﴾ البقرة: ١٦٦. واتە: (لەو كاتەدا سزای ڕۆژی دوایی دەبینن، ئەوانەی كە خەڵكی شوێنیان كەوتبوون خۆیان بەری دەكەن و لە شوێنكەوتەكانیان حاشا دەكەن، بەتایبەت كاتێك ئەو سزا توندو تیژە دەبینن، هەموو پەیوەندییەكیان دەپچڕێت كە لە نێوانیاندا هەبوو و هیچ بەڵگە و بیانویەكیان بەدەستەوە نامێنێت كە خۆیانی پێ ڕزگار بكەن).

## ٤٣- بەهەشتیەكان بانگی دۆزەخییەكان دەكەن و پێیان دەڵێن ئەو بەڵێنەی پەروەردگارمان بە ئێمەی دابوو دەستمانكەوت، ئایا بەڕاستی ئەو بەڵێنەی كە پەروەردگارتان بە ئێوەی دابوو دەستتان كەوت؟:

خوای مەزن دەفەرموویت: ﴿ وَنَادَىٰٓ أَصْحَـٰبُ ٱلْجَنَّةِ أَصْحَـٰبَ ٱلنَّارِ أَن قَدْ وَجَدْنَا مَا وَعَدَنَا رَبُّنَا حَقًّا فَهَلْ وَجَدتُّم مَّا وَعَدَ رَبُّكُمْ حَقًّا ۖ قَالُواْ نَعَمْ ۚ فَأَذَّنَ مُؤَذِّنٌۢ بَيْنَهُمْ أَن لَّعْنَةُ ٱللَّهِ عَلَى ٱلظَّـٰلِمِينَ ﴿٤٤﴾ ٱلَّذِينَ يَصُدُّونَ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ وَيَبْغُونَهَا عِوَجًا وَهُم بِٱلْـَٔاخِرَةِ كَـٰفِرُونَ ﴿٤٥﴾ ﴾ الأعراف: ٤٤ - ٤٥. واتە: ("پاشان" نیشتەجێیانی بەهەشت بانگی نیشتەجێكانی دۆزەخیان كرد: بەڕاستی

ئەو بەڵێنەی کە پەروەردگارمان پێی دابووین دەستمانکەوت و پێی بەخشین، ئایا ئێوەش ئەو بەڵێنەی کە پەروەردگارتان دابووی بەڕاستی دەستانکەوت؟! "لەوەڵامدا بەدڵ شکاوی و غەم و پەژارەیەکی زۆرەوە" وتیان: بەڵێ... ئەوسا جارچییەك جاریدا لە نێوانیاندا و هاواری کرد: نەفرەتی خوا لە ستەمکاران بێت. ئەوانەی کە بەنەرمە بڕی بەرهەڵستی ڕێبازی خوا دەکەن و کۆسپ و تەگەرە دەخەنە سەر ڕێگە و ڕێبازی خۆیان، لە کاتێکدا هەمیشە ئەوان بێ بڕوان بە زیندوو بوونەوەو لێپرسینەوە).

# بەهەشت

## بەهەشتییەكان:

خـوای گـەورە بەهەشـتی ئامـادەكردووە بـۆ ئەوانـەی باوەڕیـان هێنـاوە بـەخواو پێغەمبەرەكـەی و پەیامەكـەی كـە ئیسلامە. جا قورئـانی پیرۆز بەچـەند وەسـفێك وەسفی بەهەشتیەكانی كردووە، كە بریتین لە:

### ١- پارێزگاران و لە خواترسان (المتقون):

خـوای گـەورە دەفـەرموویت:﴿ لِلَّذِينَ ٱتَّقَوۡاْ عِندَ رَبِّهِمۡ جَنَّٰتٌ ﴾ آل عمـران: ١٥. واتـە: (بۆ ئەوانەی پارێزكارو خواناسن، لای پەروەردگاریان باخەكانی بەهەشت ئامادەیە).

﴿ وَلَنِعۡمَ دَارُ ٱلۡمُتَّقِينَ ﴿٣٠﴾ جَنَّٰتُ عَدۡنٍ يَدۡخُلُونَهَا تَجۡرِي مِن تَحۡتِهَا ٱلۡأَنۡهَٰرُۖ لَهُمۡ فِيهَا مَا يَشَآءُونَۚ كَذَٰلِكَ يَجۡزِي ٱللَّهُ ٱلۡمُتَّقِينَ ﴿٣١﴾ ﴾ النحل: ٣٠ - ٣١. واتە: (ئای كە چەندە جێگە و ڕێگە و كۆشك و تەلاری خواناس و پارێزكاران سازگارو خۆش و جوان و ڕازاوەیە. "ئەو جێگە و ڕێگەیە" باخەكانی بەهەشتی عەدنە كە بەختەوەران دەچنە ناوی، چەندەها ڕووبار بەبەردەم كۆشكەكان و بەژێر درەختەكانیدا جاری و ڕەوانە، هەرچیەك بخوازن و هەرچی ئارەزوو بكەن و هەرچی داوا بكەن، بۆیان ئامادەیە تیایدا، ئا بەوشێوەیە خوای میهرەبان پاداشتی خواناس و پارێزكاران دەداتەوە).

﴿ جَنَّةُ ٱلۡخُلۡدِ ٱلَّتِي وُعِدَ ٱلۡمُتَّقُونَۚ كَانَتۡ لَهُمۡ جَزَآءٗ وَمَصِيرٗا ﴾ الفرقـان: ١٥. واتـە: (بەهەشـتی هەمیشـەیی بـەردەوام كـە بـەڵێن دراوە بـەخواناس و پارێزكـاران، هـەر دەمێكیشە ئامادەكراوە بۆیان، كە پاداشتە و سەرەنجام).

﴿ إِنَّ لِلۡمُتَّقِينَ عِندَ رَبِّهِمۡ جَنَّٰتِ ٱلنَّعِيمِ ﴿٣٤﴾ ﴾ القلـم: ٣٤.[1] واتـە: (بەڕاسـتی بـۆ خوانـاس و پارێزكاران باخەكانی بەهەشتی پڕ لە نازو نیعمەت لەلای پەروەردگاریان ئامادەیە).

---

(١) سەیری ئەمانە بكە: آل عمران ١٣٣ و ١٩٨، الذاریات ١٥، الرعد ٣٥، الشعراء ٩٠، الزمر ٢٠ و ٧٣، الدخان ٥١ - ٥٢، محمد ١٥، الطور ١٧، الحجر ٤٥، المرسلات ٤١، النبأ ٣١.

## ٢- چاکەکاران (الأبرار):

خــوای پایەبــەرز دەفــەرموویت: ﴿ إِنَّ ٱلۡأَبۡرَارَ يَشۡرَبُونَ مِن كَأۡسٖ كَانَ مِزَاجُهَا كَافُورًا ﴿٥﴾ ﴾ الـدهر: ٥. واتــە: (بێگومــان چــاکان و پاکــانیش لــە پــەرداخێکی پــڕ شەڕابدا دەخۆنەوە، کە ئاوێتەکەی لە سەرچاوەی کافوورەوەیە).

﴿ لَٰكِنِ ٱلَّذِينَ ٱتَّقَوۡاْ رَبَّهُمۡ لَهُمۡ جَنَّٰتٞ تَجۡرِي مِن تَحۡتِهَا ٱلۡأَنۡهَٰرُ خَٰلِدِينَ فِيهَا نُزُلٗا مِّنۡ عِندِ ٱللَّهِۗ وَمَا عِندَ ٱللَّهِ خَيۡرٞ لِّلۡأَبۡرَارِ ﴿١٩٨﴾ ﴾ آل عمــران: ١٩٨. واتـــە: (باخـــەکانی بـــەهەشت کـــە چـەندەها ڕووبـار بـەژێر درەختەکانیـداو بەبـەردەم کۆشـکەکانیدا دەڕوات، هـاوڕێ لەگـەڵ ژیـانی هەمیشـەیی لەوێـدا، ئـەو شـوێنانەش لەلایـەن خـواوە ئامـادەکراوە، بـۆ میوانـداری هەمیشـەیی بەختـەوەران، ئەڵبەتـە ئـەو بەشـەی کـە لای خوایـە چـاکترو بەنرخترە بۆ چاکەکاران و خواناسان).

## ٣- ڕاستگۆیان (الصادقون):

خوای تاك و پاك دەفەرموویت: ﴿ هَٰذَا يَوۡمُ يَنفَعُ ٱلصَّٰدِقِينَ صِدۡقُهُمۡۚ لَهُمۡ جَنَّٰتٞ ﴾ المائـدة: ١١٩. واتــە: (ئەمــە ئــەو ڕۆژەیــە کــە ڕاســتگۆیان ڕاســتگۆییەکەیان ســوودیان پــێ دەگەیەنێت، باخەکانی بەهەشتیان بۆ ئامادەیە).

## ٤- گوێڕایەڵان (الطائعون):

خــوای گــەورە دەفــەرموویت: ﴿ وَمَن يُطِعِ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ يُدۡخِلۡهُ جَنَّٰتٖ ﴾ النســاء: ١٣. واتە: (ئەو کەسـەی فەرمانبـەرداری خـواو پێغەمبەرەکـەی بکـات، ئـەوە خـوا دەیخاتـە ناو باخەکانی بەهەشتەوە).

## ٥- ئەوانەی بڕوایان بەخوا هەیە و چەسپاون لەسەر ئەمە:

خوای مەزن دەفەرموویت: ﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ قَالُواْ رَبُّنَا ٱللَّهُ ثُمَّ ٱسۡتَقَٰمُواْ فَلَا خَوۡفٌ عَلَيۡهِمۡ وَلَا هُمۡ يَحۡزَنُونَ ﴿١٣﴾ أُوْلَٰٓئِكَ أَصۡحَٰبُ ٱلۡجَنَّةِ خَٰلِدِينَ فِيهَا جَزَآءَۢ بِمَا كَانُواْ يَعۡمَلُونَ ﴿١٤﴾ ﴾ الأحقاف:

١٣ - ١٤. واتە: (بەڕاستی ئەوانەی کە دەڵێن: پەروەردگارمان - الله -یەو، پاشان پابەندی ئەو ئیمانە دەبین و ڕاست و ڕەوان پەیڕەوی دەکەن و لەسەری بەردەوامن، ئەوانە هیچ جۆرە ترس و بیمێکیان لەسەر نییە و دڵتەنگ نابن. ئەوانە بەهەشتین).

## ٦- نزیك و خۆشەویستانی خوا (المقربون):

خوای گەورە دەفەرموویێت: ﴿ فَأَمَّآ إِن كَانَ مِنَ ٱلۡمُقَرَّبِينَ ﴿٨٨﴾ فَرَوۡحٞ وَرَيۡحَانٞ وَجَنَّتُ نَعِيمٖ ﴿٨٩﴾ ﴾ الواقعة: ٨٨ - ٨٩. واتە: (جا ئەگەر ئەو کەسەی کە لە سەرەمەرگدایە لە نزیکان و خۆشەویستانی ئێمە بێت. ئەوە ئیتر خۆشی و کامەرانی و ئاسوودەیی بەهەشتی پڕ لە نازو نیعمەت چاوەڕێیەتی).

## ٧- ئەوانەی بڕوایان هێناوەو کاری چاکە ئەکەن:

خوای مەزن دەفەرموویێت: ﴿ وَبَشِّرِ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ أَنَّ لَهُمۡ جَنَّٰتٖ ﴾ البقرة: ٢٥. واتە: ("ئەی پێغەمبەر (ﷺ)" مژدە بدە بەوانەی کە باوەڕیان هێناوەو کاروکردەوەی چاکەکانیان ئەجامداوە بەوەی باخەکانی بەهەشتیان بۆ هەیە).

﴿ وَمَن يَعۡمَلۡ مِنَ ٱلصَّٰلِحَٰتِ مِن ذَكَرٍ أَوۡ أُنثَىٰ وَهُوَ مُؤۡمِنٞ فَأُوْلَٰٓئِكَ يَدۡخُلُونَ ٱلۡجَنَّةَ وَلَا يُظۡلَمُونَ نَقِيرٗا ﴿١٢٤﴾ ﴾ النساء: ١٢٤. واتە: (ئەوەش کردەوە چاکەکان ئەنجامبدات نێر یان مێ لە کاتێکدا ئیماندار بێت، جا ئەوانە دەچنە بەهەشتەوەو بەقەدەر پەردەی ناوکی خورما ستەمیان لێ ناکرێت).

﴿ وَمَن يُؤۡمِنۢ بِٱللَّهِ وَيَعۡمَلۡ صَٰلِحٗا يُكَفِّرۡ عَنۡهُ سَيِّـَٔاتِهِۦ وَيُدۡخِلۡهُ جَنَّٰتٖ ﴾ التغابن: ٩. واتە: (جا ئەوەی ئیمان و باوەڕ بهێنێت بەخواو کردەوەی چاکیش ئەنجام بدات، ئەوە خوا چاوپۆشی دەکات لە گوناهو هەڵەکانی و دەیخاتە باخەکانی بەهشتەوە).

﴿وَعَدَ ٱللَّهُ ٱلْمُؤْمِنِينَ وَٱلْمُؤْمِنَٰتِ جَنَّٰتٍ﴾ التوبة: ٧٢.[1] واتە: (خوای گەورە بەڵێنی داوە بە ئیماندارانی لە پیاوان و ئافرەتان، بەوەی کە باخەکانی بەهەشتیان پێ دەبەخشێت).

قورئانی پیرۆز باسی ئەو کردەوە چاکانەی کردووە، کە جێگیر بوونی ژیان و گوزەرانی پێوە بەندە، کە ئەنجامدەری ئەوکارە چاکانە شایەنی چوونە بەهەشتن، بۆیە وەسفی کردوون بەوەی کە:

أ-بڕوایان بە خواو پێغەمبەرەکەی و ڕۆژی دوایی و پەیامی پێغەمبەر (ﷺ) بە ووردو درشتیەوە هەیە، بۆیە ئەمانە: بڕوایان بەخوا هەیە و هاوبەشی بۆ بڕیارنادەن، یادی خوا دەکەن و کاتێ بەلای ئایەتەکانی خوای گەورەدا تێئەپەڕن بێ دەنگ دەبن و گوێی بۆ شل ئەکەن و کاری پێئەکەن، ئەوانە تەوبەکارو لەخواترسن وبڕوایان بە پێغەمبەران هەیە و پشتیان گرتووەو سەریان دەخەن.

ب- پەرستشەکان ئەنجام دەدەن، ئەوانە کەسانێکن:

نوێژ ئەکەن بەجوانی و ڕێکوپێکی و شەو بێدار ئەکەنەوە، سوژدەی زۆر دەبەن و زەکات دەدەن و ماڵیان ئەبەخشن لەکاتی خۆشیدا بەبێ زیادەڕەوی و کەمڕەوی.

پ- ئەوانەن کە قەدەغەکراوەکان فەرامۆش ئەکەن، بەرگری لەئیسلام ئەکەن، ئەوانە:

کۆچبەران (المهاجرون) و پشتیوانان (أنصار)ی بەرایی و سەرەتا و ئەوانەش کە بەچاکە شوێنی ئەوان ئەکەون، جا ئەو کۆچبەرانەی کە کۆچ ئەکەن بۆ ئەوەی نەکەونە ناو بازنەی قەدەغە کراوەکان، هەروەها ئەو تێکۆشەرانەی کە لە پێناوی خوا ئازاریان پێگەیشتووەو جەنگاون و دوژمنانی خوایان کوشتووەو خۆشیان کوژراون، ئەوانەش کە ئارامگرن لە پێناوی خوا.

---

(١) سەیری ئەمانە بکە: البقرة ٨٢، النساء ٥٧ و ١٢٢، الأعراف ٤٢، یونس ٩، هود ٢٣، ابراهیم ٢٣، الکهف ٣٠ - ٣١ و ١٠٧، مریم ٩٦، طه ٧٥ - ٧٦، الحج ٢٣، العنکبوت ٥٨، السجدة ١٩، غافر ٤٠، محمد ١٢، الطلاق ١١، البروج ١١، البیِّنة ٧ - ٨، الفتح ٥.

ت- ئەوانەی کە پابەندی ڕەوشتی ڕاست و ڕێك بوون لە هەڵسوکەوتیاندا لەبەرامبەر کەسانی تر، ئەوانە:

تەنها بەڕەواو حەق نەبێت کەس ناکوژن، زینا ناکەن، شایەتی بەدرۆ نادەن، ڕقی خۆیان ئەخۆنەوە، لە خەڵکی خۆش دەبن و چاکەکارن و داوای لێخۆشبوون ئەکەن بۆ گوناهەکانیان و سورنین لەسەر ئەنجامدانی تاوان، پەیمانی خوا بەجێ ئەگەیەنن، ئەو پەیوەندییە دەگەیەنن کە خوای گەورە فەرمانی گەیاندنی کردووە، خۆیان ئەشکێنن و خاکی و خۆبەکەم زانن لەبەرامبەر خەڵکی، پشت لە نەفامەکان ئەکەن بە نەرمی و سەلام لێکردنیان، کاتێ بە لای قسەی هەرچی و پەرچی و بێ کەڵکدا ئەچن بە ڕێزەوە تێئەپەڕن، کاری چاکە ئەکەن بۆ وەلانانی خراپەکان، ئەوانەن داوا لە خوای گەورە ئەکەن چاوڕۆشنییەکیان پێ ببەخشێت و بیانکاتە پێشەوا بۆ موسڵمانان، داوا دەکەن خوا بیانپارێزێت لە سزای دۆزەخ.

ئەم چوار شتە کۆی ئەو شتانەیە کە پەیامی ئیسلام لەخۆی ئەگرێت، قورئانی پیرۆزیش بەدەق ئاماژەی بۆ زۆرێك لە شتە وردەکانی کردووە، باسی ئەوەشی کردووە کە پاداشتی ئەو شتانە بەهەشتە، هەروەك لەم ئایەتانەی خوارەوەدا هاتووە:

خوای مەزن دەفەرموویێت: ﴿ ٱلَّذِينَ يُنفِقُونَ فِي ٱلسَّرَّآءِ وَٱلضَّرَّآءِ وَٱلۡكَٰظِمِينَ ٱلۡغَيۡظَ وَٱلۡعَافِينَ عَنِ ٱلنَّاسِۗ وَٱللَّهُ يُحِبُّ ٱلۡمُحۡسِنِينَ ﴿١٣٤﴾ وَٱلَّذِينَ إِذَا فَعَلُواْ فَٰحِشَةً أَوۡ ظَلَمُوٓاْ أَنفُسَهُمۡ ذَكَرُواْ ٱللَّهَ فَٱسۡتَغۡفَرُواْ لِذُنُوبِهِمۡ وَمَن يَغۡفِرُ ٱلذُّنُوبَ إِلَّا ٱللَّهُ وَلَمۡ يُصِرُّواْ عَلَىٰ مَا فَعَلُواْ وَهُمۡ يَعۡلَمُونَ ﴿١٣٥﴾ أُوْلَٰٓئِكَ جَزَآؤُهُم مَّغۡفِرَةٞ مِّن رَّبِّهِمۡ وَجَنَّٰتٞ ﴾ آل عمران: ١٣٤ - ١٣٦. واتە: (ئەوانەی لە خۆشی و ناخۆشیدا، لە هەرزانی و گرانیدا ماڵ و سامانیان دەبەخشن، ڕق و کینەی خۆیان دەخۆنەوەو خۆگرن، لە خەڵکی خۆش دەبن و لێبوردەن، خوای میهرەبانیش چاکەکاران و چاکەخوازانی خۆش دەوێت. ئەوانەش کە تاوان یان گوناهێك ئەنجام دەدەن یاخود ستەم لە خۆیان دەکەن "دوایی بەخۆیاندا دێنەوەو سزای" خوا دێتە یادیان، ئەوسا داوای لێخۆشبوون دەکەن، جا کێ هەیە کە لە گوناهیان خۆش ببێت جگە لەخوا؟! هەروەها لەسەر گوناهو تاوانیان

بەردەوام نابن، لە کاتێکدا دەزانن "ئەوە تاوانە". ئائەوانە پاداشتیان لێخۆشبوون و لێبوردنە لەلایەن پەروەردگاریانەوە لەگەڵ باخەکانی بەهەشتدا).

هەروەها دەفەرموویێت: ﴿ فَٱلَّذِينَ هَاجَرُواْ وَأُخۡرِجُواْ مِن دِيَٰرِهِمۡ وَأُوذُواْ فِي سَبِيلِي وَقَٰتَلُواْ وَقُتِلُواْ لَأُكَفِّرَنَّ عَنۡهُمۡ سَيِّـَٔاتِهِمۡ وَلَأُدۡخِلَنَّهُمۡ جَنَّٰتٖ تَجۡرِي مِن تَحۡتِهَا ٱلۡأَنۡهَٰرُ ثَوَابٗا مِّنۡ عِندِ ٱللَّهِۚ وَٱللَّهُ عِندَهُۥ حُسۡنُ ٱلثَّوَابِ ﴾ آل عمرا: ١٩٥. واتە: (جا ئەوانەی کۆچیان کردو لە شوێنەواری خۆیان دەربەدەر کران و ئازارو ئەشکەنجە دران لە پێناوی مندا جەنگان و شەهید کران، بەڕاستی سوێند بێت چاوپۆشی دەکەم لە هەڵەو گوناهەکانیان و دەیانخەمە باخەکانی بەهەشتەوە کە چەندەها ڕووبار بەژێر درەختەکانیدا و بەردەم کۆشکەکانیدا دەڕوات، ئەمەش پاداشتێکە لەلایەن خواوە "پێشکەشیان دەکرێت" خوا پاداشتی چاك و جوانی لایە "بۆ تێکۆشەران").

﴿ لَٰكِنِ ٱلرَّسُولُ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ مَعَهُۥ جَٰهَدُواْ بِأَمۡوَٰلِهِمۡ وَأَنفُسِهِمۡۚ وَأُوْلَٰٓئِكَ لَهُمُ ٱلۡخَيۡرَٰتُۖ وَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡمُفۡلِحُونَ ٨٨ أَعَدَّ ٱللَّهُ لَهُمۡ جَنَّٰتٖ ﴾ التوبة: ٨٨ - ٨٩. واتە: (بەڵام پێغەمبەر (ﷺ) و ئەوانەی کە لە گەڵیدا باوەڕیان هێناوە، جیهاد و تێکۆشانیان کردووە "بۆ چەسپاندنی ئایینی خوا" بەماڵ و سامان و گیانیانەوە، ئا ئەوانە هەرچی خێرو خۆشی هەیە بەشیانە و ئەوانە سەربەرزو سەرفرازو و ڕزگارن).

﴿ لَئِنۡ أَقَمۡتُمُ ٱلصَّلَوٰةَ وَءَاتَيۡتُمُ ٱلزَّكَوٰةَ وَءَامَنتُم بِرُسُلِي وَعَزَّرۡتُمُوهُمۡ وَأَقۡرَضۡتُمُ ٱللَّهَ قَرۡضًا حَسَنٗا لَّأُكَفِّرَنَّ عَنكُمۡ سَيِّـَٔاتِكُمۡ وَلَأُدۡخِلَنَّكُمۡ جَنَّٰتٖ ﴾ المائدة: ١٢. واتە: (سوێند بێت بەخوا ئەگەر نوێژەکانتان بەچاکی بکەن و زەکات بدەن و باوەڕ بهێنن بەهەموو پێغەمبەرانی من و پشتیوانیان لێبکەن، قەرزی چاك و جوان و ڕێك و پێك بدەن بە خەڵکی لەبەر خوا، ئەوە بێگومان لە گوناهو هەڵەکانتان خۆشدەبم و چاوپۆشیتان لێدەکەم و دەتانخەمە باخەکانی بەهەشتەوە).

﴿ وَٱلسَّٰبِقُونَ ٱلۡأَوَّلُونَ مِنَ ٱلۡمُهَٰجِرِينَ وَٱلۡأَنصَارِ وَٱلَّذِينَ ٱتَّبَعُوهُم بِإِحۡسَٰنٖ رَّضِيَ ٱللَّهُ

عَنۡهُمۡ وَرَضُواْ عَنۡهُ وَأَعَدَّ لَهُمۡ جَنَّٰتٖ ﴾ التوبة: ١٠٠. واته: (خوای میهرەبان لەوانەی كە پێشكەوتن و یەكەم كەس بوون لە خزمەت كردنی ئیسلامدا لە كاروانی كۆچبەران و پشتیوانان و ئەوانەی كە بە ڕێكوپێكی شوێنیان كەوتوون، ڕازی بووەو ئەوانیش لەو ڕازی بوون، باخەكانی بەهەشتی بۆ ئامادە كردوون).

﴿ ٱلَّذِينَ يُوفُونَ بِعَهۡدِ ٱللَّهِ وَلَا يَنقُضُونَ ٱلۡمِيثَٰقَ ﴿٢٠﴾ وَٱلَّذِينَ يَصِلُونَ مَآ أَمَرَ ٱللَّهُ بِهِۦٓ أَن يُوصَلَ وَيَخۡشَوۡنَ رَبَّهُمۡ وَيَخَافُونَ سُوٓءَ ٱلۡحِسَابِ ﴿٢١﴾ وَٱلَّذِينَ صَبَرُواْ ٱبۡتِغَآءَ وَجۡهِ رَبِّهِمۡ وَأَقَامُواْ ٱلصَّلَوٰةَ وَأَنفَقُواْ مِمَّا رَزَقۡنَٰهُمۡ سِرّٗا وَعَلَانِيَةٗ وَيَدۡرَءُونَ بِٱلۡحَسَنَةِ ٱلسَّيِّئَةَ أُوْلَٰٓئِكَ لَهُمۡ عُقۡبَى ٱلدَّارِ ﴿٢٢﴾ جَنَّٰتُ عَدۡنٖ يَدۡخُلُونَهَا وَمَن صَلَحَ مِنۡ ءَابَآئِهِمۡ وَأَزۡوَٰجِهِمۡ وَذُرِّيَّٰتِهِمۡ ﴾ الرعد: ٢٠ - ٢٣. واته: (ئەو كەسانەن وەفا دەكەن و بەئەمەكن لە بەرامبەر ئەو پەیمانەوە كە هەیانە لەگەڵ خوای پەروەردگارداو، ئەو پەیمانەش ناشكێنن و بەڵێن هەڵناوەشێننەوە. ئەوانەش كە هەرچی خوا فەرمانی بە گەیاندنی داوە دەیگەیەنن و بەدڵ لە پەروەردگاریان دەترسن و لە لێپرسینەوەو حیسابی توند و تیژی قیامەتیش سڵ ناكەنەوە. ئەوانەش كە دانیان بەخۆدا گرت و ئارام بوون بۆ بەدەست هێنانی ڕەزامەندی پەروەردگاریان و نوێژەكەشیان بەچاكی ئەنجام داوەو لەو ڕزق و ڕۆزییەش پێمان بەخشیوون بەخشیویانە، بەنهێنی و بەئاشكرا و بە چاكەكاری و شێوازی جوان پاڵ بە نادروستی و هەڵە و خراپەكاریەوە دەنێن، ئا ئەوانە سەرەنجامەكەیان ئەو خانووبەرە "ڕازاوەیەیە لە بەهەشتدا". كە باخەكانی بەهەشتی عەدنە، بۆیان ڕازاوەتەوە، بە شادییەدەوە دەچنە ناوی، هاوڕێ لەگەڵ هەر كەسێك چاك و پاك و خواناسە لە باووباپیران و هاوسەرو نەوەكانیان، جا فریشتەكان دەچن بۆ سەردانیان لە هەموو دەروازەكانەوە).

﴿ وَعِبَادُ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلَّذِينَ يَمۡشُونَ عَلَى ٱلۡأَرۡضِ هَوۡنٗا وَإِذَا خَاطَبَهُمُ ٱلۡجَٰهِلُونَ قَالُواْ سَلَٰمٗا
﴿٦٣﴾ وَٱلَّذِينَ يَبِيتُونَ لِرَبِّهِمۡ سُجَّدٗا وَقِيَٰمٗا ﴿٦٤﴾ وَٱلَّذِينَ يَقُولُونَ رَبَّنَا ٱصۡرِفۡ عَنَّا
عَذَابَ جَهَنَّمَۖ إِنَّ عَذَابَهَا كَانَ غَرَامًا ﴿٦٥﴾ إِنَّهَا سَآءَتۡ مُسۡتَقَرّٗا وَمُقَامٗا ﴿٦٦﴾ وَٱلَّذِينَ

إِذَآ أَنفَقُواْ لَمْ يُسْرِفُواْ وَلَمْ يَقْتُرُواْ وَكَانَ بَيْنَ ذَٰلِكَ قَوَامًا ﴿٦٧﴾ وَٱلَّذِينَ لَا يَدْعُونَ مَعَ ٱللَّهِ إِلَٰهًا ءَاخَرَ وَلَا يَقْتُلُونَ ٱلنَّفْسَ ٱلَّتِى حَرَّمَ ٱللَّهُ إِلَّا بِٱلْحَقِّ وَلَا يَزْنُونَ ۚ وَمَن يَفْعَلْ ذَٰلِكَ يَلْقَ أَثَامًا ﴿٦٨﴾ ﴾ الفرقان: ٦٣ - ٦٨. **واتە: (بەندەكانی خوای میهرەبان ئەو كەسانەن كە زۆر بەهێمنی بەسەر زەویدا دەڕۆن، كاتێكیش نەفامان بە قسەو قسەلۆكی ناخۆش بەرەنگاریان دەبن، لە وەڵامیاندا دەڵێن: سڵاو "ڕەوشت بەرزی خۆیان دەنوێنن". ئەوانەی كە شەوگار بۆ پەروەردگاریان بە سوژدەو وەستان و نوێژ دەبەنە سەر. ئەوانەی كە دەڵێن: پەروەردگارا؛ لە سزای ئاگر دوورمان بكە و پەنامان بدە، چونكە سزاو ئازاری لە كۆڵ نابێتەوەو بەردەوامە. بەڕاستی ئەو دۆزەخە شوێن و نیشتەجێیەكی زۆر ناخۆش و ناسازە. "هەروەها بەندەكانی خوای میهرەبان" ئەوانەن كە: كاتێك ماڵ و سامانیان دەبەخشن و خەرجی دەكەن، نە زیادەڕەوی تێدا دەكەن و بەزایەی دەدەن، نە دەست نوقاو ڕەزیلیشن، بەڵكو لەو نێوانەدان. هەروەها ئەوانەی هیچ جۆرە خوایەكی تر لەگەڵ خوادا ناپەرستن، كەسیش ناكوژن كە خودا كوشتنی حەڕام كردبێت مەگەر بەحەق و ڕەوا، هەروەها زینا ناكەن و نزیكی ناكەون، جا ئەوەی ئەو جۆرە كارە خراپانە ئەنجام بدات، ئەوە تووشی سزاو ئازار و ڕیسوایی دەبێت).**

﴿ وَعِبَادُ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلَّذِينَ يَمْشُونَ عَلَى ٱلْأَرْضِ هَوْنًا وَإِذَا خَاطَبَهُمُ ٱلْجَٰهِلُونَ قَالُواْ سَلَٰمًا ﴿٦٣﴾ وَٱلَّذِينَ يَبِيتُونَ لِرَبِّهِمْ سُجَّدًا وَقِيَٰمًا ﴿٦٤﴾ وَٱلَّذِينَ يَقُولُونَ رَبَّنَا ٱصْرِفْ عَنَّا عَذَابَ جَهَنَّمَ ۖ إِنَّ عَذَابَهَا كَانَ غَرَامًا ﴿٦٥﴾ إِنَّهَا سَآءَتْ مُسْتَقَرًّا وَمُقَامًا ﴿٦٦﴾ وَٱلَّذِينَ إِذَآ أَنفَقُواْ لَمْ يُسْرِفُواْ وَلَمْ يَقْتُرُواْ وَكَانَ بَيْنَ ذَٰلِكَ قَوَامًا ﴿٦٧﴾ وَٱلَّذِينَ لَا يَدْعُونَ مَعَ ٱللَّهِ إِلَٰهًا ءَاخَرَ وَلَا يَقْتُلُونَ ٱلنَّفْسَ ٱلَّتِى حَرَّمَ ٱللَّهُ إِلَّا بِٱلْحَقِّ وَلَا يَزْنُونَ ۚ وَمَن يَفْعَلْ ذَٰلِكَ يَلْقَ أَثَامًا ﴿٦٨﴾ ﴾ الفرقان: ٧١ - ٧٤. **واتە: (جا ئەوەی كە تەوبە دەكات و كارو كردەوەی چاكە ئەنجام دەدات و بەتەمایە پەروەردگار تەوبەی لێ وەر بگرێت؛ ئەوە بێگومان**

دەگەڕێتەوە بۆ لای خوا بە تەوبەیەکی ڕاست و دروستەوە. "بەندەکانی خوای میهرەبان" ئەوانەشن کە شایەتی ناحەق نادەن، هەرگیز لە شوێنێکدا ئامادە نابن کە شایەتی ناحەقی تێدا ئەنجام دەدرێت یان درۆی تیادا دەکرێت، کاتێکیش بەلای گەمە و گاڵە و چەپۆکانی نەفاماندا تێدەپەڕن،، بەهێمنی و لەسەر خۆیی و سەربەرزییەوە تێدەپەڕن. هەروەها ئەوانەشن؛ کاتێك بە ئایەت و فەرمانەکانی پەروەردگاریان بێدار بکرێنەوە، هەروا بە کەڕی و کوێری بەلایدا تێناپەڕن. ئەوانەشن کە دەڵێن: پەروەردگارا؛ لە هاوسەرانمان و نەوەکانمان کەسانێکمان پێ ببەخشە کە ببنە مایەی ڕووناکی دیدەمان و شادمانی دڵمان و بمان کە بە پێشەوا بۆ پارێزکاران و خواناسان).

## وەسفی بەهەشت و بارودۆخی بەهەشتیان، هەروەك لە قورئانی پیرۆزدا هاتووە:

### ١- نزیك بوونەوەو دەرکەوتنی بەهەشت بۆ بەهەشتیەکان، بەرلەوەی بچنە ناویەوە، هەر یەك لە بەهەشتیەکانیش پلەو مەنزڵگای خۆی ئەزانێت لە بەهەشتدا، بۆیە بەرەو شوێنی خۆی ئەچێت:

خوای مەزن دەفەرموویت: ﴿ وَيُدۡخِلُهُمُ ٱلۡجَنَّةَ عَرَّفَهَا لَهُمۡ ﴾ محمد: ٦. واتە: (هەروەها دەیانخاتە ئەو بەهەشتەوە کە بە جۆرەها شێواز بۆی باس کردوون).

﴿ وَأُزۡلِفَتِ ٱلۡجَنَّةُ لِلۡمُتَّقِينَ ﴿٩٠﴾ ﴾ الشعراء: ٩٠. واتە: (ئەوکاتە، بەهەشت لە چاکەکاران و خواناسان نزیك کراوەتەوە).

﴿ وَأُزۡلِفَتِ ٱلۡجَنَّةُ لِلۡمُتَّقِينَ غَيۡرَ بَعِيدٍ ﴿٣١﴾ ﴾ ق: ٣١. واتە: (لەو لایشەوە بەهەشت نزیك خراوەتەوە لە خواناس و پارێزکارو باوەڕداران، بێ ئەوەی لێیان دوور بێت).

﴿ وَإِذَا ٱلۡجَنَّةُ أُزۡلِفَتۡ ﴿١٣﴾ ﴾ التکویر: ١٣. واتە: (کاتێك بەهەشت نیزك دەخرێتەوە "لە خواناسان").

## ٢- بەهەشت لە شوێنێكی بەرزە یاخود پلەكانی یان خانو و تەلارو دارودرەختەكانی بەرزن:

خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿ فِي جَنَّةٍ عَالِيَةٍ ﴿٢٢﴾ ﴾ الحاقة: ٢٢، والغاشیة: ١٠. واتە: (لە بەهەشتێكی بەرزو بڵندا ژیان دەبەنە سەر).

## ٣- پانتایی بەهەشت بەئەندازەی پانتایی نێوان ئاسمانەكان و زەوییە:

خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿ وَجَنَّةٍ عَرْضُهَا السَّمَاوَاتُ وَالْأَرْضُ ﴾ آل عمران: ١٣٣. واتە: (و بەهەشتێك كە پاناییەكەی ئاسمانەكان و زەوی گرتۆتەوە).

## ٤- بەهەشت چەند دەرگا و دەراوازەیەكی هەیە:

خوای پایەبەرز دەفەرمووێت ﴿ جَنَّاتِ عَدْنٍ مُّفَتَّحَةً لَّهُمُ الْأَبْوَابُ ﴿٥٠﴾ ﴾ ص: ٥٠. واتە: (باخەكانی بەهەشتی عەدنە، كە هەر هەموو دەروازەكانی لەسەر پشتە بۆیان).

﴿ حَتَّىٰ إِذَا جَاءُوهَا وَفُتِحَتْ أَبْوَابُهَا ﴾ الزمر: ٧٣. واتە: (هەتا ئەو كاتەی دەگەنە ئەوێ و دەروازەكانی بەهەشت لە ڕوویاندا كراوەیە و لەسەر پشتە).

٥- بەهەشت سەرپەرشتیاری هەیە، كە پێشوازی و سڵاو لە ئەوانە دەكەن كە دەچنە ناویەوە:

خوای گەورە دەفەرمویێت:﴿ وَقَالَ لَهُمْ خَزَنَتُهَا سَلَامٌ عَلَيْكُمْ طِبْتُمْ فَادْخُلُوهَا خَالِدِينَ ﴾ الزمر: ٧٣. واتە: (فریشتەكانی بەرپرس و سەرپەرشتیارانی بەهەشت پێشوازییان لێ دەكەن و دەڵێن: درودو سڵاوتان لێبێت، ئێوە پاك و خاوێنن، كەواتە فەرموو بچنە ناو بەهەشتەوە، هاوڕێ لەگەڵ ژیانی هەمیشەیی و نەبڕاوەدا).

## ٦- ڕووبارەكانی بەهەشت چەند ڕەنگێكی جیاوازیان هەیە:

خوای پاك و تاك دەفەرمووێت: ﴿ فِيهَا أَنْهَارٌ مِّن مَّاءٍ غَيْرِ آسِنٍ وَأَنْهَارٌ مِّن لَّبَنٍ لَّمْ يَتَغَيَّرْ طَعْمُهُ وَأَنْهَارٌ مِّنْ خَمْرٍ لَّذَّةٍ لِّلشَّارِبِينَ وَأَنْهَارٌ مِّنْ عَسَلٍ مُّصَفًّى ﴾ محمد: ١٥. واتە: (چەندەها ڕووباری لە

ئاوی سازگارو تام نەگۆڕاوی تێدایە و چەندەها ڕووباری شیر کە تامی تێك نەچووەو چەندەها ڕووبار لە شەڕابی تام خۆش و بۆنخۆش بۆ ئەوانەی کە دەیخۆنەوەو چەندەها ڕووبار لە هەنگوینی پاڵفتە و بێگەرد).

﴿ وَمَآءٍ مَّسۡكُوبٍ ﴿٣١﴾ ﴾ الواقعة: ٣١. واتە: (تاڤگەی جوان و حەوزو فوارەی ڕازاوەی تێدایە).

## ٧- ئەو ڕووبارانە بەناو باخەکانی بەهەشتدا دەڕۆن:

خوای پایەبەرز دەفەرموێت:﴿ تَجۡرِي مِن تَحۡتِهَا ٱلۡأَنۡهَٰرُ ﴾ البقرة: ٢٥ و ٢٦٦.[1] واتە: واتە: (چەندەها ڕووبار بەژێر درەخت و بەناو باخەکانیدا دەڕوات).

﴿ تَجۡرِي تَحۡتَهَا ٱلۡأَنۡهَٰرُ ﴾ التوبة: ١٠٠. واتە: (چەندەها ڕووبار بە بەردەم کۆشکەکانی و بەژێر درەختەکانیدا دەڕۆن).

﴿ تَجۡرِي مِن تَحۡتِهِمُ ٱلۡأَنۡهَٰرُ ﴾ الأعراف: ٤٣، یونس: ٩، الکهف: ٣١. واتە: (چەندەها ڕووبار بەژێر درەختەکانیدا و بە بەردەم کۆشکەکانیدا دەڕوات).

## ٨- کانیاوی تێدان:

خوای گەورە دەفەرمووێت:﴿ فِيهَا عَيۡنٞ جَارِيَةٞ ﴿١٢﴾ ﴾ الغاشیة: ١٢. واتە: (لەو بەهەشتەدا کانی و سەرچاوەو تاڤگەی ڕەوانی تێدایە).

﴿ فِيهِمَا عَيۡنَانِ تَجۡرِيَانِ ﴿٥٠﴾ ﴾ الرحمن: ٥٠. واتە: (دوو سەرچاوەی لەکانی و ئاوی سازگاریان تیایدایە و بەخوڕ بە جۆگەلەکاندا دەڕۆن).

---

(١) سەیری ئەمانە بکە: آل عمران ١٥ و ١٣٦ و ١٩٥ و ١٩٨، النساء ١٣ و ٥٧ و ١٢٢، المائدة ١٢ و ٨٥ و ١١٩، التوبة ٧٢ و ٨٩، الرعد ٣٥، ابراهیم ٢٣، النحل ٣١، طه ٧٦، الحج ١٤ و ٢٣، الفرقان ١٠، العنکبوت ٥٨، الزمر ٢٠، محمد ١٢، الفتح ٥ و ١٧، الحدید ١٢، المجادلة ٢٢، الصف ١٢، التغابن ٩، الطلاق ١١، التحریم ٨، البروج ١١، البیّنة ٨.

﴿ فِيهِمَا عَيۡنَانِ نَضَّاخَتَانِ ﴿٦٦﴾ ﴾ الرحمن: ٦٦. واتە: (دوو سەرچاوەی هەڵقوڵاویان تێدایە "كە دیمەنیان زۆر دڵڕفێنە").

٩- خانوی وای تێدایە كە ژوورەكانی لەسەر یەكن، وەك تەلارە چەند نهۆمییەكان:

خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿ لَهُمۡ غُرَفٞ مِّن فَوۡقِهَا غُرَفٞ مَّبۡنِيَّةٞ ﴾ الزمر: ٢٠. واتە: (كۆشك و تەلاری چەند نهۆم كە ژوورەكانی لەسەر یەكن بۆیان ئامادەیە).

## ١٠- درەختەكانی خاوەن لق و پۆپی سەوزن، كە ڕەش دەرئەكەون لەبەر سەوزاییەكەیان، بۆن و بەرامیان خۆشە:

خوای پەروەردگار دەفەرمووێت:﴿ وَلِمَنۡ خَافَ مَقَامَ رَبِّهِۦ جَنَّتَانِ ﴿٤٦﴾... ذَوَاتَآ أَفۡنَانٖ ﴿٤٨﴾ ﴾ الرحمن: ٤٦ و ٤٨. واتە: (بۆ ئەو كەسەش لە مەقامی پەروەردگاری خۆی ترسابێت، دوو باخی ڕازاوە ئامادەیە. ئەو دوو باخەش خاوەنی دارو درەختی گەڵا ناسك و جوانی بریسكەدارە).

﴿ وَمِن دُونِهِمَا جَنَّتَانِ ﴿٦٢﴾... مُدۡهَآمَّتَانِ ﴿٦٤﴾ ﴾ الرحمن: ٦٢ و ٦٤. واتە: (جگەلەو دوو بەهەشتەی كە باسكرا، دوو بەهەشتی تریش ئامادەیە بۆ ئەوانەی كە پلەو پایەیان وا لەخوار خاوەنانی دوو بەهەشتی ناوبراوەوە.. "ئەو بەهەشتانەش" ئەوەندە سەوز دەنوێنن مەیلەو ڕەش دەچنەوە لە جوانی و تۆخیدا).

﴿ فِي سِدۡرٖ مَّخۡضُودٖ ﴿٢٨﴾ وَطَلۡحٖ مَّنضُودٖ ﴿٢٩﴾ ﴾الواقعة: ٢٨ و ٢٩. واتە: (لە ژێر سێبەری - سدر -ی بێ دڕكدان. هەروەها درەختی مۆزیش كە بەرهەمەكانی چین چین لەسەر یەكن).

## ١١- سێبەرەكەی درێژو پان و پۆڕ و ڕازاوە:

خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿ وَنُدۡخِلُهُمۡ ظِلّٗا ظَلِيلًا ﴾ النساء: ٥٧. واتە: (هەروەها دەیانخەینە ژێر سایەی سێبەری جوان و ڕازاوەیی هەمیشەیی).

**﴿ وَظِلٍّ مَّمْدُودٍ ﴿٣٠﴾ ﴾ الواقعة: ٣٠. واتە: (لەژێر سێبەری دوورو درێژدان لەو باخە خۆشانەدا).**

**﴿ أُكُلُهَا دَآئِمٌ وَظِلُّهَا ﴾ الرعد: ٣٥. واتە: (خواردن و خواردنەوەی "هەمەجۆر و هەمەڕەنگی" بەردەوامە هاوڕێ لەگەڵ سێبەری خۆش).**

**﴿ إِنَّ ٱلْمُتَّقِينَ فِى ظِلَٰلٍ وَعُيُونٍ ﴿٤١﴾ ﴾ المرسلات: ٤١. واتە: (بەڕاستی دیندارو پارێزكاران، وان لەژێر سێبەردان، لەپاڵ كانیاو تاڤگەكاندا).**

## ١٢-كەش و هەواكەی خۆش و مامناوەندە نە زۆر گەرمە و نەزۆر ساردە:

**خوای پاك و تاك ئەفەرمووێت: ﴿ لَا يَرَوْنَ فِيهَا شَمْسًا وَلَا زَمْهَرِيرًا ﴾ الدهر: ١٣. واتە: (نەگەرمای خۆر بێزاریان دەكات، نە كزەبا و سەرما سەغڵەتیان دەكات).**

## ١٣- نازو نیعمەت و خۆشیەكانی زۆرو بێ ئەندازەیە:

**خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿ وَإِذَا رَأَيْتَ ثَمَّ رَأَيْتَ نَعِيمًا وَمُلْكًا كَبِيرًا ﴿٢٠﴾ ﴾ الدهر: ٢٠. واتە: (كاتێكیش بەهەر لایەكدا چاودەگێڕیت، ئەوە نازو نیعمەتی نەبڕاوەو بێ ئەندازەو دەسەڵاتێكی گەورە دەبینیت لە باخ و باخات و كۆشك و تەلارو دیمەنی جوان و فراوانی بێ سنور).**

**﴿ يُرْزَقُونَ فِيهَا بِغَيْرِ حِسَابٍ ﴾ غافر: ٤٠. واتە: (بێ سنوورو بێ حیساب ڕزق و ڕۆزی هەمەجۆرو هەمە چەشنیان پێدەبەخشرێت).**

**﴿ قَدْ أَحْسَنَ ٱللَّهُ لَهُۥ رِزْقًا ﴾ الطلاق: ١١. واتە: (بێگومان خوا ڕزق و ڕۆزی چاك و پاك و فرەو فراوانی بۆ ئامادەكردوون).**

## ١٤-ژیانی بەهەشتیەكان پڕە لە كامەرانی و شادومانی و بەختەوەری:

**خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿ فَهُوَ فِى عِيشَةٍ رَّاضِيَةٍ ﴿٢١﴾ ﴾ الحاقة: ٢١. واتە: (جا ئەو بەختەوەرە لە ژیانێكی پڕ لە شادی و كامەرانیدا دەژی كە زۆر پێی ڕازییە).**

**١٥- نازو نیعمەت و خۆشی و شادی بەهەشتیەكان نەبڕاوەو بەردەوامە:**

خـوای مـەزن دەفـەرموویێت: ﴿ وَجَنَّٰتٍ لَّهُمْ فِيهَا نَعِيمٌ مُّقِيمٌ ﴾ التوبـة: ٢١. واتـە: (لـەو بەهەشتانەدا نازو نیعمەتی نەبڕاوە پێشكەشیان دەكرێت).

**١٦- بەخشش و نیعمەتەكان ئامادەكراون بۆ بەهەشتیەكانكە هەرگیز كۆتایی نایەن و نابڕێنەوە:**

خـوای پـەروەردگار دەفـەرموویێت: ﴿ عَطَآءً غَيْرَ مَجْذُوذٍ ﴾ هـود: ١٠٨. واتـە: (ئەمـەش بەخششێكە هەرگیز كۆتایی نایەت).

﴿ وَلَهُمْ رِزْقُهُمْ فِيهَا بُكْرَةً وَعَشِيًّا ﴾ مریم: ٦٢. واتە: (لە بـەیانیان و ئێوارانـدا ڕزق و ڕۆزی بۆیان ئامادەیە).

﴿ أُوْلَٰٓئِكَ لَهُمْ رِزْقٌ مَّعْلُومٌ ﴿٤١﴾ ﴾ الصـافات: ٤١. واتـە: (ئـەوان ڕزق و ڕۆزی ئاشـكرای زۆرو زەبەندە و دیاری كراویان پێشكەش دەكرێت).

﴿ إِنَّ هَٰذَا لَرِزْقُنَا مَا لَهُۥ مِن نَّفَادٍ ﴿٥٤﴾ ﴾ ص: ٥٤. واتە: (بەڕاستی ئەمـە ڕزق و ڕۆزیمانـە بـۆ بەختەوەران، هەرگیز تەواو نابێت و كۆتایی نایەت).

﴿ لَّا مَقْطُوعَةٍ وَلَا مَمْنُوعَةٍ ﴿٣٣﴾ ﴾ الواقعـة: ٣٣. واتـە: (نـە بـەروبوومی تـەواو دەبێـت، نـە قەدەغە كراویشە).

﴿ أُكُلُهَا دَآئِمٌ وَظِلُّهَا ﴾ الرعـد: ٣٥. واتـە: (خـواردن و خواردنـەوەی "هەمـەجۆر و هەمەڕەنگی" بەردەوامە هاوڕێ لەگەڵ سێبەری خۆش).

**١٧- گۆشتی هەمەجۆر دەخرێتە بەردەمیان:**

خـوای پایەبـەرز دەفـەرموویێت: ﴿ وَلَحْمِ طَيْرٍ مِّمَّا يَشْتَهُونَ ﴿٢١﴾ ﴾ الطور: ٢٢. واتـە: (حـەزو ئارەزوویان لەهەر گۆشتێك بێت پێشكەشیان دەكەین).

﴿ وَلَحْمِ مِّمَّا يَشْتَهُونَ ﴾ الواقعة: ٢١. واتە: (گۆشتی هەر باڵندەیەكیش كە حـەزی لـێ بكـەن

بۆیان ئامادەیە).

## ١٨- خواردنەوەی بەهەشتیەکان لەناو کاسە و کوپە و پەرداخی زۆر جوان و قەشەنگ دایە کە تام و چێژ ئەبەخشن بە بینەران:

خــــوای گـــەورە دەفـــەرموویت: ﴿ يُطَافُ عَلَيۡهِم بِكَأۡسٖ مِّن مَّعِينِۭ ﴿٤٥﴾ بَيۡضَآءَ لَذَّةٖ لِّلشَّٰرِبِينَ ﴿٤٦﴾ لَا فِيهَا غَوۡلٞ وَلَا هُمۡ عَنۡهَا يُنزَفُونَ ﴿٤٧﴾ ﴾ الصـــافات: ٤٥ - ٤٧. واتــــە: (لــــە پـــەرداخی تایبەتیدا شەرابی تایبەتیان بەسەردا دەگێڕن. شەرابەکە زۆر سپی و بەلەزەتە بۆ ئەو کەسانەی کە دەیخۆنەوەو نۆشی دەکەن. ئەو شەرابە نەدەبێتە هۆی سەرئێشە و ئێڵنجدان، نە مەست و سەرخۆش و بێ هۆشیان دەکات).

﴿ يَدۡعُونَ فِيهَا بِفَٰكِهَةٖ كَثِيرَةٖ وَشَرَابٖ ﴾ ص: ٥١. واتــە: (بــەردەوام داوای میــوەی زۆر و خواردنەوەی هەمەجۆر دەکەن).

﴿ يَتَنَٰزَعُونَ فِيهَا كَأۡسٗا لَّا لَغۡوٞ فِيهَا وَلَا تَأۡثِيمٞ ﴿٢٣﴾ ﴾ الطور: ٢٣. واتە: (بەدڵ خۆشیەوە لەکاسی تایبەتیدا شەڕاب دەنۆشن، جارجار بۆ خۆشی لەیەکتری دەسێنن، دوور لە ڕەفتاری ناشرین و گوناه و تاوانبار کردنی یەکتر).

﴿ بِأَكۡوَابٖ وَأَبَارِيقَ وَكَأۡسٖ مِّن مَّعِينٖ ﴿١٨﴾ لَّا يُصَدَّعُونَ عَنۡهَا وَلَا يُنزِفُونَ ﴿١٩﴾ ﴾ الواقعـــــــــة: ١٨ - ١٩. واتــە: (بـەکوپ و دۆڵکـەو سوڕاحیەوە دەگـەڕێن و لـە پـەرداخی تایبەتـدا جۆرەهـا شـــەربەت و شـــەراب خواردنـــەوەی بـــەتام و خۆشـــیان پێشـــکەش دەکـــەن کـــە لەسەرچاوەیەکی ڕەوانەوە پڕ دەکرێن).

﴿ إِنَّ ٱلۡأَبۡرَارَ يَشۡرَبُونَ مِن كَأۡسٖ كَانَ مِزَاجُهَا كَافُورًا ﴿٥﴾ عَيۡنٗا يَشۡرَبُ بِهَا عِبَادُ ٱللَّهِ يُفَجِّرُونَهَا تَفۡجِيرٗا ﴿٦﴾ ﴾ الدهر: ٥ - ٦. واتە: (بێگومان چاکان و پاکانیش لە پەرداخێکی پڕ شەرابدا دەخۆنەوە، کە ئاوێتەکەی لەسەرچاوەی کافورەوەیە. کە کانییەکە بەندەکانی خوا لێی ئەخۆنەوە لە هەر شوێنێك بیانەوێت هەڵی دەقوڵێنن و فوارە دەکات).

﴿ وَسَقَىٰهُمْ رَبُّهُمْ شَرَابًا طَهُورًا ﴾ الدهر: ٢١. واتە: (ئینجا لەلایەن پەروەردگاریانەوە شەرابی پاك و بێگەرد و خاوێنیان پێشكەش كراوە).

﴿ وَكَأْسًا دِهَاقًا ﴿٣٤﴾ ﴾ النبأ: ٣٤. واتە: (لەگەڵ كاسەی پڕ لە شەرابی تایبەتیدا).

١٩- هەموو جۆرە میوەجات و بەربومێكی بۆن خۆش و بەتام بە هەموو ڕەنگەكانیەوە تیایدا ئامادەیە كە ئارەزووی دەكەن:

﴿ لَكُمْ فِيهَا فَٰكِهَةٌ كَثِيرَةٌ مِّنْهَا تَأْكُلُونَ ﴿٧٣﴾ ﴾ الزخرف: ٧٣. واتە: (میوەجاتی زۆرو هەمەجۆری تیایدا بۆتان ئامادەیە و لێی دەخۆن).

﴿ يَدْعُونَ فِيهَا بِكُلِّ فَٰكِهَةٍ ءَامِنِينَ ﴿٥٥﴾ ﴾ الدخان: ٥٥. واتە: (بانگ دەكەن تیایدا بۆ هەموو جۆرە میوەیەك، بێ ئەوەی بترسن لە تەواو بوون و، نەخۆش كەوتن و لەبەرچاو كەوتن).

﴿ وَلَهُمْ فِيهَا مِن كُلِّ ٱلثَّمَرَٰتِ ﴾ محمد: ١٥. واتە: (هەروەها بۆیان هەیە لەو بەهەشتەدا لە هەموو جۆرە بەرو بووم و میوەیەكی جوان و بەتام و بۆنخۆش).

﴿ فِيهِمَا مِن كُلِّ فَٰكِهَةٍ زَوْجَانِ ﴿٥٢﴾ ﴾ الرحمن: ٦٨. واتە: (درەختی میوەو دارخورماو هەناریان تێدایە).

﴿ فِيهِمَا فَٰكِهَةٌ وَنَخْلٌ وَرُمَّانٌ ﴿٦٨﴾ ﴾ الرحمن: ٥٢. واتە: (لە هەر جۆرە میوەیەك دوو جۆریان تێدایە).

﴿ وَفَٰكِهَةٍ مِّمَّا يَتَخَيَّرُونَ ﴿٢٠﴾ ﴾ الواقعة: ٢٠. واتە: (میوەشیان بۆ دەگێڕن، بە ئارەزووی خۆیان لێی هەڵدەبژێرن).

﴿ وَفَوَٰكِهَ مِمَّا يَشْتَهُونَ ﴿٤٢﴾ ﴾ المرسلات: ٤٢. واتە: (لە هەر جۆرە میوەیەك كە ئارەزوو بكەن بۆیان ئامادەیە و پێشكەشیان دەكرێت).

﴿ حَدَآئِقَ وَأَعۡنَٰبٗا ٣٢ ﴾ النبأ: ٣٢.[1] واتە: (چەندەها باخچەی جوان و جۆری ترێ).

## ٢٠- بەروبوومی بەهەشت وەك بەرووبومی دونیایە، بەڵام لەگەڵ بوونی جیاوازییەکی زۆر لە نێوانیاندا:

خـوای پـەروەردگار دەفـەرموویت: ﴿ كُلَّمَا رُزِقُواْ مِنۡهَا مِن ثَمَرَةٖ رِّزۡقٗا قَالُواْ هَٰذَا ٱلَّذِي رُزِقۡنَا مِن قَبۡلُۖ وَأُتُواْ بِهِۦ مُتَشَٰبِهٗا ﴾ البقرة: ٢٥. واتـە: (هـەر کاتێـك لـە میـوەو بەرهـەمی ئـەو باخانـەیان بـۆ دەهێـنن، دەڵـێن: ئێسـتا لـەوەتان هێنـا، تاوێـك لەمـەو پـێش خواردمان، هەر دەیهێنن و لەیەکتریش دەچن "لە ڕواڵەتدا، بەڵام لـە تـام و بۆنـدا زۆر جیاوازن").

## ٢١-میوەجاتی بەهەشت ملکەچ کراون و ئاسانن بۆ لێکردنەوە:

خـوای گـەورە دەفـەرموویت: ﴿ قُطُوفُهَا دَانِيَةٞ ٢٣ ﴾ الحاقـة: ٢٣. واتـە: (میوەجـاتی زۆر بەدرەختەکانەوە شۆڕ بۆتەوەو لێکردنەوەی ئاسانە لە دەست ڕەس دایە).

﴿ وَدَانِيَةً عَلَيۡهِمۡ ظِلَٰلُهَا وَذُلِّلَتۡ قُطُوفُهَا تَذۡلِيلٗا ١٤ ﴾ الانســان: ١٤. واتــە: (ســێبەری درەختــە جوانەکان بەسەر شوێنە خۆشەکانیاندا سەری فرو هێناوەو لێکردنـەوەی میوەکـانیش ئاسانە و ملکەچ کراوە).

## ٢٢- خواردن و خواردنەوە دەخرێتە بەردەم بەهەشتیەکان بەو ئامێرانەی خواردن کە لە زێرو زیو دروستکراون:

خــوای پــاك و تــاك دەفــەرموویت: ﴿ يُطَافُ عَلَيۡهِم بِصِحَافٖ مِّن ذَهَبٖ وَأَكۡوَابٖ ﴾ الزخرف: ٧١. واتە: (لە سینی و کوپی ئـاڵتون جۆرەهـا خـواردن و خواردنـەوەی جـوان و ڕازاوەو تام خۆش و بۆن خۆشیان بەسەردا دەگێڕن).

﴿ وَيُطَافُ عَلَيۡهِم بِـَٔانِيَةٖ مِّن فِضَّةٖ وَأَكۡوَابٖ كَانَتۡ قَوَارِيرَا۠ ١٥ قَوَارِيرَاْ مِن فِضَّةٖ قَدَّرُوهَا تَقۡدِيرٗا ١٦ وَيُسۡقَوۡنَ فِيهَا

---

(١) سەیری ئەمانەش بکە: یس ٥٧، الصافات ٤١ - ٤٢، ص ٥١، الطور ٢٢، الواقعة ٣٢.

كَأۡسٗا كَانَ مِزَاجُهَا زَنجَبِيلًا ﴿١٧﴾ عَيۡنٗا فِيهَا تُسَمَّىٰ سَلۡسَبِيلٗا ﴿١٨﴾ ﴾ الانسان: ١٥ - ١٨. واتە: (هەروەها لە سوراحی و دۆلکەی زیودا شەرابیان بۆ دەگێڕن کە دەکرێتە ئەو کوپ و پەرداخانەوە کە لە شوشە و کریستاڵی تایبەت دروستکراون. هەموو دام و دەزگای خواردن و خواردنەوەکان لە شووشەی زیو دروستکراون بەشێوەیەکی جوان و دڵڕفێن. هەروەها شەرابێکی تریان پێشکەش دەکرێت ئاوێتەکەی زەنجەبیلە. کە سەرچاوەیەکە لە بەهەشتدا بە سەلسەبیل ناودەبرێت).

## ٢٣- لاوانی ئێسك سووك و ڕووخۆش و زۆر جوانی نەمر خواردن و خواردنەوە بۆ بەهەشتیەکان ئامادە ئەکەن و بە چاکترین شێوە خزمەتیان دەکەن:

خوای پایەبەرز دەفەرموویت:﴿ وَيَطُوفُ عَلَيۡهِمۡ غِلۡمَانٞ لَّهُمۡ كَأَنَّهُمۡ لُؤۡلُؤٞ مَّكۡنُونٞ ﴿٢٤﴾ ﴾ الطور: ٢٤. واتە: (هەروەها منداڵانی جوان و ئێسك سووك بە دەوریاندا دێن و خزمەتیان دەکەن دەڵێی مرواری پاك و بێگەردن).

﴿ قُطُوفُهَا دَانِيَةٞ ﴿٢٣﴾ ﴾ الواقعة: ١٧. واتە: (لاوانی جوان و ئێسك سووك و نەمر بە دەوریاندا دێن و خزمەتیان دەکەن و هەمیشە گەنجن و پیرنابن).

﴿ وَيَطُوفُ عَلَيۡهِمۡ وِلۡدَٰنٞ مُّخَلَّدُونَ إِذَا رَأَيۡتَهُمۡ حَسِبۡتَهُمۡ لُؤۡلُؤٗا مَّنثُورٗا ﴿١٩﴾ ﴾ الانسان: ١٩. واتە: (ئینجا نێوجەوانانی هەمیشە لاو و ڕووخۆش و جوان و پاك، بەناویاندا دەگەڕێن، کاتێك دەیانبینیت وا دەزانیت مروارین و بەوناوەدا بڵاوبونەتەوە).

## ٢٤- دەستبەند و بازنەکانی بەهەشتیەکان لە زێڕو زیون، هەروەها پۆشاکیان لە ئاوریشمی تەنك و ئەستورە:

خوای مەزن دەفەرموویت:﴿ أُوْلَٰٓئِكَ لَهُمۡ جَنَّٰتُ عَدۡنٖ تَجۡرِي مِن تَحۡتِهِمُ ٱلۡأَنۡهَٰرُ يُحَلَّوۡنَ فِيهَا مِنۡ أَسَاوِرَ مِن ذَهَبٖ وَيَلۡبَسُونَ ثِيَابًا خُضۡرٗا مِّن سُندُسٖ وَإِسۡتَبۡرَقٖ ﴾ الكهف: ٣١. واتە: (بازن و دەستبەندی ئاڵتونیان لە دەست ئەکرێت، پۆشاکی سەوزی جوان دەپۆشن کە

دووتوێیە، چینی ژێرەوە ئاوریشمی ئەستورە و چینی سەرەوەش ئاوریشمی تەنكە).

﴿ يُحَلَّوْنَ فِيهَا مِنْ أَسَاوِرَ مِن ذَهَبٍ وَلُؤْلُؤًا وَلِبَاسُهُمْ فِيهَا حَرِيرٌ ﴾ الحـــج: ٢٣، فاطر: ٣٣. واتە: (لەوێ دەستبەندی ئاڵتون و مـرواری دەكرێتـە دەسـتیان، پۆشاكیشیان لەو بەهەشتەدا ئاوریشمە).

﴿ يَلْبَسُونَ مِن سُندُسٍ وَإِسْتَبْرَقٍ مُّتَقَـٰبِلِينَ ﴿٥٣﴾ ﴾ الـدخان: ٥٣. واتــە: (دەپۆشــن لــە ئاوریشمی تـەنك و ئەسـتور، لـەو كاتـەدا، خۆشەویستان لـە بەرامبـەر یـەك دادەنیشن "بەڕووی خۆشەوە بۆ یەكتر دەڕوانن و گفتوگۆی خۆش و بەتام ئەكەن ").

﴿ عَـٰلِيَهُمْ ثِيَابُ سُندُسٍ خُضْرٌ وَإِسْتَبْرَقٌ وَحُلُّوٓاْ أَسَاوِرَ مِن فِضَّةٍ ﴾ الانســان:٢١. واتـــە: (پۆشـــاكی بەختــەوەران ئاوریشــمی ســەوزی تەنكــە كــە بەســەر پۆشـاكی ئاوریشـمی ئەسـتوردا لەبەریان كردووە، بە بازنی زیوی ڕازێنراونەتەوە).

## ٢٥- بەهەشتیەكان لەسەر قەنەفە و كورسی و فەڕش و ڕایەخی ئاوریشمی سەرسورهێنەر شانیان داداوەو پاڵیان داوەتەوە:

خوای باڵادەست و خـاوەن شـكۆ دەفـەرمووێت: ﴿ هُمْ وَأَزْوَٰجُهُمْ فِى ظِلَـٰلٍ عَلَى ٱلْأَرَآئِكِ مُتَّكِـُٔونَ ﴿٥٦﴾ لَهُمْ فِيهَا فَـٰكِهَةٌ وَلَهُم مَّا يَدَّعُونَ ﴿٥٧﴾ ﴾ یـــس: ٥٦ - ٥٧. واتـــە: (خۆیـــان و هاوسـەرانیان لـەژێر سـێبەری درەختـی جـوان و چـڕوپڕدا لەسـەر كورسـی و قەنەفـە ڕازاوەكـان شـانیان داداوە. میوەجـاتی جـۆراو جۆریـان پێشـكەش دەكرێـت، هـەروەها هەرچی داوا بكەن و حەزی لێ بكەن دەستبەجێ ئامادەیە).

خـوای پایەبڵنـد دەفـەرمووێت:﴿ عَلَىٰ سُرُرٍ مُّتَقَـٰبِلِينَ ﴿٤٤﴾ ﴾ الصـافات: ٤٤. واتـە: (ئـەو بەختەوەرانە لەسەر كورسی و قەفەنە ڕازاوەكان بەرامبەر یەكتری دادەنیشن).

﴿ مُتَّكِـِٔينَ عَلَىٰ رَفْرَفٍ خُضْرٍ وَعَبْقَرِىٍّ حِسَانٍ ﴿٧٦﴾ ﴾ الـرحمن: ٧٦. واتــە: (شــانیان داداوە لەسەر پشتی سەوزو جوان و دۆشەكی نایاب و ڕازاوە).

﴿ فِيهَا سُرُرٌ مَّرْفُوعَةٌ ﴿١٣﴾ وَأَكْوَابٌ مَّوْضُوعَةٌ ﴿١٤﴾ وَنَمَارِقُ مَصْفُوفَةٌ ﴿١٥﴾ وَزَرَابِىُّ مَبْثُوثَةٌ ﴿١٦﴾ ﴾ الغاشـــیة:

١٣ - ١٦.[1] واتە: (چەندین تەختگەلی بەرزو بڵندو چەندین پەرداخی دانراویشی تیایە. و چەندین پشتیی ڕیزكراو و فەڕشی ڕاخراویشی تیایە).

## ٢٦- هاوسەرانی بەهەشتیەكان پاك و بێگەردو ڕەوشت بەرزن، كە قەشەنگ و خۆشەویستن لەلایەن مێردەكانیان، تەنها چاویان لەلای مێردەكانیانە:

خوای باڵادەست و خاوەن شكۆ دەفەرموویێت: ﴿ وَلَهُمْ فِيهَآ أَزْوَٰجٌ مُّطَهَّرَةٌ ﴾ البقرة:٢٥. واتە: (هەروەها لەوێدا هاوسەرانی پاك و بێ گەردیان بۆ ئامادەكراوە).

﴿ وَعِندَهُمْ قَٰصِرَٰتُ ٱلطَّرْفِ عِينٌ ﴿٤٨﴾ كَأَنَّهُنَّ بَيْضٌ مَّكْنُونٌ ﴿٤٩﴾ ﴾ الصافات: ٤٨-٤٩. واتە: (لە تەنیشتیانەوە حۆری چاوگەش دانیشتوون، جگە لە هاوسەرانیان چاو بۆ كەسی تر هەڵنابڕن. هەر دەڵێی هێلكەی كوڵاوی پاك كراو و شاراوەن "كەس دەستی لێ نەداون").

﴿ ٱدْخُلُوا۟ ٱلْجَنَّةَ أَنتُمْ وَأَزْوَٰجُكُمْ تُحْبَرُونَ ﴿٧٠﴾ ﴾ الزخرف:٧٠. واتە: ("پێیان دەوترێت": فەرموون بچنە بەهەشتەوە خۆتان و هاوسەرانتان، خۆتان و ئەوانەی وەك ئێوە خواناس بوون و لەوێ ژیانی كامەرانی و شادی و بەختەوریتان پێدەدرێت).

﴿ فِيهِنَّ قَٰصِرَٰتُ ٱلطَّرْفِ لَمْ يَطْمِثْهُنَّ إِنسٌ قَبْلَهُمْ وَلَا جَآنٌّ ﴿٥٦﴾ كَأَنَّهُنَّ ٱلْيَاقُوتُ وَٱلْمَرْجَانُ ﴿٥٨﴾ ﴾ الرحمن:٥٦ و ٥٨. واتە: (لەو بەهەشتە حۆری تیادایە كە تەنها تەماشای هاوسەرەكانیان دەكەن، پێش ئەوان دەستی كەسیان لێ نەكەوتووە، نە لە گرۆی ئادەمی و نە لە پەری. ... ئەو هاوسەرانە لە جوانی و شۆخ و شەنگی و قەشەنگیدا وەكو یاقوت و مەرجان وان).

(١) سەیری ئەمانەش بكە: الكهف ٣١، ص ٥١، الطور ٢٠، الرحمن ٥٤، الواقعة ١٥ - ١٦ و ٣٤ و ٨٩، الدهر ١٢ - ١٣.

﴿ فِيهِنَّ خَيْرَٰتٌ حِسَانٌ ﴿٧٠﴾ ...حُورٌ مَّقْصُورَٰتٌ فِي ٱلْخِيَامِ ﴿٧٢﴾ ... لَمْ يَطْمِثْهُنَّ إِنسٌ قَبْلَهُمْ وَلَا جَآنٌّ ﴿٧٤﴾ ﴾ الرحمن:٧٠ و ٧٢ و ٧٤. واتە: (لەو بەهەشتەدا حۆری جوان و شۆخ و شەنگ و ڕەوشت بەرزی تیادایە. ... حۆری چاوگەش و چاوڕەش، ئەو ئافرەتە حۆریانە لە ڕەشماڵەكانیاندا ماونەتەوە ... ئەو حۆریانە، پێش ئەوان دەستی كەسیان پێ نەكەوتووە، نە لە گرۆهی ئادەمی و نە لە پەری).

﴿ وَحُورٌ عِينٌ ﴿٢٢﴾ كَأَمْثَٰلِ ٱللُّؤْلُؤِ ٱلْمَكْنُونِ ﴿٢٣﴾ ﴾الواقعة:٢٢ - ٢٣. واتە: (هاوڕێ لەگەڵ حۆری چاوگەش و چاو ڕەش. وەك مرواری شاراوەو دەست لێ نەدراوو).

﴿ إِنَّآ أَنشَأْنَٰهُنَّ إِنشَآءً ﴿٣٥﴾ فَجَعَلْنَٰهُنَّ أَبْكَارًا ﴿٣٦﴾ عُرُبًا أَتْرَابًا ﴿٣٧﴾ لِّأَصْحَٰبِ ٱلْيَمِينِ ﴿٣٨﴾ ﴾ الواقعة:٣٥ - ٣٨.[1] واتە: (ئەو حۆریانەمان بە تایبەتی بۆ دروست كردووە. كردوومانن بە حۆریانی هەمیشە كیژ. هاوسەرەكانیان زۆر خۆش دەوێت و هەموویان هاوتەمەنن. ئەمانە هەمووی بۆ دەستە ڕاستەكان "ئەوانەی نامەی كردەوەكانیان درایە دەستی ڕاستیان").

## ٢٧- شادمان و بەختەوەر بوون بە بینینی خوای گەورە:

خوای گەورە دەفەرموێت:﴿ لِّلَّذِينَ أَحْسَنُوا۟ ٱلْحُسْنَىٰ وَزِيَادَةٌ ﴾ یونس: ٢٦. واتە: (بۆ ئەو كەسانەی چاكەیان كردووە، پاداشتی زۆر چاك هەیە لەگەڵ زیادەدا كە گەیشتنە بە دیداری خوای گەورەوە).

﴿ وُجُوهٌ يَوْمَئِذٍ نَّاضِرَةٌ ﴿٢٢﴾ إِلَىٰ رَبِّهَا نَاظِرَةٌ ﴿٢٣﴾ ﴾ القیامة: ٢٢ - ٢٣.[2] واتە: (لەو ڕۆژەدا، ڕووخسارانێك گەشاوەو ناسك و ئاسوودەن. چونكە "هەریەكە بۆ خۆی" تەماشای پەروەردگاری دەكات).

---

(١) سەیری ئەمانەش بكە: آل عمران ١٥، النساء، ص ٥٢، الدخان ٥٤، الطور ٢٠، النبأ ٣٣.

(٢) لەبارەی بینینی خوای پەروەرگار، هەروەها بۆچوون و مەزهەبەكانی زانایان لەوبارەوە بگەڕێوە بۆ بەشی خواناسی (الالهیات).

## ٢٨- هەر شتێك دەروون و نەفس حەزو ئارەزووی بکات ئەوا لە بەهەشتدا هەیە:

خوای پایەبەرز دەفەرموێت: ﴿ وَهُمْ فِي مَا ٱشْتَهَتْ أَنفُسُهُمْ خَٰلِدُونَ ﴾ الأنبياء: ١٠٢. واتە: ("ئەوان لەناو نازو نیعمەتدا" کە حەزیان لێی بوو و ئارەزوویان دەکرد بۆ هەتا هەتایی دەمێنن).

﴿ لَّهُمْ فِيهَا مَا يَشَآءُونَ خَٰلِدِينَ ﴾ الفرقان: ١٦. واتە: (لەو بەهەشتەدا هەرچی داوا بکەن بۆیان ئامادەیە هاوڕێ لەگەڵ ژیانی نەمریدا).

﴿ وَفِيهَا مَا تَشْتَهِيهِ ٱلْأَنفُسُ وَتَلَذُّ ٱلْأَعْيُنُ ﴾ الزخرف: ٧١. واتە: (لەو بەهەشتەدا هەرچی نەفس حەزی لێ بکات و دڵ بیخوازێت و چاو حەز بەدیتنی بکات ئامادەیە).

﴿ لَهُم مَّا يَشَآءُونَ فِيهَا وَلَدَيْنَا مَزِيدٌ ﴿٣٥﴾ ﴾ ق: ٣٥. واتە: (هەرچیش داوا دەکەن و حەزی لێ دەکەن بۆیان ئامادەیە تیایدا، زۆر لەوەش زیاترمان لایە).

﴿ كَذَٰلِكَ يَجْزِي ٱللَّهُ ٱلْمُتَّقِينَ ﴾ النحل: ٣١. واتە: (هەرچییەك بخوازن و هەرچی ئارەزوو بکەن و داوا بکەن، بۆیان ئامادەیە تیایدا، ئا بەو شێوەیە خوای میهرەبان پاداشتی خواناس و پارێزکاران ئەداتەوە).

## ٢٩- بۆ هەتا هەتایی و هەمیشەیی بەهەشتیەکان ژیان لە بەهەشتدا بەسەر دەبەن:

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ وَهُمْ فِيهَا خَٰلِدُونَ ﴾ البقرة: ٢٥. واتە: (ژیانی هەمیشەیی و نەبڕاوە لەو بەهەشتەدا دەبەنە سەر).

﴿ هُمۡ فِيهَا خَٰلِدُونَ ٨٢ ﴾ البقرة: ٨٢.[١] واتە: (هەر ئەوان نیشتەجێی بەهەشتن و تیایدا ژیانی هەتا هەتایی دەبەنە سەر).

﴿ هُمۡ فِيهَا خَٰلِدُونَ ﴾ یونس: ٢٦. واتە: (ئا ئەوانە نیشتەجێی بەهەشتن و بۆ هەمیشەیی ژیانی تیادا دەبەنە سەر).

﴿ خَٰلِدِينَ فِيهَا ﴾ آل عمران: ١٥ و ١٣٦ و ١٩٨.[٢] واتە: (هاوڕێ ژیانی نەبڕاوە).

﴿ خَٰلِدِينَ فِيهَآ أَبَدًا ﴾ النساء:٥٧ و ١٢٢.[٣] واتە: (لەوێدا ژیانی هەمیشەیی و بەردەوام دەبەنە سەر).

﴿ وَمَا هُم مِّنۡهَا بِمُخۡرَجِينَ ﴾ الحجر: ٤٨. واتە: (هیچ کات ئەوان لەو بەهەشتەدا دەرناکرێن).

﴿ فَٱدۡخُلُوهَا خَٰلِدِينَ ٧٣ ﴾ الزمر: ٧٣. واتە: (فەرموون بۆ هەتا هەتایی بچنە ناو بەهەشتەوە).

﴿ وَأَنتُمۡ فِيهَا خَٰلِدُونَ ﴾ الزخرف: ٧١. واتە: (هەروەها ژیانی هەمیشەیی و نەبڕاوەشی تیادا دەبەنە سەر).

﴿ لَا يَذُوقُونَ فِيهَا ٱلۡمَوۡتَ إِلَّا ٱلۡمَوۡتَةَ ٱلۡأُولَىٰۖ وَوَقَىٰهُمۡ عَذَابَ ٱلۡجَحِيمِ ٥٦ ﴾ الدخان: ٥٦. واتە: (لە هەمووی خۆشتر ئەوەیە کە هەرگیز تاڵیی مردن ناچێژن تیایدا جگە لەو مردنەی یەکەمجار، و پەروەردگاریان لە سزای دۆزەخ بەدووری گرتوون و پاراستوونی).

---

(١) هەروەها سەیری ئەمانەش بکە: الأعراف ٤٢، یونس ٢٦، المؤمنون ١١، آل عمران ١٠٧، هود ٢٣.

(٢) هەروەها تەماشای ئەم ئایەتانەش بکە: النساء ١٣، المائدة ٨٥، التوبة ٧٢ و٨٩، هود ١٠٨، ابراهیم ٢٣، الکهف ١٠٨، طه ٧٦، الفرقان ٧٦، العنکبوت ٥٨، لقمان ٩، الأحقاف ١٤، الفتح ٥، الحدید ١٢، المجادلة ٢٢.

(٣) سەیری ئەم ئایەتانە بکە: المائدة ١١٩، التوبة ٢٢ و ١٠٠، التغابن ٩، الطلاق ١١، البینة ٨.

﴿ ٱدۡخُلُوهَا بِسَلَٰمٖۖ ذَٰلِكَ يَوۡمُ ٱلۡخُلُودِ ٣٤ ﴾ ق: ٣٤. واتە: (بفەرموون بچنە ناو بەهەشتەوە لەگەڵ ئاشتی و ئارامی و هێمنیدا، ئا ئەوە ئیتر ڕۆژی نەمری و نەبڕاوەیە).

## ٣٠- قسەی بێ كەڵك و نابەجێ و یەكتر تۆمەتبار كردنی تێدا نییە:

خوای مەزن دەفەرموویت: ﴿ لَا يَسۡمَعُونَ فِيهَا لَغۡوٗا وَلَا تَأۡثِيمًا ٢٥ إِلَّا قِيلٗا سَلَٰمٗا سَلَٰمٗا ٢٦ ﴾ الواقعة: ٢٥ - ٢٦. واتە: (هیچ جۆرە قسەیەكی نابەجێ و نادروست و ناڕێك نابیستن و یەكتریش گوناهبار ناكەن. جگە لەوتنی سڵاو و وەڵامدانەوەو قسەی خۆش نەبێت).

﴿ لَّا يَسۡمَعُونَ فِيهَا لَغۡوًا إِلَّا سَلَٰمٗا ﴾ مریم: ٦٢. واتە: (ئەوجا لەوێ هیچ گوفتارێكی نابەجێ نابیستن، جگە لە سڵاو كردن و "گوفتاری خۆش و بەجێ" نەبێت).

﴿ لَّا يَسۡمَعُونَ فِيهَا لَغۡوٗا وَلَا كِذَّٰبٗا ٣٥ ﴾ النبأ: ٣٥. واتە: (لەو بەهەشتەدا هیچ جۆرە قسەیەكی پڕو پووچ و درۆو دەلەسە نابیستن).

﴿ لَّا تَسۡمَعُ فِيهَا لَٰغِيَةٗ ١١ ﴾ الغاشية: ١١. واتە: (لەو شوێنەدا قسەو گوفتارێكی ناخۆش و نابەجێ نا بیستن).

## ٣١- هەست بە ماندوێتی و بێزاری ناكەن:

خوای گەورە دەفەرموویت: ﴿ لَا يَمَسُّهُمۡ فِيهَا نَصَبٞ ﴾ الحجر: ٤٨. واتە: (هیچ جۆرە بێ تاقەتی و بێزاری و ناخۆشی و پەستییەك دووچاریان نابێت).

﴿ لَا يَمَسُّنَا فِيهَا نَصَبٞ وَلَا يَمَسُّنَا فِيهَا لُغُوبٞ ﴾ فاطر: ٣٥. واتە: (هیچ نەخۆشی و ناخۆشییەك توخنمان ناكەوێت، هیچ ئازارو ئێشێكی دەروونی تووشمان نابێت و هیچ بێزاری و ماندووبوونێكیش ڕوومان تێناكات).

## ٣٢- سوپاس و ستایشی پەروەردگاریان ئەكەن لەسەر ئەوەی بەڵێنی خۆی هێنایەجێ و نازو نیعمەتی بەوان بەخشیووە:

خوای باڵادەست دەفەرموویت: ﴿ وَقَالُواْ ٱلۡحَمۡدُ لِلَّهِ ٱلَّذِي صَدَقَنَا وَعۡدَهُۥ وَأَوۡرَثَنَا ٱلۡأَرۡضَ

نَتَبَوَّأُ مِنَ ٱلْجَنَّةِ حَيْثُ نَشَآءُ ﴾ الزمر: ٧٤. واتە: (ئەوسا ئیتر ئەو بەختەوەرانە دەڵێن: سوپاس و ستایش بۆ ئەو خوایەی، كە بەڵێنی خۆی بۆمان بردە سەرو كردینی بەخاوەنی سەر زەمینی بەهەشت و لەهەر شوێنێك و لەهەر جێیەكیدا بمانەوێت سەربەستانە ژیان دەبەینە سەر).

﴿ وَقَالُوا۟ ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ ٱلَّذِى هَدَىٰنَا لِهَٰذَا وَمَا كُنَّا لِنَهْتَدِىَ لَوْلَآ أَنْ هَدَىٰنَا ٱللَّهُ لَقَدْ جَآءَتْ رُسُلُ رَبِّنَا بِٱلْحَقِّ وَنُودُوٓا۟ أَن تِلْكُمُ ٱلْجَنَّةُ أُورِثْتُمُوهَا بِمَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ ﴿٤٣﴾ ﴾ الأعراف: ٤٣. واتە: ("ئەوسا ئیتر هەمووان بەیەك دەنگ و یەك ئاواز" دەڵێن: سوپاس و ستایش بۆ ئەو خوایەی كە هیدایەت و ڕێنمووی كردین بۆ ئەم جێگە و ڕێگە خۆشە، ئەگەر ئەو خودایە هیدایەت و ڕێنمووی نەكردینایە هەرگیز ڕێگەی هیدایەتمان نەدەزانی و ئەم پاداشتەمان وەرنەدەگرت، سوێند بەخوا بەڕاستی پێغەمبەرانی پەروەردگارمان بەحەق و ڕاستیەوە هاتن، ئەوسا بانگیان لێكرا: ئەوە ئەو بەهەشتەیە كە پێتان دراوە، بەهۆی ئەو كارو كردەوانەی كە ئەنجامتان دەدا).

﴿ وَءَاخِرُ دَعْوَىٰهُمْ أَنِ ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴾ یونس: ١٠. واتە: (دواهەمین گوفتاریشیان دوای هەموو نازو نیعمەت و بەخششێك ئەوەیە كە، پڕ بەدڵ، لەناخی دەروونیانەوە بەڕاستی دەڵێن: الحمد لله رب العالمين).

﴿ وَقَالُوا۟ ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ ٱلَّذِىٓ أَذْهَبَ عَنَّا ٱلْحَزَنَ إِنَّ رَبَّنَا لَغَفُورٌ شَكُورٌ ﴿٣٤﴾ ﴾ فاطر: ٣٤. واتە: (ئینجا هەمووان لە خۆشیدا دەڵێن: سوپاس و ستایش بۆ ئەو خوایەی كە هەرچی غەم و پەژارەیە لە دڵ و دەروونی دەركردین، بەڕاستی پەروەردگارمان زۆر لێ خۆشبوو و سوپاسگوزارە).

﴿ وَنَادَىٰٓ أَصْحَٰبُ ٱلْجَنَّةِ أَصْحَٰبَ ٱلنَّارِ أَن قَدْ وَجَدْنَا مَا وَعَدَنَا رَبُّنَا حَقًّا فَهَلْ وَجَدتُّم مَّا وَعَدَ رَبُّكُمْ حَقًّا قَالُوا۟ نَعَمْ فَأَذَّنَ مُؤَذِّنٌۢ بَيْنَهُمْ أَن لَّعْنَةُ ٱللَّهِ عَلَى ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿٤٤﴾ ﴾ الأعراف: ٤٤. واتە: ("پاشان" نیشتەجێیانی بەهەش بانگی نیشتەجێیانی دۆزەخیان كرد: بەڕاستی ئەو بەڵێنەی پەروەردگارمان پێی دابووین دەستمانكەوت و پێی بەخشین، ئایا ئێوەش ئەو

بەڵێنەی کە پەروەردگارتان دابووی بەڕاستی دەستانکەوت؟! لەوەڵامدا وتیان: بەڵێ.. ئەوسا جارچیەك جاڕیدا لە نێوانیاندا و هاواری کرد: نەفرەتی خوا لە ستەمکاران بێت).

## ٣٣- هیچ ڕق و کینەیەك لە دڵ و دەروونی بەهەشتیەکاندا نییە:

خوای پاك و تاك دەفەرموێت:﴿ وَنَزَعۡنَا مَا فِي صُدُورِهِم مِّنۡ غِلٍّ ﴾ الأعراف: ٤٣. واتە: ("هەروەها لە دەروازەی بەهەشتدا" هەرچی بوغزو کینەیەك لە دڵ و دەروون و سینەیاندا بوو ئێمە دامان ڕنی).

﴿ وَنَزَعۡنَا مَا فِي صُدُورِهِم مِّنۡ غِلٍّ ﴾ الحجر: ٤٧. واتە: (لە کاتێکدا هەرچی کینەو بوغزە لە دڵ و دەروونیاندا دەرمان کێشا).

## ٣٤- چاك و چۆنیشیان لە بەهەشتدا سڵاو کردنە:

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ تَحِيَّتُهُمۡ فِيهَا سَلَٰمٌ ﴾ ابراهیم: ٢٣. واتە: (چاك و چۆنیان لە بەهەشتدا سڵاوکردنە).

﴿ وَتَحِيَّتُهُمۡ فِيهَا سَلَٰمٌ ﴾ یونس: ١٠. واتە: (چاك و چۆنیشیان لەوێ سڵاوکردنە).

## ٣٥- فریشتەکان بەسڵاوی گەرمەوە پێشوازییان لێ ئەکەن:

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ جَنَّٰتُ عَدۡنٖ يَدۡخُلُونَهَا وَمَن صَلَحَ مِنۡ ءَابَآئِهِمۡ وَأَزۡوَٰجِهِمۡ وَذُرِّيَّٰتِهِمۡۖ وَٱلۡمَلَٰٓئِكَةُ يَدۡخُلُونَ عَلَيۡهِم مِّن كُلِّ بَابٖ ﴿٢٣﴾ سَلَٰمٌ عَلَيۡكُم بِمَا صَبَرۡتُمۡۚ فَنِعۡمَ عُقۡبَى ٱلدَّارِ ﴿٢٤﴾ ﴾ الرعد: ٢٣ - ٢٤. واتە: (جا فریشتەکان دەچن بۆ سەردانیان لە هەموو دەروازەکانەوە. "دەڵێن" سڵاوتان لێبێت لەبەرامبەر خۆگرتنتانەوە، کەوابوو ئای چەندە جێگە و ڕێگەیەکی خۆشتان بۆ خۆتان مسۆگەر کرد).

﴿ لَا يَحۡزُنُهُمُ ٱلۡفَزَعُ ٱلۡأَكۡبَرُ وَتَتَلَقَّىٰهُمُ ٱلۡمَلَٰٓئِكَةُ هَٰذَا يَوۡمُكُمُ ٱلَّذِي كُنتُمۡ تُوعَدُونَ ﴾ الأنبیاء: ١٠٣. واتە: ("ئەو بەختەوەرانە" لێقەومانی گەورەو تەنگانەی بێ

سنووری "قیامەت" تووشی غەمباری و پەژارەیان ناکات، بەڵکو فریشتەکان "بەڕووی خۆشەوە پێشوازیان لێ دەکەن و" دەڵێن ئەمە ئەو ڕۆژەیە کە کاتی خۆی بەڵێنتان پێدەدرا).

﴿ وَيُلَقَّوْنَ فِيهَا تَحِيَّةً وَسَلَٰمًا ﴾ الفرقان: ٧٥. واتە: (جا لەوێ بە سڵاو درووود پێشوازییان لێدەکرێت).

## ٣٦- بەهەشتیەکان ناترسن و خەفەتیش ناخۆن:

خوای مەزن دەفەرموویت: ﴿ ٱدْخُلُواْ ٱلْجَنَّةَ لَا خَوْفٌ عَلَيْكُمْ وَلَآ أَنتُمْ تَحْزَنُونَ ﴾ الأعراف: ٤٩. واتە: (دە بچنە بەهەشتەوە، نە ترس و بیمتان لەسەرە نە غەم و پەژارەش دەخۆن).

﴿ ٱدْخُلُوهَا بِسَلَٰمٍ ءَامِنِينَ ﴿٤٦﴾ ﴾ الحجر: ٤٦. واتە: ("پێیان دەوترێت:" فەرموون بچنە ناوی بەسەلامەتی و سەلامتان لەسەر بێت، ژیانی پڕ لە ئاسوودەیی تیادا بەرنە سەر).

﴿ فَأُوْلَٰٓئِكَ يَدْخُلُونَ ٱلْجَنَّةَ وَلَا يُظْلَمُونَ شَيْـًٔا ﴾ مریم: ٦٠. واتە: (ئا ئەوانە دەچنە بەهەشتەوەو هیچ جۆرە ستەمێکیان لێ ناکرێت).

﴿ إِنَّ ٱلْمُتَّقِينَ فِي مَقَامٍ أَمِينٍ ﴿٥١﴾ فِي جَنَّٰتٍ وَعُيُونٍ ﴿٥٢﴾ ﴾ الدخان: ٥١ - ٥٢. واتە: (بەڕاستی ئەوانەی پارێزکار و دیندارن، لە جێگە و شوێنێکی زۆر ئارامدا ژیان دەبەنە سەر. لە باخچە و دیمەنەکانی بەهەشتدا، لەپاڵ کارێزو کانی و تاڤگەکاندا دەژین).

﴿ يَدْعُونَ فِيهَا بِكُلِّ فَٰكِهَةٍ ءَامِنِينَ ﴾ الدخان: ٥٥. واتە: (بانگ دەکەن تیایدا بۆ هەموو جۆر میوەیەك، بێ ئەوەی بترسن لە تەواوبوون و، نەخۆش کەوتن و لەبەرچاو کەوتن).

﴿ ٱدْخُلُوهَا بِسَلَٰمٍ ﴾ ق: ٣٤. واتە: (بفەرموون بچنە ناو بەهەشتەوە لەگەڵ ئاشتی و

ئارامی و هێمنیدا).

## ٣٧- ڕووی گەش و شادییان پێ دەبەخشرێت:

خـوای پـەروەردگار دەفـەرموویت: ﴿ وَلَقَّىٰهُمْ نَضْرَةً وَسُرُورًا ﴾ الـدهر: ١١. واتـە: (ڕووی گەش و شادمانی پێیبەخشین).

## ٣٨- خاوەن حورمەت و ڕێز لێنراون:

خوای گەورە دەفەرموویت:﴿ وَهُم مُّكْرَمُونَ ﴾ الصافات: ٤٢. واتە: (قەدرو ڕێزێکی بێ وێنە لەلایەن پەروەردگارو فریشتەکانەوە لێیان دەگیرێت).

﴿ أُوْلَٰٓئِكَ فِي جَنَّٰتٖ مُّكْرَمُونَ ﴿٣٥﴾ ﴾ المعـارج: ٣٥. واتـە: (ئـا ئەوانـە لـە باخـەکانی بەهەشـتدا ڕێز لێنراون).

## ٣٩- بەهەشتیەکان میهرەبانی و ڕەزامەندی خوای گەورە دەست دەخەن:

خـــوای پایەبـــەرز دەفـــەرموویت:﴿ يُبَشِّرُهُمْ رَبُّهُم بِرَحْمَةٖ مِّنْهُ وَرِضْوَٰنٖ ﴾ آل عمـران: ١٥. واتـە: (بـۆ ئەوانـەی پارێزکـارو خواناسـن، لای پـەروەردگاریان باخـەکانی بەهەشـت ئامادەیـە کـە: چـەندەها ڕووبـار بـەژێر درەختەکانیـدا و بەبـەردەم کۆشکەکانیدا دەڕوات، هاوڕێ لەگەڵ ژیانی نەبڕاوە لەگـەڵ هاوسـەرانی پـاکیزەو بـەدەم هەست کردنی بەردەوام بە ڕەزامەندیی پەروەردگاری ئازیز).

﴿ رَّضِيَ ٱللَّهُ عَنْهُمْ وَرَضُواْ عَنْهُ ﴾ المائـدة: ١١٩. واتـە: (خـوای پـەروەردگار لێیـان ڕازی بـووەو ئەوانیش لەخوا ڕازی بوون).

﴿ يُبَشِّرُهُمْ رَبُّهُم بِرَحْمَةٖ مِّنْهُ وَرِضْوَٰنٖ ﴾ التوبة: ٢١. واتـە: (پـەروەردگاریان مـژدەیان دەداتـێ بـە ڕەحمـەت و میهرەبـانی تایبـەت لەلایـەن خۆیـەوە، هـاوڕێ لەگـەڵ ڕەزامەندی).

﴿ وَعَدَ ٱللَّهُ ٱلْمُؤْمِنِينَ وَٱلْمُؤْمِنَٰتِ جَنَّٰتٖ ...وَرِضْوَٰنٞ مِّنَ ٱللَّهِ أَكْبَرُ ﴾ التوبـــة: ٧٢. واتە: (خوای گەورە بەڵێنی داوە بـە ئیمانـداران لـە پیاوان و لـە ئافرەتـان، بـەوەی کـە

باخەكانی بەهەشتیان پێ دەبەخشێت.... لەگەڵ ڕەزامەندی خوای گەورەدا، كە لە هەموو نازو نیعمەتەكان بەنرخترو گرنگترە).

## ٤٠-بەدەستهێنانی بەهەشت گەورەترین سەركەوتن و دەستكەوتی بێ سنووریانە:

خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿ ذَٰلِكَ ٱلْفَوْزُ ٱلْعَظِيمُ ﴾ النساء: ١٣. واتە: (بێگومان هەر ئەوەشە سەرفرازی گەورەو دەستكەوتی بێ سنوور).

﴿ ذَٰلِكَ ٱلْفَوْزُ ٱلْكَبِيرُ ﴾ البروج: ١١. واتە: (هەر ئەوە خۆی لەخۆیدا سەركەوتن و سەرفرازییەكی زۆر گەورەو بێ سنورو بێ وێنەیە).

﴿ ذَٰلِكَ ٱلْفَوْزُ ٱلْعَظِيمُ ﴾ المائدة: ١١٩.[1] واتە: (ئەوەیە سەرفرازی گەورەو بێ سنور).

﴿ ذَٰلِكَ عِندَ ٱللَّهِ فَوْزًا عَظِيمًا ﴾ الفتح: ٥. واتە: (ئەم بەڵێنە لەلایەن خواوە دەستكەوت و سەرفرازیەكی زۆر گەورە و بێ سنورە بۆ ئیمانداران).

﴿ ذَٰلِكَ هُوَ ٱلْفَوْزُ ٱلْعَظِيمُ ﴾ التوبة: ٧٢، الدخان: ٥٧، الحديد: ١٢. واتە: (ئەوە خۆی سەرفرازیەكی زۆر گەورەو بێ ئەندازەیە).

﴿ إِنَّ هَٰذَا لَهُوَ ٱلْفَوْزُ ٱلْعَظِيمُ ﴿٦٠﴾ ﴾ الصافات: ٦٠. واتە: (بەڕاستی ئا ئەمەیە سەركەوتن و سەرفرازی و بەختەوەری گەورەو بێ سنور).

﴿ نِعْمَ ٱلثَّوَابُ وَحَسُنَتْ مُرْتَفَقًا ﴾ الكهف: ٣١. واتە: (بەڕاستی ئەو بەختەوەرانە چاكترین و جوانترین و خۆشترین پاداشتیان دەستكەوتووە، هاوڕێ لەگەڵ خۆشترین و سازگارترین جێگە و ڕێگەدا).

﴿ حَسُنَتْ مُسْتَقَرًّا وَمُقَامًا ﴾ الفرقان: ٧٦. واتە: (بەڕاستی جێگە و ڕێگە و نیشتەجێیەكی خۆش و سازگارو ڕازاوەیە).

---

(١) سەیری ئەم ئایەتانەش بكە: التوبة ٨٩ و ١٠٠، الصف ١٢، التغابن ٩.

﴿ فَمَن زُحْزِحَ عَنِ ٱلنَّارِ وَأُدْخِلَ ٱلْجَنَّةَ فَقَدْ فَازَ ﴾ آل عمران: ١٨٥. واتە: (ئەوسا ئەوەی دوور خرایەوە لە ئاگری دۆزەخ و خرایە بەهەشتەوە، ئەوە بەڕاستی سەرفراز بووە).

**٤١- مژدەیان پێ دەدرێت:**

خوای گەورە دەفەرموویت: ﴿ بُشْرَىٰكُمُ ٱلْيَوْمَ جَنَّٰتٌ ﴾ الحدید: ١٢. واتە: (مژدەی ئێوە ئەمڕۆ باخەکانی بەهەشتە).

**٤٢- پیرۆزباییان لێدەکرێت بەوەی لەناو ئەو نازو نیعمەت و خۆشیانەدان:**

خوای مەزن دەفەرموویت: ﴿ كُلُوا۟ وَٱشْرَبُوا۟ هَنِيٓـًٔۢا بِمَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ ﴿١٩﴾ ﴾ الطور: ١٩، المرسلات: ٤٣. واتە: (پێیان دەوترێت بخۆن و بخۆنەوە نۆشی گیانتان بێت لە پاداشتی کردەوەی چاك و ڕێك و پێکتاندا).

﴿ كُلُوا۟ وَٱشْرَبُوا۟ هَنِيٓـًٔۢا بِمَآ أَسْلَفْتُمْ فِى ٱلْأَيَّامِ ٱلْخَالِيَةِ ﴿٢٤﴾ ﴾ الحاقة: ٢٤. واتە: ("ئینجا پێیان دەوترێت" بخۆن و بخۆنەوەو نۆشتان بێت، بەهۆی دەست پێشخەریتان لە ڕۆژگاری ڕابردوودا).

**٤٣- بەهەشتیەکان سەرگەرم و سەرقاڵن لەناو خۆشی و شادی و بەختەوەرییەکی بێ هاوتادا، بۆیە ماوەی پرسیارکردنیان نیە، جا دوای ئەو نازو نیعمەتە هەتا هەتاییە پرسیارو داوای چی دەکەن؟**

خوای باڵادەست و خاوەن شکۆ دەفەرموویت: ﴿ إِنَّ أَصْحَٰبَ ٱلْجَنَّةِ ٱلْيَوْمَ فِى شُغُلٍ فَٰكِهُونَ ﴾ یس: ٥٥. واتە: (بەڕاستی ئەمڕۆ بەهەشتیەکان لەناو خۆشی و شادی و کامەرانیەکی بێ وێنەدا سەرگەرمن).

﴿ فَٰكِهِينَ بِمَآ ءَاتَىٰهُمْ رَبُّهُمْ ﴾ الطور: ١٨. واتە: (زۆر کەیف خۆش و دڵخۆش و ڕووخۆشن بەو بەخششانەی کە پەروەردگاریان پێی بەخشیون).

**٤٤- بەهەشتیەکان بەهەشت بەهیچ شوێنێك و جێگایەکی تر ناگۆڕنەوە،**

